# جەنگی زانیاری

## (سیخوڕی، سێکس، فریودان)

ئامادەکردن و وەرگێرانی
سیروان بیەیی

# جەنگی زانیاری

## (سیخوڕی، سێکس، فریودان)

ناوەندی ڕۆشنبیریی ئاوێر

ناوەندی ئاوێر
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- بەڕێوەبەری گشتی ناوەند: حەسەن بورەیی
- بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: ئاریز حەسەن
- بەرپرسی هونەری: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
- ڕاوێژکاری ناوەند: حەیدەر عەبدوڵڵا

Farhan Kurdi

 هەولێر - پشت پاریزگا - پشت مزگەوتی مەحموود عەلاف

 07505114142 - 07507476644

 Nawendi awer:: ناوەندی ئاوێر

 nawendi.awer@yahoo.com

# جەنگی زانیاری

## (سیخوڕی، سێکس، فریودان)

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە:

سیروان حسێن بیەیی

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ٤٥٠

# جەنگی زانیاری

(سیخوڕی، سێکس، فریودان)

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە: سیروان حسێن بیەیی

پیتچنین: وەرگێڕ

بابەت: هەواڵگری

بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

نرخ: (١١٠٠٠) دینارە

شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلات - هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی کوردستان ژمارەی سپاردنی ( ٤٥١)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.

جەنگی زانیاری

**پێشکەشە بە:**

- شەهیدانی ڕێگای سەربەخۆیی
- ئەوانەی بەرژەوەندی نیشتیمان پێش هەر بەرژەوەندییەکی تەسک دەخەن
- پارێزەرانی ئارامیی کوردستان

**سوپاس و پێزانین**

- ستار شێروانی، کە بە سەرنج و تێبینییەکانی پەرتووکەکەی دەوڵەمەندتر کرد.

## ناوەڕۆک

بەرکوڵ ........ ١٣
بەشی یەکەم ........ ١٩
سیخوڕی (Espionage) ........ ١٩
پێشەکی ........ ٢٠
تێگەیشتن لە هونەری سیخوڕی ........ ٢٥
سیخوڕی و سروشتی جیهانی سیاسەت ........ ٢٦
سیخوڕی و بازنەی هەواڵگری ........ ٢٨
سیخوڕی و چوارچێوە کارگێڕیەکەی ........ ٣٠
دیرۆکا سیخوڕی ........ ٣٣
سیخوڕی بۆ؟ ........ ٣٩
پاڵنەرەکانی سیخوڕی ........ ٤٠
نهێنی و پێداویستییەکانی پیشەی سیخوڕی ........ ٤٨
سیخوڕ و میتۆدەکانی سیخوڕی ........ ٦١
لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە ........ ٦٣
میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی نەرم ........ ٦٤
میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی دژوار ........ ٦٧
کاریگەرییەکانی ئەشکەنجەی دەروونی ........ ٦٩
ئەشکەنجەی دەروونی چۆن کاردەکات؟ ........ ٧١
کاریگەرییەکانی توانای مێشک و نیرۆلۆژی ئەشکەنجەی دەروونی ........ ٧٢
ئامرازی پەیوەندی سیخوڕ ........ ٧٥
شیفرە و شکاندنی شیفرە ........ ٧٦
زانیاری هەڵە و تێکدان ........ ٧٨
کامێرای سیخوڕی ........ ٧٩
سیخوڕی لە ئەورووپا ........ ٧٩
سیخوڕی ئابووری ........ ٨٤

بەرنامەی "نایاساییەکان"ی سۆڤیەت و رووسیا ........................ ٨٦
سیخوڕی لەڕێگای ئینتەرنێتەوە ........................................ ٨٩
ئێران و سوپا سیخوڕیەکەی ........................................ ٩٨
ئێران: ئامانج و تێکدەر ........................................ ١٠٠
چۆن ئێران بەرپەرچی ئەم هێرشە سیخوڕیانە دەداتەوە؟ ................. ١٠٣
تواناکانی هێرشی ئەلیکترۆنی ئێران ........................................ ١٠٦
ئامانجە دەرەکییەکانی ئێران ........................................ ١٠٨
گوێهەڵخستن ........................................ ١١٤
دژەهەواڵگریی ........................................ ١١٦
پۆلێنکردنی زانیاری ........................................ ١١٧
بەشی دووەم ........................................ ١٢٥
سێکس (Sexspionage) ........................................ ١٢٥
پێشەکی ........................................ ١٢٦
تەڵەی هەنگوینی ........................................ ١٢٨
مێژووی تەڵەی هەنگوینی ........................................ ١٢٩
چەمکی سیخوڕی سێکسی ........................................ ١٣٢
"سیخوڕی سێکسی" وەک میتۆدێکی هەواڵگریی و دەزگاکانی ئاسایش ..... ١٣٣
سیخوڕی سێکسی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت ........................................ ١٣٥
لەپشت دەرگا داخراوەکاندا ........................................ ١٤٩
بەشی سێیەم ........................................ ١٦٠
فریودان (Deception) ........................................ ١٦٠
پێشەکی ........................................ ١٦١
فریودان ........................................ ١٦٣
فریودان لە جەنگدا ........................................ ١٦٦
فریودان لە سەربازییدا ........................................ ١٧٣
سیستەمی فریودانی ........................................ ١٧٤

نکۆڵی و فریودانی ستراتیژی ........................ ١٧٧
جەنگی دەروونی و فریودان ........................ ١٨٥
جەنگی دەروونی و دۆخی ئێستای کوردستان لەم نێوەندەدا ........ ١٨٨
مکولترا و نامیلکەی جادوویی ونبوو ........................ ١٩٧
پاراسایکۆلۆژی و سیخوڕی ........................ ٢٠٦
پێنووسی ژەهراوی ........................ ٢١٠
نووسین بە مەرەکەبی نهێنی ........................ ٢١٢
سیخوڕی بە ئاوێتەی کیمیایی مێشکگر ........................ ٢١٥
هاوبیریی ........................ ٢١٦
بەشی چوارەم ........................ ٢١٧
ئۆپەراسیۆن ........................ ٢١٧
ئۆپەراسیۆنەکانی ئەمریکا لە ئەلبانیا ........................ ٢١٨
دزینی بەڵگەنامەی چەکی ناووکی ئێران لەلایەن مۆسادەوە ........ ٢٢٠
ئۆپەراسیۆنی باربارۆسا ........................ ٢٢٣
ئۆپەراسیۆنی چەناگەی هەڵۆ ........................ ٢٢٧
بەکارهێنانی باڵۆن بۆ سیخوڕی ........................ ٢٢٩
بازنەی سیخوڕیی لوسی ........................ ٢٣٠
تونێلی بەرلین ........................ ٢٣٤
ئۆپەراسیۆنی ئەڵماس ........................ ٢٣٦
ئۆپەراسیۆنی مۆساد لە ئەرژەنتین ........................ ٢٤٠
ململانێی جەنگی زانیاری لە ئەفریقیا ........................ ٢٤٤
پێرل هاربەر ........................ ٢٤٨
ژووری ڕەش ........................ ٢٥٢
پرسی بارمتەی ئێرانی ........................ ٢٥٤
بەشی پێنجەم ........................ ٢٥٦
کەسایەتی و سیخوڕ ........................ ٢٥٦

کۆنستانس بابینگتن ........................................ ٢٥٧
عەبدول قەدیر خان ........................................ ٢٥٨
ئەیمەن دین ........................................ ٢٦٥
گۆنین سیگیف، سیخوڕی ئێران لە ئیسرائیل ........................................ ٢٦٧
پاڤلۆڤیچ بێریا ........................................ ٢٧٢
ئوسامە بن لادن ........................................ ٢٧٤
عبدالله عەزام ........................................ ٢٨١
عەلی محەمەد، سیخوڕی ئوسامە بن لادن ........................................ ٢٨٦
ڕێنهارد هایدریک ........................................ ٢٩١
ئێدوارد سنۆدن ........................................ ٢٩٥
سیلڤیا ڕافایێل ........................................ ٣٠٠
موستەفای چکۆڵە ........................................ ٣٠٩
بوگدان ستاشنکی ........................................ ٣١٤
ریچارد سۆرج ........................................ ٣١٩
کیم فیلبی ........................................ ٣٢٦
حەسەن عەبدولجیهاد ........................................ ٣٣٢
ئیسحاک ئاخمیرۆڤ ........................................ ٣٣٤
ئالدریچ هەیزن ئەیمس ........................................ ٣٣٥
رایان ئەندێرسن ........................................ ٣٣٨
دەیڤید بارنێت ........................................ ٣٣٩
کریستۆفەر جۆن بۆیس ........................................ ٣٤١
ڕۆدۆڵف ئیڤانۆڤیچ ئابیل ........................................ ٣٤٢
مانوێل نۆریگا ........................................ ٣٤٨
گای بێرجیس ........................................ ٣٥١
ئەڤریل هاریمان ........................................ ٣٥٣
کاترینا لیونگ ........................................ ٣٥٤

........................................................................ ٣٥٦
ئۆلگا چیخۆڤا ........................................................................ ٣٥٩
ئەلبێخ سانچێز ........................................................................ ٣٦٢
بن عامی ........................................................................ ٣٦٤
ئینگا ئارڤاد ........................................................................ ٣٦٦
والتەر دورانتی ........................................................................ ٣٦٧
رۆبەرت هانسن ........................................................................ ٣٦٩
ئانا چاپمان، کچە جوانەکەی سۆڤیەت ........................................................................ ٣٧٣
ئێرڤین چەیمبەرس سکاربێک ........................................................................ ٣٧٤
شەهرام ئەمیری، زانا کوردەکە ........................................................................ ٣٧٧
برادلی مانینگ ........................................................................ ٣٧٨
بەشی شەشەم ........................................................................ ٣٧٨
دەزگا و دامەزراوە هەواڵگرییەکان ........................................................................ ٣٧٩
دەزگای هەواڵگری ناوەندی ........................................................................ ٣٨٥
دەزگای هەواڵگری نهێنی (SIS) ........................................................................ ٣٨٧
چاوەدێری ئاسمانیی ........................................................................ ٣٩٠
نووسینگەی هەواڵگریی و توێژینەوە ........................................................................ ٣٩٢
کۆمپانیای هێڵی ئاسمانیی ئەمریکا ........................................................................ ٣٩٣
هەواڵگری ئەمریکا لە جەنگی جیهانیی یەکەم ........................................................................ ٣٩٩
هەواڵگری ئەمریکا لەجەنگی جیهانیی دووەم ........................................................................ ٤٠٣
دەزگای ئاساییشی هێزە چەکدارەکان ........................................................................ ٤٠٤
هەواڵگری سوپا و فەرماندەیی پاراستن ........................................................................ ٤٠٦
دەزگای ئاساییشی سوپا ........................................................................ ٤٠٧
کۆمسیۆنی وزەی ئەتۆمی ........................................................................ ٤٠٩
بەرنامەی تالپیۆت ........................................................................ ٤١١
یەکەی ٨٢٠٠ ........................................................................ ٤١٣
پارتی کۆمۆنیستی ئەمریکی

بلێچلی پارک ........................................................ ٤١٧
نووسینگەی هەماهەنگی ئاسایشی بەریتانی ............................ ٤١٩
بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی ................................................ ٤٢٠
ناوچەی ٥١ ........................................................................ ٤٢٣
هەواڵگری لە ئیدارەی جۆرج بوشی باوکدا ................................ ٤٢٦
هەواڵگریی لە ئیدارەی جۆرج بوشی کوڕدا ................................ ٤٢٩
دەزگای هەواڵگری مۆساد ...................................................... ٤٣٢
دەزگای هەواڵگری پاکستان ................................................... ٤٣٧
هەواڵگری وڵاتی چین ........................................................... ٤٣٩
گۆستاپۆ ............................................................................ ٤٤٢
ئیدارەی کارتەر و هەواڵگریی ................................................. ٤٤٣
تۆڕی کەیمبریج پێنج ............................................................ ٤٤٥
سەرنجەکان ........................................................................ ٤٤٧
ئیندێکس ............................................................................ ٤٧٥

## بەرگوڵ

"با شتەکە قسەی خۆی بکات" ئەمە ئەو دەربڕینەیە کە لەلایەن دەزگای هەواڵگری مۆسادی ئیسرائیلییەوە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی ڕووبەڕووی وڵاتەکەیان دەبێتەوە. مەبەست لەم دەربڕینە ئەوەی کە، "هەر ئامرازێک، تەنانەت با بیرۆکەکە شێتانەش بێت، دەبێت بەکاربهێنرێت بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی نیشتیمان پێویستیەتی." لەم سۆنگەیەوە، دەکرێت بڵێین "بەدەستهێنانی زانیاری ئەو جەنگە شاراوەیە کە گەلان کێبڕکێی لەسەر دەکەن بۆ پاراستنی تاک لەئاستی ناوەخۆ، بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندی نیشتیمانی وڵات لەئاستی نێونەتەوەییدا." تەنانەت لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکەمیشدا، هێشتا هیچ پێناسەیەکی دیار و ڕوون بۆ چەمکی هەواڵگری لەگۆڕێدا نییە چونکە هەر نووسەرێک(یان دەزگایەک) بەگوێرەی ئەزموون و رامانی خۆی راڤەی دەکات. لەڕووی زمانەوانییەوە، هەواڵگری، یان راستتر بڵێین بەدەستهێنانی زانیاری، بەو چالاکییە دەوترێت کە "خەڵک لێی دەدوێن و دەیانەوێت بیزانن." بەمەش، بەواتا کورتەکەی، "بریتییە لە پرسیارکردن لە هەواڵێک." لەڕووی زاراوەییشەوە، هەواڵگری لەیەک کاتدا هەڵگری دوو واتایە: پرۆسەی هەواڵگری —واتە، کۆکردنەوەی زانیاری— و ئەنجامەکانی ئەو زانیارییەی لەلایەن سیخوڕ و هەواڵدۆزەکان کۆدەکرێنەوە. بەشێوەیەکی گشتی، هەواڵگری بەسێ ڕێگای جیاواز دەبینرێت. یەکەم، هەواڵگری وەک "پرۆسە،" واتە کۆکردنەوە، شیکردنەوە و گواستنەوەی بۆ داڕێژەرانی سیاسەتی وڵات یان فەرماندە سەربازییەکان. ئەم پرۆسەیە بەشێوەیەکی تایبەتی پێی دەوترێت "بازنەی هەواڵگری،" هەرچەندە ناوەڕۆک و ئەرکی ئەم بازنەیە لەم دواییانەدا مشتومڕی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا. دووەم، هەواڵگری وەک "ئەنجام." سێیەم، ئاژانسە هەواڵگرییەکان و کۆمەڵگای هەواڵگری وەک "دەزگایەکی کارگێڕی." ئەم سێ قۆناغەی هەواڵگری دەتوانن ببن بە کرۆکی مانەوەی دەوڵەتێک، یان گرووپێک، لە ململانێ ژیارییەکاندا.[i]

---

[i] Hulnick, A. S. (٢٠٠٦). What's wrong with the Intelligence Cycle. Intelligence and National Security, ٢١ (٦), ٩٥٩-٩٧٩.

هەروەها، دەبێت ئاماژە بەوەش بدرێت کە "زانیاری" یان "هەواڵگری" دوو چەمکی تاڕاددەیەک جیاوازن. "هەواڵگری" بەهۆی پرۆسەیەکی شیکردنەوە یان هەڵسەنگاندنی "زانیاری" بەرهەم دێت. کۆکردنەوەی زانیاری بەهۆی دوو میتۆدەوە جیادەکرێتەوە: یان ئەوەتا لەڕێگای سەرچاوەی کراوەی نووسراو(ڕۆژنامە، رادیۆ، گۆڤاری ئابووری، سیاسیی و سەربازیی)، (سەرچاوەکانی ئینتەرنێت)؛ یاخود لەڕێگای تەکنیکی توندی نهێنی و تێوەگلان لەم جۆرە کردانە. هەواڵگری یاخود زانیاری لەڕێگای چەند سەرچاوەیەکی شاراوەی وەک سیخوڕ، کارمەندی باڵیۆزخانەکان، راپۆرتی دیبلۆماسی، بڕینی پەیوەندیی گەیاندن و هێما و وێنەی سەتەلایەت، دێتە بەرهەم. ئەم ئامرازە نهێنیانە بۆ "دزینی" زانیاری بەکاردێن کە وڵاتێکی نەیار یاخود گروپێکی تیرۆریستی دەیەوێت بیشارێتەوە.[i] بەهۆی ئەوەی کە کۆکردنەوەی زانیاری دەچێتە خانەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە، دەکرێت بڵێین دەزگا هەواڵگرییەکانی- وەک دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا، دەزگای نهێنی هەواڵگری بەریتانیا، وە دەزگای یەکێتی سۆڤیەتی لێکهەڵوەشاوە- لە باشترین دەزگا هەواڵگرییەکانی جیهان لەم سەردەمەدا لەقەڵەم دەدرێن.[ii]

بەگەڕانەوە بۆ ناواخنی کۆکردنەوەی زانیاری و هەواڵگری، دەتوانین بڵێین کە ئەگەر بڕیار بێت "زانیاری هێز و دەسەڵات بێت،" بۆمان دەردەکەوێت کە هەواڵگری خۆی لەخۆیدا فۆرمێکی "هێزەکەیە." "زانیاری" دەتوانێت هاوکاربێت لە مومارەسەکردنی جۆرەکانی تری دەسەڵات. زانیاری بنچینەی سەرەکیە بۆ سیاسەت یاخود بڕیارەکان —بۆ خەڵک، دامەزراوە و حکومەت— ئەگەر بێتوو بەشێوەیەکی "ژیرانە" بەکاربهێنرێت.[iii] هەربۆیە، زۆرجار ناهاوسەنگی و گرفت لەنێوان ئەنجامی هەواڵگری و ویستی سیاسەتڤانان‌دا دروست دەبێت لەمەڕ پرسێکی دیاریکراودا. سیاسەت بەزۆری

---

[i] Russel, R. L. (٢٠٠٧). Achieving all-source fusion in the Intelligence Community. in L. K. Johnson (Ed.), Handbook of Intelligence Studies (pp. ١٨٩-١٩٩). Lonson: Routledge.

[ii] Andrew, C. (٢٠٠٤). Intelligence, International Relations and 'Undertheorisation'. Intelligence and National Security, ١٩ (٢), ١٧٠-١٨٤.

[iii] Gill, P. (٢٠٠٤). Securing the Globe: Intelligence and the Post-٩/١١ Shift from 'Liddism' to 'Drainism'. Intelligence and National Security, ١٩ (٣), ٤٦٧-٤٨٩.

لەسەر بنەمای پرەنسیپ و ئایدۆلۆژییەوە رۆدەنرێت، لەکاتێکدا هەواڵگری پشت بە بنەمای زانیاری خەملێنراو و شیکردنەوە دەبەستێت. کاتێک هەردووکیان تێکگیر دەبن، هەمیشە هەواڵگری لایەنە دۆڕاوەکەیە؛ وە کاتێک زانیاری لەدژی دەسەلات و هێز دەوەستێتەوە، ئەوا زانیاری دەبێتە قوربانی.[i] لەکۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگرییدا (جا بەهەر رێگایەک بێت)، نهێنیگەریی بنچینەی سەرکەوتنیەتی: هەروەک وارنەر(٢٠٠٩) روونی دەکاتەوە کە "بەبێ نهێنی، هیچ زانیارییەک ناچێتە خانەی هەواڵگرییەوە."[ii]

لەو چەند ساڵەی دوای ئازادکردنی ئێراق (هەندێک بە داگیرکاریی دایدەنێن) هەرێمی کوردستان تارادەیەکی بەرچاو پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە، بەلام کەوتۆتەنێو شوێنێکی جیۆپۆلیتیکی زۆر ئاڵۆز کە تیایدا وڵاتانی هەرێمیی (بەتایبەتی رژێمی ئێران کە لەکۆتایی تەمەنیەتی و هەموو رێگایەک دەگرێتەبەر بۆ مانەوەی خۆی) لەکێبڕکێدان بۆ سەپاندنی هەژموونی خۆیان.[iii] (جگە لەوەی کە بەهۆی دەوڵەمەندی ناوچەکە بە

---

[i] Fry, M. G., & Hochstein, M. (١٩٩٤). Epistemic communities: Intelligence Studies and International Relations. In W. K. Wark (Ed.), Espionage: Past, Present, Future? (pp. ١٤-٢٩). Ilford: Frank Cass & Co.

[ii] Warner, M. (٢٠٠٩). Wanted: A definition of 'intelligence'. in C. Andrew, R. J. Aldrich, & W. K. Wark (Eds.), Secret Intelligence: A Reader (pp. ٣-١٢). London: Routledge.

[iii] ئامادەکار و وەرگێڕی ئەم پەرتووکە پێی وایە کە ئەگەر لەماوەی نێوان دەستپێکردنی نۆپەراسیۆنەکان (کە ئێستا دەستی پێکردووە) بۆسەر ئێران و رووخانی رژێمە داپلۆسێنەرەکەی، کورد نەتوانێت هیچ هەنگاوێک بهاوێژێت بەرەو سەربەخۆبوون و فەرزکردنی مەرج و ئەمری واقیع بەسەر ئەمریکا، ئیسرائیل، ئەوروپا و وڵاتانی هەرێمیی، ئەوا تا چەندین دەیەی تر ناتوانێت دووبارە ئەو بابەتە بوروژێنێت. هۆکارەکانی پشت ئەم لێکدانەوەیەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەرنجی بەرژەوەندیخوازانەی زلهێزەکان، بەتایبەتی ئەمریکا، لەسەر پرسی کورد نامێنێت وە دووبارە وەک هێنری کسینجەر لەساڵی ١٩٧٥، سەرانی ئێستای ئەمریکاش فریومان دەدەن، مێژوو بۆمان دەسەلمێنێت کە لە فەرهەنگی ئەمریکادا هیچ شتێک نییە بەناوی "دۆستایەتی بەردەوام" بەڵکو ئەوەی هەیە "بەرژەوەندی بەردەوامە"، بەنەمانی رژێمی ئێرانیش ئەو بەرژەوەندییە دەکەوێتە مەترسییەوە.

سامانی سروشتی، زیاتر لە سەددەیەکی بەرژەوەندی زلهێزەکانی جیهانیش کەوتۆتە ئەم ناوچەیە.) ئێمەی کوردیش لەو نێوەندەدا (بە هەر چوار پارچەوە)، لەوەتەی بوونمان هەیە بەدوای دۆزینەوەی شوناسی گەلێکی بێ شوناسدا دەگەڕێین. زانستی هەواڵگری (وە هوونەری کۆکردنەوەی زانیاری) لەم سەردەمە، وە لەکۆنیشدا، بنەمای سەپاندنی هەژموون بۆ گەلان و ڕێچارەی مانەوەی کوردە لە هاوکێشە هەرێمی و سەلماندنی (وجود)دا. تا هەواڵگری پێشکەوتوو و ئامانجداری بەرژەوەندی گشتی نیشتیمان بێت، ئەوەندە زیاتر ڕوو لە دۆزینەوەی دەرچەی سەرکەوتن دەبین.

ئەم پەرتووکەی بەردەستی ئێوەی هێژایان، جەنگی زانیاری، هەوڵێکی بچووکە بۆ تیشک خستنەسەر سێ تەوەری گرنگی بواری کۆکردنەوەی زانیاری: سیخوڕی، سێکس و فریودان. ئەم سێ چەمکە تەواوی کاری هەواڵگری پێکناهێنن، بەڵام سێ لە بنچینەی هەرەگرنگی ئەو زانستەن کە، ئێمە کورد بەتایبەتی، هۆکارن لە گەیشتن بە کەناری ئارامی، بێگومان لە حاڵەتی سەرکەوتنیاندا. ئامانجی هەرەسەرەکی لە کۆکردنەوە و وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە بریتییە لەهەستکردنی بە کەمی سەرچاوەی کوردی لەم بوارەدا و ئاشناکردنی خوێنەری کورد بە هونەرێک کە تەواوی ڕووداوەکانی جیهانیی لەسەر بنیادنراوە. هەموو ئەو داتا و زانیارییانەی ئێمەی مرۆڤ وەریان دەگرین لەسەر پێنج سەرچاوە ڕۆنراوە: ئەزموونی کەسیی؛ دابونەریت؛ ڕاگەیاندن (کە لەلایەن دەسەڵاتەوە ئاراستەدەکرێت)؛ ژیربیریی (لۆژیک)؛ وە لێکۆڵینەوەی زانستی. ئەم هەوڵەی کە من داومە زیاتر ئاشناکردنی خوێنەرە بە دوو سەرچاوەی کۆتایی (ژیربیریی و لێکۆڵینەوەی زانستی) چونکە ئەم دووانە تاکە میتۆدن کە مرۆڤێکی "ئاقڵمەند" سوودیان لێوەردەگرێت و بنەمای سیاسەتی وڵاتێکی لەسەر بینادەکات. بەپێچەوانەوە، سێ لە سەرچاوەکانی یەکەم (ئەزموونی کەسیی، دابونەریت، ڕاگەیاندن) هەرگیز جێگای متمانەنین چونکە دەکرێت لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، گەلێکەوە بۆ گەلێکی تر، دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێک تر جیاواز بن. ئێمەی کوردیش، قوربانی دەستی نەریت، میدیا و ئەزموونی سۆزداری خۆمانین.

لەمەودوا، ناکرێت ئێمەی کورد بەشێوازێک رەفتار بکەین کە "نەرمتر" بێت لە هی دوژمنانمان، کە هەواڵگری تاکە دەرچەیە بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم ئەرکە.

تا ئەم دواییانە، هەروەک ئامارەی پێکرا، دیدی کورد لەرووی جیهانبینییەوە تارادەیەک زۆر تەسک بووە، بەتێڕوانین لەوەی هێشتا ئێمە لەحاڵەتی "نوزانەوەین" بۆ بەدەستهێنانی مافەکانمان. خۆشبەختانە، بەهۆی کرانەوەی کورد بەرووی جیهانەوە، ئێستا ئەو دەرفەتە هەیە پەلبهاوێژین، لەرووی هەواڵگرییەوە، بۆناو ریزەکانی دوژمن، بەرلەوەی هەر کارەساتێک بقەومێت ئامادەباشیی تەواومان تیادا هەبێت بۆ بەرەنگاربوونەوە. زۆر گرنگە هەست بەوەش بکەین کە "هیچ" وڵاتێک لەگەڵ کوردا هاوسۆز و دۆست نییە، ئەوەی هەیە تەنیا دۆستایەتیەکی بەرژەوەندیخوازانەیە (لە ئەنجامدانی ریفراندۆمیش ئەمە بە کردەوە سەلمێنرا). کورد پەندێکی سەرنجراکێشی هەیە لەم بارەوە، کە دەڵێت "ب هیڤیا خەلکی، خۆلیا د شکەلکی." واتە، هەرکارێک بە دەست و بازووی خۆت ئەنجامی نەدەی، سەرئەنجامەکەی شکستە. بۆیە، ئێستا کاتی ئەوەیە ئەم پەندە بکەینە سەرقافلەی پاراستنی ئاسایشی نیشتیمانیی و تاکە دەرچەش لەم نێوەندەدا لە هەواڵگرییەوە مەیسەر دەبێت.

ئەم پەرتووکە بۆسەر شەش بەش (پشک) دابەشکراوە. لە سێ بەشی یەکەمدا، بەتیۆرتەسەلی باس لە سیخوڕی، سێکس و فریودان لەکاری هەواڵگری و زانستی کۆکردنەوەی زانیاری بەهۆی ئەم سێ رێکارە کراوە. دواتر، لە بەشی چوارەمدا باسی چەند ئۆپەراسیۆنێکی گرنگی جیهانی کراوە کە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری وەگەڕخراون. ئامانج لەمەشدا ئەوەیە خوێنەر تەنیا سەیری رووە تیۆرییەکەی نەکات بەڵکو ئاشنابێت لەگەڵ چەند ئۆپەراسیۆنێکی کردەیی کە لە ئەرزی واقیعدا روویانداوە. بەشی پێنجەمیش بۆ بەناوبانگترین سیخوڕەکانی جیهان تەرخانکراوە کە توانیویانە بەهۆی سیخوڕی، سێکس و فریودانەوە سەرکەوتنی مەزن (زۆرجاریش شکستیان هێناوە) بۆ خۆیان و گەلەکەیان تۆمار بکەن. بەشی کۆتاییش تایبەتە بە ناساندنی بەناوبانگترین

دەزگا و دامەزراوەی بواری هەواڵگری جیهانیی کە دەکرێت لەڕووی کارگێڕیی و چۆنیەتی کارکردنیان سوودیان هەبێت، بەتایبەتی دەزگای هەواڵگری ناوەندی.
دەبێت ئاماژە بەوەش بکەین کە ڕەنگە بۆ زۆرێک لە خوێنەرانی کورد بەکارهێنانی "سێکس" لە کردەی سیخوڕیدا وەک دیاردەیەکی نامۆ سەیر بکرێت، بەڵام بۆ گەیشتن بەئامانجی نەتەوەیەک ناکرێت سڵ لەبەکارهێنانی هیچ میتۆدێک بکرێتەوە. جگە لەوەش، نەک تەنیا بەکارهێنانی بەڵکو باسکردنی ئەو بابەتە هۆکارێکی بنچینەییە بۆ بەرپەرچدانەوەی سیخوڕە سێکسییەکانی وڵاتانی نەیار، بەتایبەتی ئێران و تورکیا، کە هەموو ئامرازێک بەکاردەهێنن بۆ لەباربردنی هەژموونی کوردستان، بەتایبەتی دوای ئەنجامدانی ریفراندۆمە مێژووییەکەی ٢٥ ئەیلولی ٢٠١٧.
لەکۆتاییدا، دەبێت بڵێین کە کاتی ئەوە هاتووە کورد، وەک هێزێکی شەرعی، بچێتەناو جیهانی ئاڵۆزی هەواڵگری، چیتر لە سەنگەرەکانی بەرگریی ئەم بوارە نەوەستێت و دەست بە هێرش بکات. بەڵام نابێت ئەوەش لەیادبکرێت کە مەیسەربوونی ئەم ئامانجە پیرۆزە بەندە بە مەرجی یەکخستنەوەی نێومالّی کورد بەگشتی، و هەرێمی کوردستان بەتایبەتی، چونکە دوژمن هیچ دەرفەتێک ون ناکات بۆ لێکترازاندنی کورد و پارچەپارچەکردنی زیاتری کوردستان، بەڵگەش بۆ قسەکانمان لەدەستدانی زیاتر لەنیوەی خاکی کوردستانە تەنیا لەماوەی چەند رۆژێکی کەمدا.
نابێت ئەوەش لەیاد بکرێت کە ئەوەی لەم پەرتووکەدا باسکراوە تەنیا دڵۆپێکە لە زەریایەک چونکە سروشتی جیهانی هەواڵگری سروشتێکی نهێنیگەرایییە، و دۆزینەوەی بەڵگەنامە لەم بارەوە کارێکی ئەستەمە. بۆیە، هیوادارم توانیبێتم هەوڵێکی بچووک بدەم لە خزمەتکردنی نیشتیمان و ئاشناکردنی خوێنەری کورد بە بابەتگەلێکی هەستیاری وەک مامەڵەکردن لەگەڵ زانیاری و جیهانە فراوانەکەی. هیچ کەسێکیش لە کەموکورتی بەدەر نییە، ئەم یاسایە لەسەر بەندەش جێبەجێ دەبێت.

**سیروان بیەیی**

تەمموزی ٢٠١٨، ئاوایی بێێ

## پێشەکی

سەرەتا، دەکرێت بڵێین وشەی "سیخوڕی" لەزمانی کوردیدا هەڵگری چەندین مانای جیاجیایە. هەندێک وا لێکیدەدەنەوە کە "هونەرێکە بۆگەڕان بەدوای ئەو شتەی کە لەمرۆڤ دەشاردرێتەوە لەلایەن بەرامبەرەکەیەوە." هەندێکی تریش وا تێی دەڕوانن کە کردەیەکە لەلایەن مرۆڤەوە بۆئەوەی "بەچاوتیژی بڕوانێتە شتێک بۆئەوەی بیناسێت یان بیسەلمێنێت." ئەمە لەڕووی زمانەوانییەوە. بەڵام لەڕووی کردارییەوە، "سیخوڕی" بەو ئەرکە دەوترێت کە لەپێناو دۆزینەوە و گەڕان بەدوای هەواڵێک و پشکنینی بەشێوەیەکی شاراوە و نهێنی دێت. هەروەها، واش سەیردەکرێت کە، "خۆت گوێ بۆ هەواڵێک شل بکەی بەبێ ئەوەی قسەکەرەکە هەست پێ بکات."

لە ئەندێشەی هەر مرۆڤێکدا ئەگەر بڕوانینە چەمکی "سیخوڕی" دەبینین ئەم کردەیە بە ئاشکراکردنی نهێنییەوە وابەستەیە، کە کارێکی باش نییە و زیان بە کەسایەتی مرۆڤ دەگەیەنێت. مرۆڤی "ئاسایی" پێی وایە سیخوڕ ئەو کەسەیە کە بەدوای عەیبوعاری خەڵکی تردا دەگەڕێت (بەپێی دەقێکی ئیسلامی) بۆئەوەی بزانێت هەڵگری چ نهێنییەکن. هۆکاری هەرەسەرەکی لەم نێوەندەشدا دەگەڕێتەوە بۆسەر ئایەتێکی قورئانی پیرۆز کە خودای باڵادەست دەفەرموێت، "... وە مەکەونە هەواڵپرسی لە عەیب و عاری خەڵکی، وە لەخوابترسن، تابزانیت کوڕەکەی چۆنە و، کچەکەی چی ئەکا و، ژنەکەی قسە لەگەڵ کێ دەکات و بزانن خودا تەوبە وەرئەگرێ لە هەرکەسێ تەوبە بکا و خودا میهرەبانە."[i] ئەوەی لەم پەرتووکەدا هاتووە لەبارەی سیخوڕییەوە، مەبەستەکە ئەوە نییە سیخوڕ لەسەر عەیبوعاری خەڵکی وەک تاک بوەستێت، چونکە ئەمە لەڕووی ئەخلاقیەوە کردەیەکی ناپەسەندە بەڵکو ئامانج لە سیخوڕیدا ئەوەیە بەدوای هەواڵی دوژمنەوە بین بۆ پاراستنی بەرژەوەندی نیشتیمانی و ئاساییشی

---

[i] ..... وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ. سورەتی حوجەرات، ئایەتی دوازدە. راڤەی مەلا عەبدولکەریمی موددەڕیس، تەفسیری نامی، بەرگی شەشەم، لا ١٠٥.

گشتی وڵات. ئەم کارە نەک تەنیا دەبێت لەلایەن کاربەدەستانی وڵاتێکی دیاریکراوەوە بیری لێبکرێتەوە، بەڵکو دەبێت وەک ستراتیژیەتی کاری دەوڵەت سەیر بکرێت.
بۆ زیاتر فراوانکردنی بابەتەکە، دەکرێت ئاماژە بەوەش بدەین کە سیخوڕی تەنیا بەشێکە لە کردەی هەواڵگری و بەس. چەندین ڕێگای تر هەن بۆئەوەی دەزگا هەواڵگرییەکان بەهۆیەوە زانیاری وەچنگ بخەن، بەڵام سیخوڕی (بەهەموو جۆرەکانییەوە) ئامرازە هەرە سەرەکیەکەیە بۆ وەدەستهێنانی هەواڵی دوژمن. یەکێک لە پێناسە هەرە پەسەندکراوەکانی سیخوڕی دەکرێت بەم چەشنە باس بکرێت کە بریتییە لەو کردەوەیەی "زانیاری نهێنی لەبارەی بارودۆخی سەربازیی یا سیاسیی یان ئابووری دەوڵەتی دەستکەوێ و، دەیانداتە دەوڵەتێکی تر." هەندێک لە شارەزایانی ئەو بوارە وا پێناسەی دەکەن کە، "زانینخوازیی دەنگوباسی دوژمنە لەشەڕ و ئاشتییدا و، زانینخوازی جووڵانەوە و تفاقەکانی بەمەبەستی گەیاندنی هەواڵەکانی بۆ دەوڵەت یان سوپا بۆ ئاگاداری وەرگرتن لەبۆی یان خۆپاراستن لێی (دژەسیخوڕی)، یان بۆ زانینی خاڵە لاوازەکانی دوژمن بۆ سوودوەرگرتن لێیان، یان لەپێناو زانینی چەکەکانی بۆ بەرگریکردن بەهەمان شێوە، یان خۆپاراستن لێیان بەچەکی هاودژ."
یاسا نێونەتەوەییەکانیش لەم پێناسەکردنی ئەم بابەتە بێ بەری نین. لەساڵی ١٩٠٧ لە شاری لاهای هۆڵەندا ڕێککەوتنێک واژوو کرا و پێناسەیەکی روونی بۆ "سیخوڕی" کردووە، "بەسیخوڕ لەقەڵەم نادرێ ئەو کەسە نەبێ کە لەنهێنییدا کاردەکات، یان خۆی دەگۆڕێت لەپێناو کۆکردنەوەی، یان هەوڵدان بۆ توێژینەوەی زانیاری لە ناوچەکانی کردەوەکانی جەنگاوەری سەربەیەک لە دوو تیپی شەڕکەر، بەمەبەستی گواستنەوەیان بۆ تیپەکەی تر." بەڵام ناکرێت ئەوە لەیاد بکەین کە شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئامانجی هەرەباڵای سیخوڕی بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری بۆ دەوڵەت. هەموو دەوڵەتێک پێوستی بە کۆکردنەوەی زانیاری هەیە لەبارەی دەوڵەتانی ترەوە، چ جای ئەو دەوڵەتە نەیاریشی بێت.
سیخوڕیش تەنیا پەیوەست نییە بەیەک تاقمی دەوڵەتەوە، بەڵکو بۆنموونە سەرکردە سەربازییەکان پێوستیان بە زانیاری سەربازیی هەیە لەبارەی هێز و توانای دوژمن، و

رووپێوی ئەو شوێنەی کە جەنگەکەی تیادا دەکەن. سیاسییەکان دەبێت چەندین زانیاری جۆراوجۆر بزانن، بەو مەرجەی کە دەبێت لەکاتی گونجاودا بەدەستی بهێنن بۆئەوەی بتوانن لەسەر بنەمای ئەو زانیارییە بەدەستهاتووانە سیاسەتی دەوڵەت دابڕێژن. لەهەمووشی گرنگتر، دەسەڵاتی باڵای دەوڵەت، سەرۆک، کە دەبێت هەموو ئەم جۆرە زانیارییانەی پێبگات، تەنانەت بە زانیاری دەروونی دوژمنیشەوە کە زۆر لە وڵاتان (کوردستان بە نموونە) ئەم لایەنە فەرامۆش دەکەن. کۆکردنەوەی زانیاری لەرێگای سیخوڕییەوە بۆ هەر مەبەستێک بێت پێوستە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕ بێت. لەوانە، دیاریکردنی ناوەڕۆکی ئەو زانیارییەی کە دەوڵەت پێویستیەتی. دواتر، گواستنەوەی زانیارییەکان لە شوێنی خۆیانەوە بۆ ئەو شوێنەی راڤەدەکرێن کە تا چ ئاستێک سوودیان هەیە. پاشان، ئەو زانیارییانە دەبێت شیکردنەوە و خەملاندنیان بۆ بکرێت. لەکۆتاییدا، رادەستکردنی ئەو زانیارییانە بۆ سەرکردەی باڵاکانی وڵات، بەڵام دەبێت لە ئان و ساتی گونجاودا بێت.

ناکرێت "دەوڵەت" لەسەر بنەمای حیزبایەتی و خزمایەتی هەروا لە خۆیەوە سیخوڕ هەڵبژێرێت چونکە لە ستراتیژیەتی ماوەدرێژی ئەم کارەدا، خودی دەوڵەتەکە دەبێتە قوربانی و دەکرێت ئەم سیخوڕە لەلایەن وڵاتێکی دوژمنەوە فریو بدرێت، یان ببێتە سیخوڕی دووسەرە، کە زیانی بێ ئەندازە لە وڵات و بەرژەوەندی نیشتیمانی بدات. بۆیە، ئەو سیخوڕەی دیاری دەکرێت پێویستە هەڵگری چەند تایبەتمەندییەک بێت. سیخوڕەکە، دەبێت لەو کەسانە بێ کە باوەڕ بە ئامۆژگاری و راستگۆییەکەی، دڵسۆزیەکەی بۆ وڵات بکرێت نەوەک لەو کەسانەی تۆمەتباربووە لە راستگۆییەکەی و سوود لە هەواڵەکانی وەرناگیرێت، ئەگەر راستگۆش بێت، رەنگە هەواڵێکی راستی مێنابێت، و تۆمەتبارکرابێت بەڕاستیەکەی، بۆیە دەرفەتی سوودوەرگرتن لە هەواڵەکەی بەهۆی ئەوەوە لەدەست دەچێت. پێویستە کەسەکە لەداناییدا شارەزابێت و فروفێڵی زۆر بزانێت. لەحاڵەتی گرتندا، دەبێت لە ئەشکەنجەدان، ئەگەر دوژمن پێی زانی، ئارام بگرێت بۆئەوەی ئەو زانیارییەی لایە سەبارەت بە وڵاتەکەی نەیخاتە مەترسییەوە، بەتایبەتی زانیاری سەربازیی، واتە دەبێت کارێک بکات کە نەناسرێت

لە بنەڕەتدا کاری سیخوڕی دەکات. جگەلەمەش، ئەو کەسە دەبێت شارەزایی و ئەزموونێکی هەبێت لە مەسەلەی گەشتکردن بە وڵاتاندا، بزانێت ئەو وڵاتەی بۆی دەڕوات جوگرافیاکەی بە چ چەشنێکە بۆئەوەی پێویستی بە پرسیارکردن نەبێت (هەرچەندە ئێستا بەهۆی تەلەفۆنی زیرەکەوە ئەم کێشەیە چارەسەرکراوە، بەڵام ناکرێت بەشێوەیەکی رەها پشت بەم رێگایە ببەسترێت چونکە ئامێری زیرەک بەبەردەوامی لەژێر چاودێری دەزگا هەواڵگرییەکانی جیهاندایە). مەترسییەکانی ئەم چەندەش زیاد دەبێت ئەگەر سیخوڕەکە پرسیاری شوێن و رێگاوبانی لە کەسێکی خۆجێی وڵاتی ئامانج کرد، دەکرێت ئەمیش لە بەرامبەردا چەند پرسیارێکی لێبکات دەربارەی وڵاتەکەی، بەمەش ناسنامە و ئەرکی ئەو سیخوڕە دەکەوێتە مەترسییەوە. هەروەها، یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی سیخوڕ ئەوەیە کە دەبێت توانای رووناسی لایەنی بەرامبەری هەبێت چونکە جار هەیە تەنیا بە هێزی خوێندنەوە روو سیخوڕەکە دەتوانێت زانیاری بەدەست بهێنێت.

تەنیا ئەم تایبەتمەندیانە سەرەوە بەس نین بۆئەوەی سیخوڕێک سەرکەوتوو بێت. یەکێک لە خاسیەتە هەر سەرەکییەکانی سیخوڕ دەبێت نهێنیپارێز بێت، کەمدوو بێت، لەشوێنی مەترسیدار و بۆ هیچ کەسێک باس لە ئەرکی خۆی نەکات. زانینی زمانی بیانیش گرنگییەکی تایبەتی هەیە. زمانی ئەو وڵاتەی سیخوڕی بۆ دەنێردرێت دەبێت بەباشی بزانێت بۆئەوەی هەر قسەیەک گوێبیست دەبێت بەئاسانی بیگوازێتەوە، ئەگەر زمانی ئەو وڵاتە بە نووسینیشەوە بزانێت ئەوە هێندەی تر سوودی هەیە. خۆگۆڕین و خۆشاردنەوە لەحاڵەتی لەناکاو و تایبەتدا یەکێکی ترە لە سیفەتە بەرزەکانی سیخوڕ، دەبێت بەشێوەیەک فێرکرابێت کە بتوانێت بەرگەی هەموو جۆرە ناڕەحەتییەک بگرێت. دەبێت سیخوڕ توانای خۆگونجاندن و راهاتنی لەگەڵ بارودۆخی دەورووبەر هەبێت. دەکرێت ئەو ژینگەیەی سیخوڕەکەی بۆ رەوانە دەکرێت ژینگەیەکی لەبار نەبێت و نەگونجێت لەگەڵیدا بەڵام ئەو کەسەی هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەم کارە دەبێت بەدڵنیاییەوە هەڵگری ئەم سیفەتە بێت. گوێڕایەڵی لەفەرمانەکانی سەرووی خۆی، یەکێکی ترە لەو تایبەتمەندیانە، بەتایبەتی لە سەربازییدا. قوربانیدان بەخۆی

و پێداویستییە کەسییەکانی زۆر گرنگە لەلایەن سیخوڕەوە تێبینی بکرێت، ئەوە کارەی ئەوان پێی هەڵدەستن پێویستی بە قوربانیدانە، ڕەنگە جاری وا هەبێت تەنانەت ژیانیش بکەوێتە مەترسییەوە. بۆیە، بەرلەوەی ببێتە سیخوڕ و ڕەوانەی وڵاتێک بکرێت، دەبێت ئەم چەندە بەتەواوی لەلای روون بێت.

هەموو ئەو سیفاتانەی سەرەوە دەبێت لە سیخوڕدا هەبن بۆئەوەی کاری خۆی بە باشی بکات و لەکاتی گونجاودا زانیاری بگەیەنێتە سەرووی خۆی. بەڵام، دەزگای هەواڵگریش، بەشی سیخوڕی، دەبێت ئەمەی لەبەرچاو بێت کە پاراستنی ئەو سیخوڕە و دابینکردنی پێداویستییەکانی لەئەستۆی ئەواندایە. هەر کەموکورتییەک لەم چەندەدا دەبێت هۆی خستنەمەترسی زانیاری نهێنی وڵات و لەکۆتاییشدا زیانی بێ ئەندازە بە ئاسایشی نیشتیمانی دەگات.[i]

بەنیسبەت زۆربەی ئەو کەسانەی تازەن لە مەودای هەواڵگرییدا سیخوڕی دیاردەیەکی سەددەی بیستەمە و لەنزیکەوە سەروکار و پەیوەندی هەیە لەگەڵ جەنگی سارددا. ئەوەی راستی بێت، واقیعەکە زۆر جودایە لەمە. بەکارهێنانی سیخوڕ و دژەسیخوڕی مێژوویەکی درێژی هەیە لە جیهان و بەتایبەتی ئەمریکا، واتە کاتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەددەی شانزەمی زایینی. ئەمریکا وڵاتێک بوو کە چەندین پاڵەوان و بکوژ، سەرکەوتن و شکستی بەرهەمهێناوە لەمێژووی خۆیدا. ئەو وڵاتە لەبەردەم چەندین هەڕەشەی جددی وەستاوەتەوە لەو کاتەی هێرشی کراوەتە سەر.

لەم بەشەدا، ئامانجی سەرەکی ئەوەیە هەندێ زانیاری و وردەکاری ببەخشینە خوێنەر دەربارەی سیخوڕی بەشێوەیەکی گشتی. هەر لەم چوارچێوەیەدا، تەواوی ئەو بابەتانەی سەروکاریان بە سیخوڕییەوە هەیە خراونەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. جگە لەمەش، تەنانەت دەست بۆ بابەتی ئەشکەنجەدانی سیخوڕ و جۆرەکانی براوە کە بە پێویستمان زانی وەک بەشێکی دانەبڕاوی ئەم کارە تیشکی بخرێتە سەر. هەر لەم بەشەدا، سیخوڕی و جۆرەکانی بە تێروتەسەلی باسیان لێوەکراوە. بەتایبەتی، ئەو

---

[i] هەواڵگری لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبیدا، د. ئەبەز مەجید ئەمین، و: کەمال غەمبار، دەزگای وەرگێڕان ٢٠٠٥.

جۆرە سیخوڕییەی سەروکاری هەیە لەگەڵ بەکارهێنانی ئینتەرنێت و کۆکردنەوەی زانیاری بەم رێگەیەوە. وە، سەرنجێکی زۆر ورد خراوەتە سەر وڵاتی ئێران لەم نێوەندەدا. ئامانج لەم کارەش تەنیا زانینی ئاستی تواناکانی ئێران لەم بوارەدایە لەهەمبەر وڵاتان و وەرگرتنی زانیاری لەبارەی ئەوەی کوردستان دەکەوێتە کوێی هەڕەشە سیخورەکانی ئەلیکترۆنی ئێرانەوە- هەرچەندە ئەمریکا لەم رووەوە رابەرایەتی جیهان دەکات (سیلیکۆن ڤالی، ئەو شوێنەیە کە تەواوی جیهان لێیەوە دەخرێتەژێر چاودێری دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکاوە، بەهۆی ئەوەی هەموو کۆمپانیاکانی بواری گەیاندن و ئینتەرنێتی ئەو وڵاتەی لێیە)، بەڵام بەهۆی ئەوەی ئەو وڵاتە خۆی خاوەنی ئەم جۆرە تەکنەلۆژیایەیە و بۆ کردەی سیخوڕی بەکاری دەهێنێت، بەپێویستمان زانی تەنیا باس لە ئێران بکەین کە نەیاری سەرسەختی کوردستانە و دەیەوێت ئەو هەژموونەی ئێستا هەرێم هەیەتی بەتەواوی لەباری بەرێت.

## تێگەیشتن لە هونەری سیخوڕی

سیخوڕی پێشبڕکێیەکی کۆتانەهاتووە لە نێوان سیخوڕ و دەزگاکانی دژەسیخوڕیدا. ئەم پێشبڕکێیە لەلایەن وڵاتانی زلهێز و بچووکەوە هێنرایە نێو گۆڕەپانی بەرژەوەندیخوازیی و سەپاندنی هەژموونەوە؛ ئەم کارەش لەڕێگای بەکارهێنانی کەسایەتی، کار، وە گروپە تیرۆرستیەکانەوە مەیسەر دەبێت. لێرە و لەم پەرتووکەدا، هەوڵ دەدرێت بایەخی سەرەکی بە ئەزموونی ئەمریکا و رووسیا (وە سۆڤیەتی جاران) لە ئەنجامدانی سیخوڕی لەدژی ئامانجە بیانییەکان و پاراستنی خۆی لەکاری سیخوڕی کە لەدژیدا ئەنجام دەدرێن، بدرێت. ئەو بابەتانەی باسکراون، بەشێوەیەکی ورد خراوەنەتەڕوو. بەم هۆیەشەوە خوێنەر زیاتر ئاشنای ئەنجامدانی کردەی سیخوڕی و دژەسیخوڕی دەبێت. بۆ زیاتر قوڵبوونەوە لە بابەتێکی تایبەت، ئێمە (وەرگێڕ) لەم پەرتووکەدا تەکنیکی دانانی سەرچاوەم بۆ هەر بابەتێک پەیڕەو کردووە. ئامانج لەمەشدا ئەوەیە کە خوێنەر بۆ درێژەی بابەتەکە بڕوانێتە ئەو ژێدەرانەی کە چیرۆکی بابەتەکەی لەسەر رۆنراوە.

## سیخوڕی و سروشتی جیهانی سیاسەت

دەبێت لەم نێوەندەدا ئاماژە بە دوو خاڵ بکەین دەربارەی پێگەی سیخوڕی لە نووسیندا لە جیهانی سیاسەت. یەکەم، رامانی کۆن و ئاسایی دەربارەی سیاسەتی نێونەتەوەیی جەختی کردۆتەسەر جیاوازییەکانی نێوان سیخوڕی لەکاتی جەنگ و ئاشتییدا. یاسای نێونەتەوەیی رێگای بە رۆڵی گرنگی سیخوڕی داوە لە کۆکردنەوەی زانیاری لەکاتەکانی جەنگدا. بەگەڕانەوە بۆ مێژوو، لەکاتی جاڕدانی پەیمانی بروکسل لەساڵی ١٨٧٤ هەواڵگریی بەشێوەیەکی یاسایی وەک ئامرازێکی کاروباری جەنگیی رێگای پێدرابوو. سروشتە دانسقەکەی ئەم هونەرەش خراوەتە بەرباس و تێرامان. بۆ نموونە، سیخوڕەکان پێویستە لەکاتی کردەی سیخوڕیدا بگیرێن لەلایەن لایەنی سیخوڕی لەسەرکراودا، ئەمە وەک شتێکی ئاسایی بینراوە. ئەگەر لەکاتی کردەی سیخوڕیدا دەسبەسەرکرا، یاسای نێونەتەوەیی پشتیوانی رێگرتن لە پێدانی هەندێ ماف و شکۆی تایبەت بە گیراوەکە دەکات کە بەپێچەوانەوە بەو خەڵکە ئاساییە دەدرێت کە بەتاوانێکی ئاسایی تۆمەتبارکراون. دۆخی سیخوڕی لەکاتی ئاشتیدا کەمتر روونە. ئەم دۆخە وەک سەرپێچیکردنی سەروەریی و سەربەخۆیی سیاسی وڵاتێک لەقەڵەم دەدرێت. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، هەندێک لێکۆڵەر و شارەزا لەم بوارەدا بە چالاکییەکی ئەخلاقی، سیاسیی وە یاسایی پەسەندکراو دەیبینن.

جیاوازی نێوان سیخوڕی لەکاتی جەنگ و ئاشتییدا گرنگیی تیۆریی و پراکتیکی خۆی لەدەست دەدات. جاڕدانی جەنگ بەشێوەیەکی فەرمی بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای جەنگەوە چیتر باوی نەماوە. جەنگی جیهانیی دووەم کۆتا جەنگی جاڕدراو بوو ئەمریکا تیایدا بەژداری کرد. جەنگی کۆریا، ڤێتنام، کەنداوی فارس، ئێراق، ئۆپەراسیۆنی پاراستنی ئاشتی لە کۆسۆڤۆ وە لوبنان، گریندا، وە جەنگی دژەتیرۆر هەموویان بەبێ جاڕدانی جەنگ ئەنجامدراون. هەروەها سنوورەکانی نێوان شەڕ و ئاشتییش بەرەو کاڵبوونەوە دەچن. لەماوەی جەنگی سارددا، ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت هەرلووکیان خۆیان لەحاڵەتی جەنگدا دەبینی بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەڕووی سەربازیی، سیاسیی، و دیبلۆماسیی رکابەری یەکتر

بکەن. سیاسەتی دەرەوەی چەندین وڵاتی بچوکتر لەڕووی هەژموونەوە، بەتایبەتی ئەوا وڵاتانەی کەوتبوونە نێوان بەرداشی جەنگە نەیارییەکانی وەک جەنگی نێوان هیندستان و پاکستان وە ئیسرائیل و عەرەبە دراوسێکانی، جیاوازیی دروست ناکەن لەنێوان سیخوڕی لەکاتی جەنگ و ئاشتیدا.

سنوورەکانی نێوان جەنگ و ئاشتیی لە کەیسی تیرۆریزمدا بەشێوەیەکی فراوان ناڕوونە. لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕووداوەکانی یازدەی ئەیلوول، سیاسەتی سەرکەوتووی دژەتیرۆر لەسەر زانیاریی ڕۆدەنرێت بەڵام کۆکردنەوەی و شیکردنەوەی ئەو زانیارییانە ناکرێت تا ئەوکاتە گیرۆ بن تا کردە تیرۆرستیەکە ئەنجام دەدرێت. دەبێت ئەم پرۆسەیە بەرلە کۆکردنەوە و شیکردەوەی ئەو زانیاریە ئەنجام بدرێت و لەکاتی ئاشتیدا ئەنجام بدرێت.

دووەم، بەهای سیخوڕی لەلایەن دارێژەرانی سیاسەتەوە دەنرخێنرێت، هۆکاری ئەمەش بریتییە لەوەی ئەوان بە سوود وەرگرتن لە کردەی سیخوڕەکان دەتوانن مەترسی دبلۆماسی و سەربازیی لەناکاو کەمبکەنەوە. هێرشی لەناکاو لە کایەی جیهانی سیاسییدا کەم بایەخی پێدەدرێت: هێرشی لەناکاو تەنیا ئەو کاتە گرنگە کە ئەگەرە بنەڕەتییەکان هەڵدەوەشێنێتەوە کە سیاسەتی لەسەر ڕۆنراوە. بەئەنجامدانی ئەمە، رۆڵی هێرشی لەناکاو وەک زیادکردنی هێزێک دەگێڕێت، واتە زیادکردنی بڕی ئەو هێزەی هەیە لەلایەن ئەو وڵاتەی هێرشەکە ئەنجام دەدات.

جێگای گومان نییە کە ڕێگرتن لە هێرشی لەناکاو ئەرکێکی ئاسان نییە چونکە هۆکارە بنەڕەتییەکانی ئەم جۆرە هێرشانە لەژمارە نەهاتوون. یەکەم، ئەو وڵاتانەی هێرشی لەناکاو بەکاردەهێنن چالاکییەکانیان بە نهێنیی ئەنجام دەدەن. ئەوان سوود لە هوونەرەکانی فریودانی جەنگ وەردەگرن. دووەم، وڵاتان کۆشش دەکەن بۆ دەستنیشانکردنی زانیاری گرنگ لە زانیاری بێ واتای هەڕەمەکی یان ئەو دەنگۆیانەی دەزگا هەواڵگرییەکان دەستی دەخەن. لەو شوێنەی فریودان هەوڵدەدات سەر لە نەیار بشێوێنێت بە لەخشتەبردنی، دەنگۆ وا لە نەیار دەکات سەری لێبشێوێت بەهۆی بوونی زانیاری نامۆ کە دەزگا هەواڵگرییەکان وەری دەگرن. دەنگۆ ئەو زانیاریانەیە

که دەبێت لێی بکۆڵرێتەوە، هەڵبسەنگێنرێت، وە فەرامۆش بکرێت بە ئامانجی گەڕان بەدوای هێماکانی ئەگەری هێرشی لەناکاو.

سیخوڕی ئامرازێکی گرنگە بۆ رێگرتن لە هێرشی لەناکاو چونکە وادەکات داڕێژەرانی سیاسەتی پەنجەرەیەکیان هەبێت کە لێیەوە توانا و نیازە راستەقینەکانی دوژمن بینن. هەروەها، سیخوڕی دەتوانێت فریودان لەکاربخات وە رێ لە دەنگۆ بگرێت. لەبەر ئەم هۆکارانە، هەرگیز ناکرێت هونەری سیخوڕی بەرەو نەمان بچێت و هەردەم جێگای بایەخی وڵاتان دەبێت. هەرچەندە مەترسییەکانی شکست هەردەم کراوەن وە نموونەکانی شکست دەکرێت زۆر زیاتر بن لە نموونەی سەرکەوتن، دیسانیش داڕێژەرانی سیاسەت لەسەر ئەم بنەمایە بڕیار دەدەن تەنانەت ئەگەر بۆ رێگاگرتن لە رووداوێکی تری وەل یازدەی ئەیلول یان پێرل هاربەرێکی تر. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، سیخوڕی دەرمانی دەردی هەموو کێشەیەکی هێرشی لەناکاو نییە. دەکرێت هەندێجار هەر سیخوڕی ببێتە هۆی لەرێلادانی داڕێژەرانی سیاسەت، ئەمەش لەکاتێکدایە کە ئەو وڵاتە سیخوڕی لەسەر دەکرێت بەهۆی کردەی فریودانەوە زانیاری هەڵە بداتە دەزگا هەواڵگرییەکانی نەیارەکەی، بەمەش سەرکەوتنی ئەمان لە پەیبردن بە هێرشی لەناکاو سنووردار و خەلەفێنەر بکات.

## سیخوڕی و بازنەی هەواڵگریی

سیخوڕی کردەیەکی رێکخراوە. واتە، بەشێکە لە زنجیرەیەکی چالاکی فراوانتر کە ئامانجیان ئاگادارکردنەوەی داڕێژەرانی سیاسەتە دەربارەی جیهانی دەوروپشتیان. بەشێوەیەکی دەستەجەمعی ئەم چالاکیانە پێیان دەوترێت "بازنەی هەواڵگریی".

یەکەمین هەنگاوی بازنەی هەواڵگریی بریتییە لە دیاریکردنی ئەرک. بە واتایەکی تر، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە داڕێژەرانی سیاسەت و بەرپرسە باڵاکانی هەواڵگریی بڕیار لەسەر ئەوە بدەن چ زانیارییەکیان پێویستە کە بەکەڵکیان بێت بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی دیاریکراو و چەند ئامانجێکی سیاسیی. هەنگاوی دووەم لە پرۆسەی هەواڵگرییدا بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاریی. لێرەدا سیخوڕی دەکەوێتە نێو بازنەی

هەواڵگریی. هەر کۆمەڵگایەکی هەواڵگریی خودانی چەندین ستراتیژیەتی جیاجیایە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی لە قۆناغی یەکەمدا. کۆمەڵگای هەواڵگریی چەندین بژاردەی لەبەردەستە بۆئەوەی کاری لەسەر بکات. بنچینەییترین سەرچاوە لەنێوان زانیاری سەرچاوەی کراوە و زانیاری نهێنیدایە. زانیاری سەرچاوەی کراوە بریتیین لەو زانیاریانەی کە بەئاشکرا دیارن —وەک، زانیاری تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و وەرگرتنی زانیاری لە هاوڕێ و کەسە نزیکەکانی ئامانجێکی دیاریکراو. ئەرکی سەرەکی سیخوڕی ئەوەیە زانیاری نهێنیی دەست بخات و هەر بۆ ئەم مەبەستەش وەگەڕدەخرێت. بژاردەی سەرەکی لێرەدا دەکەوێتە نێوان سیخوڕی تەکنەلۆژیی و سیخوڕی کلاسیکی مرۆیی. سیخوڕی تەکنەلۆژیی پشت بەبەکارهێنانی سەتەلایەت، فڕۆکە، وە ئامرازە ئەلیکترۆنییەکان دەبەستێت بۆئەوەی بتوانێت وێنەیەکی ڕوون وەدەست بخات دەربارەی تواناکانی نەیار و بەئاسانی ئەو شەپۆلانە ببڕێت و گوێ لێ بگرێت کە دوژمن لە پەیوەندییەکانیاندا بەکاری دەهێنن. سیخوڕی مرۆیی بریتییە لە دەستخستنی وێنە، بەڵگەنامە، و چەند ماددەیەکی بەهاداری تری هەواڵگریی، ئەمەش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن دامەزراوەی هەواڵگرییەوە سەرپەرشتی دەکرێت.

هەنگاوی سێیەم لە بازنەی هەواڵگرییدا بریتییە لە پرۆسەکردن و هەڵسەنگاندنی ئەو زانیارییانەی لە هەنگاوی دووەمدا بەدەست هێنراون. تەنیا ئەو کاتە زانیاری دەبێتە هەواڵگریی کە هەڵسەنگێنرابێت و خەمڵێنرابێت. هەڵسەنگاندنی زانیاری لەسەر دوو ئەگەر ڕۆنراوە. یەکەم، تا چ ئەندازەیەک سەرچاوەکە پشتپێبەستراوە. دووەم، زانیارییەکە تا چ ئەندازەیەک باشە. متمانە دەربارەی بەهای زانیارییەکە گرنگترین بەشی ئەم هەنگاوەیە. بۆئەوەی برەو بە متمانە بدەین لەو زانیارییانەی دەزگاکان کاری لەسەر دەکەن، ئەو دەزگا هەواڵگرییانە دەبێت کار لەسەر چەندین سەکۆی جیاجیا بکەن (سیخوڕ، سەتەلایەت، ناردنی سیخوڕ بۆناو باڵیۆزخانەکانی نێو وڵات) بۆئەوەی هەمان ئەو زانیارییە بەدەست بهێنن.

دژەسیخوڕی لەم خاڵەدا دەکەوێتە نێو بازنەی هەواڵگرییەوە. بەگەڕان بەشێوەیەکی بەردەوام بەدوای سیخوڕ و پاراستنی نهێنیی دەزگایەک، چالاکیەکانی دژەهەواڵگریی

کار بۆ ئەوە دەکات متمانەی شیکەرەوە و بەکارهێنەرانی زانیارییەکان کە ئەمان بەدەستی دەهێنن زیاد بکات. بەپێچەوانەوە، دژەسیخوڕی دەکرێت کاریگەرییەکی پێچەوانەی هەبێت، دەتوانێت شیکردنەوەی هەواڵگریی تووشی ئەنگی بکات ئەمەش بەهۆی گومانخستنەسەر زانیارییەک کە لە بنەڕەتەوە دروست بووە. کاتێک گومان و دوودڵی باڵ دەکێشن بەسەر چەند لایەنێکی پیلانگێڕیی دژەسیخوڕی و دەزگاکەش لێکۆڵینەوەی لەسەر ناکات، "سەرگەردانی هەواڵگریی" دروست دەبێت کە ئەوکات هیچ دەرچەیەک بۆ رزگاربوون لەئارادا نابێت.
قۆناغی چوارەم لە بازنەی هەواڵگرییدا بریتییە لە شیکردنەوە و ئەنجام. لێرەدا هەر یەکێک لەو زانیارییانەی بەدەست هاتووە و هەڵسەنگێنراوە کۆدەکرێنەوە و وەک بەڵگەنامەی ئامادە دەخرێنە بەردەم داڕێژەرانی سیاسەت. کۆتا قۆناغ لە بازنەی هەواڵگرییدا بریتییە لە قۆناغی "فیدباک" کە تیایدا داڕێژەرانی سیاسەت وەڵامی هەواڵگریی دەدەنەوە لەمەڕ ئەو زانیاریە ئامادەیەی ئەوان وەریانگرتووە.

## سیخوڕی و چوارچێوە کارگێڕییەکەی

لەکاتێکدا گەمەی سیخوڕی لەدژی دەزگا دژەسیخوڕیەکان لەلایەن چەند کەسێکەوە ئەنجام دەدرێت، پێکهاتەیەکی گرنگی کارگێڕیی و بیرۆکراتیش لەخۆدەگرێت. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەتێکڕا بەم سەینوبەینە دەوترێت *کۆمەڵگای هەواڵگریی*. دەزگای هەواڵگری ناوەندی(CIA)، ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی(NSA) وە پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی وەزارەتی بەرگریی ئەندامی هەرە کاریگەر و خودان شیانی ئەو وڵاتەن. بەرلە هێرشەکانی یازدەی ئەیلول، بەڕێوەبەرایەتی سەرۆکی دەزگای سی ئای ئای، بەڕێوەبەری هەواڵگریی ناوەندی، سەرۆکی کۆمەڵگای هەواڵگرییش بوو. ریفۆرمەکانی هەواڵگریی دوای یازدەی ئەیلول وای کرد هەندێ گۆڕانکاری دروست ببن، وە بەمەش بەڕێوەبەری هەواڵگری نیشتیمانی لە دەسەڵاتدا زیاتر کاریگەر بوو لە کۆمەڵگای هەواڵگریی وە دامەزراوەیەکی نوێی دروست کرد لەژێر ناوی بەشی ئاسایشی ناوخۆ ( Department of Homeland

Security). ئامانج لە دروستکردنی ئەم بەشە بریتیی بوو لەوەی وەک دەزگایەک کاریکات کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وەڵامی هەر ئامانج، ئەرک، تەکتیک، وە پرۆسەیەکی پەیوەستدار بە ئاساییشی گشتی بداتەوە. بەم پێیە، کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا تەنیا ئەرکی ئەو کارانە دەبێت کە تارادەیەکی زۆر ئاسانن بۆ چارەسەرکردن.

یەکێک لە سەرەکیترین سیاسەتەکانی هەواڵگریی بریتییە لەوەی کە کارەکانی بەشێوەیەکی نهێنیی ئەنجام بدات و لە بەرامبەریشدا بەرپەرچی هەوڵە نهێنییەکان بداتەوە کاتێک لەلایەن دەزگا نەیارەکانەوە هێرشی دەکرێتە سەر. بۆ ئەوەی بە ئاسانی بتوانین کۆنترۆڵی ئەم دۆخە بکەین و بەشێوەیەکی تۆکمە کۆنترۆڵی نهێنییەکان بکەین، سەرەتا دەبێت دەوڵەت یاسایەکی تایبەت بەم چەندەی هەبێت بۆئەوەی بزانن بە چ چەشنێک مامەڵە لەگەڵ سیخوڕی، دژەسیخوڕی، کردەی پەنهان، وە شیکردنەوەی هەواڵگریی بکرێت و چۆن ئامانجەکانیان لە ژینگەیەکی تەندروستدا ئەنجام بدەن. لە ئەمریکادا ئەمە بەم شێوەیە ڕێکخراوە: کۆنگرێس ئەم چالاکیانەی وەک ئەرکی جێبەجێکاری داناوە وە ڕاستەوخۆ سەربە سەرۆکی ئەو وڵاتەوەن. ئەرکی سەرۆک لەم نێوەندەدا بریتییە لە بڕیاری بەجێگەیاندنی ئەجێندای وڵاتەکەی لە کات و ساتێکی سنووردارادا. تەنانەت جاری واش هەیە ئەو سەرۆکانەی کە زۆر پەیوەستن بە کاری هەواڵگرییەوە ناکرێت لەگەڵ وردەکاری ئۆپەراسیۆنە سیخوڕییەکاندا کۆک بێت و هەموو کون و کەلەبەرێکی پەسەند بکات. هەروەها، لەبەر ئەوەی کردەی سیخوڕی چالاکی فریودان و فێڵبازی لەخۆ دەگرێت، ناکرێت سەرۆک وردەکاری تەواوی کردە سیخوڕییەکە بزانێت؛ تەنیا ئەوە بەسە بزانێت ئامانج لە کردەکەدا چییە. هەربۆیە، سەرۆک لەسەریەتی "نکۆڵی قابیلکەر" وەک سیاسەتێکی ستراتیژیی بەکاربهێنێت بۆئەوەی بەرپەرچی هەموو ئەو دەنگۆیانە بداتەوە کە وڵاتانی ئامانج بە تۆمەتی دەستدرێژی هەواڵگریی ئاراستەی دەکەن. ئەم کارە تەنیا لە ئەستۆی سەرۆک وڵاتدا نییە، بەڵکو داڕێژەرانی سیاسەتیش دەبێت هونەرێکی باڵایان هەبێت لەم نێوەندەدا بۆئەوەی لە پەیوەندییە دبلۆماسییەکاندا تووشی تەنگی نەبن. تا زیاتر

یاسادانەر و سەرۆکەکان لە نۆپەراسیۆنی سیخورپیدا تێوەبگلێن کارەکە ئەستەمتر دەبێت بۆ نکۆڵیکردن لەم جۆرە بانگەشەیە.

## دیرۆکا سیخوڕی

سیخوڕیکردن مێژوویەکی ئەوەندە قووڵی هەیە کە دەکرێت بیگەڕێنینەوە بۆ سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ، لەبەر ئەوەی مرۆڤی سەرەتایی بەشێوەیەکی نهێنی لەنێو سروشتدا چاودێری ئاژەڵانی دەکرد بەمەبەستی دەسکەوتنی پاروە نانێک، لە زۆر لێکۆڵینەوە هاتووە کە سیخوڕیکردن هونەرێکی کۆنە و ناتوانرێت بەوردی سەرەتای سەرهەڵدانەکەی دیاری بکرێت، ئەم هونەرە هەر لەگەڵ بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی هەبووە و هەر لەگەڵ بەرەبەیانی ژیانی مرۆڤایەتیدا سیخوڕەکان بە یەکەمین ئامرازەکانی ململانێ ئەژمار دەکران بۆ دەست بەسەردا گرتن و سەپاندنی یاسای هێز. کاری هەواڵگری بە سێیەمین پیشە دانراوە لەدوای جادووگەری و بەدڕەوشتی، ناوچەی خۆرهەڵاتی ناڤین لەو ناوچانەیە کە بۆ یەکەمین جار بە کاری هەواڵگری ئاشنا بووە، ئەویش بە هۆکاری مێژوویی و جوگرافی کە ئەم ناوچەیە پێی ناسراوە.

کاری هەواڵگری لەسەرەتای پەیدابوونییەوە تا گەیشتووەتە ئێستا، بەچەندین قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە، هاوشانی پێشکەوتنی سەردەمیانەی ژیانی مرۆڤەکان، لەگەڵ ئەوەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و زانست هۆکارەکانی چاودێری کردن و شوێنپێ هەڵگرتنی ئاڵۆز و جۆراوجۆر کردووە بەڵام هەمووان لەسەرئەوە کۆکن کە یاریکەری سەرەتا و کۆتایی ئەم گەمەیە تەنها مرۆڤ بووە. دیرۆکنڤیسان تا ئێستا ناکۆکن لەسەر دیاریکردنی مێژووی هەواڵگری بەشێوەیەکی ورد، بەڵام هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی کە سیخوڕی یەکێکە لەپیشە کۆنەکان، بەپشت بەستن بەو بەڵگە مێژووییانەی کە ئاشکرا کراون لە خۆرهەڵاتی دێریندا و لەناو نەتەوە جیاوازەکاندا هەبووە، وەک لەلای میسریەکان و عەرەبەکان و جووەکان و مەغۆلەکان و هەروەها یۆنانییەکان و ڕۆمەکان. بەڵام لەو سەردەمانەدا و ئەوەی کە پێویستی کاری سیخوڕی هێناوەتە ئاراوە بەزۆری ململانێی سەربازیی نێوان ئەو نەتەوانە بووە، هەروەها جیاوازی ئاستی ژیانی ژیارییان، ئەمەش بەپێی بنەمای ناسینی نەیار لەپێناو خۆپاراستن لێی؛ لەبەرئەوە هەواڵگری سەربازیی بە کۆنترین جۆری هەواڵگری دادەنرێت لەجیهاندا.

کۆنترین کتێبەکان باس لە چالاکی سیخوڕ دەکەن، کۆنترین نووسەرێکیش کە لەبارەی

هونەرەکانی شەڕ نووسیبێتی (سون تزو)ی چینی بووە، ناوبراو یەکەمین کەس بووە کە پێناسەیەکی دیاریکراوی سیخوڕی کردووە و هەستاوە بەڕێکخستنی یاساکانی ئەم کارە، بەشێکی گەورەی نووسینەکانی تەرخان کردووە بۆ سەرچاوە نهێنیەکان و شێوازی کارکردنیان و ئەو چەکانەی کە بەکاریان هێناوە. گرنگی هەواڵگری دەگەڕێتەوە بۆ پێویستی دەوڵەت یا سەرکردە بەو نهێنیانە دەربارەی دوژمن، زانراوە کە هونەری هەواڵگری واتە (سیخوڕی) زۆر کۆنە، میسریەکان پێش ٥٠٠٠ ساڵ سیستەمی سیخوڕیان هەبووە، سیخوڕیکردن بەسەر دوژمنەکانیانەوە بە هونەرێکی بەرز داناوە بە یەکێ لەجۆرەکانی زانستی جەنگی لایان ناسراوە، مێژووی میسر و جەنگەکانی پڕن لەو سەرکەوتنە سەربازیانەی کە بەهۆی هەواڵگریەوە هاتونەتە ئاراوە، ئەوەتا یەکێک لە ئەفسەرانی هەواڵگری میسری کۆن کە ناوی "توت" بووە، توانیویەتی ٢٠٠ سەرباز لە فەردەی گەنمدا بەسەر پشتی بەلەمێکەوە بگەیەنێتە بەندەری یافا کە ئەو کاتە لەلایەن خۆیانەوە ئابڵوقە درابوو لەو کاتەدا، پاش لەنگەرگرتنی بەلەمەکە لەبەندەری یافا سەربازەکانی هاتنەدەرەوە و دەستیان گرت بەسەر شارەکەدا.

هەروەها دیرۆکڤان تۆلیبۆس کە لەنێوان ساڵانی ٢٠١-١٢٠ پ.ز دا ژیاوە دەڵێت: "سەرکردە دەبێت بەردەوام بێت لەسەر راڤەکردنی ئارەزووی کەسایەتی دوژمنەکەی."

هەروەها هۆمیرۆسی شاعیر دەربارەی چیرۆکی ئەسپی تەروادە ئەم رووداوە دەگێڕێتەوە کە بەیەکێ لە شاکارەکانی سیخوڕی دادەنرێت لە مێژوودا. سەبارەت بە کۆنترین سیخوڕیش لە مێژوودا، لێکۆڵەران قەلەڕەشەکەی پێغەمبەر نوح بەکۆنترین سیخوڕ دادەنێن، بەڵام لەڕاستیدا سیخوڕێکی سەرکەوتوو نەبوو لەبەر ئەوەی کارەکەی بە سەرکەوتوویی ئەنجام نەدا، بەڵکو رۆیشت و نەگەڕایەوە. لای یۆنانی و رۆمەکانیش بەسەرهاتێکی مێژوویی زۆر هەیە کە کارامەییان دەردەخات لە زانینی هونەرەکانی جەنگدا، دیرۆک بۆمان ئەگێڕێتەوە کە لەساڵی ١٦٣ ی پێش زایین، کاتێک رۆمەکان دەیانویست سوریا داگیر بکەن کە ئەو کاتە لەژێر دەستی سلجوقیەکاندا بوو، لەڕێگەی سیخوڕەکانیانەوە زانیان کە سلجوقیەکان خاوەنی ژمارەیەکی زۆر لە فیلی جەنگین

کە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لە بردنەوەی جەنگدا، بۆیە بە نهێنی هەستان بە ناردنی دەستەیەک بۆ لە ناوبردنی فیلەکان و تا لەکۆتاییدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.
زۆرێک لەو سەرکردانەی لەمێژوودا توانییویانە سەرکەوتنی مەزن لە جەنگەکاندا تۆمار بکەن و سنووری دەسەلاتیان فراوان بکەن، سوودیان لە هەواڵگری بینیوە. وەک (سەرجۆنی ئەکەدی، ئەسکەندەری مەکدۆنی، نەبوخوزنەسر، سەنحاریب، جەنگیز خان). لەلای جووەکان سیخوڕی گرنگیەکی تایبەتی هەیە و بە کارێکی پیرۆز دادەنرێت لایان، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر و رزگارکەریان، موسا، سوودی لێوەرگرتووە، لە تەوراتدا هاتووە کە موسا سیخوڕەکانی خۆی ناردووە تا هەواڵی زەوی پیرۆزی بۆ بهێنن، قەلا بەهێزەکانی شاری کەنعانیەکان ترسی خستبووە دڵی سیخوڕەکانی موساوە، لەو کتێبەدا باس لەوە ئەکرێت کە: "موسا چەند کەسێکی نارد تا هەواڵی سەر زەوی کەنعانی بۆ بهێنن،" دوای ئەوەی کە ناوی ئەو کەسانە ئەژمێرێت کە دەچن هەواڵی بۆ بهێنن پێیان دەڵێت: "لە نەقەبەوە سەرکەون بچنە سەر چیاکان، بزانن زەوییەکەی چۆنە، بزانن ئەو میللەتەی لەو شوێنەدا دەژی لاوازن یان بەهێزن، زۆرن یان کەمن، ئەو زەوییەی لەسەری دەژین چۆن زەوییەکە، ئەو شارانەی کە تێیدا دەژین چۆن شارێکن، ئایا لە چادر دروست کراوە یان قەلا، زەوییەکی چۆنە، بەپیتە یان بێپیت، دارودرەختی تێدایە یان نا، لە بەروبومەکەی بهێنن...".
ئەو کاتە وەرزی پێگەیشتنی ترێ بوو، سیخوڕەکانی موسا بە نەقەبدا سەرکەوتن و گەیشتنە حیرون، دواتر چونە دۆڵی ئەشکول، لەوێ چڵێک لەداری ترێیان لێکردەوە، دوانی تر هەندێک هەنار و خورمایان بردەوە، دوای تێپەڕینی چل رۆژ ئەو کەسانە گەڕانەوە بۆ لای موسا و هاروون و بەنی ئیسرائیل. دوای گەڕانەوەیان راپۆرتێکیان پێشکەش کرد وتیان: "ئێمە چووینە سەرئەو زەوییەی کە تۆ ئێمەت بۆ نارد، بەروبومەکانی ئەو شوێنە شیر و هەنگوین بوو، میللەتەکەیان بەهێز و شارەکانیشیان لە شێوەی قەلای تۆکمە و دروستکراو بوو، لەوێ نەوەی (عناق)مان بینی، ئەم کەسانە زۆر گەورە بوون، هەروەها حسی، یەبووسی، ئەموریمان بینی کە لە چیادا دەژین، کەنعانیەکانیش لە کەنار دەریا دەژیان لە کەناری ئەردەن"، هەروەک لە تەوراتدا

هاتووە کاتێک خواوەند داوا لە یەشوع کوڕی نون دەکات بۆ ئەوەی پێشڕەوەی بەنی ئیسرائیل بکات لەخاکی ئەردەنەوە تا کەنعان، یەشوع سوودی لە ئەزموونەکانی خۆی وەرگرت لەگەڵ موسادا، دوو کەسی نارد تا هەواڵی (ئەریحا)ی بۆ بهێنن بۆ ئەوەی بزانێت دووژمنەکەی چەند بەهێزە، یا هەر زانیاریەکی تر کە پێویستە بەر لە هێرشکردن بیزانێت، لەو ئەرکەدا لەشفرۆشێک یارمەتی ئەو دوو پیاوەی دا لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکەیان و هاتنەدەرەوەیان لەو شارە بەبێ ئەوەی کەس پێی بزانێت لەلایەن پاسەوانەکانی پاشاوە، ئەمە بە یەکەمین ڕووداو دادەنرێت لە مێژوودا کە تێیدا ئافرەتێک بەشداری کاری هەواڵگری بکات، لەم ڕووەوە لێکۆڵەران پێیان وایە لەسەرەتای پەیدا بوونی کاری هەواڵگری پەیوەندیەک لەنێوان کاری هەواڵگری و تەڵەی سێکسی (لە بەشی دووەمی ئەم پەرتووکە بۆ ئەم بابەتە تەرخانکراوە) دروست بوو.

لای عەرەبەکانیش سیخوڕیکردن شتێکی باو بووە، چ لەسەردەمی جاهیلی یان سەردەمی ئیسلام کە سیخوڕەکانیان بە "چاوەکان" ناو بردووە و بەزۆری لە جەنگەکاندا بۆ دیاریکردنی شوێنی دوژمن و ژمارەیان سودی لێوەرگیراوە، مێژووی عەرەبی باس لەوە دەکات کە پێغەمبەر محمد (د.خ) پێش ڕوودانی شەڕی بەدر دوو لە سەحابەکان دەنێرێت بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر هێزی "کافرەکان،" لەلای کانی بەدر یەکێک لەسەحابەکان دوو کوڕ ئەبینێت کە خەریکی ئاو خواردنەوەن، کوڕەکان ئەهێنن بۆ لای پێغەمبەر (د.خ) ئەویش لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردن و توانی لەڕێگەی چەند پرسیارێکەوە ژمارەی هێزی کافرەکان بزانێت و لەوانی پرسی: ژمارەی ئەو حوشترانە چەندە کە ڕۆژانە سەری دەبڕن؟ کوڕەکان وەڵامیان دایەوە کە ڕۆژێک نۆ و ڕۆژێک دوو حوشتر سەرئەبڕن و ئەیخۆن، لێرەدا پێغەمبەر (د.خ) زانی کە ژمارەی هێزی کافرەکان لەنێوان ٩٠٠ بۆ ١٠٠٠ کەسە لەبەرئەوەی عەرەبەکان بەگشتی نەریتیان وایە کە حوشترێک بۆ ١٠٠ کەس تەرخان دەکەن. بەخوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەر (د.خ) دەتوانرێت لەڕێگەی پەند و وانەکانیەوە پەی بە هونەری هەواڵگری ببرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر (د.خ) هەڵگری پەیامێکی ئاسمانی بوو، بەڵام

دەتوانین بلیمەتی ناوبراو ببینین لەیەکلاکردنەوەی زۆرێک لەکێشەکاندا بەتایبەتی لەبواری شەڕدا. لەسەردەمی مەغۆلەکانیشدا ئەو نووسینانەی کە لەو سەردەمەوە بەجێماوە ناوی زۆر سیخوڕی بەناوبانگ و ناودار لەخۆدەگرێت، کە توانیویانە شانبەشانی فەرماندەکەیان، واتە جەنگیز خان، بجەنگن، ئەو فەرماندەیەی کە توانی ئیمپراتۆریەتێک بۆ مەغۆلەکان دروستبکات و کۆی ئەو وڵاتانە داگیربکات کە دەکەونە نێوان چین و دەریای رەشەوە لە دیارترین ئەو سیخوڕانەش (نویون)ە کە ناوبراو لە پێشەوەی ئەو هێزە بوو کە جەنگیز خان ناردی بۆ لای ئیمپراتۆریەتی چین بەمەبەستی یارمەتیدانی، بەڵام لەڕاستیدا هۆکارێکی باش بوو بۆ داگیرکردنی چین.

زۆر سەرچاوە باس لەوە ئەکەن کە مەغۆلەکان پیاو و منداڵیان بەکارهێناوە بۆ بینینی ریزەکانی دوژمن و کۆکردنەوەی زانیاری و هەرگیز شەڕێکیان نەئەکرد کە پێشتر زانیاری تەواویان لەسەر دوژمنەکانیان نەبوایە. هەروەک رۆژهەڵات، لە رۆژئاواش لەگەڵ پەرەسەندنی جەنگەکاندا کاری هەواڵگری پێش کەوت، لەسەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەورووپا پەندێکی میللی باو بوو کە دەیووت: "کاتێک کە دەزانی دوژمنەکەت دەیەوێت چی بکات، دەتوانیت زاڵ بیت بەسەریدا". یەکێک لە سیاسیە فەرەنسیەکان بە ناوی ریچیلو سیخوڕەکانی هان ئەدا کە کاری بۆ بکەن لەناو ڤاتیکان و بەریتانیادا بەشێوەیەک کە کاری سیخوڕیکردن بوو بە هونەرێک لە هونەرەکانی جەنگ و پیلانگێڕان بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری و بەکارهێنانی سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا. لەسەدەی شانزەیەمدا وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بە ناوی سێر فرەنسیس ئەلغنام هەستا بە دروست کردن و پەرەپێدانی سیخوڕەکان لەدەرەوەی وڵات و ئەیناردن بۆ ئەورووپا و خۆرهەڵاتی ناڤین، هەروەها هەستا بە بەکارگرتنی ئەو سەرچاوانەی کە توانای قسەکردنیان هەبوو بە زمانە بێگانەکان و ئامادەبوون ژیان بەسەر بەرن لە دەرەوەی وڵات و توانا و ئەزموونی دزەکردنە نێو دەزگا دەوڵەتیەکانیان هەبوو، ناوبراو هەستا بە راهێنانی ئەو جۆرە کەسانە لەسەر چالاکی نهێنی و کۆکردنەوەی هێماکان و چەند توانا گەلێکی دیکە. بەو پێیەش، ناوبراو دادەنرێت بە دامەزرێنەری یەکەمین رێکخراوی هەواڵگری لە جیهاندا، ئەو پێی وابوو

کە هەواڵگری بڕبڕەی پشتی هەر دەوڵەتێکە کە هەوڵی مانەوە و خۆپێشخستن بدات.
کاری هەواڵگری لەگەڵ گەشەکردنیدا دەبێتە گرنگترین پێکهێنەری سوپا ڕێکخراوەکان.
فریدریک ڤیلهیلمی یەکەم، پاشای پروسیا لەساڵەکانی ١٧١٣-١٧٤٠ دەڵێت:
"فەرماندەی هێزی دوژمنەکەم ئەچێت بۆ شەڕ و سەد چێشتلێنەر پێش خۆی ئەخات، بەڵام من سەد سیخوڕ پێش خۆم ئەخەم". وەک باس ئەکرێت هەواڵگری گرنگترین پێکهێنەری سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن بووە لە شەڕەکاندا، تا ئەمڕۆش کتێبەکانی مێژوو باس لە ڕۆڵی سەرۆک ئەرکانی سوپاکەی ناپلیۆن واتە (مارشاڵ لویس ئەلکساندەر) دەکەن لەو ڕووەوە کە هیچکات شەڕی نەدەکرد گەر زۆرترین زانیاری لەسەر دوژمنەکەی بەدەست نەهێنابوایە. هەروەها ئینگلیزەکان بەو پێیەی لە مێژوودا هاتووە هەر لە دێر زەمانەوە بایەخیان بە هەواڵگری سەربازی داوە.
لەسەدەی حەڤدەهەمدا، گرنگترین کاریان بریتی بوو لە زانینی مەودا و توانای کەشتیگەلی دەریایی ئیسپانیەکان کە ململانێی ئینگلیزەکانیان دەکرد بۆ دەستگرتن بەسەر جیهاندا لەگەڵ ئیسپانیەکان جەنگێکی درێژخایەنیان دەست پێکردن و سیخوڕەکانیان گەیاندە کۆشکی پاشایەتی تا سەرئەنجام بە ئامانجی خۆیان گەیشتن و توانیان ئیسپانیا تێک بشکێنن. ئەمڕۆش، کاری سیخوڕی زیاتر لەجاران ئاڵۆز و جۆراو جۆر بووە، ئەگەر لە رابردوودا سیخوڕەکان تەنها کاریان کۆکردنەوەی زانیاری بوایە لەسەر توانا و قەبارەی سوپای دوژمن ئەوا لەمڕۆدا دەبێت زانیاری تەواو لەسەرجەم بوارەکاندا بەدەست بێنن، بۆیە چەند جۆرێکی هەواڵگری پەیدا بووە وەک هەواڵگری پیشەسازی و ئابووری و بازرگانی و تەکنەلۆژی هتد... لەبەرئەوەی هەواڵگری یاریەکی هەمیشەییە لەنێوان ئەو دەوڵەتە بەهێزانەی کە هەمیشە هەوڵ دەدەن لە دوژمنەکەیان هۆشیارتر و پێشکەوتووتر بن[1].

---

[1] Miller, N. (١٩٨٩). *Spying for America: The Hidden History of US Intelligence*. Paragon House Publishers.
-Nagy, J. A. (٢٠١١). *Spies in the Continental Capital: Espionage across Pennsylvania during the American Revolution*. Westholme.

## سیخوڕی بۆ؟

ئامانجی هەرەسەرەکی دژەسیخوڕی پاراستنی نهێنییەکانە. ئەمەش پێویستی بە وشیاری پاڵنەری سیخوڕەکانەوە هەیە، دەبێت بزانرێت ئەو سیخوڕەی بە ئەرکێک هەڵدەستێت تا چ ئاستێک توانای خۆدەربازکردن و نەچوونە ژێر کاریگەرییە سۆزدارییەکانەوە هەیە، لەسەرووی هەموشیانەوە دەبێت ئامانجێکی روون و ئاشکرایان بۆ دیاری بکرێت. دیرۆک ئەوەمان پێدەڵێت کە چەند هۆکارێک هەن وادەکەن سیخوڕەکان ژیانی خۆیان بخەنە مەترسیەوە بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەرکێک. یەکێک لە پاڵنەرەکانی سیخوڕیکردن بریتییە لە چاوسوورکردنەوە و هەڕەشەکردن. مومارەسەکردنی ئەم فاکتەرە خۆی لەخۆیدا رەگوڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆسەر هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەت (لە بەشی دووەمدا بەدرێژی باسی لێوەکراوە) بەڵام دەزگاکانی تریش پەیڕەوی دەکەن. بەکارهێنانی سێکس و هەوەسبازیی و نانبڕین دوو پاڵنەری سەرەکین بۆ چاوسوورکردنەوە و هەڕەشە. پاڵنەری دووەم بریتییە لە پێویستی پارە. پێویست ناکات بڕەکە زۆر بێت. بەزۆری بڕە پارەیەکی کەم بەسە بۆ قایلکردنی کەسێک بۆئەوەی سیخوڕی بکات یان وایان لێبکەن بەردەوام بن لەسەر ئەم کارە.

لەڕاستیدا، پێدانی پارەیەکی زۆر بە سیخوڕ بەزۆری جێگای مەترسییە چونکە سەرنجیان رادەکێشێت و چالاکیەکانی بە دەزگایەکی تر دەڵێت ئەگەر هەمان بڕ بەردەوام نەبێت. پاڵنەری سێیەم بریتییە لە ئایدۆلۆژیی. هەندێک سیخوڕ رەدووی پاڵنەرێکی سیاسیی دەکەون. ئەوان بڕوایان بە دۆزێک هەیە کە کاری بۆ دەکەن وە کارەکانیان وەک خیانەت لەقەڵەم نادەن. پاڵنەرەکانی ئایدۆلۆژیەت جیاوازن: شوعیەت، سەرمایەداری، نەتەوەپەرستی ئەتنی، یان وڵاتپارێزی. پاڵنەری کۆتایی، هەندێ لە سیخوڕەکان پێویستیان بە هەندێ شت هەیە بۆ دەربازبوون لە ئاڵۆزیی سایکۆلۆژی، ویست، هێز، تووڕەیی، یان سەرکێشی. ئەمانە هەموویان هۆکارن کە سیخوڕ دەیەوێت لەڕێگای ئەم کارەوە غەریزەکەی پێ پڕبکاتەوە.

## پاڵنەرەکانی سیخوڕی

یەکێک لەو پرسیارانەی کە بە بەردەوامی ڕووبەڕووی شارەزایانی بواری سیخوڕی دەکرێتەوە بریتییە لەوەی کە ئایا ئەوە چ پاڵنەرێکە وادەکات مرۆڤ خیانەت لە وڵاتەکەی خۆی بکات. پێدەچێت وەڵامەکە کەمێک سادەدە بێت بەڵام لەژێر پەردەی ئەم سادەییەدا پاڵنەری زۆر ئاڵۆز ڕۆڵی خۆیان لەم چەندەدا دەگێڕن. ئەو پاڵنەرانەش لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر لە گۆڕاندان. پارە ڕۆڵی هەرە دیار دەگێڕێت لەنێو ئەم کەسانەی لەدژی وڵاتەکانیان سیخوڕی ئەنجام دەدەن. ئەم تێڕامانە دەکرێت شتێکی تێگەیشتراو بێت و ڕاستییەکی تێدابێت کە گەواهیدەری قسەکانمان بێت، بەڵام ئایا هیچ بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرمان لەبەردەستە بۆ سەلماندنی ڕەوایەتیدان بەم قسەیە؟ ئایا چ میتۆدێک بەکاردەهێنرێت بۆ سەلماندنی؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە ڕۆژەڤی ئەکادیمیای هەواڵگرییدا مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە. هەربۆیە، بەپشت بەستن بە وتەی توێژەرانی ئەم بوارە وەرامی ئەم پرسانە پشتڕاستدەکرێتەوە.

سیخوڕی لە کۆکردنەوەی زانیاری، هەڵگرتنی و لەکۆتاییدا پێدانی بە دەزگا هەواڵگرییە بیانییەکان پێک دێت، بێگومان ئەم کردارەش زیان بە دەوڵەت دەگەیەنێت. ئەو کەسەی چالاکیەکەش ئەنجام دەدات لە هەواڵگری بیانی شەریکی ئەم تاوانەیە. دەکرێت خودی سیخوڕی ئامانج بێت یاخود ئامرازێک بێت بۆ بەدەستهێنانی مەبەستێکی تر، ئەمەش بەهۆی بەکارهێنانی کەسانەوە ئەنجام دەدرێت. ئەو پاڵنەرانەی کە بەهۆیەوە سیخوڕی لەسەر ڕۆنراوە بەشێوەیەکی بەرفراوان پشت بە خودی کەسەکە دەبەستێت. ئێف بیّ ئای ئەمریکا چوار هۆکاری دەستنیشانکردووە، ئەمەش دوای ئەوە هات کە دەزگاکە بەو دەرئەنجامە گەیشت کە پارە و ئایدۆلۆژیا، هەڕەشە یان ویستی کەسی هۆکاری سەرەکین بۆ سیخوڕیکردن. ئەو پاڵنەرانەی سەرەوە بەزۆری تێکەڵ و تایبەت بە کەسێکن. بێگومان، هۆکارەکانی ئەم پاڵنەرانەش پەیوەستن بە ئاکار و ڕەفتاری خودی کەسەکەوە. زۆر ئەستەمە بتوانرێت پاڵنەرەکان بە جۆرێکی تایبەتی بە کەسایەتیەوە وابەستە بکرێن. دەکرێت زیاتر حەز و خەیاڵی کەسی، ژینگەکەی و دەرفەت، هۆکاری سەرەکی بن لەپشت

ئەنجامدانی کردەی سیخوڕی. دەکرێت کەسەکان بەهۆی چلێسییەوە کردەی سیخوڕی ئەنجام بدەن یان بەهۆی گرفتی کەڵەکەبووی داراییەوە. دەکرێت چلێسیش وەک هۆکارێک بدرێتە پاڵ پاڵنەرەکانی ترەوە وەک ئایدۆلۆژیی، لاوازبوونی هزریی، داخپێدان بەهۆی بەناڕەوایی لەگەڵ جوڵانەوە لەلایەن وڵاتەکەیەوە (یان بەشێوەیەکی تایبەتیتر لەلایەن دەزگا هەواڵگریەکەیەوە) یاخود بەهۆی دڵسۆزی دابەشکراو، واتە دڵسۆزبوون بۆ دوو ئایدۆلۆژییەت یان دوو دەوڵەت. پارە تەنیا لەبەر ئەوە پێویست نییە کە هێزی کڕینی شتمەک و پێداویستییە بەڵکو سیمبولی سەرکەوتن، کاریگەریی و ئامرازێکە بۆ بڕوابەخۆ بوون. لەم کەیسەدا پاڵنەرەکان بەس نین بۆ ئامادەکردنی کەسێک بۆ ئەنجامدانی ئاکارێکی تاوانبارانە بەڵکو هەبوونی پاڵنەرێکی بەهێز یەکێکە لەو هەنگاوە پێویستانەی لە بوون بە سیخوڕ لەدژی وڵاتەکەت.[i]

لەوەتەی دامەزراندنیەوە لەساڵی ١٩٨٦، ناوەندی توێژینەوەی ئاسایشی فەرمانبەرانی بەرگریی (PERSEREC) بەشێوەیەکی زانستیانە سەرنجی خۆی خستۆتەسەر دیاردەی خیانەتی متمانە. ناوەندەکە کە لەژێر سەرپەرشتی وەزارەتی بەرگریی لەساڵی ١٩٩٢، ٢٠٠٢، و ٢٠٠٨ سێ ڕاپۆرتی بڵاوکردەوە، بەپشت بەستن بەو زانیارییانەی لە داتابەیسی سیخوڕی ناوەندەکە هەبوون. توێژینەوەکە لەسەر بەڵگەنامەی ئاشکرای فەرمی، ڕاگەیاندن، لێکۆڵینەوە و تۆماری دادگا، نموونەی ڕۆژنامەوانی، و کاری ئەکادیمی و ئەو پەرتووکانەی باسیان لە چەند کەیسێکی تایبەت لەم بوارە کردووە، ڕۆنراوە. لەساڵی ١٩٩٢، داتابەیسەکە پەرەپێدرا بە مەبەستی زانینی ئاماری ١١٧ هاوڵاتی ئەمریکی کە لە سیخوڕیەوە تێوەگلابوون لەدژی ئەمریکا، ئەمەش لەڕێی خیانەتکردن لە وڵاتەکەیان بەهۆی پێدانی، یان هەوڵدان بۆ پێدانی، زانیاری نهێنی بە هێزە بیانییەکان. چەندین کەیسی نوێ لەسەر بنەمای ئاسایی خرانەتە نێو ئەو داتابەیسە. لەساڵی ٢٠٠٨، ژمارەکە بۆ ١٧٣ کەس بەرزبووەوە.

---

[1] Pertman, A. (٢٠٠١). Why They Spy, The Boston Globe, February ٢٥.
-Sarbin T. R., Carney R. M., Eoyang C. (١٩٩٤). Citizen espionage: studies in trust and betrayal, Praeger Publishers.
-Gelles, M. (٢٠٠٦). Exploring the Mind of the Spy, http://rf-web.tamu.edu/security/security٪٢٠guide/Treason/Mind.htm (١١,٠٢,٢٠١١)

تۆمارەکان پێکهاتبوون لە زانیاری دەربارەی تایبەتمەندی کەسایەتی و پیشە و جیاوازی کردەی سیخوڕی. دوای وەرگرتن و شیکردنەوەی داتاکان، دەرکەوت کە لەسەدا ٦٧ بەژداربووان پارە پاڵنەری سەرەکی بووە لە ئەنجامدانی کردەی سیخوڕی لەدژی وڵاتەکەیان. لەمەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە گرفتی دارایی لەسەرووی ئەو هۆکارانەوە دێت کە پاڵ بە کەسێکەوە دەنێت سیخوڕی بکات.[1]

## سایکۆلۆژیای سیخوڕی

پرسێکی زۆر قورس هەیە کە مرۆڤ بەئاسانی ناتوانێت لێی تێبگات: بۆچی کەسێکی دیاریکراو کاری سیخوڕی هەڵدەبژێرێت؟ سایکۆلۆژیای سیخوڕی چەند پرسێکی تری لەم جۆرە لەخۆی دەگرێت نەوەک تەنیا بوون بە سیخوڕ، لەوانە، ئایا بۆچی کەسێکی دیاریکراو تەنانەت پیشەیەکی هەواڵگریی هەڵدەبژێرێت؟ ئایا پرۆفایلی سایکۆلۆژیی ئەفسەرێکی نهێنی چییە کە زۆربەی ژیانی خۆی لەژێر پەردەی نهێنییدا دەگوزەرێنێت، ئەمە چ واتایەکی هەیە؟ چۆن هۆکاری سایکۆلۆژی تاکەکەسی کاریگەریی دادەنێت لەسەر کۆکردنەوە شیکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی؟

بەڵام ئەو پرسەی لە هەمووشیان گرنگترە ئەوەیە کە ئایا بۆچی کەسێک کە لەپێگەیەکی پڕلەمتمانە دانراوە دواتر خیانەت لەو متمانەیە دەکات و لە کردەی سیخوڕی تێوەدەگلێت؟ ئایا بۆچی زیان بە وڵات یان گروپەکەی خۆی دەگەیەنێت؟ ئایا بۆچی سومعەی بنەماڵەکەی لەکەدار دەکات؟ ئەمانە ئەو پرسانەن کە پێیان دەوترێت "سیخوڕی ناوخۆ،" و هەڵوەستەی لەسەر دەکەین.

بەرلە سەرهەڵدانی زانستی سایکۆلۆژیی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا، ڕەفتاری مرۆڤ بەزۆری لەسەر مۆڕاڵ و بڕوای ئایینی ڕۆنرابوو. جگە لەو بڕوا کۆنانە، ڕوونکردنەوە بۆ ڕەفتاری ناپەسەند و نایاسایی، وەک سیخوڕی، بەزۆری وەک تاوانی مۆراڵی پشتبەستراو بە ئایین و باری کۆمەڵایەتی لەقەڵەم دەدران نەوەک پاڵنەری

---

[1] Michalak, S. (٢٠١١). Motives of espionage against ones own country in the light of idiographic studies. *Polish Psychological Bulletin*, ٤٢(١), ١-٤.

سایکۆلۆژی.[i] بەزۆری لەو سەردەمانەدا شتێک نەبوو بەناوی پاڵنەرەکانی سایکۆلۆژی لەپشت کردەی سیخوڕیدا، بەڵکو ئەوەی هەبوو ئەوە بوو کە ئەوان پێیان وابوو جەنگی "چاکە" و "خەراپە"یە: بەواتایەکی تر، ئەو سیخوڕەی بۆ "ئێمە" کاردەکات "چاکە" و ئەوەشی لەدژی ئێمەیە بێگومان وێنەیەکی "خەراپ"ی هەیە و قێزەوەنە. ئەم ئارگومێنەتە لەدوای سەدەی نۆزدەمەوە تارادەیەکی زۆر باش بەرەو کاڵبوونەوە چوو، ئێستا دەزگا هەواڵگرییەکان رێکاری وایان هەیە کە باش دەزانن هۆکار و لێکدانەوەکانی پشت کردەی سیخوڕی کەسێکی دیاریکراو چین و بۆچی ئەم کارەی ئەنجامداوە.[ii]

ستانیسلاف لاڤچێنکۆ، ئەفسەری باڵای دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت(KGB)، دوای هەڵهاتنی بۆ ئەمریکا پەرتووکی یادەوەرییەکانی خۆی نووسیی[iii] کە تیایدا ناوبراو پێشنیاری چەندین پاڵنەری کرد لەپشت کردەی سیخوڕیدا. ئێمە لە خوارەوە بەتێروتەسەلی باسی هەر هەموویان دەکەین.

یەکەم: پارە... ئەمە لە گرنگترین فاکتەرەکانی پشت کردەی سیخوڕییە، هۆکارەکەشی بریتییە لە چڵێسی ئەنجامدەری کارەکە یاخود قەرزاری ئەندامی دەزگایەکی هەواڵگریی کە دەیەوێت قەرزەکانی ئەندامانی ماڵەوەی پێبداتەوە، یاخود چارەسەری نەخۆشی بنەماڵەکەی پێبکات یان پارەی خوێندنی مناڵەکەی بدات بۆئەوەی لە فێرگایەکی نایاب بخوێنێت. لە هەر یەکێک لەم فاکتەرانەدا، سیخوڕ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە سیخوڕی باشترین یان تەنانەت تاکە ئامرازە بۆ بەدەستهێنانی ئەو پارەیەی کە پێویستیەتی. پزیشکی دەروونی دەزگای هەواڵگری ناوەندیی(CIA)، تێری تۆمپسن، ئاماژە بەوە دەکات کە ژمارەیەک هۆکاری تریش هەن کە رەنگە جگە

---

[i] T. L. Brink. (٢٠٠٨) *Psychology: A Student Friendly Approach*. "Unit One: The Definition and History of Psychology."

[ii] K. Herbig, & M. Wiskoff. *Espionage against the United States by American Citizens*. ١٩٤٧-٢٠٠١ (Monterey CA: Defense Personnel Security Research Center, ٢٠٠٢).

[iii] S. Levchenko. *On the Wrong Side: My life in the KGB* (New York: Pergamon, ١٩٨٨).

لە پارە هاندەر بن بۆ سیخوڕی، لەوانە بوونی پارە نیشانەی سەرکەوتن، هێزی کۆمەڵایەتی و شکۆیە لەم سەردەمەدا: بوونی پارەیەکی ئاوا زۆریش دەتوانرێت بەئاسانی لەڕێی کردەی سیخوڕییەوە بەدەست بهێنرێت. هەروەها تۆمپسن جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە کە ویستی ئەنجامدانی کردەی مەترسیدار(سەرکەشیی)، کە یەکێکە لە رەفتارە زگماکیەکانی مرۆڤ، رەنگە بەبێ ویستی ئەنجامدەری کارەکە ببێتە هۆی بڕیارێکی لەم جۆرە کە پێی وابێت ئەو کارەی ناوبراو ئەنجامی دەدات دەکرێت بە بەدەستهێنانی پارە زیاتر خزمەت بەخۆی بکات و باکی بە کارەکەی نەمێنێت.[i]

دووەم: **ئایدۆلۆژیا**... ئایدۆلۆژیا بریتییە لە کۆمەڵێک بڕوای هاوبەش دەربارەی ئەوەی جیهان چۆن یان دەبێت بە چ چەشنێک بێت. پزیشکی دەروونی و نووسەر ستیڤن پینکەر دەنووسێت، "ئایدۆلۆژیا ناتوانرێت وەک بەشێکی مێشک یان تەنانەت تەواوی مێشکی کەسێک بناسرێتەوە، چونکە ئەم چەندە بەسەر مێشکی چەندان کەسدا بڵاوبۆتەوە و شتێکی تاکەکەسی نییە."[ii] لەبەر ئەو خەسڵەتە کۆمەڵایەتییەی هەڵی گرتووە، ئایدۆلۆژیەتی کەسێک تا ئەو ئەندازەیە دەڕوات کە کاردانەوەکانی خودپەرستی کەسێک بسەلمێنێت. لەم رووەوە، ئایدۆلۆژی وەک پاڵنەرێکی تر(پارە) خۆی دەنوێنێت، لەو رووەوەی کە وەک ئامرازێک بۆ کەسێک خزمەت دەکات بۆ نیشاندانی بەها یان بڕوای کەسێک؛ هۆکاری هەڵبژاردنی ئایدۆلۆژییەت بریتییە لە دووپاتکردنەوەی بڕوای بەئاگا و بێئاگای کەسێک کە پێشتر لەنێو خودی کەسێکدا چەسپاوە.[iii] لە کەیسی سیخوڕیدا، ئایدۆلۆژیایەکی تایبەت دەکرێت وەک پاڵنەری راستەقینە بۆ سیخوڕێک بۆ شکاندنی ئەو متمانەی پێی دراوە یان وەک ئامرازێک بۆ بە ئەقڵانیکردنی رەفتارەکانی خزمەت بکات. ئەو گروپەی کە پێی دەوترێت "کەیمبریج

---

[i] T. Thompson. *Why Espionage Happens* (Florence SC: Seaboard Press, ٢٠٠٩).
[ii] S. Pinker. *The Better Angels of Our Nature: Why Violence Has Declined* (New York: Viking, ٢٠١١).
[iii] M. Shermer. *The Believing Brain: From Ghosts and Gods to Politics and Conspiracies – How We Construct Beliefs and Reinforce Them as Truths* (New York: Times Books, ٢٠١١).

پێنج"[i] -لە بەشەکانی داهاتوودا بە تێروتەسەلی باسمان لێیەوە کردووە- دەکرێت وەک "بڕواداری ڕاستەقینە" بووین کە پاڵنەرەکەیان بۆ کارکردن لەگەڵ سۆڤیەت لەدژی نیشتیمانی خۆیان کە شانشینی یەکگرتووی بەریتانیا بوو بەشێوەیەکی بەرفراوان (بەڵام گشتی نا) لەسەر بڕوایەکی یۆتۆپیایی بە ئایدۆلۆژیەتی کۆمۆنیستی ڕۆنرابوو. چەند نموونەیەکی تری پاڵنەری ئایدۆلۆژیی سیخوڕەکانی ئەمریکا لە سەردەمی جەنگی سارددا بەرچاو دەکەون، وەک جولیوس و ئەسیل ڕۆزنبێرگ و شیکەرەوەی دەزگای هەواڵگری بەرگریی و سیخوڕی کوبایی ئانا مۆنتێس. بەرلەوەی جەنگی سارد کۆتایی پێ بێت، ئایدۆلۆژیەت ڕۆڵێکی کارای دەگێڕا لە تەجنیدی یەکێتی سۆڤیەت، ئەمەش دەزگای هەواڵگری (KGB) ناچارکرد بەدوای پاڵنەری تردا بگەڕێت.[ii] بێگومان سەرانی دەزگاکە هەر بەم پاڵنەرە نەوەستان، بەڵکو بەلێبڕاوانە کاریان دەکرد بۆئەوەی پاڵنەری تر بدۆزنەوە بۆ لەخشتەبردنی سیخوڕەکان.

سێیەم: هەڕەشە... ئەم پاڵنەرەی سیخوڕی پاڵنەرێکی نەرێنییە نەوەک ئەرێنی، وە دەکرێت وەک ئازاردان و تەنانەت ئەشکەنجەدان یەکسان بکرێت. بەپێچەوانەی هاندەرە گشتییەکانی تر، لەم کەیسەدا، سیخوڕ بە ویست و ئارەزووی خۆی کارناکات بەڵکو بەشێوەیەکی کاریگەرانە ناچارکراوە کاری سیخوڕی بەهۆی ترس و سزادان، ئاشکراکردنی کاری هەڵە یان هەندێ سەرئەنجامی نەویستراوی تر ئەنجام بدات. لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە، ئەم میتۆدە زۆر بە کەمی وەک ڕێگایەک بۆ تەجنیدکردن پشتی پێدەبەسترێت چونکە پاڵنەری هەرەسەرەکی سیخوڕەکە بریتییە لە هەڵهاتن لەو سزایەی پێیەوە هەڕەشەی لێکراوە نەوەک خۆشحاڵکردنی ئەو دەزگایەی یان ئەو کەسەی سیخوڕی بۆ دەکات. سیخوڕ تەنیا تا ئەو قۆناغە ئامادەیی هاوکاری تیادایە کە پێویستە و هەرکە زانی کارەکەی پێکهات ئیتر ئەوەی لە دەروونی دایە دایناڕژێت. نموونەی هەرە بەرچاوی ئەم جۆرە بریتییە لە "تەڵەی هەنگوینی" —بەشی دووەمی

---

[i] Kim Philby, Donald Maclean, Guy Burgess, Anthony Blunt, and John Cairncross were recruited while attending Cambridge University in the UK.

[ii] K. Herbig, & M. Wiskoff. *Espionage against the United States by American Citizens.* ١٩٤٧-٢٠٠١ (Monterey CA: Defense Personnel Security Research Center, ٢٠٠٢).

ئەم پەرتووکە بۆ ئەم پرسە تەرخانکراوە- کە تیایدا دەزگایەکی هەواڵگری بیانی هەڵدەستێت بە ئاراستەکردنی پیاوێک یان ئافرەتێک بە فریودانی سێکسی کەسێکی ئامانج بۆئەوەی رەزامەندی هاوکاری ئەو بەدەست بهێنن لەرێی هەرەشەی ئاشکراکردنی کردەکەی.

چوارەم: خودپەرستی... ئەم پاڵنەرە دەکرێت وەک بەرگریکردن لە بروا و بۆچوونی کەسێک بۆ بریاردان پێناسە بکرێت. بەکارهێنانی ئەم چەمکە لەلایەن لاڤچێنکۆ زیاتر جەختی دەکردەوە لەسەر ویستی سیخوڕ بۆ بەرەنگاربوونەوە، سەرکەشی و خۆشییەک.[1] لەم کەیسەدا، سیخوڕ پێی وایە کە تەنیا ئەو بیرۆکەیەی لە هزری ئەودایە دەتوانێت پۆزش بۆ ئەم کارەی بهێنێتەوە، لەکاتێکدا مەرج نییە ئەو شتەی کە ناوبراو بیری لێ دەکاتەوە لەسەر بنەمایەکی ئەقڵانییەت رۆنرابن. لێرەدا، تەنیا ئامانج ئەوەیە ئەنجامدەرەکە دەیەوێت بیسەلمێنێت کە ئەو خاوەنی چەند توانایەکی تایبەتە بەڵام لەلایەن دەزگاکەیەوە پەی بەو توانایە نەبراوە هەر بۆیە لەرقی ئەوان دەست دەکات بە پێدانی زانیاری نهێنی بە دەزگایەکی تر.

پێنجەم: تۆڵە... لێرەدا سیخوڕ بە تووڕەییەکی نائایدۆلۆژیی پاڵنراوە کە لەلایەن وڵاتەکەی خۆی یاخود تەنانەت ئەو دەزگایەی تیادا کاردەکات وای لێکداوەتەوە (یان دەکرێت لە حەقیقەتیشدا وابێت) کە نادادیی لەهەمبەر ئەو کەسەدا کراوە، بۆنموونە نەبوونی سوپاس و پێزانین لە هەمبەر ئەو کارانەی ئەنجامی داوە، یان شکست لە بەرزبوونەوەی پلەی وەزیفی، مووچەی کەم یاخود قەرەبووی تر، یان هەر پێویستییەکی کەسی کە بۆی پڕنەکرابێتەوە. لەئەنجامدا، هەواڵدۆزەکە یان کارمەندەکە هەموو هەوڵێکی خۆی بەگەڕ دەخات بۆ تۆڵەکردنەوە لەرێگای سیخوڕیکردنەوە. دەبێت ئاماژە بەخاڵێکی زۆر گرنگ بدرێت لێرەدا کە دەکرێت نادادیەکەی راست بێت یاخود نا، بەڵام لەلایەن سیخوڕەکەوە بە حەقیقی و شەخسی لێکدراوەتەوە. تۆمپسن ئاماژە بەوەدەکات کە چاوەڕوانی ناواقیعی لە پڕکردنەوەی

---

[1] K. ScheibeK. "The Temptations of Espionage: Self-Control and Social Control," In T. Sarbin, et al. (eds.). *Citizen Espionage: Studies in Trust and Betrayal* (Westport CT: Praeger, ١٩٩٤).

پێداویستی لەلایەن شوێنی کارەوە، غەدری کارگێڕیی، زیادلەپێویست سەیرکردنی لێهاتووی حەقیقی کەسێک، و کولتوری تۆڵە کە لەلایەن میدیاوە ئاراستە دەکرێت، هۆکارن بۆئەوەی کەسێک بەم کارە هەڵسێت.[i] پزیشکی دەروونی دەیڤید چارنی، کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ چەندان تۆمەتبار بەسیخوڕی کردووە، وەک ڕۆبەرت هانسن، ئێرل پیت، و برایان پاتریک رەگان، ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو سیخوڕانەی کە بەهۆی تۆڵەوە لەدژی دەزگاکانیان پاڵنراون بەزۆری هەر بەردەوام دەبن لە بینینی خۆیان وەک هاوڵاتی وەڵاتپارێز و ئاماژە بەوەدەکەن کە هەرگیز لە نیازی ئەواندا نەبووە زیان بە بەرژەوەندی وڵاتەکەیان بگەیەنن.[ii]

شەشەم: **مەرایی کردن**[iii]... لێرەدا، سیخوڕ بەهۆی ویستێک بۆ رازیکردنی دڵی کەسێکی تر پاڵنراوە. لەکاتێکدا وادیارە کە شتێکی نەکردەییە کەسێک تەنیا بەهۆی راگرتنی دڵی کەسێکی تر سیخوڕی بکات، بەڵام ناکرێت بڵێین ئەمە لەناو دەزگا هەواڵگرییەکاندا روونادات. بۆ نموونە، ئەگەر سیخوڕێک لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە پاڵنرابێت، دەکرێت بەبێ برانەوە کاربکات بۆ خۆشحاڵکردنی دەزگای بەرامبەر لە هەوڵێکدا بۆ نیشاندانی وابەستەیی ناوبراو لە دۆزەکەدا. مایکل وۆکەر، کوڕی جۆن ئەنتۆنی وۆکەر و بەشێک لە بازنەی سیخوڕی باوکی، گەواهی ئەوەیدا کە لەساڵی ١٩٨٣ ئەو بۆتە سیخوڕ ئەمەش بەهۆکاری "پارە و خۆشحاڵکردنی باوکم."[iv]

هەروەها، مەرایی کردن ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە ئۆپەراسیۆنی "رۆمیۆ" کە لەلایەن دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە ئەنجامدا، کە تیایدا هەواڵدۆزێکی دەزگاکە پەیوەندییەکی سۆزداری لەگەڵ ئافرەتێکی تەنیای سکرتێر لە ئامانجێکی دامەزراوەی

---

[i] T. Thompson. *Why Espionage Happens* (Florence SC: Seaboard Press, ٢٠٠٩).

[ii] D. Charney. "True Psychology of the Insider Spy," *The Intelligencer: Journal of U.S. Intelligence Studies* ١٨ (١), Fall-Winter ٢٠١٠, ٤٧-٥٤.

[iii] خۆشرین کردن، خۆبردنەپێش (Ingratiation)

[iv] Associated Press. "Member of spy ring released after ١٥ years." The Topeka Capital-Journal, February ١٧, ٢٠٠٠. *cjonline.com,* Accessed January ٢٣, ٢٠١٤.

ئەڵمانیای ڕۆژئاوا گرێدەدات. بەپێچەوانەی پاڵنەری هەرەشە "تەڵەی هەنگوینی،" سیخوڕیەکە لەسەر بنەمایەکی ڕاستەقینە لەنێوان ئامانج و هەواڵدۆزەکەدا ڕۆنرابوو.[i] زۆر گرنگە ئەوەش بزانین کە شارەزایانی کۆمەڵگای هەواڵگریی و توێژەرانی پشت بە کەیسی تایبەت دەبەستن بۆ زانین و لێکۆڵینەوە لە پاڵنەر و ڕەفتارەکانی ئەو کەسانەی بە کردەی سیخوڕی هەڵدەستن. بە تێڕامان لە نموونەگەلی ئەم بوارە، بۆمان دەردەکەوێت بە چ شێوازێک ڕێ لەم دیاردەیە دەگیرێت، بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین کە نەکەوینە ئەو داوەی کە جیاوازییەکی بەرچاو هەیە لە کەیسێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، یان لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر. سیخوڕەکان بەزۆری بەهۆی پرۆسەی ڕێکخراوەیی و نەریت و ئەدای خودی سیخوڕەکە پەی پێنابرێت، بەمەش سیخوڕیەکەی دەشاردرێتەوە. هەندێجار تەنانەت دەزگا دژەهەواڵگرییەکانیش بەلاڕێدا دەچن لە دۆزینەوەی ئەو سیخوڕەی زانیاری لەدەزگاکە دەباتە دەرەوە؛ بۆیە زۆر گرنگە بایەخی زۆر بەو دۆخ و ژینگەیە بدرێت کە کارمەندانی هەواڵگریی تیادا کار دەکەن.

## نهێنی و پێداویستییەکانی پیشەی سیخوڕی

بێگومان نهێنی و هەڵخەڵەتاندن و فروفێڵ لەکاری سیخوڕیدا دوو ڕەگەزی بنچینەیین و هەرلەسەرەتاوە دەبنە دوو خەسڵەت و دەچەسپێن بەو کەسەوە کە سەردەکات بەم پیشەیەدا، سیخوڕی کردن بەسەر نهێنییەکانی کەسانی ترەوە، هیچ نییە جگە لە کۆمەڵێک فروفێڵ و ڕێگای نهێنی گرتنەبەر بۆ وەدەستهێنانی زانیاری. لێ زەرورییەتی پیشەکە زۆرجار پێویست بەوە دەکات پیشەوەرانی ئەم بوارە کردەوەی کوشتن و تیرۆرکردن ئەنجام بدەن بۆ بەدەستهێنانی زانیاری داواکراو، ئەم خاڵەش وادەکات لەلایەن زۆرینەی هەرەزۆری خەڵک بەپیاوانی پیشە مەترسیدارەکە ناوزەد بکرێن.

---

[i] M. Wolf. *Man Without a Face: The Autobiography of Communisms' Greatest Spymaster* (New York: Times Books, ١٩٩٧).
- Charney, D. L., & Irvin, J. A. (٢٠١٤). A Guide to the Psychology of Espionage. *Association of Former Intelligence Officers*.

لەبارەی ئەم جۆرە کردەوە مەترسیدارانەوە، هەواڵگری بولگاریا کردەوەیەکی بێوێنەی ئەنجامدا. یەکێک لە بەکرێگیراوەکانی بۆیەکەم جار ئامێرێکی وەکو لولەی دەمانچەی بەکارهێنا بۆ تەقاندنەوەی پارچە پلاتینێکی بچووک بەرەو رووی یەکێک لە جیابووەوە بولگارییەکانی بەئامانجی کوشتنی.

سیخوڕە بولگارییەکە توانی گۆرگی مارکۆف، کە بەلای دەزگای هەواڵگرییەوە بە جیاکراوە لەقەڵەم دەدرا، بپێکێت لەوکاتەی لەبەردەم نووسینگەکانی بی بی سی لە لەندەن تێپەڕ دەبوو(ئەم رووداوە لەساڵی ١٩٧٨ ئەنجامدرا). بەپێی هەندێ سەرچاوە، دەڵێن گوایە مارکۆف لەپڕ هەستی بە ئازارێک کرد لە رانی راستیدا بێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانێت، ئەوەندە نەبێت کەسێکی نامۆی بینی کە بە شەقامەکەدا رای دەکرد و هەوڵیدەدا خۆی حەشار بدات و لەبەرچاوی رێبواران خۆی ون بکات.

ئێوارەی ئەو رۆژە گەرمی لەشی مارکۆف بەجۆرێکی مەترسیدار بەرزبووەوە، بۆیە هەرزوو بۆ وەرگرتنی چارەسەر گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانە. پزیشکەکان شکستیان هێنا لە زانینی هۆکاری نەخۆشییە کتوپڕەکەی، ئەوە بوو دوای سێ رۆژ مانەوە لە نەخۆشخانە گیانی سپارد. دواتر، نوژدارەکان رایانگەیاند: "حاڵەتی ژەهراویبوون دووچاری مارکۆف بووە لە ئاکامی هەوکردنیدا بەهۆی پارچەکانزایەکی دروستکراو لە پلاتین و ئەیریدۆم. پارچە پلاتینەکان لە رانی راستیدا بووە و ئەم جۆرە تێکەڵە کیمیایی-کانزاییە بەشێوەیەکی ئاسایی لە دروستکردنی فڕۆکەدا بەکاردەهێنرێت. لەکاتی ئامادەکردنیدا لە فڕنی زۆر گەرمدا تێکەڵ دەکرێن." نووژدارەکان لە درێژەی پێناسەکردنی پارچەکانزایەکەدا گووتیان: "پارچەیەکی پلاتینی چەماوەیە و تیرەکەی تەنیا دوو ملیمەترە و لەهەرچوار لاوە هەڵکۆڵراوە بەهۆی ئامێرێکی تایبەت بە دروستکردنی ئەم جۆرە بابەتە وردانە.

پزیشکەکان بەکۆتاهێنان بە راپۆرتەکەیان ئاماژەیان بەوەدا کە ناوبراو بەهۆی ئەو پارچە کانزایەوە مردوو کە خوێنەکەی ژەهردار کردووە و بۆیە بەهێواشی و لەسەرخۆی بەهۆی کاریگەرییەکەوە کووشتوویەتی.

گومانی تیادا نییە ئەم رووداوی تیرۆرکردنە سەرنجی چاودێرانی راکیشا بەرەو چەند رووداوێکی تر کە پێشتر روویاندابوو و بوونە هۆی گیان لەدەستدانی چەند جیابووەوەیەکی تری سیاسیی. ئەوەتا لەمانگی تەمموزی ساڵی ۱۹۷۳دا، بۆریس ئەرنۆف کە پەناهەندەیەکی بولگاری بوو لە دانیمارک دەژیا، لەپڕدا بۆماوەیەکی کورت شوێنبزر کرا، پاشان لەبەردەم یەکێک لە دادگاکانی بولگاریا لە شاری سۆفیای پایتەخت راوەستا بەتۆمەتی ناپاکیی و دوژمنایەتی کردنی رژێمی شیوعی. ئینجا فەرمانی ۱۵ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنرا. کەچی ئەرنۆف دوای دوو مانگ تێپەڕاندنی زیندانیەکەی لە بارودۆخێکی تەمومژاویدا کۆچی دوایی کرد.

گۆڤاری لاوانی کۆمۆنیستی لە بولگاریا، نارودی ملادی، لەدوای مردنی ئەرنۆف وتارێکی بڵاوکردەوە دەربارەی کردەوەی کوشتوبڕ و تاوانی ئەرنۆف کە پێی هەڵساوە و دووپاتیشی کردەوە کە مردن چارەنووسی هەموو ناپاک و دوژمنەکانی سۆشیالیزمە. بەرلەوەی کار لەکار بترازێت، هەندێ لێکۆلیاری ئینگلیزی دەستنیشانی تێکەڵە کانزایی-کیمییایەکەیان کرد و هەڵسان بە توێژینەوە لەسەر ئەو پارچە کانزایەی لە رانی مارکۆڤ دەرهێنرا. دواتر دەرکەوت کە ئەو پارچە کانزایە ئاخنراوە بە ژەهرێک بەناوی "ریسین"ی دەرهێنراو لە رۆنی "خروع"ی زەرد.[أ]

ئەو رووەکەی ژەهری ریسین لێیەوە بەرهەم دێت

[أ] خروع: جۆرێکە لە رووەکی گژوگیایی لە گروپی "فربۆنیات". گەڵاکانی پانکەڵەن، رێدی بنەڕەتی ئەم رووەکە کیشوەی ئاسیاییە، لە هەندێک جێگەدا بۆ جوانکاری دەچێنرێت.

لەم لاشەوە، هەروەو دەزگای هەواڵگری ناوەندیی و یەکێتی سۆڤیەت ئامێری درۆگر(Polygraph)یان بەکارهێنا بۆ لێکۆڵینەوە لە راستگۆیی کارمەندەکانیان بۆ پەردەلادان لەڕووی میسداقیەتی ئەوانەی تۆمەتبار دەکرێن بە سیخوڕیکردن بۆ بەرژەوەندی دوژمنان. ئەم ئامێرە کاردەکات بۆ تۆمارکردنی ئاڵوگۆڕە فیزیاییەکانی لەشی ئەو کەسانەی خۆدەدزنەوە لە گوتنی قسەی راست لەکاتی لێکۆڵینەوەدا، وەک گۆڕانی پەستانی خوێن، گەرمی لەش و رێژەی دەردانی ئارەق کە هەمیشە وەک کاردانەوەی بایۆلۆژی روودەدات لە ئەنجامی هەستکردن بە ترس لەسەرئەنجامی درۆکردن.

دەزگای هەواڵگری ئەمریکی هەمیشە لەکاتی لێپرسینەوەی تۆمەتبارەکاندا پشتی بەم پرسیارە دەبەست: "ئایا هیچ کات شتێکت لە ماڵ و موڵکی دەوڵەت دزیوە؟" ئەمە لەکاتێکدا دەزگاکانی تر کۆمەڵە پرسیارێکیان بەکاردەهێنا، وەک ئەو پرسیارانەی خاوەن کار دەیانکات لەو کەسانەی پاڵێوراون بۆ وەرگرتنی کار لەلایەن خاوەن کارەکە. بەهەرحاڵ، ئامێری درۆگر سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە ئاشکراکردنی درۆ لە بواری سیخوڕی و دژەسیخوڕیدا، بەمەش لەنێو دامەزراوە فەرمییەکاندا بەکارهێنانی بەشێوەیەکی فراوان تەشەنەی کرد، جگە لە ناوەندی پەیوەندییە حکومییەکان لە بەریتانیا کە کارمەندانی ئەو دەزگایە ملکەچ بوون بۆ ئەو ئامێرەیان بە توندی رەتکردەوە، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک، دیارترینیان پێشێلکردنی نهێنی کەسیی لەلایەن ئەم ئامێرەوە و شکستهێنانی لە تۆمارکردنی سەرجەم گۆڕانە فیزیاییەکان لە لەشدا کە زانایان تەنیا هۆکارەکەیان بە درۆکردن بەند نەکردووە. شایانی ئاماژە بۆکردنە کە ئامێری درۆگر لەم رۆژگارانەی ئەمڕۆشماندا لە نێو دامەزراوە بازرگانییەکانیش بەکاردەهێنرێت بۆ دڵنیابوون لەسەر راستی کارمەندە تازە دامەزراوەکان. هەر لەهەمان بواردا، واتە لە بواری بەکارهێنانی تەکنیکی زانستی لە خزمەتی سیخوڕیدا، ئەمریکی و سۆڤیەتییەکان هەوڵی بەکارهێنانی داودەرمانی کیمیاویی تایبەتییاندا بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەقڵی مرۆڤ داوە، هەرچەندە هەوڵی تەواو لەبەر دەست نییە لەسەر هەوڵدانی سۆڤیەت لەم رووەوە، بەڵام ئاگاداری تەواومان

ا

هەیە بەسەر ئەو پلانانەدا کە ئەمریکییەکان دای دەرێژن بۆ بەرهەمهێنانی ئەم دەرمانە مەترسیدارانە. لەساڵی ١٩٥٠، سی ئای ئەی لە رێگای تاقیگا پزیشکییە بڵاوەکانی وڵاتەوە هەوڵێکی سەرەتاییدا بۆ بەرهەمهێنانی ئەو دەرمانانەی کە ناوی لێنابوو "جۆڵەکەی شین،" پاشان هەوڵەکانی چڕتر کردەوە و ئەمجارە دەرمانێکی بەرهەمهێنا بەناوی "مکولترا."

لەم کاتەدا، ریچارد هێلمز، جێگری بەرپرسی بەڕێوەبەری پلاندانانی سی ئای ئەی، لەوکاتەدا پێشنیاری ئەوەی کرد کە ئاژانسەکە بڕی سێ سەد هەزار دۆلاری تەرخان بکات بۆ ئەم پرۆژە گرنگە. دوای پێشکەشکردنی ئەو پێشنیارە ئاڵن دالس، جێگری بەڕێوەبەری هەواڵگری ئەمریکا، یەکسەر بە پێشنیارەکە قایل بوو. بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکە، ناوبراو سیدانی گوتلیبی وەک بەڕێوەبەری پرۆژەکە هەڵبژارد. ئیدی زۆربەی تاقیگە زانستییەکان لە زانکۆ و نەخۆشخانەکان خرانە خزمەتی ئەم پرۆژە هەواڵگرییەوە.

لەلای خۆیەوە ئەمریکا پروپاگەندەی ئەوەی کرد گوایە یەکێتی سۆڤیەت پرۆسەی کۆنترۆڵکردنی کیمیاییانەی بەسەر ئاوەزی هەندێک لە تۆمەتبارکراو و زیندانییەکاندا جێبەجێ کردووە. واشنتۆن بۆ سەلماندنی پروپاگەندەکانی پەنای بردەبەر ئاشکراکردنی بارودۆخی هەندێک لەو زیندانیانەی کە وایان نیشاندەدا سەریان دەسوڕا لەکاتی دادگاییکردنیاندا لە مۆسکۆ. هەروەها، سی ئای ئەی بارودۆخی هەندێک لەو زیندانیانەی ئاشکرا کرد کە لە کۆریای باکوورەوە گەڕابوونەوە، ئەمەش وەک بەڵگەیەکی سەلمێنەری پروپاگەندەکان، نەخاسمە هەندێکیان دووچاری تێکچوونی ژیری و راڕایی دەروونی هاتبوون لەدوای گەڕانەوەیان بۆناو وڵات.

لە یاداشتنامەکەیدا سەرۆکی بەشی پزیشکی سەربە دەزگای هەواڵگری ناوەندی لەکانوونی دووەمی ١٩٥٢دا بۆ بەرپرسەکانی خۆی ناردووە، دەنووسێت: "زۆر بەڵگەی یەکلاکەرەوە هەیە لەسەر ئەوەی شیوعییەکان ماددەی بێهۆشکەری کیمیایی و بەند راوەستاندن و خورپەی کارەبایی و هەندێ جار خەواندنی موگناتیسیشیان بەکارهێناوە بۆ زاڵبوون بەسەر ئاوەزی دوژمن و زیندانییەکاندا، لەبەر ئەوەی پێویستە لەسەرمان

هەڵسین بە هەڵمەتێکی زانستی تا لەسەر ئەنجامدا بتوانین هەمان تەکنیکی پزیشکی و زانستی بەجۆرێک بەکاربهێنین بۆ ئەوەی هەمووان دڵنیابن لەوەی ئەو جۆرە تەکنیکانە لە دەستێکی ئەمیندا دەمێننەوە."

هەروەها، یەکەم سەرۆکی دامەزراوەی جیهانی نەخۆشییە ئەقلییەکان، دکتۆر ئیۆن کامێرۆن، چەند تاقیکردنەوەیەکی ئەنجامدا بۆ زاڵبوون بەسەر ئاوەزی هەندێک لە نەخۆشەکاندا، لەم نێوەندەدا ئەم جۆرە دەرمانانە بەکارهێنران: تورزاین، نمبوتال، سیکونال، فیرونال، فنرگال. کامێرۆن هەوڵیدا مێشکی چەند کەسێکیان بشۆرێتەوە بە بەکارهێنانی پەیامێکی دەنگی کە لەرێگەی ئامێرێکی بچووکی تۆمارکەرەوە ئاراستەی دەکرد، ئامێرە تۆمارکەرەکەی خستبووە ژێر سەرینی نەخۆشەکانەوە. لەماوەی ئەو سی رۆژەی کەنەخۆشەکانی ئەم تاقیکردنەوەیان بەسەردا جێبەجێکرا، ئەوان تووشی غەیبوبە (coma) ببوون بەهۆی بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی سەرەوە لەدژیان.

تاقیکردنەوەکانی کامێرۆن بوونە جێی سەرسوڕمانی دکتۆر دۆنهالب، پرۆفیسۆری دەروونناسی لە زانکۆی مکهیل. زانکۆکە دەربارەی تاقیکردنەوەکانی کامێرۆن دەڵێت: "ئەگەر رێکەوتایە یەکێک لە قوتابیەکانم پێشنیاری کردەوەیەکی گاڵتەجاڕی وەک ئەوەی کامیرۆنی بکردایە یان هەر بیریشی لێ بکردایەتەوە، دەستبەجێ لەزانکۆکە دەرم دەکرد."

لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٣، هەواڵگری ئەمریکا پرۆژەیەکی نوێی دەستپێکرد لە هەمان بواری تەکنیکی سیخوڕیدا. ئەم پرۆژەیە ئێستا جەنگی خانە بایۆلۆژییەکانی لێ کەوتۆتەوە، یان بە واتایەکی تر، پزیشکانی سی ئای ئەی و پەیمانگا زانستییەکانی دەستیان کرد بە تاقیکردنەوە لەسەر خانەکانی لەشی مرۆڤ لەمیانەی بەکارهێنانی ماددەی (LSD)[1]یەوە. دکتۆر درانک ئۆلسن بە ویستی خۆی خرایەژێر یەکەم

[1]جۆرە دەرمانێکە کە کاریگەرییەکی بێ ئەندازە دەکاتە سەر مێشک و هەڵوەسە دروست دەکات، بەشێوەیەک کە وێنەی ناڕاست و سەیر سەیر بۆ مرۆڤ دروست دەبێت. ئەم دەرمانە لە زۆربەی

ئەزموونگەرییەوە. لەم ئەزموونەدا، حەفتا مایکرۆگرام لە ماددەکە لەنێو شوشەیەکی کوانترۆدا گیرایەوە و دکتۆر ئۆلسن یەک پێکی لێخواردەوە و دەستبەجێ هەستی کرد چالاکییەکانی زیاد لە ئاستی سروشتی خۆی پەرەی سەندووە. بەڵام ئەم چالاکیە دەستکردە درێژەی نەکێشا. ئۆلسن هەستی بە دڵ تەنگییەکی قووڵ کرد، لەئەنجامدا داوای دیدەنی یەکێک لە پسپۆڕە دەروونییەکانی کرد. سی ئای ئەی، کە هەر لەسەرەتاوە خۆی سەرپەرشتی تاقیکردنەوەکەی کردبوو، ڕێگەی نەدا بە بەکارهێنانی پزیشکێکی دەروونی یاسایی بۆ ئەم مەبەستە، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەکا بابەتەکە ئاشکرا ببێت. هەربۆیە، داوای لە دکتۆر هارۆلد سینای کرد تاکو کردەکانی پشکنین بۆ پزیشکی نەخۆشکەوتوو، دکتۆر ئۆلسن، بکات چونکە بەجۆرێک باری دەروونی تێک چوو بوو کە لە بەرواری ٢٧ی تشرینی دووەمی ١٩٥٣ لە هۆتێل واشنتۆن ستانلەردا خۆکوژی ئەنجامدا، ئەمەش واتە تەنیا چوار ڕۆژ دوای خواردنەوەی ماددەکە. تاکو مێژووی پەردەلادان لەڕووی بەسەرهاتەکەی دکتۆر ئۆلسن نەهاتە پێش و لیژنەی لێکۆڵینەوە لەساڵی ١٩٥٧ کردەوەکەی ئاشکرا نەکرد، بنەماڵەی ناوبراو نەیاندەزانی سی ئای ئەی تاقیکردنەوەی کیمیاییان بەسەردا کردووە، واتە هۆکاری مردنەکەیان نەدەزانی. ئیدی دوای ئەم ڕووداوە، لەساڵی ١٩٦٣ پڕۆژەی بەرهەمهێنانی ئەو ماددەیەی وەستێنرا بۆئەوەی دەست بکرێت بەڕاپەڕاندنی پڕۆژەی دیکە بۆ بەرهەمهێنانی ژەهر و دەرمانی لەم جۆرە، کە سی ئای ئەی پەیتاپەیتا خەونی بەدەستهێنانیەوە دەبینی.

کۆنترین جۆری هەواڵگری کە مێژوو ناسیبێتی هەواڵگری سەربازییە، لەبەرئەوەی لە رابردوودا و تەنانەت تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم گرنگترین ئامانجی دەزگای هەواڵگری وڵاتان ئەوە بوو کە بزانرێت دەوڵەتە دوژمنەکەی چ جۆرە چەک و سوپایەکی لەبەردەستدایە و لەکوێدا ئەو سوپایانە ڕێکدەخرێنەوە لەکاتی جەنگەکاندا، واتە سیخوڕیکردن لەو کاتانەدا تەنها پەیوەست بوو بە کاروباری سەربازییەوە. لە

---

هەرە نقدی وڵاتانی جیهان قەدەغەیە، فۆرمولەی زانستیەکەشی بریتیە لە $C_{20}H_{25}N_3O$ (وەرگێڕ).

سەردەمە کۆنەکاندا سیخوڕ سەربازێک بوو بە جلوبەرگی تایبەتییەوە کە سواری ئەسپەکەی دەبوو لە شوێنێکدا و لەپێش سوپای نەیارەکانیەوە دەوەستا و دواتر بە خێرایی دەگەڕایەوە بۆ لای فەرماندەکانی و زانیارییەکانی لەسەر ژمارەی سەربازانی سوپای دوژمن و جۆری چەکەکانیان دەگواستەوە، زۆرجار بەم جۆرە سیخوڕانە وتراوە (دەستەی پێشەنگ)، تا ئەمڕۆش سیخوڕی لەو جۆرە بوونی ماوە، بەڵام بە ئامرازگەلێکی جیاوازترەوە کە لەبری ئەسپ ئامێری ناردن و بێتەل و وەرگری نیشانەکانی ڕووناکی پێیە و بروسکەی هێمادار وەرئەگرێت.

لە رابردوودا ئەسپ و حوشتر دوو ئامرازی زۆر سەرەکی بوون لە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمن و تەنها ئامراز بوون بۆ خێرا گواستنەوەی زانیارییەکان و گەیاندنی بە فەرماندە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم لە شەڕەکانی ناپلیۆندا ئەسپ ئامرازێکی سەرەکی بوو لەکاری سیخوڕی کردندا. لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا ئامرازەکانی هەواڵگری گۆڕانێکی سەرەتاییان بەسەردا هات بەزۆری سوود لە کۆتری نامەبەر وەردەگیرا، هەروەها شەمەندەفەر و لە هەندێک کاتی بەپەلەشدا باڵۆن بەکاردەهێنرا. لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا ئامرازەکانی هەواڵگری گۆڕانی بنچینەیی بەسەردا هات ئۆتۆمبیل و فڕۆکە بوون بە دوو ئامرازی زۆرک چالاک، دواتر کارەکان پێشکەوتن تاگەیشتە وێنەگرتن لە ئاسمانەوە و بەکارهێنانی ئامێری ئەلیکترۆنی بۆ گوێگرتن، سەرباری بەکارهێنانی مانگی دەستکرد کە دەتوانێت هەموو جووڵە و چرپەیەک بگوازێتەوە. هەموو ئەم پێشکەوتنانەش بە شۆڕشێک دادەنرێت لەبواری ئامرازەکانی هەواڵگریدا، ئامراز و ئامێرەکان بەشێوەیەکی ریشەیی گۆڕان، داهێنانەکان گوێگرتن و بینینی لە دوورەوە ئاسانترکرد و لە ئاستێکی بەرفراواندا خستنیە بەردەم دەزگا هەواڵگریەکان لەگەڵ زۆربوونی ئەو ئامرازە هەواڵگریانەی کە داهێنران ئەرکەکانی سەرشانی دەزگا هەواڵگریەکان زیاتر بوو.

پاش جەنگی جیهانی دووەم هەواڵگری سنوورەکانی زیاتر بەرفراوان بوو چەندەها جۆری لێ پەیدابوو هەواڵگری سەربازیش بوو بەشێک لە بەشەکانی هەواڵگری، ئیتر هەواڵگری بایەخی بە کۆکردنەوەی زانیاری جۆراوجۆر دەدا لەبوارە جۆراوجۆرەکانی

وەک تەکنەلۆژی و پیشەسازی و ئابووری و کۆمەلایەتی...هتد، بە کورتی هەواڵگری بوو بەو شتەی کە دەیوست هەموو شتێک لەبارەی هەموو کەسێکەوە بزانێت لەهەموو کاتێکدا. بێگومان زانینی هەموو شتێک پێویستی بە پارە و کەسی دیاریکراوە وەک چۆن رێگریکردن لەوەی کەسانێک هەموو شتێک لەبارەی ئێمەوە بزانن پێویستی بە پارە ە کەسانێکی دیاریکراوە. واتە ئەگەر سیخوری بریتی بێت لە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دەوڵەتێکی دیاریکراو ئەوا ئەرکی ئەو دەوڵەتەش ئەوە دەبێت کە زانیاری کۆبکاتەوە لەسەر ئەو دەوڵەتەی کە زانیاری لەسەر کۆدەکاتەوە، کۆی ئەم کارانەش پێویستی بە هەزارەها کارمەند هەیە و هەروەها بودجەی تەرخانکراوی تایبەتی لەلایەن دەوڵەتەوە، هەروەها بوونی دەزگایەکی دژەهەواڵگری، کاتێک سیخورێک ئاشکرا دەکرێت پێویستە دەستگیربکرێت و بدرێتە دادگا ئەو کەسەش کە رادەسپێردرێت بۆ چاودێریکردن و دەستگیرکردنی سیخور هیچ نەبێت دەبێت تواناکانی لە سیخورەکە زیاتر یان یەکسان بێت. بۆیە، لە هەر ولاتێکدا دەزگایەکی ئاسایش هەیە کە ئەم دەزگایە بە پێی ولاتەکان ناو و ئەرکەکەی دەگۆرێت، بەلام ئەرکی سەرەکی بریتیە لەوەی چاودێری سیخورە بێگانە و ناوخۆییەکان بکات و تەنانەت بچێتە ناویشیانەوە بۆ ئەوەی شانەکانیان ئاشکرا بکات و پەیوەندیەکانیان بدۆزێتەوە. دەزگای ئاسایش لەزۆر شتدا لە دەزگای هەواڵگری دەچێت بەلام خاوەن بەرپرسیاریەتیەکی زیاترە کە زۆرجار ئەو بەرپرسیاریەتیانە دەدرێتە پۆلیس، لەگەل بوونی جیاوازی لە ناسنامەی ئەم دوو دەزگایە لە ولاتاندا بەلام پێویستی وایخواستووە کە هاوئاهەنگی و پەیوەندیەکی بەهێز دروست ببێت. لەزۆر دەوڵەتدا لیژنەیەکی هاوبەش لە هەردوو دەزگا و گەورە بەرپرسی دیکەی دەوڵەت دروست دەکرێت کە پەیوەندیدارن بە ئەنجامدانی پلانەکانی دەوڵەت.

هەماهەنگی لەنێوان ئەندامانی ئەم لیژنەیەدا زۆر پێویستە، لەبەرئەوەی کاتێک هەریەکێک لەم دوو دەزگایە بیەوێت دەسەلاتی زیاتری هەبێت و زاڵتر بێت دەبێتە هۆی تێکدانی هاوسەنگی کارگێری و کارەکان. هەردوو دەزگای هەواڵگری و ئاسایش لە زۆربەی ولاتانی جیهاندا بەبەردەوامی لە بەرفراوان بوون دان تا ئەوەی بوون بە

بەشێک لە دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و هەرشتێکی ڕۆژانە لەوڵاتدا، هەر دەوڵەتێک لەم سەردەمەدا ناچارە لە چوارچێوەی کارە کارگێڕییەکاندا بایەخ بە هەردوو دەزگای هەواڵگری و ئاسایش بدات و بە دەیەها ملیۆن پارەیان بۆ خەرج بکات.
بەپێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیا ئەو داهێنانانەی کە لە بواری هەواڵگریدا دەکران پێشکەوتنی بەرچاویان بە خۆیەوە بینی و چەندین ئامراز و کەرەستەی شوێنپێهەڵگرتن و چاودێری کردن داهێنران کە ئەمەش کاری سیخوڕی کردنی تاڕادەیەک ئاسان کرد، ئامراز و کەرەستەکانی هەواڵگری بە پێیان دەوترێت (gadgates) کە ئەم ناوەش لە لایەن ئەمریکییەکانەوە لێیان نراوە، هەرچەندە ئەوان کەسانێکن کە زۆر بە کەمی بەکاری دەهێنن بەڵکو بەو ئامراز و کەرەستانە دەڵێن: ئەو شتانەی کە چیتر بەکەڵکی بەکارهێنان نایەن، واتە ئەو وردە شتانەی کە بەکەڵکی فڕێدان دێن.
ئامراز و کەرەستەکانی سیخوڕی کاتێک بەردەست دەکەون وادەردەکەوێت کە بەکارهێنانیان ئاسان بێت بەڵام لەڕاستیدا بەکارهێنانیان پێویستی بە بارودۆخی گونجاو هەروەها وریاییەکی زۆرە، سەرەڕای ئەوەش زۆرێک لەم ئامێرانە بەهۆی بچووکی قەبارەیان زوو تێک دەچن و خراپ دەبن، تێکڕای ئەو ئامێرانەی کە سیخوڕ بەکاریدەهێنێت پێویستی بە ووردبینی هەیە لە هەڵبژاردنی شوێنی بەکارهێناندا، ئەم ئامێرانە جۆراوجۆرن و بەئاسانی ناتوانرێت بکڕدرێن لەبەرئەوەی بەئاسانی دەست ناکەون و گرانبەهان تا خولێکی تایبەت لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانیان نەبینرێت ئەستەمە بتوانرێت بەسەرکەوتوویی بەکار بهێنرێن. زۆرێک لە دەزگا هەواڵگریە پێشکەوتووەکان بەو شێوەیەی کە دەیانەوێت بودجەیەکی زەبەلاح تەرخان دەکەن بۆ دابینکردنی ئەم ئامێرانە کە سەرەڕای ئەوەی بچوکن بەڵام خاوەن کاراییەکی بەرزن، وەک ئامێری ناردنی (بیب-بیب) کە قەبارەکەی بەئەندازەی دەنکە نۆکێک دەبێت و بەدەرزی بۆینباخ یان خشڵ و ئامرازەکانی جوانکارییەوە دەلکێنرێت یارمەتی کەسی هەواڵگر ئەدات کە شوێنی ئەو مرۆڤە دیاری بکات کە هەڵی گرتووە بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت.

لە نموونەی تری جۆرەکانی ئامرازەکانی هەواڵگری وەک ئامێری وێنەگرتن بە ئەندازەی پاکەتە شقارتەیەک هەروەها ئامێری نێرەر و وەرگر کە قەبارەکەی زۆر بچووکە، وە ئامێری وێنەگرتنی تایبەت کە دەتوانێت لەو دیو دیوار و بەربەستە کانزاییەکانەوە وێنە بگرێت، پێنوسی دەمانچە کە دەتوانێت گولەیەکی عەیارە (٧،٥) ملم بتەقێنێت هەروەها دەتوانێت ژەهر یان هەر مادەیەکی تر بتەقێنێت و ببێتە هۆی جەڵدەیەک کە تەنانەت کاریگەریەکەشی بە توێکاری پزیشکی دەرناکەوێت، ئامێری کردنەوە و شکاندنی قاسەی ئاسنین، هەروەها ئامێری تۆماری دەنگی ئۆتۆماتیکی کە دەتوانێت پەیوەندی تەلەفونی نێوان دوو دەوڵەت تۆمار بکات، دووربین بە تیشکی ژێر سوور کە دەتوانێت لە شەودا لە دووریەکی زۆرەوە وێنە بگرێت.

زۆربەی ئەم ئامێرە بچووکانە لەرێگەی رووکەشێکەوە ئەشاردرێنەوە و بەجۆرێک دیزاین دەکرێن کە شێوەی ئامێرێکی ئاسایی هەبێت کە رۆژانە بەکاردەهێنرێت ئەمەش بۆ ئەوەی ئامێرەکە سەرنجی کەس رانەکێشێت و هەوڵ بۆ دزینی بدات لە کۆتاییدا ئاشکرا بێت، لە رابردوودا زۆربەی ئامێرەکانی سیخوڕی لە شێوەی چەرخدا دیزاین دەکران بەڵام ئێستا پشتی پێنابەسترێت لەبەرئەوەی لەلای خەڵکی جیهان ناسراوە. سەرچاوەکان لەمڕۆدا ئامێری مۆبایل بەکارئەهێنن بۆ وێنەگرتن هەروەها کامێرا بەکاردەهێنن کە لەشێوەی کاتژمێری دەستیدا دیزاین کراوە کە زۆر بەئاسانی دەتوانن لە دەستیان دابکەنن و بیپشکنن و بەرزی بکەنەوە بۆ لای گوێیان و لەهەمان کاتدا وێنەی هەرکەسێکیان دەوێت بیگرن، هەروەها ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە کاتژمێرانە بەکاردەهێنن دەتوانن وا خۆیان پیشان بدەن کە دەچەمێنەوە بۆ سەیرکردنی کامێراکە بەڵام لەهەمان کاتدا ورد کاربکات لەسەر ئەوەی ئەو وێنەیەی کە دەیگرێت بیخاتە ناو ئەو چوارچێوەیەی کە دەیەوێت. هەروەها ئامێری وێنەگرتنی نهێنی لەچەند شێوەیەکی تردا دیزاین کراون وەک: دەسکی گۆچان، سوراو، پاکەتی سپیاوی ئافرەتان، پاکەتی جگەرە و ملوانکە.

یەکێک لەو چەکانەی کە سیخوڕ حەز بە بەکارهێنانی ئەکەن بریتییە لە کامێرای لێنز گەورە کە زۆرجار سیخوڕ توانیویەتی وێنەی بنکە سەربازیە زەمینی و ئاسمانیەکان

و وێنەی پیاوانی دوژمن بەدەست بهێنێت تەنها بە وێنەگرتنیان لەناو ئۆتۆمبیلەکەیەوە. لە جۆرەکانی کامێرای تایبەت بە سیخوڕەکان کامێرای (minox)بەوە ناسراوە کە زۆر بچووکە و تەنها کەسە پیشەگەرەکان دەتوانن بەکاری بهێنن بە تایبەتی جۆری (minox-C) کەقەبارەی هێندەی پێنووسێک دەبێت، هەروەها کامێرای جۆری (tista) کە لەشێوەی چەرخ دیزاین کراوە، جۆرێکی تریش هەیە ناوی (yashka) یە کە سیخوڕ دەتوانێت لەناو دەستی دا دایبنێت بەبێ ئەوەی سەرنجی هیچ کەسێک بەلای خۆیدا رابکێشێت، زۆربەی سیخوڕە روسیەکان کامێرای جۆری (ئیکزاکاتا)یان بەکار دەهێنا لەکاتی وێنەگرتنی بەڵگەنامەکاندا کە ئەم ئامێرە زۆر ووردە و لێنزەکەی سادەیە و بەئەندازەی (٣،٥) ملم. لەبواری وێنەگرتنی زانیارییەکاندا کامێرایەک هەیە کە خێراییەکەی هێندەی خێرایی دەنگە، ئەم ئامێرە دەتوانێت وێنە بگرێت لەپشت دیوارە ئەستوور و بەربەستە ئاسنینەکانەوە، لەسەرەتادا بوونی ئامێرێکی وا وەک خەون وابوو، ئەم ئامێرە لەسەرەتادا دەیتوانی وێنەی ئەو شتانە بگرێت کە دەکەونە پشت دیوارێکەوە لەحاڵەتی جیاوازدا، دواتر ئەم ئامێرە پێشخرا و لەتوانایدا هەبوو ئەو شتانەی کە پێویست بوون وێنە بگرێت و لەسەر شاشەیەکی ئەلکترۆنی پیشانیان بدات بە پێی ئاراستەی عەدەسەی کامێراکە، بۆ خۆپاراستنیش لەم جۆرە کامێرایە ماددەیەک هەیە کە دەبێت دیواری شوێنەکان یان ئەو شتانەی کە ناتەوێت وێنەی بگیرێت پێی چەور بکرێت ئەم ماددەیەش قەدەغەکراوە ناوی بهێنرێت و پێکهاتەکەی ئاشکرا بکرێت لەبەرئەوەی بە یەکێک لە نهێنیەکانی وەزارەتی بەرگری فەرەنسا دادەنرێت، تائێستاش هیچ وڵاتێکی تر نەیتوانیوە ماددەیەکی لەو شێوەیە دروست بکات.

تۆمارکردنی دەنگیش بە هێندەی وێنەگرتن گرنگی خۆی هەیە و چەندێک سیخوڕ پێویستی بەوەیە وێنەی دوژمنەکەی بگرێت بە هەمان شێوەش پێویستی بەوەیە دەنگی تۆمار بکات و گوێی لێبگرێت، گوێی مرۆڤی ئاسایی توانایەکی دیاریکراوی هەیە تەنها لە دووری مەودایەکی دیاریکراو دەتوانێت ببیستێت لەبەرئەوە چەندین ئامێرگەلی جۆراوجۆر داهێنراون کە توانای بیستنیان سەدان جار لە توانای بیستنی

مرۆڤ زیاترە و بەبێ کەم و زیاد هەموو جۆرە دەنگێک تۆمار ئەکات، ئامێرەکانی بیستن و تۆمارکردن زۆر لە ئامێرەکانی وێنەگرتن بەهێزترە و دەتوانرێت بە قەبارەیەکی ئێجگار بچووک بەرهەم بهێنرێت کە تیایاندایە بە ئەندازەی سەرە دەرزییەک دەبێت بەڵام باشترین ئەندازە بەو پێیەی کە پاتریەک هەڵگرێت کە بۆماوەیەکی زۆر کاربکات ئەندازەی سەری دەنکە ئیسپرینێکە، ئەتوانرێت ئەم ئامێرە بخرێتە گیرفانی ئەو کەسەی کە پێویستە چاودێری بکرێت، ئەشتوانرێت لەشێوەی قوپچەیەکدا بکرێت بە جلوبەرگەوە هەندێ کەسیش هەن کە قووتی ئەدەن، ئەم ئامێرە کە بە (بالین) ناسراوە بەکارئەهێنرێت بۆ شوێنپێهەڵگرتنی ئەو کەسانەی کە جێگەی گومانن یاخود بۆ پاراستنی سەرچاوەیەک لەڕێگەی زانینی شوێنی بوونیەوە. مێژووی سوود وەرگرتن لە ئامێری (بالین) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ۱۹٦۸ کە لەسەرەتادا وەک ئامێرێکی دژە هەواڵگری بەسەرکەوتوویی بەکارهێنرا، کاتێک دەزگای هەواڵگری تورکیا تێبینی ئەوەی کرد کە ئیمرێ نابیتی کارمەند لە هاوپەیمانی ئەتڵەسیدا لە برۆکسل و کارمەندی گەورەی وەزارەتی دارایی لە تورکیا بە بەردەوامی لەدەرەوەی ئەنقەرەی پایتەخت بۆ شوێنێکی نادیار گەشتی دەکرد، بەچاودێریکردنی (نابیت) دەرکەوت کە کەسێکی شارەزایە لەخۆقوتارکردن لەو کەسانەی کە چاودێری ئەکەن بەبێ ئەوەی کەس هەستی پێبکات، کە دواجار ئامێری (بالین) یان لەناو جانتاکەیدا دانا و توانیان ئەو کەسە بدۆزنەوە کە پەیوەندی ئەکرد پێیانەوە دواتر دەرکەوت کە بەڵگەنامەی زۆر نهێنی و تایبەتی دەفرۆشت بە یەکیەتی سۆڤێت تا سەرئەنجام دەستگیرکرا.

پیاوانی دەزگای هەواڵگری بەشێوەیەکی گشتی سوود لە ئامێری دەنگ تۆمارکردن وەرئەگرن گەر بتوانن بەباشی لەناو ژوور یان ئۆتۆمبیل بیشارنەوە، بەڵام سیخوڕی لێهاتوو بەگشتی لەشوێنی نامۆی وەک ژووری هۆتێلەکان یان لەناو تەکسیدا قسەناکەن، وە ئەگەر بۆ ماوەیەک ئۆتۆمبیلەکانیان بەجێ بهێڵن پاش گەڕانەوەیان دەیپشکنن تا بزانن ئامێری دەنگ تۆمارکردنی تێدا دانەنراوە. لێکۆڵەران ئاماژە بەوە دەکەن کە جۆری زۆری ئامێری دەنگ تۆمارکردن هەیە لە بازاڕدا، ئەو کەسانەش کە

حەز بەم جۆرە ئامێرانە دەکەن ئەتوانن لەقەبارەی پاکەتی شقارتەوە دەستیان بکەوێت تا دەگاتە ئەندازەی پولێکی پۆستکردن، پەخش کردنی دەنگی ئەم ئامێرانەش لەسەر شەپۆلی مامناوەند و FM پەخش دەکرێت، ئەتوانرێت ئەم شەپۆلانە پەخش بکرێت بۆ هەر رادیۆیەک کە خێرایی لەرەلەرەکانی لەنێوان (٨٠) تا (١٠) بێت، بەناوبانگترین و سادەترین جۆری ئەم ئامێرانە ئەو جۆرەیە کە دەتوانێت لە مەودای (٢٠٠) تا (٣٠٠٠) دەنگ بگوازێتەوە، دەزگا هەواڵگریەکان هەوڵێکی زۆر ئەدەن کە بەشی گوێگرتن لە پەیوەندیە تەلەفونیەکان بە جۆرێک پێشبخەن کە بتوانێت هەرچییەک لە ژوورێکدا باس ئەکرێت بگوازێتەوە تەنانەت ئەگەر تەلەفونەکەش کوژاوە بێت[أ].

## سیخوڕ و میتۆدەکانی سیخوڕی

سیخوڕەکان بەگشتی بۆ دوو جۆر دابەش دەکرێن: ئەوانەی کە خۆیان زانیاری کۆدەکەنەوە و ئەوانەی کە خەڵکی تر تەجنید دەکەن بۆ کۆکردنەوەی زانیاری بۆ ئەوان. جۆری یەکەمیان بەزۆری پلانیان بۆ دارێژراوە و لەلایەن پلاندارێژەرەکەیەوە رێنمایی دەکرێت. ئەوەی تریان بەشێوەیەکی تایبەت لەژێر پیشەی شاراوەی وەک دبلۆماتکار، رۆژنامەڤان و خاوەن کاری بیانی کاردەکات. سیخوڕەکان بەزۆری لەگەڵ کۆکردنەوەی هەواڵگری نێونەتەوەییدا سەروکاریان هەیە. ئەوان بەشێوەیەکی تەقلیدی کاری وەک دزینی دیزاینی موشەک و بۆمب و کۆدی سەربازی بۆ وڵاتێک و پێدانی بەوی تر دەکەن. تەکنەلۆژیا و داتاکانی وەرگیراو لە رادار، کۆمپیوتەر، ئامێری لەم بابەتانە هەمیشە ئامانجی سیخوڕەکانە. تەنیا ئەوە بەس نییە سیخوڕەکان بتوانن زانیاری لەلایەن بەرامبەر بەدەست بهێنن، بەڵکو لەسەریشیان پێویستە سیخوڕی دەزگاکانی دوژمنیش بدۆزنەوە.

---

[أ] سیخوڕی و دژەسیخوڕی، بلید وفسکاو بلوخ، و. مەشخەل کەولۆسی، ناوەند و چاپ و پەخشی برایان، ٢٠٠٢

ئەو سیخوڕانەی لە فیلمەکاندا وێنا دەکرێن، بەشێوەیەکی تەقلیدی ناسنامەیەکی نهێنیی هەڵدەگرن ژیانی خۆیان ئەو ژیانە نییە کە لەسەر بنەمای درۆ و ماسک ڕۆنرابێت. پاڵنەری جیاواز کاری کردۆتەسەر کەسی جیاواز، وەک پارە، خۆشی، وڵاتپارێزیی. هەر بۆ نموونە، ڤلادیمێر پوتینی سەرۆکی هەنوکەی ڕووسیا وتی کە ویستی ناوبراو بۆ پەیوەندیکردن بە دەزگای هەواڵگریی وڵاتەکەی بۆ فیلمێک دەگەڕێتەوە بەناوی "شمشێر و قەڵغان"[i] کە لەساڵی ١٩٦٨ بینیویەتی، ناوەڕۆکی فیلمەکە باس لە دیمەنێکی ڕۆمانسی چەند هەواڵدۆزێکی هەواڵگری سۆڤیەت دەکات لە جەنگی جیهانیی دووەم. سەرباری ئەم فیلمەش، پوتین زۆر حەزی لە خوێندنەوەی بەسەرهاتی سەرکەشی هەواڵدۆزەکانی سۆڤیەت دەکرد.

باشترین جۆری سیخوڕ ئەوانەن کە دیار نین، ئەوانەی کە لێهاتوون لە تەجنیدکردنی مرۆڤ لە بارِ و ئاهەنگ، و دواتر بەستنی پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵیاندا. سیخوڕی باش ئەوانەن کە لێهاتوون لە چاودێری و شیکردنەوە و گرتنی وێنە. هەواڵدۆزی دووسەرە ئەو سیخوڕانەن کە بۆ هەردوولا کاردەکەن، بەزۆری وانیشان دەدەن کە سیخوڕی لایەنێکن بەڵام لەڕاستیدا بۆ هەردوولا کار دەکەن. سیخوڕی ناوخۆیی هەواڵدۆزی دووسەرەن کە ناسنامەیان زۆر نهێنییە و پێگەکەیان لەناو دەزگایەکدا وایان لێدەکات بە شاراوەیی بمێننەوە و لەکاتێکدا زانیاری دەزگاکەیان بە دوژمن بدەن.

جۆ *شارکی* لە ڕۆژنامەی نیۆیۆرک تایمز دەربارەی سیخوڕی ئەم سەردەمە نووسیویەتی، "سیخوڕی لەئێستادا بۆتە ئامرازێکی تری گەشتی بازرگانی، ئەمەش بەهۆی فراوانی و هەرزانی تەکنۆلۆژیا و گۆڕانی خێرای دۆخی جیهان و گەیشتن بەشوێنی ڕووداوەکان.

[i] *The Sword and the Shield*

## لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجە

ئەو زیندانیانەی بەتۆمەتی تاوانی گەورە بەند دەکرێن بەشێوەیەکی ئاسایی دەبردرێنە ژووری تاکەکەسیی، هەرگیز رووناکی کارەبایان لەسەر ناکوژێنرێتەوە و لەخەو بێ بەش دەکرێن. ئەم جۆرە تۆمەتبارانە لە زستاندا ئاوی ساردیان بەسەر جەستەدا دەکرێت و لە هاوینیشدا بە کەلەپچەکراوی و لەبەر گەرما مێشومەگەزی لێ کۆدەکرێتەوە. پاسەوانەکانی زیندان ئەنجامدەری سەرەکی ئەم جۆرە ئەشکەنجانەن، جاری وا هەیە ئەم ئەشکەنجەیە پێنج جار لە رۆژێکدا دووبارە دەکرێتەوە. لە گرتوخانەی سۆلۆڤەتسکی سۆڤیەتدا، جارەی واهەبوو بەندیەکەیان ناچار دەکرد لەسەر سەری پارچە ئاسنێکی عەمودئاسا دانیشێت بۆماوەی هەژدە کاتژمێر، هەرکە ماندوو بوایە ئیتر بە توندی لێیان دەدا.

لەهەوڵێکدا بۆئەوەی ناچاربکرێن دان بەتاوانەکەیاندا بنێن، زیندانیەکان بە چەقۆ ئازار دەدران، جگەرەیان بە جەستەیەوە دەکوژاندەوە، بەتوندی لێیان دەدان، و بە ئاوی بەفر ئەشکەنجەیان دەدان. تەنانەت چەند راپۆرتێک هەیە باس لەوە دەکەن کە زیندانییەکانی بەخێرایی چوار میل لەکاتژمێرێکدا بەدوای ئۆتۆمبیلەوە راکێشراون. زیندانیەکی پێشوو بە رۆژنامەی نیۆیۆرک تایمزی راگەیاند کە، "من خۆم بینیم چەند کەسێکیان بە قولابێکی ئاسنی ئاخنراو بەژێر پەراسووەکانی هەڵواسرابوو. من خۆن شوانێکی ئەڵمانیم بینی گۆشتی مرۆڤی زیندووی دەخوارد."

لە وەسفکردنی ئەشکەنجەی یەکێک لە بەرپرسانی هەواڵگریی لەساڵی ١٩٥١، مێژوونووسێکی رووسی بە رۆژنامەی لۆس ئەنجلۆس تایمزی راگەیاند، "لەوکاتەی هیچی لەبەردا نەبوو بە قامچی لێیاندەدا، و پاشان لە ژوورێکی ساردخانەدا دەیانهێشتەوە. تاکە خۆراکی رۆژانەی ئەو بریتیی بوو لە نان و پەرداخێک ئاو. وە بەدرێژایی رۆژ و شەو کەلەپچەکراو بوو. ئەو بۆماوەیەکی زۆر درێژ بەم شێوەیە هێڵرایەوە. بەڵام هیچ شتێکی واشوو نەکرد."

تەکنیکی ئەشکەنجەدانی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت بریتیی بوو لەوەی نەهێڵێت تۆمەتبارەکە بخەوێت. ئەوانەی بەم هۆیەوە شێت بوون، دەیانگواستنەوە بۆ ژوورێکی

بێدەنگ و قوفڵکراو کە هیچ کەسی بێزار نەکردبوایە. لەساڵانی چلەکاندا، سیخوڕی ئەڵمانی مارکوس وۆلف دەنووسێت: "بەشی لێکۆڵینەوە توندترین بەشی ناو هەواڵگریی بوو، و من هەرگیز نەمدەویست بکەومە ژێردەستی "دڕندەکانی" ئەم بەشە."

دەزگای هەواڵگری ناوەندی (CIA) تەنیا بەوە نەوەستا مەشقی هەواڵدۆزەکانی خۆی بدات بەوەی لەحاڵەتی دەستگیرکردنیاندا بتوانن بەرگەی ئەشکەنجە بگرن، بەڵکو هەڵسا بە دروستکردنی جۆرە حەبێکی کوشندە بەناوی "سیناید" کە هەموو هەواڵدۆزێکی بیانی بەزانیاری گرنگەوە هەڵی دەگرت، بەرلەوەی دەستگیر بکرێن یان لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکرێت یەکسەر خودکوژییان ئەنجامدەدا. هەروەها، چاوێلکەیەکیان دروست کرد کە بەهەمان ماددە ئاخنرابوو، بەرلە گیرانیان دەیانخوارد و دەمردن. دیلۆماتکارێکی سۆڤیەت کە کاری بۆ ئەمریکا دەکرد ئەم ماددەیەی خوارد کاتێک لەلایەن دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتەوە دەستگیرکرا، بەرلەوەی بەریبێتەوە گیانی لەدەستدا.

## میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی نەرم

دینا راستۆن لە رۆژنامەی واشنتۆن پۆستدا دەنووسێت: هەواڵدۆزی ئێف بی ئای بەناوی عەلی سوفیان، کە بەعەرەبیەکی پاراو دەدوێت، لێکۆڵەری زیندانیانی دەزگاکە بوو. ناوبراو تەکنیکی لێکۆڵینەوەی کۆنی ئێف بی ئای بەکارهێنا —بەتایبەتی بنیادنانی ژینگەیەکی هاوڕێیانە لەگەڵ گیراوەکەدا- بۆئەوەی زانیاری پێویست و کاریگەری هەواڵگریی بەدەست بهێنێت. با نموونەی کەیسی لێکۆڵینەوەی ئەبو جەمال، یەکێک لە پاسەوانە تایبەتییەکانی ئوسامە بن لادن، وەربگرین. سوفیان، کە لە یازدەی ئەیلولدا لە وڵاتی یەمەن بوو، چەند رۆژێک دوای هێرشەکان داوای لێکرا لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەبو جەمالدا بکات. سەرەتا ئەبوجەمال، کە بە باوکی "مردن" ناسرابوو، رەتیکردەوە راستەوخۆ قسە بۆ سۆفیان و هاوکارەکەی بکات. لەجیاتی

ئەوە ناویراو تەنیا ئەوکاتە وەڵامی پرسیارەکان دەداتەوە کە لەڕێگای پاسەوانی یەمەنیەوە بێت. سوفیان هەوڵی زۆریدا لەڕێگەی قسەی خۆشەوە قایلی بکات.[i]

"پاشان ئێوارەیەک سوفیان قاپێک شیرینی لەسەر مێزەکەی ئەبو جەمال دانا وەک ڕێگایەک بۆ خۆشیرینکردن و نیشاندانی ڕێز. بەڵام پیاوەکەی قاعیدە دەستی لە شیرینیەکە نەدا. دوای ئەوەی سوفیان بەوە دەزانێت کە ئەبو جەمال نەخۆشی شەکرەی هەیە، ئەوجارە دەچێتەوە لای و قاپێک لە کێکی بێ شەکری دەخاتە بەردەمی. ئەو بە ئەبو جەمال دەڵێت کە ئەو دەزانێت کە لەگەڵ شەکردا کێشەی هەیە، هەربۆیە هەندێ کێکی بێ شەکری بۆ هێناوە بۆئەوەی بیانخوات. سوفیان دەنووسێت، "بینیم ڕووخساری ئەبو جەمال سەرسوڕمانی پێوە دیار بوو. ئەو وافێرکرابوو کە جگە لە دڕندەیی هیچی تر لە ئەمریکییەکان چاوەڕوان نەکات، چ جار بگاتە ڕەفتاری بەبەزەیی. ناویراو هەستی بە شەرمەزاری کرد و بەهێواشی پێی وت "شکرا". لەژێر دابونەریتی ئیسلامیدا، ئەگەر کەسێک لەگەڵتدا بەبەزەیی بوو دەبێت تۆش سوپاسی بکەی، وە ئەبو جەمال لەبەر ئەوەی کەسێکی ئایینی بوو ئەم ئادابەی جێبەجێ کرد. ئێستا ئەو سەیری من دەکات نەوەک [پاسەوانێکی یەمەنی]، چاوەڕوانی پرسیاری داهاتوو دەکات." بەهۆی ئەم ڕەفتاری سوفیانەوە، ئەبو جەمال ناسنامەی حەوت لە ڕفێنەرانی هێرشەکانی یازدەی ئەیلولی ئاشکرا کرد، ئەمەش بووەهۆی ئەوەی ئەمریکا بەڵگەی کۆنکریتی هەبێت لەسەر ئەوە کە قاعیدە لەپشت هێرشەکانەوە بووە. کێکەکان هۆکار نەبوون، بەڵکو یەکێک لەو ڕێگایانە بوو سوفیان توانی بەهۆیەوە سەرکەوێت."[ii]

دوای شەش مانگ، سوفیان ڕووبەڕووی لێکۆڵینەوەی سیخوڕێکی تر بووەوە، ئەم جارە پیاوێک بوو بەناوی ئەبو زوبەیدە، کە گولەیەکی بەر کەوتبوو لەکاتی گیرانیدا و پاشان گواسترایەوە وڵاتێکی سێیەم بۆ لێکۆڵینەوە. هەرزوو دوای ئەوەی سوفیان

[i] Dina Temple-Raston, Washington Post, October ٢٨, ٢٠١١; Review of the Book: The Black Banners: The Inside Story of ٩/١١ and the War Against al-Qaeda by Ali H. Soufan and Daniel Freedman (Norton, ٢٠١١)

[ii] هەمان سەرچاوە

گەیشتە لای بۆ چاوپێکەوتن، بەندکراوەکە خۆیدایە دەست برینەکانیەوە و تووشی شۆک بوو. پلانەکە ئاوا بوو کە ناوبراو بەزیندووی بهێڵرێتەوە چونکە لەدەستدانی بەواتای لەدەستدانی سەرچاوەیەکی گرنگیی زانیاری دەهات. هەربۆیە، سوفیان و تیمەکەی بەپەلە ئەویان بۆچارەسەر گەیاندە نەخۆشخانە –بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان لە وڵاتی سێیەمدا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکرد (ناوەکەی دەبوایە بە نهێنی بمێنێتەوە)، گروپەکە دەبوایە لەژێر ناوی سەربازێکی بریندار ناوبراو بە کارمەندانی نەخۆشاخانە بناسێنێت.

سوفیان دەڵێت، "ئێمە نەماندەزانی کە بەمشێوەیە نەخۆشخانە بریندارەکە وەردەگرێت یان نا، و دەکرا ئەبو زوبەیدە لە هەر ساتێکدا گیانی لەدەست بدات. خەڵک سەیری دەکردین، بێگومان دەیانویست تێبگەن بۆچی ئەم سەربازانە سەربازێکی هاوڕێی خۆیان بە کەلەپچەکراوی لەسەر عارەبانەکەی داناوە و هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەن. دوای ئەوەی لەگەڵ پزیشکەکان قسەکرا، ئەبوزەبەیدە بەخێرایی بردرایە ژووری نەشتەرگەری. دوای چەند خولەکێک، پزیشکەکان دەستیان بە نەشتەرگەری کرد."

سوفیان بەدرێژایی چاکبوونەوەی ئەبو زوبەیدە هاوکارێکی باش بوو. ناوبراو چەندین هەفتەی یەکلەدوای یەک خواردنی پێدەدا و پاکی دەکردەوە. سوفیان دەنووسێت کە ئەو هاوڕێیەتیەی لەم ماوەیەدا پەرەی پێدا بووە هۆی ئەوەی ئەمریکا زانیاری گرنگی هەواڵگریی لە ئەبو زوبەیدە دەربهێنێت. لەکۆتاییدا، توانیان کەسێک ئاشکرا بکەن بەناوی موختار (ناوی راستەقینەی خالید شێخ موحەممەد بوو) کە ئەندازیاری هێرشەکانی یازدەی ئەیلول بوو. (بەرلە زانیارییە هەواڵگرییەکانی ئەبو زوبەیدە، ئێف بی ئای تەنانەت نەشی دەزانی کە موحەممەد ئەندامی رێکخراوی قاعیدەیە)[1]

جگە لە ئاشکراکردنی موحەممەد، ئەبو زوبەیدە زانیاریگەلێکی پێبەخشین کە بووە هۆی دەستگیرکردنی هاوڵاتی ئەمریکی خۆزێ پادیلا، کە دواتر بە پێدانی هاوکاری ماددی بە قاعیدە تۆمەتبارکرا. سوفیان دەنووسێت، هەموو ئەمانە بەهۆی تەکنیکی لێکۆڵینەوەی تەقلیدی نەرم ئەنجام دران. پاشان، هەرکە ئەبو زوبەیدە هەرچی هەیبوو

---

[1] هەمان سەرچاوە

بۆ سوفیانی دارِشت، ئیتر سی ئای ئەی هاتنەنێو مەسەلەکەوە. بەرپرسانی ئەو دەزگایە بە سوفیانیان راگەیاند کە "لەمەودوا واشنتۆن شتێکی نوێ دەکات لەکاتی لێکۆڵینەوەدا." دەزگای هەواڵگری ناوەندی و گرێبەستکارانی لەکۆتاییدا ٨٣ جار تەکنیکی ئاوپرژێنیان لەسەر ئەبو زوبەیدە تاقیکردەوە. ئەم ئەشکەنجەیە بەردەوام بوو تا ناوبراو دانی بەوەدانا کە ئەو سێیەم کەسی ناو قاعیدەبوو. لەڕاستیدا، ئەمە کاری ناوبراو نەبوو بەڵکو تەنیا چەند کەمپێکی مەشقی بۆ قاعیدە بەڕێوەبردووە بەڵام هەرگیز ئەندامی ئەو گروپە نەبووە. دەزگای هەواڵگری ناوەندی دواتر ئەوەی ئاشکرا کرد کە "تەکنیکی پێشکەوتووی لێکۆڵینەوە"ی ئەوان هۆکار بووە کە ئەبو زوبەیدە زانیاری گرنگ بدات دەربارەی موحەمەد و پادیلا. بەڵام سوفیان ئەمە رەتدەکاتەوە و دەڵێت ئەمە راست نییە. ئەو دەنووسێت، تەکنیکی ئاوپرژاندن لە یەکی ئابی ٢٠٠٢ دەستی پێکرد. پادیلا بەرلە چوار مانگ دەستگیرکرابوو، ٨ی ئایار، لە فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی شیکاگۆ ئۆهەیەر.[1]

## میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەی دژوار

بەگوێرەی گۆڤاری نیوزویک، تەکنیکی ئاوپرژێن توندترین میتۆدی لێکۆڵینەوەی توندە کە دەست بەسەر تەواوی ژینگەی گیراوەکەدا دەگرێت. بەپێی نامیلکەی دەزگای هەواڵگری ناوەندی بۆ لێکۆڵینەوە: "لێکۆڵەر دەتوانێت جیهانی بەندییەکە بەجۆرێک لێبکات کە بەهیچ پێوانەیەک وەک ئەوە نەبێت کە لێی راهاتووە، بەڵکو هەر خودی جیهانەکەش نامۆ دەبێت —لەم تەکنیکەدا گیراوەکە توانای دەرک کردن بە کات، شوێن، و فەزا و تێگەیشتن ناکات.

[1] *The Black Banners: The Inside Story of ٩/١١ and the War Against al-Qaeda* by Ali H. Soufan and Daniel Freedman (Norton, ٢٠١١)

وێنەیەکی کارتۆنیی، دەلالەت دەکات لە چۆنیەتی بەکارهێنانی میتۆدی لێکۆڵینەوەی توندی ئاپرژێن بۆ دەرهێنانی زانیاری هەواڵگری گرنگ لە سیخوڕێک یاخود تیرۆریستێک[i]

یەکێکی تر لە میتۆدە دژوارەکان بریتییە لە تەکنیکی "خەوزڕاندن" کە کەسی ئامانج دەخرێتە ژوورێک کە پلەی گەرمای بەرزی هەبێت و لە دۆخێکی پڕ لە سترێسدا بێت بۆماوەی چەند کاتژمێرێک، بگرە چەندین رۆژ ئەگەر ئامانجەکە خۆڕاگر بێت.

خالید المقتری، هاوڵاتی دەستگیرکراوی یەمەنی لە شاری فەللوجەی ئێراق لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ و لە ئەیلولی ٢٠٠٦ ئازادکرا، لە دوو زیندانی زۆر توندی ئەمریکیدا رووبەڕووی میتۆدی لێکۆڵینەوەی توند کراوە. لە گرتوخانەی ئەبوغرێبی ئێراق، ناوبراو هەموو جلەکانی لەبەر داکەنراو، بەئاوی زۆر سارد لە کەشوهەوایەکی ساردا هەڵواسرا. لە بنکەی ئاسمانی باگرام لە ئەفغانستان ناوبراو لە خەو و خۆراک بێبەشکرا، مۆسیقای بەدەنگی بەرز بۆ پێکرا و بۆماوەی چوار پێنج رۆژ لە تاریکیدا بوو لەوکاتەی ئەو مۆسیقایەی کە فیلمە ترسناکەکانەوە وەرگیرابوو دڵ و گوێی گۆش

---

[i] سەدان میتۆدی تری لێکۆڵینەوە هەیە، بەڵام بەهۆی هەستیاری بابەتەکە و دووربوونی هاوڵاتیان لە بەکارهێنانیان لە کۆمەڵگادا، ئێرە شوێنی باسکردنیان نییە.

کردبوو.(هەرکە دەتویست بخەویت ئەوان دەهاتن، بەتووندی لەدەرگایان دەدا. مۆسیقا و هاتوهاوارێک بوو هیچ کەس بەرگەی نەدەگرت).[1]

## کاریگەرییەکانی ئەشکەنجەی دەروونی

چەندین تەکنیکی لێکۆڵینەوەی گرتوخانەی گوانتانامۆ و شوێنەکانی تر بەتایبەتی دروستکرابوون بۆ دەستگرتن بەسەر لاوازییە دەروونییەکانی گرتووەکان. ئەم جۆرە تەکنیکانە بۆئەوە نەبوون جەستەی ئەمان "بشکێنن" بەڵکو زیاتر ئامانجیان ئەوە بوو کە هزر و مێشکیان "بشکێنن" یان قەناعەتیان پێ بهێنن قسە بۆ لێکۆڵەرەکان بکەن، لەوکاتەی هیچ نیشانەیەکی جەستەیی ئەشکەنجە بەجێ نەهێڵن. لەکاتێکدا چەندین میتۆدی ئەشکەنجەی دژوار هەیە کە نکۆڵی لە بوونیان ناکرێت، بەڵام بەتێڕامان لە مومارەسەی ئەشکەنجەی دژوار بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم تەکنیکە زۆرجار سەرکەوتوو نەبووە و کەسی وامەبووە بەرگەی گرتووە. لەم نووسینەدا دەمەوێت ئەو تێڕامانە پێچەوانە بکەمەوە، بەهۆی لێکۆڵینەوەی زانستیی و ئەو مێژووەی لەبەردەستمانە، کە پێمان وابووە میتۆدی لێکۆڵینەوەی دژوار هەمیشە سەرکەوتوو بووە بەڵکو ئەشکەنجەی دەروونی زیاتر کاریگەریی هەبووە. سەرەڕای ئەمەش، ئەم میتۆدە دەروونیانەش زۆرجار دەبنە هۆی وێرانکردنی کەسی بەئامانجگیراو؛ لەکۆتاییدا داننان بەو تاوانەی ئەنجامیانداوە.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە، ئایا تەکنیکی پێشکەوتووی لێکۆڵینەوەی گرتوخانەی گوانتانامۆ لە کوێوە هاتووە. لەساڵی ١٩٦٣دا، دەزگای هەواڵگری ناوەندی هەڵسا بەکۆکردنەوەی هەموو داتاکانی بەکارهێنانی ئەم جۆرە تەکنیکانە لەژێرناوی "لێکۆڵینەوەی دژەهەواڵگری کوباک" وەک نامیلکەیەکی رێنمایی بۆ کارمەندانی ئەم بوارە چاپکرد. سوپای ئەمریکا زانیارییەکانی ناو ئەم نامیلکەیەی بەکارهێنا بۆ داهێنانی بەرنامەیەک بەئامانجی مەشقپێدانی ئەندامانی سوپاکەی بۆئەوەی بەرگەی

[1] Amnesty International "The Case of Khaled al-Maqtari," March ١٣, ٢٠٠٨; Washington Post, March ١٥, ٢٠٠٨

تەکنیکەکانی کوبارک بگرن، لەوکاتەی دەگیرێن یان ئەشکەنجە دەدرێن، بۆئەوەی دوور بن لە دانپیانانی هەڵە.

لەساڵی ۲۰۰۲، دکتۆر بروس جێسین، یەکێک لە ئەندامانی دەروونی بەرنامەکەی سوپای ئەمریکا بۆ لێکۆڵینەوە، کاری لەسەر ئەوە کرد چۆن بتوانن ئەو ئەشکەنجە دژوارە بگۆڕن بۆ شێوەگەلێکی ئەشکەنجەی دەروونی لەلایەن لێکۆڵەرەوانی گرتوخانەی گوانتانامۆ بۆسەر گرتوەکان.[i] مەشقەکانی بەرنامەکە پێک دێن لە ناوپرژێن، خەوزڕاندن، پەراوێزخستن، دانان لە شوێنی پڕلە فشاری دەروونی، هەڵواسین، مۆسیقای بەرز و رووناکی زۆر، مامەڵەکردن لەگەڵ گرتووەکان وەک ئاژەڵ، دانانیان لەبەر پلەیەکی بەرزی گەرما، و رووتکردنەوەی بەزۆر.[ii] یەکێک لەو هۆکارانەی کە بۆچی ئەم بابەتە هەردەم جێگای گفتوگۆیە ئەوەیە کە مەترسییەکانی نێوان پەرینەوە لە هێڵی نێوان تەنیا پرسیارکردن و ئەنجامدانی ئەشکەنجە زۆر بەرزە.

دکتۆر فرانک سەمەرز، شارەزا لەبواری دەروونی و کاریگەرییەکانی سۆزداری لەسەر مرۆڤ، لەم بارەوە دەنووسێت، "ئەشکەنجەی دەروونیش، هەروەک ئەشکەنجەی جەستە، لە کاریگەریی درێژخایەنی کەسی لێ بەکارهێنراودا تەنانەت خەراپتریشە چونکە ئەگەر کەسێک قاچت بشکێنێت یان قۆڵت بشکێنێت، ئەمە چاک دەبێتەوە. بەڵام ئەگەر کەسێک مێشکت بشکێنێت، دەکرێت هەرگیز نەهێتەوە باری پێشووی."[iii]

کاریگەرییەکانی تەکنیکی لێکۆڵینەوە کە هیچ زامێکی جەستەیی بەدوای خۆیدا ناهێڵێت پێویستی بە روونکردنەوەی زیاتر هەیە. لەهەندێک بارودۆخدا، تەکنیکی ناجەستەیی دەکرێت بۆ ئاستی ئەشکەنجە بەرزبێتەوە، بەپێی یاسا ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان. سەرەڕای ئەمەش، بۆ ئەو دەروونناسانەی کە لەگەڵ رزگاریوانی

---

[i] Basoglu, M. et al. "Psychological effects of torture: a comparison of tortured with nontortured political activists in Turkey." *American Journal of Psychiatry* ۱۵۱ (۱۹۹٤): ۷٦.

[ii] Senate Committee on Armed Services, *Inquiry into the Treatment of Detainees*, xiii.

[iii] Telephone Interview with Frank Summers, Ph.D., Training and Supervising Analyst, Chicago Institute for Psychoanalysis (Feb. ۲٥, ۲۰۱۰).

ئەشکەنجە کاردەکەن، نیگەرانی هەرەسەرەکی ئەوان ئەوەنییە بگەن بە دەرچەیەکی یاسایی دەربارەی ئەشکەنجەی نەخۆشەکانیان بەڵکو بۆئەوەیە تێبگەن و چارەسەری ئەو بارە دەروونییە بکەن کە بەهۆی ئەو جۆرە تەکنیکانەوە تووشی بوون. لێکۆلینەوەکان دەربارەی قوربانیانی ئەشکەنجە ئەوە نیشاندەدەن کە تەکنیکەکانی وەک زەبوونی سێکسی دەکرێت ببێتە هۆی ئازارێکی دەروونی زۆر قووڵ. قوربانیانی ئەشکەنجەی دەروونی هەمان ئاستی ئازارمان نیشاندەدەن کە ئامانجێکی ئەشکەنجەی جەستەیی تووشی بووە، وە بەدرێژایی زەمەن هەردووکیان زەرەرمەندی یەکسانی تەندروستین. لەڕاستیدا، توێژینەوەیەک لەم دواییانە ئەوەی دەرخست کە "بەرکەوتوانی دەروونی بەئاسانی جیاناکرێنەوە لە بەرکەوتوانی ئەشکەنجەی جەستەیی."[i] ئەشکەنجەی دەروونی کاریگەرییەکی قوڵی هەیە بۆسەر تەندروستی مرۆڤ، وەک ئەشکەنجە دەروونییەکانی ناڕێکی فشاری دوای بەڵایەک، خەمۆکی، و دڵەڕاوکێ. بەزیاتر قووڵبوونەوە و روونکردنەوەی ئەو هەڕەشە تووندە کە ئاستی فشاری ئاستبەرز دەبێتە هۆی تێکدانی سیستەمی دەمارەکان و هەناسە و هاتووچۆی خوێن، دکتۆر رۆنا فیلدس، دەروونناسی شارەزا لە تیرۆریزم و توندئاژۆیی، دەنووسێت: "چیتر هیچ بنەمایەک نییە بۆ مشتومڕکردن لەسەر ئەوەی بەکارهێنانی ئەم جۆرە تەکنیکانە نە ئۆرگانەکانی مرۆڤ تێکدەدەن و نە خودی ژیانیش دەخەنە مەترسییەوە."[ii]

## ئەشکەنجەی دەروونی چۆن کاردەکات؟

ئەشکەنجەی دەروونی دەبێتە هۆی تێکشکاندنی مێشکی مرۆڤ لەڕێگەی هێرشێکی بەهێزەوە بۆسەر سیستەمی کارکردنی مێشک.[iii] دەروونناسەکان بەم جۆرە حاڵەتانە دەڵێن " homeostasis"، کە مەبەست لێی ئاماژەدانە بە توانای ئۆرگانیزمێک بۆ رێکخستنی ناوەخۆیی بەئامانجی بەردەوامیدانی بە هاوسەنگیەکی جێگری لە وەڵامی

[i] Basoglu, "Torture vs Other Cruel, Inhuman, and Degrading Treatment," ٢٨٣.
[ii] Fields, "Neurobiological Consequences of Psychological Torture," ١٥٣.
[iii] Jacobs, "Documenting the Neurobiology of Psychological Torture," ١٦٥–٦٧.

گۆڕانی دەرەکیدا. لەژێر دۆخی ئاساییدا، کەسێک دەتوانێت وەڵامی ئەم جۆرە بەرکەوتنە بەهۆی ماوەی ئەو ڕێکخستنانە بداتەوە. سەرەڕای ئەمەش، ئەو فشارەی لە ئەشکەنجەدا بەکارهاتووە، بە ئەشکەنجەی دەروونیشەوە، ئامانج لێی ئەوەیە هانی "ئاستێکی بەرزی شلەژانی دەروونی بدات بەبێ کردەیەکی گونجاو کە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەم ڕێکخستنە."

هەرچەندە ئەم جۆرە ڕێکخستن و ڕزگابوونە دەروونیانە لە چەمکدا ئەبستراکتن، بەڵام لە بەکارهێنانیاندا زۆر کۆنکریتین. چونکە تەکنیکەکانی ئەشکەنجەدان ڕێگا بەپێداویستی جیاوازی قوربانیەکان نادەن. دکتۆر یو جەیکوب، نیورۆسایکلۆجیست و شارەزا لە بواری کاریگەریی تەندروستی دەروونی، دوو نموونە دەهێنێتەوە.[i] یەکەم، هەموو مرۆڤێک پێویستی بە هاندەری گۆڕانکاری بەردەوام هەیە. کاتێک مرۆڤێک دەخرێتەژێر ژینگەیەکی تەواو دەستکرددا کە ڕێ لە هەموو ئەو هاندەرانە دەگرێت، لەڕێگای تەکنیکێک کە پێی دەوترێت بێبەشکردنی هەستیی، تەواوی سیستەمی خۆشانی مرۆڤ تێکدەچێت. بۆپڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە، کەسەکە هەڵدەستێت بە داهێنانی پاڵنەرێک. لەماوەی تەنیا چەند کاتژمێرێکی کەمی بێبەشکردنی هەستییدا، قوربانییەکان ئەزموونی وڕێنەکردن و چەند نیشانەیەکی تری دەروونی دەکەن.

دووەم، لەلایەکی ترەوە، کاتێک مرۆڤ نەیتوانی بەرگەی ئەو ئەشکەنجە دەروونییە بگرێت، سیستەمی بەرگریی مرۆڤ بەشێوەیەک کاردەکات کە فشارە دەروونییەکان کەمبکاتەوە لەسەر مێشک.

### کاریگەرییەکانی توانای مێشک و نیرۆلۆژی ئەشکەنجەی دەروونی

بەشێوەیەکی گشتی، تەکنیکە پێشکەوتووەکانی لێکۆڵینەوەی دەزگای هەواڵگری ناوەندی بەڕێژەیەکی زۆر بەرز دەبێتە هۆی خەمۆکی، فشاری دەروونی و دڵەڕاوکێ. با سەرەتا نووستن وەک نموونە وەربگرین کە ڕۆڵێکی مەزن دەگێڕێت لە

---

[i] Jacobs, Uwe. "Documenting the Neurobiology of Osychological Torture: Conceptual and Neurobiological Observations." In *The Trauma of Psychological Torture*, edited by Almarendo E. Ojeda, ١٦٣. Westport, CT: Praeger, ٢٠٠٨.

بەرەوپێشچوونی توانای مێشک، بەتایبەتی لە یادگە، فێربوون، و بیرکردنەوەی لۆژیکی، دەربڕینی نادروست، و بڕیاردان.[i] لەڕووی رەفتاریشەوە، خەوزڕاندنیش دەبێتە هۆی گۆڕینی سروشتی مرۆڤ لەڕووی دەروونییەوە.[ii]

هەروەها، زەبوونی سێکسیش، وەک ناچارکردنی زیندانییەکان بۆ پۆشینی جلی ژێرەوەی ئافرەتان بەسەر سەریەوە، پەیوەندییەکی زۆر قووڵی هەیە لەگەڵ خەمۆکی، خەوی ناخۆش، و هاتنەوە بیری یادگاری ناخۆش. دکتۆر ویلسن ئەم حاڵەتە بە "ڕووخانی تەواوی دەروون و لەدەستدانی خودبەڕدەوامی" وەسف دەکات.[iii]

بەرکەوتنی هەستەوەری، لەڕێگای دەنگەدەنگ و ڕووناکی ڕاستەوخۆ، دەبێتەهۆی دروستبوونی جۆرە وەڵامێکی وا سەیر کە هەموو هۆرمۆنەکانی فشار و ئازار و کیمیایی لە مێشکدا دەربدات، کە بەتێپەڕبوونی کات وا لە قوربانییەکە دەکات لەناو واقیعیەت دەرچێت و بەتەواوی رێکخستنی بیرکردنەوە لەدەست بدات. ئەم تەکنیکە بەشێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ خەوزڕاندندا بەکاردێت، کە ئەمەش زیاتر توانای مێشک ئازار دەدات. هەروەک دکتۆر جودی ئۆکاوا، دەروونناس و پسپۆڕی ڕزگاربوون لە ترۆما بەم شێوەیە ئەم کاریگەرییانە وەسف دەکات: "خەڵک لەژێر ئەم بەرکەوتنە هەستەوەرییەدا دەشکێت؛ سیستەمی دەماریی ناتوانێت بەرگەی هێزەکەی بگرێت."[iv]

پەراوێزخستن و پچڕاندنی هەستەوەریی دەبنە هۆکاری ئازاری دەروونیی. ئەم جۆرە تەکنیکانە هەمیشە پشت بە خودی لێکۆڵەرەوەکە دەبەستێت، چونکە قوربانییەکە خوا خوایەتی قسەلەگەڵ مرۆڤێک بکات. دکتۆر ئۆکاوا بەم شێوەیە باس لە

---

[i] Kim, "Effect of Total Sleep Deprivation," ١٢٧.

[ii] Billiard, "Is insomnia best categorized as a symptom or a disease?" S٣٥; Breslau, "Sleep disturbance," ٤١١.

[iii] Wilson, J. P. *Trauma, Transformation, and Healing: an integrative approach to theory, research, and post-traumatic therapy*. New York: Brunner/Mazel, ١٩٨٩.

[iv] Silcove et al. "The impact of torture on post-traumatic stress symptoms in war-afflicted Tamil refugees and immigrants." *Comparative Psychiatry* ٤٣ (٢٠٠٢): ٤٩.

بەسەرهاتی نەخۆشێکی خۆی دەکات کە بۆماوەی درێژ لە وڵاتی کێنیا تووشی پەراوێزخستنی دەروونی کرابوو:

> ئەو هەر دەیویست گوێبیستی دەنگی پاسەوانی زیندانەکە بێت —ئەو رۆژانە تەنیا یەک جار خواردنی پێدەدرا، کە پێکهاتبوو لە برێکی کەم لە دانەوێڵە و شۆرباێ کە دواتر رەتیکردەوە لە ژەمی بەیانیدا دانەوێلەکە بخوات، چونکە دەیویست پاسەوانەکە هەر هیچ نەبێت سزایەکی بدات.

پەراوێزخستن و بێبەشکردنی هەستەوەریی هۆکارێکی گرنگ بۆ تووش بوون بە دڵەڕاوکێ، وڕێنە (نەتوانیی بیرکردنەوە و چڕکردنەوەی بیر)، گرفتی دەروون جەستەیی، نارێکی دەروونی. هەموو ئەمانە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، نارێکی سیستەمی دەمار، هەڵئاوسانی بەرگریی دەروونی.
لەکۆتاییدا، ماوەتەوە بڵێین کە نیرۆبایۆلۆجیستەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە تەکنیکەکانی ئەشکەنجەی دەروونی کەریگەرییان هەیە بۆسەر بایۆلۆژیای مێشکی مرۆڤ. ئەم تەکنیکە بەناو "نا-زامدارانە" دەکرێت ببنە هۆی لەدەستدانی مێشک، بەهۆی دووبارە رێکخستنەوەی خانەکانی مێشکەوە. هەروەها، هۆکارێکیشن بۆ بەرهەمهێنانی شەپۆلێکی هێواشی نائاسایی چالاکی مێشک. هەروەها، لێکۆڵەران گەیشتوونەتە ئەو دەرئەنجامەش کە ئەم جۆرە تەکنیکانە دەبنە هۆی لەدەستدانی یادگەی مرۆڤ و سیستەمە درێژخایەنەکەی.[i]

ئەشکەنجەی دەروونی لە چەندین تایبەتمەندیدا هاوبەشە لەگەڵ ئەشکەنجەی جەستەییدا. هەروەک پرۆفیسۆر ئەلمێریندۆ تۆژیدا روونی دەکاتەوە، لە سیاسەتی فشاری دەروونیدا، ئەشکەنجەی دەروونی تەنیا نەبەستراوەتەوە بە خودی تەکنیکە دەروونییەکە، "بەڵکو لاوازکردنی دەروونیش کە ئەم تەکنیکانە لەسەر قوربانییەکە جێی دەهێڵن." سەرەڕای ئەمەش، "هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە وەستانی

[i] Catani, "Tortured Brain," ١٨٠–٨٤; Fields, "Neurobiological Consequences of Psychological Torture," ١٤٦–٥٤.

درێژخایەن، چۆکدادان، کرنۆشبردن ئازار بە جەستە دەگەیەنن، بەشێوەیەک کە دەکرێت وەک ئەشکەنجەی دەروونی سەیر بکرێت."[i] هەردوو ئەشکەنجەی دەروونی و جەستەیی دەکرێت ببنە هۆکاری نەخۆشی دەروونی، وەک نیگەرانی و خەمۆکیی. وە، هەروەک دکتۆر فیلدز دەریدەخات: "ئەشکەنجە، جا چ لەڕێگای ئامرازی جەستەییەوە بێت وەک لێدان، یان لەڕێگای دەروونییەوە بێت، دەبێتە هۆی تێکچوونی مێشک لە هەردوو باری دەروونی و جەستەییدا. تەنانەت کار گەیشتۆتە ئەوەی توێژەران هیچ جیاوازییەک ناکەن لەنێوان ئەشکەنجەی دەروونی و جەستەیی لەڕووی زامداربوون و چارەسەرکردنییەوە."[ii]

## ئامرازی پەیوەندی سیخوڕ

"ستیگانۆگرافی" میتۆدێکە بۆ شاردنەوەی پەیام لەنێو چەند بەڵگەنامەیەکدا. ئەم میتۆدە سوودێکی تایبەتی هەیە بۆ سەردەمی ئینتەرنێت. لەکۆندا پەیامەکان لەنێو هێڵی نووسیندا دەنێران، بەتایبەتی لەنێو هێڵی گۆڤارەکاندا، لەڕێگای هەڵمی لێزەرەوە کە بتوانرێت لەڕێگەی وردبینێکی بەهێزەوە بخوێنرێتەوە. لە نوسخەیەکی گۆڤاری ناشنال جوگرافیدا لەساڵی ١٩٨٣ پەیامێک لەسەر ڕۆخی ڕیکلامێکی بازرگانی نووسرابوو کە تیایدا نووسرابوو: "تەنیا دە خولەک بووەستە... نوێنەرەکەمان دەڵێت..." پەیامەکە لەلایەن سیخوڕێکی ئەمریکی لە نووسینگەیەکی هەواڵگری سۆڤیەت درایە هەواڵدۆزێک. سیخوڕەکە ژمارەیەکی زۆر لە ڕاپۆرتی چەک و پلانی سەربازی دایە سۆڤیەت تا ئەوکاتەی ئاشکرا بوو و لەساڵی ١٩٨٦ بەسزای مردن گەیەنرا.

ژمارەیەکی بەرچاوی هەواڵدۆزی ئەمریکا بەهۆی بەکارهێنانی گیرەی کاغەزەوە فێڵیان لێکرا. بەڵگەنامەکانی فەرمی سۆڤیەت بە گیرەیەکی کاغەزی ئاساییەوە بەیەک

i Ojeda, "What Is Psychological Torture," ٣-٤.

ii Physicians for Human Rights and Human Rights First. "Leave No Marks: Enhanced Interrogation Techniques and the Risk of Criminality(٢٠٠٧)."http://physiciansforhumanrights.org/library/report-٢٠٠٧-٠٨-٠٢.html.

بەسترابوونەوە کە بووە هۆی جێهێشتنی نیشانەی ژەنگ لەسەر کاغەزەکان.
هەواڵدۆزێکی دەزگاکە بە ئاژانسەکانی ئەسۆشیەیتد پریسی راگەیاند کە "سەدان هەواڵدۆز بەم رێگەیە دەستگیرکران."
هەندێجار سیخوڕەکان مەرەکەبی نادیار بەکاردەهێنن. پەیامەکان لەسەر کاغەز یان پارچە قوماشێک دەنووسران و دواتر بەهۆی گیراوەیەکی کیمیایی ئاشکرا دەکران. گەنجەکان لەکۆندا بەبێ هیچ گیراوەیەکی کیمیایی و تەنیا بە بەکارهێنانی گیراوەی لیمۆ دەیانتوانی مەرەکەبی نادیار دروست بکەن. دەزگای هەواڵگری ناوەندیی (CIA) جۆرە کاغەزێکی بەرهەمهێنا کە بەخێرایی لە ئاودا بتوێتەوە بۆئەوەی سیخوڕەکان پەیام بخوێننەوە و یەکسەر لەناوی بەرن.

## شیفرە و شکاندنی شیفرە

شیفرەکان تەنیا بەشێکی دانەبڕاوی نێوان سیخوڕەکان نین بەڵکو بەشەکانی تریش —سەربازی، دیبلۆماتکارەکان و پیشەسازی– سوودی زۆری لێ وەردەگرن بەشێوەیەک کە دەبێت ناوەڕۆکی ئەو پەیوەندییانە بەنهێنی بهێڵنەوە. شکاندنی شیفرە یان دۆزینەوەی سەرچاوەیەک بۆ ئاشکراکردنی نهێنی شیفرە یەکێک بووە لە کودەتا هەرەمەزنەکانی بواری هونەری سیخوڕی.
پرۆژەی ڤینۆنای ئەمریکی بۆ شکاندنی شیفرە هاوکار بوو لە ئاشکراکردنی چەند نهێنییەکی مەزن. ڤینۆنا ئامێرێکی نووسینی سۆڤیەتی بوو کە شیفرەی لە شێوازی ژمارەدا بەرهەم دەهێنا. شیفرەشکێنەکانی ئەمریکا توانیان بەهۆی دۆزینەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ژمارە شەش کە لەوێوە دەهات، بشکێنن.
لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا، نازییەکان پەیامی نهێنییان نارد دەربارەی شوێنی کەشتیگەلی دەریایی و پێگە بەرگرییەکانیان لەڕێگەی ئامێری ئێنیگماوە، کە ئامێرێکی تایبەت بوو لە شکاندنی شیفرە کە وەک ئامێرێکی نووسینی وابوو، دەیتوانی پەیامەکان بە ٢٠٠ ترلیۆن شێوازی جیاجیا لەڕێگای سیستەمێکی میکانیکی و ئەلیکترۆنی بنێرێت. بەریتانییەکان توانیان شیفرەکە بەهۆی زانیارییەکی بچووکی

هەڵەی مرۆیی بشکێنن و بەم چەشنەش هاوپەیمانەکان توانیان بەئاسانی ئەو پەیامانە بخوێننەوە کە لێیەوە دەنێردران.

ئەڵمانەکان پێیان وابوو ئامێری ئێنیگما ئامێرێکە هیچ کەس ناتوانێت بیشکێنێت و بەشێوەیەکی ئازادانە پەیامی رادیۆییان دەنارد کە هاوپەیمانەکان توانیان چاودێری بکەن لەجیاتی هێڵی تەلەفۆن و کێبلی گەیاندن، کە هەردووکیان تاڕادەیەکی بەرچاو چاودێریکردنیان ئەستەمتر بوو. زیانی هاوپەیمانان لە ٤٣٢ هەزار تۆن لە حەزیرانی ١٩٤١ کەم بووەوە بۆ ١٢ هەزار و سەد تۆن لە تەمموز، ئەمەش دوای ئەوە هات بەریتانییەکان توانیان شیفرەی ئامێری ئێنیگما بشکێنن.

دوو ئەفسەری ئەڵمانیای نازی خەریکی شیفرەدارکردنی پەیامن لەڕێگەی ئامێری ئێنیگماوە

## زانیاری هەڵە و تێکدان

زانیاری هەڵە ئەو پرۆسەیە کە وڵاتێک بە ئەنقەست دەنگۆیەک لە میدیا بڵاودەکاتەوە بەمەبەستی زیانگەیاندن بە دوژمنێک. هەردوو دەزگای هەواڵگری ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت وزەیەکی زۆریان سەرفکرد لە داڕشتنی پلانی لەم جۆرە لەماوەی جەنگی سارددا. بۆ روونکردنەوەی ئەوەی کە پرۆسەکە چۆن کاری دەکرد، یەکێک لە ئەفسەرانی پێشووی هەواڵگریی بە ئاژانسی رۆیتەرزی رایگەیاند، "تۆ دەبوایە هەوڵبدەی و رۆژنامەڤانێک تەجنید بکەی و بەمەش ئەو کەسە دەبووە هەواڵدۆزی کاریگەریی."[1] رۆژنامەڤانە بیانییەکە پاری پێدرا یان بەهۆی رقەوە لەدژی رژێمێک کارەکە دەکات و "بەمەش جۆرە ئەدەبیاتێک دەخاتەناو رۆژنامەکانەوە کە لەبەرژەوەندی تۆدا بێت."

دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت چەند بابەتێکی لە میدیادا وروژاند کە سی ئای ئەی خەریکی فرۆشتنی پارچەی جەستەی مرۆڤە و تاقیکردنەوەی نهێنی ئەنجامداوە بە ڤایرۆسی (HIV) کە بۆتە هۆی پەتای ئایدز لە ئەفریقیا. دەزگای هەواڵگری ناوەندیش لەم جۆرە کارانە بێ بەری نەبوو، چەندین بابەتیان لە رۆژنامەکانی کابولی ئەفغانستاندا بڵاوکردەوە لەماوەی جەنگی نێوان سوپای ئەو وڵاتە و سۆڤیەت.

لەسەرەتای ساڵی ۲۰۰۰دا، ئاشکرا بوو کە ئەمریکا جۆرە بەرنامەیەکی پڕ لە ئامێری سیخوڕی بە سۆڤیەت فرۆشتبوو بەمەبەستی تێکدانی تەکنەلۆژیا و ئابووری ئەو وڵاتە. بەرنامەی کۆمپیوتەرییەکە بۆ هێڵی بۆڕی غازی سروشتی سیبیریا بەکارهات کە بووە هۆی تەقینەوەیەکی مەزن لە هاوینی ۱۹۸۲. ئامانج لەمەدا تەنیا ئەوە بوو زیان بە ئابووری سۆڤیەت بگەیەنن و رووخانی رژێمی سۆڤیەت خێرا بکەن. تۆماس رید، ئەفسەری پێشووی هێزە ئاسمانییەکانی ئەمریکا، لە پەرتووکەکەدا لەژێر ناونیشانی (مێژووی ناوەوەی جەنگی سارد) دەنووسێت: "بۆ لەکارخستنی غازی سۆڤیەت، بەدەستهێنانی ئەو پارە زۆرە لە رۆژئاواوە، و تێکدانی ئابووری ناوەخۆی رووسیا، ئەو بەرنامەی کۆمپیوتەرییەی هێڵی بۆڕی، پەمپ، تۆرابین و وەلڤەکانی

دەجوولاند، وارێکخرابوو کە بەرگەی خێراییەکی سنووردار بگرێت، هەرکە لە خێراییەکەی دەرچوو، ئیتر تەقینەوەیەکی مەزن دروست بکات."

## کامێرای سیخوڕی

کامێرای سیخوڕی لەئێستادا بەشێوەیەکی وابچووک دروستکراوە کە بتوانرێت لەنێو قۆپچەی چاکەتێکدا بچێنرێت و بەشێوەیەکە کە دەتوانرێت بەئاسانی بخرێتە نێو دیوارەوە. مێژووی ئەم جۆرە کامێرانە بگرە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵی ١٨٨٥، و لە جەنگی جیهانیی یەکەمیشدا کامێرا لەسەر پشتی کۆتری نامەبەردا بۆمەبەستی سیخوڕی دانرا. دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەم جۆرە تەکنیکەی لەساڵانی حەفتاکاندا پەیڕەو کرد.

ئەم جۆرە کامێرانە بەشێوەیەکی ئاسایی لەناو چەرخی جگارەکێشان، گۆپاڵ، شقارتە، تەکەی جگەرە، پاکەتی جگەرە، دەمبوسی بۆینباغ، پەرتووک، کاتژمێری گیرفان، و پێنووسدا دادەنرێت. دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB) توانی جۆرە کامێرایەک بە لێنزەوە دابهێنێت کە قەبارەکەی ئەوەندە بوو دەچوو ناو ئەنگوستیلەیەک. کامێرای مینۆکس یەکێک بوو لە گرنگترین ئەو بەرهەمانەی دروستی دەکرد. ئەم جۆرە کامێرایە توانای ئەوەی هەبوو ٤٤ وێنەی روون بگرێت. لەم سەردەمەدا، هەردوو دەزگای هەواڵگری ناوەندی و رووسیا توانیویانە جۆرە کامێرایەک بەرهەم بهێنن کە توانای بینینی ڤایرۆسی مەمکی ئافرەتیان هەبێت!

## سیخوڕی لە ئەورووپا

سەرەڕای باڵادەستی هەردوو دەزگای هەواڵگری ئەمریکا و سۆڤیەت (ئێستاش رووسیا) بەسەر رۆڵی یاری سیخوڕی و بەشەکانیدا، کەچی دەزگا هەواڵگریە ئەورووپیەکانیش رۆڵی هاوبەشێکی دڵسۆزیان هەبوو لەو سیخوڕی و دژەسیخوڕیەی جیهانی تەنیبوو. بەریتانیا بەتەنها خۆی پەیوەندییەکی باشی هەبوو لەگەڵ ئەمریکادا لەم بوارە. ئەوەبوو هەردوولا لەساڵی ١٩٤٧ پرۆتۆکۆلێکیان واژوو کرد سەبارەت بە ئاڵوگۆڕکردنی

ئەو نامانەی لەرێی بێتەڵەوە وەردەگیرێن و هاوکاری یەکتریش دەکەن بۆ شیکردنەوەی شیفرەکانیان. هەروەها، هەردوولا رێکەوتن لەسەر بەستنەوەی ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکی لە واشنتۆن بە ناوەندی پەیوەندی حکومی بەریتانی لە شێلتنگهام، ئەمەش بەهۆی بێتەڵێکەوە دەبێت کە هەمیشە لەکاردا دەبێت بۆئەوەی خێراییەک بدرێتە پرۆسەی گۆرینەوەی نامەکان لەسەر تەرزی ئەم پرۆتۆکۆڵە هەریەک لە وڵاتانی ئوسترالیا، کەنەدا، و نیوزلەندا و سەرجەم وڵاتە بەژدارەکانی پەیمانی ناتۆ هەڵسان بە واژووکردنی پرۆتۆکۆلێک سەبارەت بە ئاڵوگۆرکردنی زانیاری سیخوری و قەڵاچۆکردنی پرۆسەکانی چالاکی سیخوری سۆڤیەت. ئەمریکا رۆڵێکی مەزنی هەبوو لە وەرگرتنی زانیاری و پەیامی بێتەڵی ئاڵوگۆرکراو لەنێوان دەوڵەتانی سەربە بلۆکی کۆمۆنیستی بەهۆی مانگی دەستکردەوە. مانگە دەستکردەکانی ئەمریکا بەجۆرێک پێشکەوتوو بوون کە توانایان هەبوو گفتوگۆ تەلەفۆنییەکانی رابەرانی سۆڤیەت وەربگرن، لەکاتێکدا بە ئۆتۆمبیلی دیبلۆماسی هاتوچۆیان دەکرد، ئەو ئۆتۆمێبیلانەی ئامێری تەلەفۆنی بێتەلی تێدایە.

بەرلە رۆڵە گرنگەی ئەمریکا لە بواری سیخوریکردندا، بەریتانییەکان خاڵی پرشنگداریان تۆمارکردووە لە بواری سیخوری و زانیارییدا، ناوەندی پەیوەندییە حکومییە بەریتانییەکان لە هۆنگ کۆنگ وەک نموونە، زانیاری زۆر سوودبەخش و بەکەڵکی دایە ئەمریکا لە ساتەوەختی جەنگەکانی ڤێتنامدا. هەروەها ناوەندێکی تریش کارئاسانی بۆ واشنتۆن دەکات لەپێناو پەرەپێدانی بەکارەکانی ئاژانسی ئاسایشی نیستیمانی ئەمریکا و بنکە سیخوریەکەی لەسەر تەپۆلکەی مینوسی سەربە کەرتی یۆرکشایەری بەریتانیدا. هەندێک لە پسپۆران پێیان وایە ئەو بنکەیە زەبەلاحترین بنکەیە لە هەموو جیهاندا. هیچ بوارێکیش نییە بۆ بەراوردکردنی لەگەڵ بنکەی سۆڤیەتیدا. شایانی باسە کە بنکەی مینوسی ئەمریکی راستەوخۆ بەستراوەتەوە بە هێڵەکانی تەلەفۆنی بەریتانیاوە، ئەمەش بەواتای مسۆگەرکردنی زیاترین زانیاری و پەیامی هاتووی ئەلیکترۆنی و بێ تەل دێت لە سەرتاسەری ئەورووپادا. یەکێک لە توێژەرانی ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی لە کۆتایی حەفتاکاندا

دەربارەی بنکەی مینوس دەڵێت، "بنکەیەکی گوێهەڵخستنی زەبەلاحە توانای گوێهەڵخستنی هەیە بەسەر سەرجەم هێڵە تەلەفۆنیەکانەوە لە ئەوروپادا." سەبارەت بە کردەوە هەواڵگرییەکانی بەریتانیاش، زۆرینەی لە ناوەندی پەیوەندییە حکومییەکاندا بەڕێوەبراوە کە لە ئەوروپا و ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی بڵاوبوونەتەوە و زۆرینەی کات لە بەرژەوەندی دەزگای هەواڵگریی نهێنی بەریتانیادا کاریان کردووە.
جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەوەش بدەین کە گروپێک لە زانا بەریتانییەکان سەربە ناوەندی خزمەتگوزاری بە زمانی تەکنەلۆژییەکان، بەرلە هەر گروپێکی تری زانستی توانییان ئامێری تایبەت بە هەواڵگریی بەکاربهێنن. ئەم ئامێرە کۆمپیوتەریانە دەیان توانی لەماوەی پەیوەندیکردنە تەلەفۆنییەکاندا چەند وشەیەکی بەرنامەداری دیارکراو وەربگرن و فەرمان بدەنە ئامێرەکانی تۆمارکردن تاکو پەیوەندییە تەلەفۆنییەکە تۆماربکەن و سەرچاوەکەشی بزانن، پێدەچێت بنکەی سەرەکی ئەم جۆرە کردەوە تەکنەلۆژیانە لە شانتری هاوسی ڤیکتۆریای بەریتانیا بێت، لەکاتێکدا ناوەندی خوێهەڵخستنی بەریتانیا جیهانیی بارەگاکەی لە لەندەنی پایتەختە بەڵام دەزگای هەواڵگری بەریتانیا جارجار دووچاری گورزێک دەبوو لەسەر ئاستی سیخوڕی، بەتایبەت لەدوای دەستگیرکردنی جیۆفری برایمی سیخوڕی سۆڤیەت لەساڵی ١٩٨٢ بەتۆمەتی دزەپێکردنی زانیاری لە ناوەندی پەیوەندییە حکومییە بەریتانییەکانەوە بۆ بەرژەوەندی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت. برایم لەساڵی ١٩٦٨ەوە بۆ ١٩٧٧ لەو ناوەندەدا کاری کردووە، لەم ماوەیەدا توانیویەتی زانیاری تەکنەلۆژی و بێ تەڵی بەکەڵک بداتە سۆڤیەتییەکان. ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو کە تەنانەت دەستگیرکرانەکەشی لەڕێگای دەزگای هەواڵگرییەکانی بەریتانیەوە نەبوو، بەڵکو بەڕێکەوت بوو. پۆلیسی ئەو وڵاتە بەتۆمەتی هاوڕەگەزبازیی دەستگیریان کرد و ئەمەش ژنەکەی هاندا نهێنی بەکرێگرتنەکەی بۆ سۆڤیەت ئاشکرا بکات.
لەپاش لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە برایم دوو پەیوەندی راستەوخۆی بە بەرپرسە باڵاکان لە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت گرێداوە دوای دەست لەکارکێشانەوەی لەساڵی ١٩٧٧. پەیوەندی یەکەمیان ساڵی ١٩٨٠ لە ڤیەننا کراوە و هی دووەمیش لەساڵی

١٩٨١ لە بەرلین کراوە، هەرچەندە دادگاییکردنەکەی برایم رێگەی نەدا چەندێتی و چۆنیەتی زانیارییەکان ئاشکرا بێت کە بۆ سۆڤیەتی ناردووە، بەڵام هەندێک لە پسپۆڕان پێیان وایە برایم زانیاری لەسەر پرۆژەیەکی سیخوڕی داوەتە سۆڤیەتییەکان کە ناوی (بەیمان)ی لێناوە و بەهۆیەوە رۆژئاوا لەرێگەی مانگە دەستکردەکانەوە دەتوانێت دەنگ و رەنگی هەرچی چالاکی سۆڤیەتی بەپێی خواستەکانی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا و بەریتانیا تۆماربکات. هەروەها، پێدەچێت زانیاریشی دەربارەی مانگی دەستکردنی سیخوڕی (ئارگۆس) دزیبێت کە لە حەزیرانی ١٩٧٥دا لە خولگەکەی خۆیدا دانرا لەپێناو دۆزینەوە و وەرگرتنی لەرەلەرەکانی دەنگ بەشێوەیەکی ورد و رێکوپێک. هەروەها دەوترێت کە ئارگوس توانای تۆمارکردنی سەرجەم ئەو گفتوگۆیە بێتەلانەی هەیە کە لەنێوان فەرماندەی تانکەکانی پەیمانی وارشۆدا گرێدەدرێت لەهەموو بستە خاکێکی سەربە بلۆکی سۆشیالیستیدا.

لەلایەکی ترەوە، سی ئای ئەی لەدوای جەنگی جیهانیی دووەم هەڵسا بە دامەزراندنی دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیای رۆژئاوا و رینالد گیلانی کردە بەرپرسی دەزگاکە. ناوبراو بەرپرسی هەواڵگری نازی بوو لە ئەورووپای رۆژهەڵات لەسەردەمی هیتلەردا بەڵام دوای خۆبەدەستەوەدانی بە سی ئای ئەی و پێدانی زانیاری بەسوود سەبارەت بە دەزگا هەواڵگرییەکانی رۆژهەڵات، هەواڵگری ئەمریکا هاتەسەر ئەو بڕوایەی کە هاوکاریکردن لەگەڵیدا باشترە لە زیندانیکردن یان لەسێدارەدانی. بەم شێوەیە، گیلان لەدوای جەنگ دەستی کردەوە بە تەجنیدکردنەوەی بەکرێگیراوە کۆنەکان لە وڵاتانی ژێر رکێفی ستالیندا. لە چەند پرۆسەیەکی سیخوڕی کردنیشدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لە گرنگترین سەرکەوتنەکانیدا، گەیشتنی بەکرێگیراوێکی ئەم بوو بەناوی ئەرنست گرامش بە پۆستێکی زۆر گرنگ و هەستیار لە هەواڵگری ئەڵمانیای رۆژهەڵاتدا. بەڵام لە تەممووزی ساڵی ١٩٥٠دا، حکومەتی بۆن (پایتەختی ئەوکاتی ئەڵمانیا) بڕیاریدا کاروبارەکانی هەواڵگری ئەڵمانیای رۆژئاوا بەڕێوەبەرێت و ناوەکەش بگۆڕێت و بیکاتە ئاژانسی هەواڵە فیدراڵیەکان، ئەمەشدوای قایلبوونی سی ئای ئەی بەم گۆڕانکاریانە.

ساڵی ١٩٦٣، ناوبراو ریسواییەکی تری بۆ دەزگاکە تۆمارکرد لەکاتێکدا پەردە لادرا لەڕووی پەیوەندی سێ بەکرێگیراو لەگەڵ گیلان بە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتەوە، سێ کەسەکەش بریتیی بوون لە هانز کیمنس، ئەرفیل تیبەبل، هاینز فیلف کە هەرسێکیان کۆنەئەندامی دەزگای هەواڵگری نازی بوون لە سویسرا. بەڵام هاینز فلیف، وەک هەندێک پێیان وایە، مەترسیدارترینیان بوو و پتر لە هەمووشیان زیانبەخش بوو لەڕووی چۆنایەتی ئەو زانیاریانەی کە بۆ دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتی دزیون، ئەخاسمە خۆی بەرپرسی قەلاچۆکردنی سیخوڕیکردنی سۆڤیەت بوو لەنێو هەواڵگری ئەڵمانیای رۆژئاوادا. ئەو زانیارییانەی لەدوای دادگایکردنی ئەم سێ بەکرێگیراوە بڵاوبوونەوە، ئاماژەیان بەوە دەکرد ئەو سێ کەسە هەزار و پێنج سەد وێنەی مەلەفاتی هەواڵگری ئەڵمانی و ژمارەیەکی گەورەی کاسێتی تۆمارکردن و گوێهەڵخستنیان داوە بە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت. دوابەدوای ئەم ریسواییە سیخوڕیە، رای گشتی ئەمریکا و ئەلمانیای رۆژئاوایی تەڵسی خۆیان دەربڕی لەهەمبەر سیاسەتەکانی سی ئای ئەی لەدووبارە تەجنیدکردنەوەی گیلانی نازی وەک بەرپرسی هەواڵگری لەدوای جەنگ، بەڵام رای گشتی راستەوخۆ کارناکاتەسەر سیاسەتی سیخوڕی و دژەسیخوڕی.

هەرلە ئەلمانیای رۆژئاوادا، هەواڵگری ئەڵمانیای رۆژئاوا دەستکەوتێکی گرنگی تۆمارکرد لەدژی هەواڵگری بەرامبەردا، کاتێک توانی یەکێک لە بەکرێگیراوەکانی بەناوی گونتەر گلیۆم وەک پیاوێکی زانیاری لە نووسینگەی راوێژکاری ئەڵمانیای رۆژاوادا فیلی برانت دابنێت. فیلی لەساڵی ١٩٧٤دا دەستی لەکارکێشایەوە لەدوای ریسواییەکەی دەستگیرکردنی گلیۆم وەک سیخوڕی ئەڵمانیای رۆژهەلات.

لە ئەورووپای دابەشبوو بەسەر رۆژهەلات و رۆژئاوادا، هەواڵگریی چینی میللیش رۆڵی سیخوڕی خۆی هەبوو لە شەستەکاندا، ئەوەبوو لەو ساڵانەدا یەکەم رووداوی سیخوڕی لەشاری هیگی هۆڵەندی لەساڵی ١٩٦٦ روویدا کاتێک پیاوێکی چینی لە دەرەوەی حەرەمی باڵیۆزخانەی چیندا دۆزرایەوە و بەدەم ئازارەوە دەیناڵاند. دواتر دەرکەوت ئەو ئێش و ئازارەی بەهۆی ئەشکەنجەدانەوە بووە لەسەر دەستی هەواڵگری چینی.

باڵیۆزخانەی چینی لەوکاتەدا رایگەیاند کە گوایە ئەو کەسەی بەناوی هسو تسو تسایە لە پەنجەرەی باڵیۆزخانەکەوە خۆی فڕێداوەتە خوارەوە. دوای ئەوەی هۆشی لەدەستداوە، ئەمەش بۆتەهۆی شکاندنی کەللەی سەری و ئێسقانی دەستی. ناوبراو تەنیا یەک رۆژ دوای چارەسەری پزیشکی لە نەخۆشخانە رفێنراو و گوازرایەوە بۆ باڵیۆزخانەی چین، دواتر رایانگەیاند کە تسای بەهۆی زامەکەیەوە گیانی لەدەستداوە. هەر بەم بۆنەیەوە، وەزیری دەرەوەی هۆڵەندا داوای لێکۆڵینەوەی لە مردنی تسای کرد بۆ زانینی هۆکاری مردنەکەی، کەچی باڵیۆزخانەی چین کێشەکەی بە کێشەیەکی نێوخۆیی لەقەڵەمدا و رایگەیاند کە وەزارەتی دەرەوەی هۆڵەندا بەهیچ شێوەیەک خۆی لە کێشەکە هەڵنەقورتێنێت. دوابەدوای ئەم ناکۆکیەش وەزارەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە باڵیۆزخانەی چینی داخست، وڵاتی چینیش لەهەمبەر ئەم هەنگاوەدا هەمان هەڵوێستی نیشاندا، هەرچەندە داخستنی باڵیۆزخانەکان درێژەی نەکێشا و زوو بەزوو ناکۆکییەکان چارەسەر کران.[i]

## سیخوڕی ئابووری

سیخوڕی ئابووری (بە سیخوڕی بازرگانیش ناسراوە) تارادەیەک چەمکێکی نوێیە لەنێو جیهانی هەواڵگرییدا. ئەم جۆرە سیخوڕیە بەشێوەیەکی تایبەتی بەوە ناسراوە کە لەلایەن ئەکتەرێکی حکومەتەوە ئەنجامدەدرێت لەدژی کۆمپانیایەکی بازرگانی کەرتی تایبەت لە وڵاتێکی تردا.[ii] ئامانجی سیخوڕی ئابووری بریتییە لە کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی زانیاری نهێنی کارکردنی پەیوەست بە کۆمپانیا بیانییەکان و گواستنەوەی ئەو زانیارییانە بۆ کۆمپانیا خۆجێییەکان. کۆکردنەوەی زانیارییەکان (واتە، سیخوڕیەکە) لەلایەن دەزگایەکی حکومەت یان داردەستێکی سەربە حکومەت ئەنجامدەدرێت، لێرەدا ئامانجەکە بریتییە لە گواستنەوەی ئەو

---

[i] سیخوڕی و دژەسیخوڕی، بلید وفسکاو بلوخ، وەرگێڕانی مەشخەل کەولۆسی، ناوەند و چاپ و پەخشی برایان، ٢٠٠٢

[ii] https://www.fbi.gov/about/faqs/what-is-economic-espionage.

زانیارییە بەدەستهاتوانە لەڕێگای سیخوڕییەوە بەمەبەستی پەرەپێدان و هاندانی کۆمپانیا خۆجێیەکان. بەمەش، ئەم جۆرە سیخوڕە پاڵنەرەکەی بریتیی دەبێت لە بەرژەوەندی ئابووری، بەپێچەوانەی سیخوڕی تەقلیدی، کە پاڵنەری سەرەکی بریتییە لە ئاسایشی نیشتیمانی یان پاراستنی بەرژەوەندی. ئەو زانیارییەی کە لێرەدا مەبەستە تەنیا زانیاری نهێنی تایبەتە بەکار و پیشەوە، وەک داتای کڕیار، زانیاری گرێبەست، زانیاری چۆنیەتی کارکردن وەک داتای لۆجیستی و بەرهەمهێنان، و چەند زانیاری تری نهێنی بازرگانی.

لەڕاستیدا، سیخوڕی ئابووری فۆرمێکی یاسایی کار نییە. بەڵکو زیاتر کردەیەکە لەلایەن وڵاتێکەوە ئەنجام دەدرێت بۆ دزینی نهێنی بازرگانی، کە لەزۆربەی کەیسەکاندا لەژێر یاسای خۆجێیدا رێگای پێنادرێت. لەم چەند ساڵانەی دواییدا، ژمارەی کەیسی ئەم جۆرە سیخوڕییە لەڕێگای ئینتەرنێتەوە زیادی کردووە.[i] هۆکاری ئەمەش رەنگە بۆ ئەو راستییە بگەڕێتەوە کە بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لەم ساڵانەی دواییەدا ئابووری و پیشەسازی لەئاستی نێودەوڵەتیدا زیاتر بە دیجیتالی کراون، بەمەش بێگومان زیاتر دووچار(موعەرەز) دەبن بۆ سیخوڕی ئابووری لەرێگای فەزای ئۆنلاینەوە.

ئەگەرهاتوو سیخوڕی ئابووری لەلایەن دەوڵەتەوە لەدژی کۆمپانیا و کەسایەتی بازرگانی خۆجێیی ئەنجامدرا، ئەوکات دەکرێت پەنا بۆیاسای خۆجێی ئەو حکومەتە بدرێت، کە سنووری پەیوەندییەکانی نێوان حکومەت و هاوسنوورەکانی دیاری دەکات. کاتێک نهێنی بازرگانی کۆمپانیایەک لەلایەن کۆمپانیایەکی تر دەدزرێت، ئەمەش هەر لە چوارچێوەی یاسای خۆجێی دەبێت چارەسەر بکرێت. بەڵام کاتێک دەوڵەتێک

---

[i]https://www.fireeye.com/content/dam/fireeyewww/services/pdfs/mandiant-apt١-report.pdf;
-the ٢٠١٦ annual report of the Australian Government's Security IntelligenceOrganisation("ASIO")https://www.asio.gov.au/sites/default/files/٢٠١٦٪٢٠ASIO٪٢٠Annual٪٢٠Report٪٢٠UNCLASSIFIED٪٢٠WEB.pdf.
-٢٠١٧ report from PwC on the cyber campaign Cloud Hopper: https://www.pwc.co.uk/issues/cybersecuritydataprivacy/insights/operation-cloud-hopper.html.

سیخوڕی دەکات و نهێنی بازرگانی کۆمپانیایەک لە دەرەوەدا دەدزێت، ئەوا دەبێت پەنا بۆ یاسای نێودەوڵەتی ببردرێت.

## بەرنامەی "نایاسابییەکان"ی سۆڤیەت و رووسیا

بەرنامەی "نایاسابییەکان" بریتیی بوو لە تۆڕێکی سیخوڕی نووستووی رووسیا لەژێر ئەرکی نافەرمی و نهێنییدا. لێکۆڵینەوەیان لەلایەن ئێف بی ئای بووە هۆی دەستگیرکردنی دە سیخوڕی ئەو وڵاتە و لەکۆتاییشدا ئاڵوگۆڕێکی مەزنی زیندانییەکان لەنێوان رووسیا و ئەمریکادا لە ٩ی تەمموزی ٢٠١٠ ئەنجامدرا.[i]
وڵاتی کەنەدا شوێنێکی باو بوو بۆ سیخوڕەکانی سۆڤیەت، دواتر رووسیا، کە بەشێوەیەکی کۆچبەر روویان لەو وڵاتە دەکرد بەر لەوەی لەلایەن دەزگای هەواڵگری وڵاتەکەیەوە رەوانەی دەوڵەتێکی ئامانج بکرێن، بەتایبەتی ئەمریکا و بەریتانیا.[ii]
سیخوڕەکان لەلایەن دەزگای هەواڵگری بیانی رووسیەوە لە ئەمریکا سەرپەرشتیان دەکرا. بە رەفتارکردن وەک هاوڵاتی ئاسایی ئەمریکی، ئەو سیخوڕانە هەوڵیان دەدا پەیوەندی دروست بکەن لەگەڵ ئەکادیمیستەکان، پیشەکارەکان، و داڕێژەرانی سیاسەت، ئامانج لەمەش بریتیی بوو لە دەست گەیشتن بە زانیاری هەواڵگریی. ئەوان ئامانجی چەندین ساڵی چاودێری بوون لەلایەن ئێف بی ئایەوە. لێکۆڵینەوەکانی ئێف بی ئای، کە بە "ئۆپەراسیۆنی چیرۆکی تارماییەکان" ناسرابوو، لەکۆتاییدا بووە هۆی دەستگیرکردنی دە کەس لە ئەمریکا و کەسی یازدەمیش لە وڵاتی قوبرس.[iii] هەر دە

---

[i] "Ten Alleged Secret Agents Arrested in the United States" (https://www.justice.gov/opa/pr/ten-alleged-secret-agentsarrested-united-states). United States Department of Justice. June ٢٨, ٢٠١٠. Retrieved ٢٠ September ٢٠١٦.

[ii] "The day we discovered our parents were Russian spies" (https://www.theguardian.com/world/٢٠١٦/may/٠٧/discover ed-our-parents-were-russian-spies-tim-alex-foley). The Guardian. Retrieved ٧ May ٢٠١٦.

[iii] "The Russian Spy Ring of ٢٠١٠, The Use of Ciphers and Radio Messages" (https://web.archive.org/web/٢٠١٥٠٢١٦٠٠٤٠٠٦/http://www.numbersstations.com/russian-spy-ring). The NSRIC. Archived from the original

سیخوڕەکە بەتۆمەتی ئەنجامدانی کاری نهێنی لەجیاتی ڕووسیای فیدراڵی لە ئەمریکا تۆمەتبارکران.[i] ئەو گومانلێکراوەی لە قوبرس دەستگیرکرابوو تەنیا ڕۆژێک دوای دەستگیرکردنەکەی بە کەفالەت ئازادکرا. کەسی دوازدەمیش، هاوڵاتی بەڕەگەز ڕوسی کە بۆ کۆمپانیای مایکرۆسۆفت کاری دەکرد، لە ١٣ی تەمموزی هەمان ساڵدا دیپۆرت کرایەوە. دادگای باڵای مۆسکۆ لە حەزیرانی ٢٠١١ ڕایگەیاند کە سیخوڕێکی تری وڵاتەکەیان لەئەمریکا توانیویەتی ڕابکات بەبێ ئەوەی دەستگیربکرێت.[ii] هەر دە سیخوڕەکەی ڕووسیا لە ٩ی تەمموزی ٢٠١٠ گواسترانەوە بۆ شاری ڤیێنا، دوای ئەوەی لەدادگا تۆمەتەکەیان بەسەردا ساغ بووەوە. هەر هەمان ڕۆژ، سیخوڕەکان لەگەڵ چوار هاوڵاتی ڕووسی ئاڵوگۆڕیان پێکرا، کە سێ لەوانە بەتۆمەتی خیانەتی مەزن لەلایەن ڕووسیاوە تۆمەتبارکرابوون.[iii]

بەبەکارهێنانی بەڵگەنامەی ساختە، هەندێک لە سیخوڕەکان ناسنامەی ئەمریکییەکانیان دزیبوو، خوێندن لە زانکۆکانی ئەمریکا و بەژداربوون لە دامەزراوە بەنێوبانگەکانی ئەو وڵاتە وەک ئامرازێک بوو بۆ چوونەنێو بازنەی هەواڵگری و دەزگاکانی حکومەتەوە.[iv] دوو لەو کەسانەی دەستگیرکرابوون ناوەکانی ڕیچارد و سینسیا مۆرفیان بەکارهێنا و لە نیوجێرسیدا نیشتەجێ بوون. دووی تریان لەژێر ناوی ڕۆژنامەنووس ڤیکی پیلایز و پیاوێک بەبەکارهێنانی ناوی خوان لێزارۆ لە

(http://www.numbe rs-stations.com/russian-spy-ring) on February ١٦, ٢٠١٥. Retrieved ٣١ January ٢٠١٥.

[i] Ten Alleged Secret Agents Arrested in the United States (http://www.justice.gov/opa/pr/٢٠١٠/June/١٠-nsd-٧٥٣.html) Monday, June ٢٨, ٢٠١٠, United States Department of Justice official web site.

[ii] "Дело Потеева: предатель нанес ущерб в ٥٠ млн долларов, но не смог обмануть начальство украинской любовницей" (http://newsru.com/russia/٢٨jun٢٠١١/poteev.html). NEWSru. ٢٠١١-٠٦-٢٨. Retrieved ٢٠١١-٠٦-٢٨.

[iii] "Russia, U.S. swap ١٤ in Cold War-style spy exchange" (https://www.reuters.com/article/idUSLDE٦٦٨٠KB٢٠١٠٠٧٠٩), Reuters, July ٩, ٢٠١٠.

[iv] Savage, Charles. "U.S. Charges ١١ With Acting as Agents for Russia" (https://www.nytimes.com/٢٠١٠/٠٦/٢٩/world/europe/٢٩spy.html), The New York Times, June ٢٨, ٢٠١٠. Retrieved June ٢٨, ٢٠١٠.

نیۆیۆرک نیشتەجێ بوون. دۆسییەکانی دادگا ئەوەیان نیشاندا کە ئەو دوو کەسە لەلایەن رووسیاوە نێردرابوون بەشێوەیەکی وا رێکخرابوون کە بەشێوەیەکی فەرمی لەو وڵاتە هاوسەرگیریی بکەن و تەنانەت منداڵیشیان ببێت بۆئەوەی گومانەکان لەسەر سیخوڕیبوونی ئەوان تا نزمترین ئاست بێت.
دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەلایەن دادگای فیدراڵی ئەمریکا، دەرکەوت کە ئەو سیخوڕە رووسیانە لە ئەمریکا زانیاری زۆر گرنگیان داوەتە دەزگای هەواڵگری وڵاتەکەیان لەڕێگای پەیامی شاراوە لەناو وێنەی دیجیتاڵی، کە بە مەرەکەبی نادیاری نووسرابوو، سەرەڕای ئەوەی کە هەندێکیشیان بە ئاڵوگۆڕی جانتای هاوشێوە لە وێستگەیەکی شەمەندەفەر گواسترابوونەوە. ئەوم جۆرە پەیامانە بەزۆری لە تێرمیناڵی گراند سێنتراڵ و پارکی ناوەندی ئاڵوگۆڕیان پێدەکرا.
ئەرکی سەرەکی سیخوڕە رووسەکان لەلایەن "ناوەندی مۆسکۆ" دیاری دەکرا، کە ئامانجی سەرەکیان بەدەستهێنانی زانیاری بوو دەربارەی سیاسەتی ئەمریکا لە ئەمریکای ناوەڕاست، تێڕامانی ئەمریکی بۆ سیاسەتی دەرەوەی رووسیا، گرفتەکانی بەردەم سیاسەتی سوپای ئەمریکا و سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە بەکارهێنانی ئینتەرنێت لەلایەن تیرۆرستانەوە.[1] بەگوێرەی راپۆرتەکانی میدیا، پلانی ئێف بی ئای ئەوەبوو ئۆپەراسیۆنی دەستگیرکردنی "ناپاساییەکان" لە ناوەڕاستی مانگی حەزیرانی ۲۰۱۰ دەست پێبکەن، بەڵام کردەکە لەلایەن چەند ئەندامێکی گروپەکە زیاتر بووەهۆی پەلەکردنی دەزگاکانی هەواڵگریی چونکە پلانیان داڕشتبوو بە زووترین کات لە ئەمریکا دەرچن، ئەمە جگە لەوەی کە ئانا چاپمان (لە بەشی کەسایەتی سیخوڕەکان باسی لێوەکراوە) گومانی زۆری لەسەر بوو لەوەی کە ناسنامە راستەقینەکەی ئاشکرابووە. ڤلادیمێر گورییێف پلانی ئەوەی دانابوو بەرەو فەرەنسا گەشت بکات (دوور نەبوو بچێتەوە رووسیا)، بێزروکۆڤ هەموو کارەکانی رێکخستبوو بۆئەوەی لەگەڵ کورەکەی بە زووترین کات لە ئەمریکا دەرچێت، ئانا چاپمان، لە پەیوەندییەکی

---

[1] McCullough, Declan (۲۰۱۰-۰٦-۲۸). "Alleged Russian agents used high-tech tricks" (http://news.cnet.com/۸۳۰۱-۱۳۵۷۸_ ۳-۲۰۰۰۹۱۰۱-۳۸.html). CNET News. Retrieved ۲۰۱۳-۰۸-۱۸.

تەلەفۆنیدا لەگەڵ باوکی تەنیا یەک ڕۆژ بەرلە دەستگیرکردنی، وتی کە ئەو گومانی هەیە ئاشکرابووبێت و پلانی دانابوو لە ناوەڕاستی ٢٠١٠ بەرەو مۆسکۆ بەڕێبکەوێت.[i]

## سیخوڕی لەڕێگای ئینتەرنێتەوە

شارەزایانی بواری هەواڵگری لە جیهاندا سیخوڕی وەک یەکێک لە پیشە کۆنەکان دەناسێنن کە دیرۆکەکەی بۆ هەزاران ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، بەلام لەگەڵ پێشکەوتنی ژیانی مرۆڤایەتیدا ئەم پیشەیەش گۆڕانکاریەکی زۆری بەسەردا هاتووە و چەندین کەرەستە و کەلوپەلی جۆراوجۆری تێدا بەکاردەهێنرێت، سەرەڕای ئەم پێشکەوتنە بەرچاوەی دنیای هەواڵگری هەموان لەسەر ئەوە کۆکن کە مرۆڤ ڕۆڵی سەرەتا و کۆتایی لەم یاریەدا دەبینێت. پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا ژیانی مرۆڤەکانی ئاسان کردووە و ڕێگا درێژەکانی بۆ کورت کردوونەتەوە، زۆرێک لە وڵاتە زلهێزەکان لە پێشبڕکێیەکی بەردەوامدان بۆئەوەی نوێترین داهێنانە زانستیەکان بخەنە خزمەتی سیستەمی هەواڵگری و سەربازی وڵاتەکەیان.

داهێنانی کۆمپیوتەر یەکێکە لەو شۆڕشانەی لەبواری تەکنەلۆژیادا بەرپاکراوە لە سەدەی بیستەمدا کە کاریگەریەکی گەورەی هەبووە لە جیهانی سەربازی و هەواڵگریدا بەتایبەتی لە بواری کارئاسانی کردن بۆ تۆمارکردن و شیکردنەوەی زانیارییەکان، بێگومان کاریگەری ئەم ئامێرە ئاڵۆزە زیادی کرد بەتێپەڕبوونی کات و دوای ئەوەی کۆمپیوتەرەکانی جیهان لەڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە بەیەکەوە بەسترانەوە. لەم سەردەمەدا، کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت بە بەشێکی دانەبڕاو دێتەئەژمار لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکیدا، ئەمە سەرەڕای ئەو گرنگیەی کە هەیەتی لە کاروباری فەرمانگەکانی حکومەت و دەزگاکان بە تایبەتی لەبواری تۆمارکردنی زانیاریە گرنگەکان، ئەمەش وایکردووە کە داتابەیسەکانی کۆمپیوتەر ببێتە ئامانجێکی دەزگای هەواڵگری وڵاتان تا لەڕێگەیەوە زانیاری گرنگ و هەستیار بەدەست بهێنن، کە گونجاوترین ڕێگەش

---

[i] "Investigation of Russian agent in Massachusetts led to FBI takedown of network"(http://www.nj.com/news/index.ssf/٢٠١٠/٠٧/investigation_into_russian_age.html). Associated Press. Retrieved July ٢٥, ٢٠١٠.

هەوڵدانە بۆ دزینی ئەو زانیاریانە لەڕێگەی ئەو کەلێن و خاڵە لاوازانەی کە لەپێکهاتەی سیستەمەکاندایە ئەم ڕێگایەش یەکێکە لەشێوازە بەناوبانگەکانی هاککردن، کە ئەمەش بووە هۆی هاتنەئارای جۆرێک لە هەواڵگری ئەلکترۆنی کە بە "سیخوڕی سایبیری" دەناسرێت کە لە ئێستادا وەک لقێکی سەربەخۆی هەواڵگری سەیر دەکرێت و لە فەرهەنگی هەواڵگریدا پێی دەوترێت سایبیری.

سایبیر زاراوەیەکی یۆنانیە بەواتای توانای بڕیاردان و ئاراستەکردن دێت، کە لە ئێستادا بۆ مەبەستی ئاماژەکردن بە جیهانی کۆمپیوتەر و ئامێرە ئەلکترۆنیەکان و ئینتەرنێت بەکاردەهێنرێت. بەڵام جەنگی سایبیری و سیخوڕی سایبیری دووشتی لێکجیاوازن، لەبەرئەوەی جەنگی سایبیری ئامانج لێی بریتییە لە پەککستنی سیستەم و ئامێرە ئەلکترۆنیەکان لەپێناو زیان گەیاندن بە دەوڵەتی ئامانج، بەڵام سیخوڕی سایبیری ئامانجی یەکەمی دزینی زانیاری گرنگ و جۆراوجۆرە بە تایبەتی زانیاری سەربازی. جەنگی سایبیری بریتییە لەو چالاکیانەی کە لەلایەن دەوڵەتێکی دیاریکراوەوە ئەنجامدەدرێت بەمەبەستی دزەکردنە ناو کۆمپیوتەر و رایەڵەی دەوڵەتێکی تر لە پێناو زیان گەیاندن یان پەککستنی سیستەمی ئەلکترۆنی و لەناوبردنی، بەڵام ئەم جەنگە مەرج نییە لەلایەن دەوڵەتێکی دیاریکراوەوە ئەنجام بدرێت بەڵکو هەندێکجار لەلایەن گروپە تیرۆرستیەکان و چەتەکانی ئینتەرنێت و ئەو ڕێکخراوانەی کە لەڕووی ئایدۆلۆژی و سیاسیەوە یاخیبوون ئەنجام دەدرێت. بەهۆی گرنگی ئەم جەنگەوە لەئێستادا زۆرێک لە حکومەتی وڵاتان جەنگی سایبیریان کردووەتە بەشێکی دانەبڕاو لە ستراتیژی سەربازی خۆیان، هەروەها هەموو هەوڵەکانیان دەخەنەگەڕ بۆ پەرەپێدانی تواناکانیان لەبواری جەنگی سایبیری. سەرەڕای ئەمەش، جەنگی سایبیری تەنها بریتی نییە لە پەککستن و لەناوبردنی سیستەمە ئەلکترۆنیەکان بەڵکو هەندێکجار وەک ئامرازێکی جەنگی دەروونی بەکاردەهێنرێت لەپێناو کۆنترۆڵکردنی بیروباوەڕی جەماوەر و ئاراستەکردنی.

لەبەر گرنگی جەنگ و سیخوڕی سایبیری زۆرێک لە وڵاتان سوپایەکی تایبەت بەم جەنگەیان دامەزراندووە، بەڵام ئەندامانی ئەم سوپایە نە فیشەکێک دەتەقێنن و نە

دڵۆپێک خوێن لە لووتیان دێت، بەڵکو تەنها بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر هەوڵی بەدەسهێنانی زانیاری و زیان گەیاندن و کاریگەری دانان لەسەر وڵاتانی دوژمن دەدەن، لەئێستا وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هەوڵێکی زۆری خستووەتە گەڕ تا سووپای سایبیری وڵاتەکەی بەرەوپێش بەرێت کە لە بنەڕەتدا ئەم سووپایە سەر بەدەزگای CIAیە، لەئێستادا ئەم سووپایە هەزاران کارمەندی سایبیری دەگرێتەخۆ کە پسپۆڕن لە بواری هاککردن و دزینی زانیاری کە پێشبینی دەکرێت ئەم سوپایە لەداهاتوودا بەهۆی گرنگیەکەی ببێتە دەزگایەکی هەواڵگری سەربەخۆ.[i]

سەرجەم ئامارەکان ئاماژە بە ترسناکی دۆخی سایبیری جیهانی دەکەن، لە وڵاتێکی وەک بەریتانیا رۆژانە لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا سەد هەزار هێرشی ئەلیکترۆنی ئەنجامدەدرێت، بەڵام مەترسیەکانی شەڕی سایبیری لە ئەمریکا زۆر لەمانە زیاترن بەجۆرێک کە شارەزایان هێرشە سایبیریەکان بە گەورەترین مەترسی ناودەبەن لەسەر ئاسایشی ئەمریکا، لەئێستادا چین یەکێکە لەو وڵاتە پێشەنگانەی کە خاوەنی سوپایەکی سایبیری تایبەت بە خۆیەتی کە سەرئێشەیەکی زۆری بۆ ئەمریکییەکان دروست کردووە، تەنانەت حکومەتی ئەمریکاش دانی بەوەدا ناوە کە زۆربەی هێرشە سایبیریەکان لە چینەوە دەکرێتە سەری ، ئامانجی سەرەکی دەزگای هەواڵگری چین لەم هێرشە سایبیریانە دزینی تازەترین تەکنەلۆژیای سوپای ئەمریکایە، لەبەرئەوەی چین و ئەمریکا لەڕووی تەکنەلۆژیای سەربازییەوە دوو رکابەری سەرسەختی یەکترن، لەساڵی ٢٠١٣ کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنانی فڕۆکەی جەنگی ئەمریکی رایگەیاند کە هێرشێکی ئەلیکترۆنی لە چینەوە کراوەتە سەریان کە ئامانجی دزینی نوێترین دیزانی فڕۆکەی "تارماییی جەنگی" بووە، هەرچەندە حکومەتی ئەمریکی ساڵانە بڕی ١٥ ملیار دۆلار تەرخان دەکات تەنها لەبواری ئاسایشی زانیارییەکان، بەڵام هێشتا مەترسیەکان لەسەری بەردەوامن[ii].

---

[i] Carr, J. (٢٠١١). *Inside cyber warfare: Mapping the cyber underworld.* " O'Reilly Media, Inc.".

[ii] Gompert, D. C., & Libicki, M. (٢٠١٤). Cyber warfare and Sino-American crisis instability. *Survival,* ٥٦(٤), ٧-٢٢.

بەڵام ئامانجی جەنگە سایبیریەکان لە ئێستادا زۆر لەوە فراوانترە و بەهۆیەوە دەتوانرێت ژێرخانی ئابووری و کارگە ئەتۆمیەکان و دەزگا و کۆمپانیا جۆراوجۆرەکان و هەروەها وێستگەکانی ئاو و کارەبا و غاز و هۆکارەکانی هاتووچۆ و راگەیاندن بکرێتە ئامانج، لەبەرئەوەی سەرجەم ئەو دامەزراوانە بۆ ئاسان راپەڕاندنی کارەکانیان پشت دەبەستن بە کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت. لەساڵی ٢٠٠٧، دوای ئەوەی حکومەتی ئێران دەستی کرد بە بەرنامە ئەتۆمیەکەی لەلایەن ئیسرائیل و وڵاتانی خۆرئاواوە هەوڵێکی دیبلۆماسی زۆر خرانەگەڕ بۆ رێگرتن لەوەی کە ئێران ببێت بە خاوەنی چەکی ئەتۆمی بەڵام سەرجەم ئەو هەوڵانە بێسوود بوون و رۆژ لەدوای رۆژیش ئێران لە بەرهەمهێنانی یەکەم بۆمبی ئەتۆمی نزیک دەبووەوە تا ئەو کاتەی کە شارەزایانی بواری سایبیری ئیسرائیل و ئەمریکا توانیان لەرێگەی ڤایرۆسێکی کۆمپیوتەرییەوە نزیکەی پەنجا هەزار کۆمپیوتەری کارگە ئەتۆمیەکانی ئێران پەکبخەن، ئەم ڤایرۆسە کە بە (Net Stux) ناسرابوو لەکۆتاییدا خۆی ون کرد و هیچ کەسێکیش نەیتوانی کۆدەکانی ئاشکرا بکات کە ئەمەش بۆ چەندین ساڵ بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی لەلایەن ئێرانەوە دواخست، بەڵام شارەزایانی بواری سایبیری ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم ڤایرۆسە لەرێگەی پۆرتی (USB)ەوە تووشی کۆمپیوتەرەکانی کارگە ئەتۆمیەکانی ئێران بووە نەک لەرێگەی ئینتەرنێتەوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە سیخورەکانی مۆساد توانیویانە دزە بکەنە ناو دامەزراوە ئەتۆمیەکانی ئێران[i]. بەتێڕوانین لە ئامارەکانی هێرشە سایبیریەکان و کاریگەریان لەسەر ژیانی مرۆڤایەتی بۆمان دەردەکەوێت کە مەترسیەکی زۆر لە ئارادایە بەتایبەتی ئەگەر لەم رێگایەوە چەتەکانی ئینتەرنێت و هاککەرەکان بتوانن کاریگەری لەسەر کورە ئەتۆمیەکان دابنێن یان جووڵەی کۆمپانیاکانی بواری فرۆکەوانی بوەستێنن یان زیان بە ژێرخانی ئابووری وڵاتێک بگەیەنن.

لەئێستادا، حکومەتی وڵاتانی خۆرئاوا نیگەرانن لەوەی کە کەسانی ئاستبەرز لە بواری تەکنەلۆژیای زانیاری و کۆمپیوتەر بە لێشاو روودەکەنە کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەت

---

[i] Fidler, D. P. (٢٠١١). Was stuxnet an act of war? Decoding a cyberattack. *IEEE Security & Privacy*, ٩(٤), ٥٦-٥٩.

لەبەرئەوەی ئەو کۆمپانیایانە بایەخێکی زیاتر بەلایەنی ئاسایشی ئەلیکترۆنی سیستەمەکانیان دەدەن و پارەیەکی زۆرتر دەبەخشن بەو کەسانە بۆ سوود وەرگرتن لە تواناکانیان، وە هەندێکجار خودی ئەو کەسانەی کە لەبواری تەکنەلۆژیای زانیاری خاوەن لێهاتووی و ئاستێکی بەرزن دەبنە ئامانجی دەزگا هەواڵگریەکان ئەگەر رازی نەبن کاریان بۆ بکەن، نموونەی ئەمەش پسپۆڕێکی بواری سایبریە بەناوی شین تۆد کە کاری بۆ کۆمپانیایەکی ئەمریکی بواری ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان دەکرد و دوو رۆژ دوای وازهێنانی لەو کۆمپانیایە بە کوژراوی دۆزرایەوە، کەس و کارەکەشی ئاماژە بەوە دەکەن کە لەلایەن دەزگایەکی هەواڵگریەوە کوژراوە.

نموونەی ئەو رووداوانە زۆرن کە ئاماژە بە مەترسی و کاریگەری هێرشە سایبیریەکان دەکەن لەسەر ژیانی رۆژانەی مرۆڤ کە دەیسەلمێنن هەوڵدانی دەزگا هەواڵگریەکان بۆ پێشکەوتن لەم بوارەدا لەخۆڕایی نییە، لە مانگی ٨ ی ساڵی ٢٠١١ دا هێرشێکی ئەلیکترۆنی وێستگەیەکی دابەشکردنی ئاویی لە ئەمریکا کردە ئامانج و بەهۆیەوە ئەو وێستگەیە لەکارکەوت، هەروەها ئامارەکانی حکومەتی ئەمریکی ئاماژە بەوە دەکەن کە دامەزراوە پیشەسازیەکانی ئەمریکا لە ماوەی ساڵێکدا زیاد لە ١٢٥ هەزار جار رووبەڕووی هاککردن بوونەتەوە. بەڵام یەکەم حاڵەتی مردن کە بەهۆی هێرشی سایبرییەوە ئەنجام درابێت دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠١٠ کە ئەویش مردنی کەسێک بوو لە نەخۆشخانەیەکی ئیتاڵیادا کە دوای ئەوەی کۆمپیوتەرێکی نەخۆشخانەکەیان هاککرد توانیان رێژەی ئەو دەرمانانەی کە لە کۆمپیوتەرەکەدا پێویست بوو رۆژانە بەکاری بهێنێت دەسکاری بکەن و بیگۆڕن بەرێژەیەکی بەرزتر کە لەئەنجامی ئەم خراپ بەکارهێنانە بووە هۆی گیان لەدەستدانی.

بەهۆی مەترسیەکانی هێرشە سایبیری لەئێستادا حکومەتی ئەمریکا کار بۆ دانانی یاسایەک دەکات کە رێگای پێدەدات چاودێری سەرجەم نامە ئەلکترۆنیەکان بکرێت لەلایەن دەزگا هەواڵگریەکانەوە، هەروەها حکومەتی ئەمریکی دانی بەو راستیەشدا ناوە کە چەندین حاڵەتی مردن تۆمارکراون کە هۆکارەکەیان هێرشە سایبیریەکان بوون و هەر بەم هۆکارەش ئەمریکا هۆشداری داوە بە وڵاتان کە مافی ئەوەی بە

خۆی دەدات وەڵامی هێرشە سایبیریەکان بە هێرشی سەربازی بداتەوە، ئەگەری پێکدادانی سەربازی نێوان وڵاتان بەهۆی هێرشی سایبیری یەکێکە لەو ئەگەرانەی کە پێشبینی دەکرێت لە سەدەی بیست و یەکدا روویدات. ئەو وڵاتانەی کە خاوەنی بەهێزترین سوپای سایبیری خۆیانن بریتین لە: ئەمریکا، چین، رووسیا، ئیسرائیل و بەریتانیا.

لەساڵی ٢٠١٠ ئەمریکا گرنگیدانی بە جەنگی سایبیری زیاتر کردووە، کاتێک سوپای سایبیری و هێزی ئاسمانی و دەریایی لە یەک دەزگادا کۆکردوەتەوە، وە چەندین ملیار دۆلاری بۆ ئەم پرۆژەیە تەرخان کردووە، پێش دوو ساڵ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بە فەرمی فراوانکردنی هێزە ئەلیکترۆنیەکانی راگەیاند و ژمارەی کارمەندەکانی لە ١٨٠٠ کارمەندەوە بەرزکردەوە بۆ ٦٠٠٠ کارمەند. وڵاتی چینیش لەبەرامبەر ئەم هەوڵەی ئەمریکا رایگەیاند کە هەوڵدەدات توانا ئەلیکترۆنیەکانی گەشەپێبدات بۆ ئەنجامدانی باشترین جەنگی سایبیری. هەروەها، رووسیاش یەکێکە لە وڵاتە پێشەنگەکانی جەنگی سایبیری کە چەندین هێرشی سایبیری کاریگەری دژی وڵاتانی دوژمنی خۆی بەسەرکەوتوویی ئەنجامداوە بەتایبەتی هەردوو وڵاتی ئۆکرانیا و جۆرجیا. لە ئەورووپاش، شاری لەندەن بە وێستگەی جەنگی سایبیری وڵاتان دادەنرێت دادەنرێت لەگەڵ حکومەتی بەریتانیا کە لەم دواییانەدا وەبەرهێنانی زۆری کردووە لە بواری پێشکەوتنی سوپای سایبیری وڵاتەکەی. هەرچەندە ئیسرائیل وڵاتێکی تازە لە دایک بووە بەڵام لەئێستادا خاوەنی باشترین تیمی هاککەرە و لەگەڵ یەکەی پاراستنی ئاسایشی سایبیری. لەم چەند ساڵەی رابردوودا هاوشانی ئەمریکا و چین و رووسیا و بەریتانیا، ئیسرائیل بووە یەکێک لە زلهێزەکانی بواری جەنگی سایبیری و هەواڵگریی سایبیری.

لەپرۆژەیەکدا سوپای سایبیری ئیسرائیلی چەندین یەکەی تەرخان کردووە بە کاری سیخوڕی ئەلکترۆنی و هاککردن، هەروەها بایەخدان بەلایەنی هونەری و فێرکردنی ئەم زانستە لە ئیسرائیل تەنانەت پرۆگرامی خوێندنی قۆناغەکانی سەرەتایش دەگرێتەوە. لەدوای ئەو وڵاتانە کۆریای باکوور و ئێران وەک دوو یاریکەری جیهانی

لە بواری جەنگی سایبیریدا دەردەکەون، کۆریای باکوور تائێستا چەندین هێرشی سایبیری دژی ئەمریکا ئەنجامداوە کە گرنگترینیان ئەو هێرشە بوو کە کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنانی فیلمی کردە ئامانج، هەروەها ئێرانیش توانیویەتی چەندین هێرشی سایبیری دژی کۆمپانیا و دامەزراوەکانی سعودیە ئەنجام بدات و بەو هۆیەوە سەدان کۆمپیوتەری لەکارخستووە، بەڵام پسپۆڕانی بواری جەنگی سایبیری ئاماژە بەوە دەکەن کە حکومەتی ئێران بۆ بەهێزکردنی سوپای سایبیری وڵاتەکەی چەندین هاککەری روسی و چینی بەکرێگرتووە کە بەم هۆکارە توانیویەتی چەندین هێرشی سایبیری ئەنجام بدات دژی ئەمریکا کە گرنگترینیان هاککردنی سیستەمی نیشتنەوەی فڕۆکەیەکی سیخوڕی بێفڕۆکەوان بوو کە لەبری ئەوەی فڕۆکەکە لە بنکەیەکی ئاسمانی ئەمریکی لە پاکستان بنیشێتەوە لە باکوری ئێران نیشتەوە.

پێش دەیان ساڵ ئەم جۆرە رووداوانە تەنها لە فیلمە خەیاڵییە زانستیەکاندا دەبینران بەڵام لەئێستادا بوون بەڕاستی، وە بە تێپەڕبوونی کاتیش ئامێری ئاڵۆزتر و پێشکەوتووتر دادەهێنرێت کە رەنگە ئەم ئامێرانەی ئەمڕۆ لە چاویاندا زۆر سادەبن، هەر بەم هۆکارە حکومەتی وڵاتان بایەخێکی تایبەتی بە جەنگی سایبیری و هەواڵگری سایبیری دەدەن و وەک هەڕەشەیەکی جدی تەماشای دەکەن لەبەرئەوەی کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی و بەرەنگاربوونەوەی مەترسیەکان.

با نموونەیەک وەرگرین لەسەر سیستەمی هاککردن و دەسبەسەرداگرتنی سیخوڕەکان بەسەر کۆمپیوتەردا کە چییە و چۆن کاردەکات. کاتێک کەسانی رێپێنەدراو هەڵئەسن بەکرینەوە و چوونەژوورەوەی رژێمی کارپێکردنی ئامێرەکەت بەڕێگای نایاسایی و بەمەبەستی کاری خراپی وەک سیخوڕی و دزین و تێکدان، رێ دەکەوێ بۆ کەسی سیخوڕ هەستێ بە گواستنەوە یان سڕینەوە و زیادکردنی فایل و بەرنامە، هەروەک چۆن ئەتوانێ بڕیاردەربێ لە رژێمی کارپێکردنەکەدا و هەڵسێت بەدەرکردنی فەرمانی وەک لەبەرگرتنەوە (کۆپیکردن) و وێنەگرتن و پاشەکەوتکردن. سیخوڕەکان کێن؟ ئەو کەسانەن کە دەست بەسەر ئامێرەکەتدا دەگرن و ئەتوانن هەموو پەڕگەکانی ناوی

ببینن یان بیدزن و ئامێرەکەش تێک بدەن. بەو شێوەیە ئەبنە سیخوڕ(جاسووس) و ئەتوانن هەرچییەک تۆ دەیکەی لەڕێی ئینتەرنێتەوە ببینن. ئەو شتانەی هاوکارییان دەکات لەدەستبەسەرداگرتنی ئامێرەکەی ئەمانەی خوارەوەن:

١. بوونی فایلی سیخوڕی (Trojan)

سیخوڕ ناتوانێت دەست بەسەر ئامێرەکەتدا بگرێ ئەگەر پەڕگەی سیخوڕی لە کۆمپیوتەرەکەتدا نەبێ بۆ نموونە پەڕگەی ترۆجان. ئەو پەڕە یارمەتیی سیخوڕ ئەدەن بەهۆیانەوە بچنە ناو کۆمپیوتەرەکەت، کاتێک سیخوڕ یەکێک لە بەرنامەکانی سیخوڕی بەکاردەهێنێ کە ئەبەسترێتەوە بە فایلەکەوە کە وەک receiver کاردەکات، ئەتوانێت بە هۆیەوە سیخوڕ(ناوی بەکارهاتوو) و(وشەی نهێنیی تێپەڕ بوون) دابنێ تەنیا خۆی بتوانێ بچێتە ناو کۆمپیوتەرەکەت و، دەشتوانێ ئامێرەکە بەکراوەیی بەجێ بێڵێت بەجۆرێک هەر سیخوڕێکی تر بتوانێ بچێتە ناوی!

٢. پەیوەندی بە تۆڕی ئینتەرنێتەوە

سیخوڕ ناتوانێت بچێتەناو ئامێرێک ئەگەر تۆڕی ئینتەرنێتی پێوە نەبەسترابێت. واتە، ئەگەر کۆمپیوتەرەکەت پەیوەندی بە تۆڕی ئینتەرنێت یان هەر تۆڕێکی ترەوە نەبوو، مەحاڵە جگە لە خۆت کەسێکی تر بتوانێ بچێتە ناوی. لەبەر ئەوە هەرکاتێک هەستت کرد سیخوڕ چۆتە ناو ئامێرەکەت، خێرابکە لە پچڕینی پەیوەندیی ئامێرەکەت بەتۆڕی ئینتەرنێتەوە، تابتوانی رێ لەبڵاوبوونەوە و دەستبەسەرداگرتنی تەواوی سیخوڕ بگری لە ئامێرەکەتدا.

٣. بەرنامەی یاریدەدەر بە کاری سیخوڕی

سیخوڕی ئاسایی پێویستی بە بەرنامەی یاریدەدەر هەیە بۆ دەست بەسەراگرتن. ناسراوترینیان ئەمانەن:

Web cracker
Net Buster
Netbus Haaxporg
Net Bus ١,٧
Girl Friend
Busscong

BO Client and Server

کاتێک ئامێری کۆمپیوتەرەکەت تووشی پەرگەی سیخوڕی دەبێت ڕاستەوخۆ هەڵدەسن بەکردنەوەی (port) یان پەنجەرەیەکی ناو ئامێرەکەت، بەو شێوەیەش هەرکەسێک بەرنامەی سیخوڕی هەبێت ئەتوانێت بچێتە ناو ئامێرەکەت لەڕێی ئەو پەڕەوە کە هەڵدەسێ بە کردنەوەی ئەو جێیانەی لە پەنجەرە نهێنییەکان دەچن کە لەڕێیانەوە سیخوڕ دەچێتەژوور. سیخوڕ ناتوانێت دەست بەسەر ئامێری کۆمپیوتەردا بگرێت ئەگەر ئەم مەرجانەی نەبێت:

- دەبێت کۆمپیوتەرەکە هەڵگری پەرگەی سیخوڕی بێت.
- دەبێت سیخوڕ ژمارەی ئای پی ئەدرەسی تایبەتیی ئەو کەسە بزانێت.

لەگەڵ بوونی چەند مەرجێکی تری وەک پەیوەندیبوونی کۆمپیوتەرەکە بە تۆڕی ئینتەرنێتەوە و زانینی سیخوڕ لە چۆنێتی بەکارهێنانی بەرنامەی سیخوڕی بۆ دەستبەسەراگرتن.

بەمانایەکی تر، ئەگەر ئامێری کۆمپیوتەرەکە هەڵگری پەرگەی سیخوڕی نەبوو، سیخوڕ ناتوانێت بچێتە ناوی ئەگەر ژمارەی ئای پی ئەدرەسیش بزانێت، وە بە پێچەوانەشەوە مەحاڵە سیخوڕی ئاسایی بتوانێ بچێتە ناو ئامێرێک ئەگەر ژمارەی ئای پی ئەدرەس نەزانێت، تەنانەت ئەگەر کۆمپیوتەرەکە هەڵگری پەرگەی سیخوڕیش بێت.(جگە لە کەسانی باوەڕپێکراو لەم کارە، تەنیا لە توانای ئەواندایە بچنەناو هەر ئامێرێک لەگەڵ بوونی هەر بەرگرێک ڕێگای نهێنییان هەیە بۆ پەی بردن بە یاسا جیاوازەکان!)

ناونیشانی تایبەتیی بە هەموو بەکارهێنەرێکی تۆڕی ئەنتەرنێت، ئەو ژمارەیەیە کە شوێنی کۆمپیوتەرەکەی لێوە دەزانرێت کاتی بەکاربردنی تۆڕی ئینتەرنێت، ژمارەکە لە چوار بەش پێک دێت، هەربەشێکی ناونیشانێکی دیاریکراو دەستنیشان دەکا، بەشی یەکەمی ژمارەکە ناونیشانی وڵاتەکە و بەشی دووەم ناونیشانی کۆمپانیای دابەشکردنەکە و بەشی سێیەم دامەزراوی بەکارهێنراو و بەشی چوارەم بەکارهێنراوەکە خۆی. ژمارەی ئای پی ژمارەیکی جێگیر نیە و لەگەڵ هەر چونەژوورەوەیەکی

ئینتەرنێت دەگۆڕێت. بۆ نموونە ئەگەر تۆ چویتە ناو ئینتەرنێت و سەیری ژمارەی ئای پی یەکەت کرد ئەم ژمارەیە بوو(٦٣,٢٠٩,٣,١٠٢) پاشان پەیوەندیت لەگەڵ ئینتەرنێت پچڕاند و دوای چەند خولەکێک چویتەوە ناوی، دەبینیت ژمارەکە گۆڕاوە. بۆنموونە بەم شێوەیە: (٦٣,٢٠٩,٣,١٢٢) سەرنجی گۆڕان بدە لە ژمارەکانی کۆتایدا، ژمارە ١٠٢ گۆڕاوە بەژمارە ١٢٢. لەبەر ئەوە ئامۆژگاری دەکرێین بە بەکارنەهێنانی بەرنامەی قسەکردنی وەک (ICQ) لەبەرئەوەی هەڵدەستێ بە نیشاندانی ژمارەی ئای پی بەشێوەیەکی هەمیشەیی، تەنانەت لەگەڵ شاردنەوەشی سیخوڕ دەتوانێ بەکاربیێنێ بۆ چوونە ناو ئامێری کەسی داواکراو، لەگەڵ بوونی پەرگەی سیخوڕی لە کۆمپیوتەرەکەدا[1].

## ئێران و سوپا سیخوڕیەکەی

فەزای بەکارهێنانی ئینتەرنێت بۆتە نوێترین سنوور لە جەنگی ساردی چل ساڵەی نێوان ئێران و ئەمریکادا. دەکرێت بوترێت زیاتر لە هەر حکومەتێکی تر لە جیهان، کۆماری ئیسلامی ئێران کەوتۆتەبەر هێرشی وێرانکەری ئینتەرنێتی لەلایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیەوە. لەهەمانکاتدا، چەند گروپێکی سەربە هێزەکانی ئاسایشی ئێران —سوپای گاردی شۆڕشی ئیسلامی و وەزارەتی ئیتلاعات— شارەزایی و لێهاتوویەکی بێ ئەندازەیان هەیە لە بەئەنجامگەیاندنی ئۆپەراسیۆنی هێرشی سایبیریدا. ئامانجەکانی ئەم چەشنە هێرشانە پێک دێن لە رەخنەگرانی کۆماری ئیسلامی لە دەرەوە و ناوەوە، دامەزراوەکان، رێکخراوە ناحکومییەکان، و دامەزراوە ئابووریی، بەرگریی ودیبلۆماسییەکانی وڵاتانی وەک ئەڵمانیا، ئیسرائیل، سعودیە، و ئەمریکا. حکومەتی ئێرانی چەندین نموونەی هێرشە سایبیرییەکانی ئاشکراکردووە بۆسەر نەیارانی، کە توانا بەهێزەکەی ئاشکرا دەکەن لەکاتێکدا نکۆڵی لە چەندین هێرش کردووە کە دراوەتە پاڵی. بۆخودوورگرتن لەم جۆرە هێرشانە، ئێران تەکنیکی بەکارهێنانی گروپەکانی سەربەو وڵاتە ئەنجام دەدات و لەکۆتاییشدا نکۆڵی قابیلکەر[٤]

---

[1] پێگەی وەشان

بەکاردەهێنێت. سەرەڕای ئەم نکۆڵیانە، روونە کە ئێران توانایەکی زۆر بەگەڕدەخات بۆ هەردوو مەبەستی هێرشبردن و بەرگریی لە حکومەتەکەی، وە هیچ باکی نییە لە بەکارهێنانی ئەو سوپایە لە هەر رووداوێکی ململانێکارییدا.

تواناکانی سوپای ئێران لە بواری هێرشی سایبیرییدا بێگومان بەبەراورد لەگەڵ هی ئەمریکا، چین، روسیا بەمشێوەیە فراوانە پێشکەوتوو نییە. لەوکاتەی سوپای هاککردنی ئێرانییەکان لەسەرەتای ساڵانی ۲۰۰۰ەوە دەرکەوت، بەڵگەیەکی کەم هەیە لێیەوە دڵنیابین کە بەرلە ساڵی ۲۰۰۷ هیچ هێرشێکی لەم جۆرەی ئەنجام داوە یان نا. هۆکاری ئەم درەنگ دەستپێکردنەش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی توانای لەم بوارەدا.

سەرەڕای ئەمەش پەیمانگای پارتی دیموکراتی مۆسکۆ و چالاکانی سیاسی لە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکای ۲۰۱٦ ئەوەمان پێدەڵێن کە جەنگی زانیاری دەکرێت بەهۆی تەکنیکی زۆر سەرەتاییەوە ئەنجام بدرێت. ئێرانیش بەهەمان شێوە وڵاتان و دەزگای موعەرەز بەو جۆرە هێرشانە کە ناپێشکەوتوون لەناوەوە و دەرەوەی وڵاتەکەی کردۆتە ئامانج، وەک کۆمپانیاکانی نەوتی سعودیە، حکومەتەکانی رۆژهەڵاتی ناڤین، و بانقەکانی ئەمریکا. هەرچەندە ئەو ئۆپەراسیۆنانە بوونەتە زیانی گەورەی دارایی، ئەو میتۆدانەی بەکارهێنران بۆ لەناوبردنی داتاکان و یان رێگرتن لە چوونە ناو سیستەمەوە بەشێوەیەکی رێژەییانە سادەدە بوون.

ئێران ئەوەی نیشانداوە کە چۆن وڵاتانی لاواز لە بواری سەربازیی دەتوانن ئۆپەراسیۆنی سایبیری بەکاربهێنن بۆ بەربەرەکانێکردن لەگەڵ وڵاتانی نەیاری پێشکەوتوو. ئۆپەراسیۆنەکانی تەهران لەدژی بەرژەوەندییە بیانییەکان بەزۆری سیخوڕی و تێکدان بووە لەدژی ئامانجی نەرم لە وڵاتانی نەیاردا، نەوەک دزی ئابووریی. هێرشی وێرانکەر و تێکدەر بەبەردەوامی لەلایەن تەهرانەوە بەکارهاتووە بۆئەوەی توانای خۆی نیشان بدات و بەنەیارەکانی بڵێت ئێمەش لەم مەیدانەدا وجودمان هەیە. بەشێوەیەکی گشتی، رووداوی تێکدەر بەپشت بەستن بە ستراتیژیەتی ئەو وڵاتەوە، تەنیا لەوکاتەدا ئەنجام دەدرێن کە وەک تۆڵەکردنەوە سەیر بکرێن لەکاتی جەنگدا. واتە، زۆربەی هەرزۆری قوربانیانی ئەم جۆرە هێرشانە هەر لەنێو

سنووری ئێراندان یان دەکرێنە سەر ئەو ئێرانیانەی لە دەرەوەی وڵاتدا دەژین — ئەوانەی کە پێیان دەوترێت دوژمنی ناوەخۆیی کە سەرکردایەتی تەهران زۆر لێیان دەترسێت.

بەکارهێنانی ئینتەرنێت و سۆشیال میدیا لەلایەن رژێمە نەیارەکان و رەخنەگرەکانی ئێرانەوە هۆکاری باش بوون بۆئەوەی وا لە بیریارانی تەهران بکات کە هێزە دەرەکییەکان لەرێگای تەکنەلۆژیای نوێوە خەریکی پیلانگێرانن لەدژی کۆماری ئیسلامی. بەڵام ئامانجی هێرشەکانی دیجیتاڵی ئێران تەنیا بەرگریکارانی مافی مرۆڤ و وڵاتانی نەیار نین بەڵکو دامەزراوە سیاسییە کولتورییەکان و تەنانەت دامەزراوە حکومییەکانی ئێرانیش دەگرێتەخۆی. سیخوڕی دیجیتاڵی و هێرشی تێکدارانە لەدژی رەخنەگرانی دەوڵەت ئەوەی بۆ رای گشتی ئێران سەلماندووە کە چالاکییەکانی ئۆنلاینی هەر تاکێکی ئەو وڵاتە دوورنییە لە مەودا و سنووری دەوڵەت. هەربۆیە، زۆر گرنگە ئەوە بزانین کە ئیتر ئێرانیش هاتۆتەنێو بازنەی ئەو وڵاتانەی هەروا بەئاسانی خۆیان بەدەستەوە نادەن و جەنگی سایبیریان راگەیاندووە.

## ئێران: ئامانج و تێکدەر

لەسەرەتای چالاکی سایبیری ئێرانیەوە لەهاوینی ٢٠١٢ —بەئاشکراکردنی سۆفتوێرێکی سیخوڕی بەناوی *مەهدی*– کۆمپانیاکانی ئاسایشی ئینتەرنێتی و دەزگاکانی حکومەتە رۆژئاواییەکان بەشێوەیەکی رۆتینی هەموو ئەو چالاکیە مەترسیدارانەی ئێرانیان تۆمارکردووە کە بەهۆی هێرشی سایبیرییەوە دەکرێتە سەریان.[1] لەگەڵ ئەوەشدا، سەرەڕای ئەو هێرشانەی دەکرێنەسەر دامەزراوە بیانییەکان، ئەم راپۆرتانە زۆر بەدەگمەن باسیان لە سروشتی ئۆپەراسیۆنە سایبیرییەکان و پاڵنەرەکانی هێرشکردن کردۆتەوە.

[1] GReAT, “The Madi Campaign – Part I,” SecureList, July ١٧, ٢٠١٢, https://securelist.com/blog/ incidents/٣٣٦٩٣/the-madi-campaign-part-i-٥.

تێرامانی تەهران لەسەر ئەم هێرشە زۆرانە ڕۆنراوە کە دەکرێتەسەر ژێرخانی ئەو وڵاتە. لەوکاتەوەی جبەخانەی ناووکی نهێنی ئێرانی لەلایەن گروپێکی ئۆپۆزسیۆن لەساڵی ٢٠٠٢ ئاشکراکرا، ژمارەیەکی بەرچاوی ئەکتەری بیانی هەڵسان بە پێکهێنانی چەند ئۆپەراسیۆنێکی سایبیری کە ئامانج لێیان دەستگەیشتن بوو بە جبەخانەی ناووکی ئێران، ژێرخانی ئابووریی، کەلوپەلی سەربازیی، و دەزگا حکومییەکان، بۆ هەردوو مەبەستی سیخوڕی و تێکدانیان.[i]

لەڕاستیدا، زۆربەی نموونە دیارەکانی مۆدێرن سەبارەت بە جەنگی سایبیری بریتیین لە ئۆپەراسیۆنی تێکدان –کە لەمێژوودا لەڕووی ئامادەکاری و پێشکەوتنەوە وێنەی نەبووە– کە لەلایەن ئەمریکا و ئیسرائیلەوە لەدژی جبەخانەکانی ناووکی ئێران ئەنجامدراون. لە ئۆپەراسیۆنەی کە بە ئۆپەراسیۆنەکانی ئۆلۆمپیک ناسرابوو، سیخوڕی سایبیری بەناوی (Stuxnet) بەکارهات بۆ تێکدانی پێکهاتەکانی جبەخانەی پیتاندنی یۆرانیۆمی ناتانز، کە بووە هۆی وێرانکردنی زیاتر لە هەزار یەکەی ئەتۆم و ئێرانی لە پێشکەوتنەکانی ناووکی زیاتر لە یەک ساڵ بردە دواوە.[ii]

لەوکاتەی بەرنامەی (Stuxnet)ی سیخوڕ تاکە ئامانج لێی بریتیی بوو لە لاوازکردنی بەرنامەی ناووکی ئێران، چەندین ئۆپەراسیۆنی تریش ڕێکخران بۆئەوەی ژێرخانی ئابووری و نەوتی وڵاتەکە تێکبدەن. لە ئایاری ٢٠١٢، ژمارەیەکی زۆر لە توێژەر ئۆپەراسیۆنێکی تری وێرانکەریان لەدژی ئێران ئاشکرا کرد.[iii] ئەو سیخوڕ سایبیریانەی بە (Wiper) و (Flame) ناسرابوون، جێگرەوەی (Stuxnet)، لەوکاتە دۆزرانەوە کە کۆمپیوتەرەکانی وەزارەتی نەوتی ئێران و کۆمپیوتەرەکانی کۆمپانیای نەوتی

---

[i] David E. Sanger, "Obama Order Sped Up Wave of Cyberattacks Against Iran,"NewYorkTimes,June ١,٢٠١٢,http://www.nytimes.com/٢٠١٢/٠٦/٠١/world/middleeast/obama-ordered-wave-of-cyberattacksagainst-iran.html.

[ii] Langner, R. (٢٠١١). Stuxnet: Dissecting a cyberwarfare weapon. *IEEE Security & Privacy*, ٩(٣), ٤٩-٥١.

[iii] Iran's National Computer Emergency Response Team, Kaspersky Lab, and CrySyS Lab.

نیشتیمانی ئێرانی لەکارکەوتن. لەکۆتاییدا دەرکەوت کە ئیسرائیل لە پشت ئەم کارەوە بووە.[i]

چەندین ئۆپەراسیۆنی دژبە ئێران لەماوەی دوای ئۆپەراسیۆنی یارییەکانی ئۆلۆمپیک بەردەوام بوون. لە حەزیرانی ۲۰۱۲دا، لەسەروبەندی گفتوگۆ چڕەکانی نێوان ئێران و زلهێزە نێودەوڵەتییەکان، وەزیری ئیتلاعاتی تەهران رایگەیاند کە جبەخانەی ناوکی وڵاتەکەی بۆتە ئامانجێکی تری "هێرشێکی مەزنی سایبیری."[ii] لەکۆتاییەکانی ئەو ساڵەدا، ئێران رایگەیاند کە چەند ئۆپەراسیۆنێکی تری سایبیری کراوەتەسەر بانکی ناوەندی، وەزارەتی فەرهەنگ، کۆمپانیای نەوتی ئێرانی سەردەریا.[iii]

جگە لە کردەی تێکدان، دەزگا هەواڵگرییە بیانییەکان بە بەردەوامی ژێرخانی ئێرانییان دەکردە ئامانج بەمەبەستی ئەنجامدانی کردەی سیخوڕیی، ئەم راستییە دواتر لەلایەن ئێدوارد سنۆدن (لە بەشی چوارەمدا باس کراوە) بۆ رای گشتی ئاشکرا کرا. کارمەندێکی پێشووی دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکا رایگەیاند کە سنۆدن کارێکی کردووە کە بۆتە هۆی نیشاندانی ئەو راستییە کە ئێران یەکێکە لەو وڵاتانەی جیهان کە زۆرترین چاودێری لەسەر دەکرێت: ملیاران هێڵی ئینتەرنێت و تۆماری تەلەفۆن لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا و هاوکارانی کۆکردونەتەوە. لەڕاستیدا، ئێران بەشێوەیەکی وا چاودێری دەکرێت کە ئۆپەراسیۆنێکی سیخوڕی کەنەدی لەدژی ئێران جارێکیان گیربوو لە ئۆپەراسیۆنێکی هەواڵگری فەرەنسی کە ئەوانیش خەریکی سیخوڕیکردن بوون بەسەر هەمان تۆڕەوە.[iv]

---

[i] Ellen Nakashima, Greg Miller, and Julie Tate, "U.S., Israel Developed Flame Computer Virus to Slow Iranian Nuclear Efforts, Officials Say," Washington Post, June ١٩, ٢٠١٢, https://www.washingtonpost .com/world/national-security/us-israel-developed-computer-virus-to-slow-iranian-nuclear-effortsofficials-say/٢٠١٢/٠٦/١٩/gJQA٦xBPoV_story.html.

[ii] "Iran Says Detected 'Massive Cyber Attack:' State TV," Reuters, June ٢١, ٢٠١٢, https://www.reuters .com/article/us-iran-cyber-nuclear/iran-says-detected-massive-cyber-attack-state-tv-idUSBRE٨٥K١EA٢٠١٢٠٦٢١.

[iii] "Iran 'Fends Off New Stuxnet Cyber Attack,'" BBC News, December ٢٥, ٢٠١٢, http://www.bbc.com/ news/world-middle-east-٢٠٨٤٢١١٣.

[iv] Communications Security Establishment Canada, "SNOWGLOBE: From Discovery to Attribution," accessed December ٤, ٢٠١٧, a presentation discussing

## چۆن ئێران بەرپەرچی ئەم هێرشە سیخوڕیانە دەداتەوە؟

ڕێبەری مەزنی ئێران، ئایەتوڵا خامنەیی، لەمێژە بڕوای وایە ئامانجی واشنتۆن ڕوخاندنی کۆماری ئیسلامی ئێرانە، ڕێک وەک ئەو کارەی کە لەدژی ڕژێمی کۆمۆنسیتی چیکوسلۆڤاکیا ئەنجامیدا.[i] بەپشت بەستن بەم ژیربیرییە (مەنتیق)، ئێرانیش لەشکری سیخوڕی سایبیری خۆی وەگەڕخست و ئەویش ویستی ببێتە شۆڕەسوارێکی ئەم مەیدانە و هەروا دەستەوەستان نەوەستێت چونکە لەم سەردەمەدا ئەمە دەبێتە هەڕەشەیەکی مەزن بۆسەر سەقامگیری خودی ڕژێمەکەی. تەهران هەمیشە کردەوە قێزەوەنەکانی لەبواری ئینتەرنێتدا بەسەر هاوڵاتیانی خۆیەوە دەداتەپاڵ دوژمنەکانی، بەتایبەتی ئەمریکا، بۆئەوەی کۆماری ئیسلامی لەناوبەرێت. پشتیوانی حکومەتە خۆرئاواییەکان بۆ دەستگەیشتن بە ئینتەرنێتی بێ سانسۆر و وێستگە تەلەڤزیۆنیەکانی فارسی زمان —وەک بی بی سی فارسی— وەک پێکهاتەی سەرەکی ئەم ستراتیژیەتە دەبینرێن. هاتنەمەیدانی سۆشیال میدیا، وەک فەیسبووک و تویتەر، و ئەپلیکەیشنی نامەناردن، وەک تێلێگرام، هەڕەشەیەکی مەزنن بۆسەر مۆنۆپۆلی درێژخایەنەی حکومەتی ئێران بەسەر میدیا و گەیاندنەوە.

نیگەرانی هەرەمەزنی خامنەیی لەوکاتەدا هەستی پێکرا کاتێک لە حەزیرانی ۲۰۰۹دا ئەحمەدی نەژادی سەرسەخت دووبارە وەک سەرۆک هەڵبژێردرایەوە-هەرچەندە دەوترا بە تەزویر و ساختە بووە. ئەمە بووەهۆی ڕاپەڕینێکی سەرتاسەری خەڵکی ئێران کە لەکاتی شۆڕشی ئەو وڵاتەوە لەساڵی ۱۹۷۹ ئێران شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو. هەروەها، ئەمە ساتێکی گرنگ بوو لە چۆنیەتی بەرپەچدانەوەی تواناکانی هێرشی سایبیری حکومەتی ئێرانی، لەوکاتەی ئەو جوڵانەوە مەزنە —کە بە بزووتنەوەی سەوز ناسرابوو— بووە بە یەکێک لە سەرەتاییترین ئامانجی زانراوی ئۆپەراسیۆنەکانی ڕژێمەکە. ڕکەبەری ئۆنلاینی نێوان ئۆپۆزسیۆن، بەبەکارهێنانی ئینتەرنێت بۆ

---

the French malware otherwise known as Babar, available at http://www.spiegel.de/media/media-٣٥٦٨٣.pdf.

[i] Karim Sadjadpour, "Reading Khamenei: The World View of Iran's Most Powerful Leader," Carnegie Endowment for International Peace, March ١٠, ٢٠٠٨, http://carnegieendowment.org/files/sadjadpour_ iran_final٢.pdf.

هەماهەنگی خەباتی سیاسیی، و حکومەت، بۆ هەوڵدان بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو جوڵانەوەیە، بووەهۆی ڕێگاخۆشکردن بۆ ململانێی داهاتوو نەک تەنیا لەنێوخۆی وڵات بەڵکو تەنانەت لەگەڵ هێزە بیانییەکانیش.

هەرزوو دوای ئەوەی نزیکەی دوو ملیۆن ئێرانی لە ١٥ حەزیرانی ٢٠٠٩ خۆپیشاندانیان ئەنجامدا، پشتەڤانانی بزووتنەوەی سەوز دەستیانکرد بە خەبات لەدژی حکومەت لەسەر کۆنترۆڵکردنی زانیاری.[أ] کاتێک دەسەڵاتداران میدیاکارانی بیانی لە وڵاتەکەی دەرکرد، تۆڕی مۆبایلی کوژاندەوە، و چەندین ڕەخنەگری دیاری دەستگیرکرد، ئەم جارە ئینتەرنێت بوو بە کەناڵی سەرەکی بۆ هاوئاهەنگیکردن لەنێو ئاژاوەکەدا. لەوەڵامدا، کۆنگرێسی ئەمریکا، پاشان ئیدارەی سەرۆک باراک ئۆباما، وە کۆمپانیاکانی تەکنەلۆژی ئەمریکی وایان بەباش زانی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە ئێران بەئاسانی دەستیان بەو کەناڵانە بکات "

لەو ماوەیەدا، هاککەرانی پشتیوانی ڕژێم ئەلیبراوانە کاریان دەکرد بۆ تێکدانی وێبسایت و چاودێریی خستنەسەر ئەواری تۆڕی ئینتەرنێت. لەنێوان کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩ و حەزیرانی ٢٠١٢دا، گروپێک کە ناوی لەخۆینابوو سوپای سایبیری ئێرانی چەندین وێبسایتی هاککرد کە سەربە ئۆپۆزسیۆنی سیاسیی ئێرانی، کۆمپانیای ئیسرائیلی، میدیای سەربەخۆی فارسی زمان، و پلاتفۆرمی سۆشیال میدیا بوون، بەمەش لەجیاتی پۆستی دژە حکومەت بکرێت، ئەمان هەڵسان بە پۆستکردنی هەموو ئەو پەیامانەی پاڵپشتی ڕژێمیان دەکرد. کاتێک چالاکوانانی مافەکانی مرۆڤ و سەرکردەکانی ئۆپۆزسیۆن بانگی خەڵکیان کرد بێنەسەر شەقام، وێبسایتی گرنگی

---

[أ] "١٥ June ٢٠٠٩ – Tehran – Iran – Protest continued – Protesters Are Going to Freedom (Azadi Sq)," YouTube video, ١:٠٢, posted by "saeidkermanshah," June ١٥, ٢٠٠٩, https://www.youtube.com/watch?v=٩_hr٧G٤At٨٤.

[٤] "U.S. State Department Speaks to Twitter Over Iran," Reuters, June ١٦, ٢٠٠٩, http://www.reuters.com/article/us-iran-election-twitter-usa idUSWBT٠١١٣٧٤٢٠٠٩٠٦١٦. More aggressively, in an opinion piece in the Wall Street Journal, a former

سەر بەو گروپانە بوونە ئامانجە ئەو سوپا سایبیرییە.[i] ڕەخنەگرانی حکومەت سیخوڕییان بەسەرەوە کرا. تەنانەت هاککەرێکی ئێرانی توانی بچێتەناو سیستەمی کۆمپانیایەکی ئاسایشی هۆڵەندی بەناوی (DigiNotar) کە ڕێگای خۆشکرد بۆئەوەی تەهران سیخوڕی بەسەر هەموو بەکارهێنانی ناوخۆیی (Gmail) بکات، کە بە یەکێک لە مەزنترین هاککردنی ئاسایش لە مێژووی ئینتەرنێتدا دێتەهەژمار.[ii]

لەکۆتاییدا، درندەیی، چاوەدێری لەڕێگای ئینتەرنێت، وە ئەو سانسۆرەی لەلایەن هێزەکانی ئاسایشەوە خرایە سەریان، بزووتنەوەی سەوز لاواز بوو، و بۆ ساڵی ٢٠١١ گڕی خۆپیشاندانی گشتی کوژایەوە. دەزگاکانی ئاسایش ژینگەیەکی دیجیتالی مۆدێرنیان پەرەپێدا، هەموو ئەوانەی لە خۆپیشاندانەکان بەژداربوون چاودێری چڕیان خرایەسەر، هەژماری سۆشیال میدیای هەموویان پشکنینێکی وردیان بۆکرا و ئەوانەی لەم تۆڕانەدا چالاک بوون دەستبەجێ دەستبەسەرکران. دواتر بەرپرسێکی گاردی شۆڕشی ئیسلامی وتی کە ڕاگرتنی ئەو خۆپیشاندانانە پێویستی بەوە دەکرد ژمارەیەکی زۆر خەڵک دەستگیر بکرێت، و هەموو ئامرازەکانی پەیوەندی وەک تەلەفۆن و ئینتەرنێت، بپچڕێنرێت.[iii] بزووتنەوەی سەوز ئەوەی بۆ کۆماری ئیسلامی دەرخست کە دەکرێت ئینتەرنێت وەک ئامرازێکی جووڵاندنی شەقام بەکاربهێنرێت و کاریگەرییەکی بێئەندازەی هەیە لەسەر مۆنۆپۆلکردنی زانیاری لەلایەن ڕژێمەوە.

---

[i] "Cyber-attack on BBC Leads to Suspicion of Iran's Involvement," BBC News, March ١٤, ٢٠١٢, www.bbc.com/news /technology-١٧٣٦٥٤١٦.

[ii] Black Tulip: Report of the Investigation Into the DigiNotar Certificate Authoritybreach(Delft:FoxITBV,٢٠١٢),https://www.rijksoverheid.nl/binarierijk soverheid/documenten/rapporten/٢٠١٢/٠٨/١٣/ black-tulip-update/black-tulip-update.pdf.

[iii] Akbar Ganji, "Iran's Green Movement Five Years Later – 'Defeated' But Ultimately Victorious," Huffington Post, accessed December ٤, ٢٠١٧, https://www.huffingtonpost.com/akbar-ganji/iran-greenmovement-five-years_b_٥٤٧٠٠٧٨.html.

## تواناکانی هێرشی ئەلیکترۆنی ئێران

ئۆپەراسیۆنی ئەلیکترۆنی دەرفەتی کەم مەترسیدارتری داوەتە تەهران بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و تۆڵەکردنەوە لەدژی نەیاری ناوەخۆیی و دەرەکی رژێمەکەی. بەرلەوەی تەکنەلۆژیای پەیوەندی زانیاری بەشێوەیەکی ئاوا بەربڵاو بەردەست بێت، ئۆپەراسیۆنە هەواڵگرییەکانی حکومەتی ئێران بەزۆری پشتی بە تەجنیدکردنی هەواڵدۆزی بیانی دەبەست بۆ سیخوڕیکردن و غافڵکوژی دیبلۆماتکار و نەیارەکانی رژێم. ئەم ئۆپەراسیۆنانە بەشێوەیەکی رۆتینی دەبوونە جێگای شەرمەزاری پێگەی ئێران لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا لەوکاتەی هێرشبەرەکان دەگیران، جگە لەوەش تەنانەت لەکاتی سەرکەوتنیشیاندا ئێران لەلایەن سەرانی وڵاتانەوە سەرکۆنە دەکرا. بەبەراورد لەگەڵ ئۆپەراسیۆنی نهێنیدا، تواناکانی هێرشی سایبیری بووەهۆی پێدانی نکۆڵیکردنێکی بەهێزتر و بەم پێیەش کەمتر دەبووە ئامانجی تۆڵەکاری لەلایەن وڵاتانەوە چونکە بکەری ئەم جۆرە کارانە بەشێوەیەکی نادیار کاردەکات و ناسنامەکەی دیار نییە.

بەدرێژایی دەیەی رابردوودا، ئۆپەراسیۆنی هێرشی سایبیری بوونەتە ئامرازی هەرەدیاری حکومەتی ئێرانی، بۆ مەبەستی سیخوڕی، پێدانی زانیاری بە سیخوڕەکان، و هەڕەشە. هەروەها، ئاستی پرۆفیشنالیەت، ئامادەکاریی و پێویستی بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی لەم چەشنە (وەک ئۆپەراسیۆنی یارییەکانی ئۆلۆمپیک)، ئێران هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە. بەپێچەوانەی ئۆپەراسیۆنە سایبیرییەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل، کە لەلایەن دەزگای هەواڵگرییە پرۆفێشنالەکانەوە بەپشتیوانی بودجەی ملیار دۆلاری ئەنجام دەدرێن، تواناکانی بەرگریی و هێرشی ئێرانی بەشێوەیەکی رێکخراو نین و پارەیەکی کەمیان بۆ دابین کراوە.[1] هەربۆیە، ئێران لەم رووەوە تووشی

---

[1] Barton Gellman and Ellen Nakashima, "U.S. Spy Agencies Mounted ٢٣١ Offensive Cyber-Operations in ٢٠١١, Documents Show," Washington Post, August ٣٠, ٢٠١٣, https://www.washingtonpost.com/world/national-security/us-spyagencies-mounted-٢٣١-offensive-cyber-operations-in-٢٠١١documentsshow/٢٠١٣/٠٨/٣٠/d٠٩٠a٦ae١١٩e١١e٣b٤cbfd٧ce٠٤١d٨١٤_story.html.

گرفتی زۆر دەبێتەوە و لەلایەن نەیارانیەوە، بەتایبەتی ئەمریکا و ئیسرائیل، هەڕەشەیەکی زۆری لەسەرە. تەنانەت کۆکردنەوەی هەواڵگری مرۆیی تەهرانیش لە وڵاتە بیانییەکاندا، بەتایبەتی لە دەرەوەی رۆژهەڵاتی ناڤین، بەهەمان شێوە لاوازە.
ئێران زۆر بەکەمی بەرپرسیاریەتی تۆپەراسیۆنی هێرشی سایبیری دەگرێتەئەستۆ، بەوانەشەوە کە پشتیوانی کۆماری ئیسلامی دەکەن، و چەندین لێدوانی دژبەیەکی داوە لەمەڕ پێگەی هێرشە سایبیرییەکانی. دەسەڵاتدارانی ئێرانی مێژوویەکی درێژیان هەیە لەگەڵ جوان نیشاندانی توانا سەربازییەکانی وڵاتەکەی، بە تۆپەراسیۆنی سایبیریشەوە. لە وەڵامی زنجیرەیەک لە تێکدانی ژێرخانەکەی لە ئۆکتۆبەری ٢٠١٢، وەزیری ئیتلاعاتی ئەو وڵاتە، حەیدەر موسلیحی، ئاماژەی بەوەدا کە "کۆماری ئیسلامی ئێران لە فەزای سایبیریدا ئەوەندە بەهێزە کە تەنانەت سەرکردەی زلهێزەکانی جیهانیش دان بە سەرکەوتنەکانی وڵاتەکەماندا دەنێن."[i] فەرمانداری گاردی شۆڕشی ئیسلامی، موحسین کازمی، رایگەیاند کە بەشی کاروباری سایبیری گاردی شۆڕشی ئیسلامی ئەرکی ئەوە نەبووە تۆپەراسیۆنی هێرشکاریی ئەنجام بدات.[ii]
ئێران چەندین راپۆرتی بەکارهێنا بۆئەوەی وانیشانی چاوی جیهان بدات کە وڵاتەکەی قوربانییە و ستەمی لێدەکرێت، مەبەست لەمەش تەنیا ئەوە بوو سەرنجی جیهان و رای گشتی لەسەر پێشێلکارییەکانی لابدات، هانی تواناکانی خۆی بدات بۆئەوەی بەرپەرچی هێرشی مەترسیدار بداتەوە. کاتێک لەلایەن ئەمریکاوە تۆمەتبارکرا بە ئەنجامدانی هێرشی تێکدان لەدژی بانقەکانی ئەمریکا، جێگری وەزیری دەرەوەی ئێران، حوسێن جابری ئەنسار، وەڵامی دایەوە کە "حکومەتی ئەمریکا، کە دەیان ملیۆن کەسی بێتاوانی خستۆتە مەترسی ژینگەیەکی کارەساتبار لەڕێی هێرشی سایبیری لەدژی جبەخانەی ئاشتیانەی ناووکی ئێران، لەو پێگەیەدا نییە ئەوتۆمەتانە

---

[i] "Minister: Iran Faces ٥٠٠ Daily Cyber Attacks," Khabar Online, November ١٠, ٢٠١٢, http://english .khabaronline.ir/detail/١٨٣٠٠٧.
[ii] "We just want to monitor (enemies') cultural and social moves in cyber," quoted in "IRGC to Set Up Division to Defend Iran Against Cyber Threats," Sahar TV, October ١٦, ٢٠١٢, http://english.sahartv.ir/ news/irgc-to-set-up-division-to-defend-iran-against-cyber-threats-١٦٣٨.

بداتە پاڵ هاوڵاتیانی وڵاتێکی تر، بە ئێرانیشەوە، بەبێ ئەوەی بەڵگەی دروستی لەبەردەستدا بێت."[i] بەدرێژایی دروستبوونی کاری سەرەکی ئێران وابووە کە خۆی وەک قوربانی هێرشە سایبیرییەکانی ئەمریکا نیشان بدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەساڵی ٢٠١٥دا رایگەیاند کە ناوەندی هێرشە لەناکاوەکانی سایبیری بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە توانیویانە بەرلە هێرشە سایبیرییەکانی ئەمریکا لەدژی ژێرخانی پیشەسازی ئەو وڵاتە بگرن. سەرانی ئێرانی بەبەردەوامی رادەگەیەنن کە گرێبەستکارانی وڵاتەکەی توانیویانە بەرهەمی بەرگریی پەرەپێبدەن، وە نموونەی هەرە دیاریشیان دروستکردنی سۆفتوێری دژەڤایرۆسی "پادڤیش"ە.[ii] سەرباری ئەم بانگەشانە، ئێران سەرکەوتنی زۆر کەمی بەدەستهێناوە لە دروستکردنی پیشەسازییەکی پێشکەوتووی ئاسایشی سایبیری بۆ پاراستنی ژێرخانی وڵاتەکەی.

### ئامانجە دەرەکییەکانی ئێران

بەلەبەرچاوگرتنی توانای سایبیری ئێران و بەرەنگاربوونەوەی نەیارەکانی، ئەو وڵاتە هەمیشە لەئامادەباشییدا بووە هێز و بازووی خۆی بۆ تۆڵەسێنی نیشان بدات. بەشێوەیەکی تایبەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، تەهران بە ئۆپەراسیۆنی سایبیری هەڕەشە لە نەیارەکانی کردووە. لەڕاستیدا، هیچ کاتێک ئێران سڵ ناکاتەوە لە لێدانی هەر ئامانجێک کە لەدژی ئەو وڵاتەی لە مەیدانە، تەنانەت ئەو وڵات و گروپانەش کە هاوبەشی دەکەن لە ئایین و ئایدۆلۆژیای ئەو وڵاتە. بۆ نموونە، چەند رۆژێک دوای رووداوەکەی ئەیلولی ٢٠١٥ لە وەرزی حەجدا کە بووە هۆی کوژرانی ٤٥٠ حەجاجی ئێرانی، حکومەتی سعودی و وەزارەتی حەج لەم چەندە تۆمەتبارکران. هەرکە پەیوەندیەکان بەشێوەیەکی خێرا لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا ئاڵۆزیان تێکەوت،

---

[i] "Statement by Foreign Ministry Spokesman for Indictment of US Justice Department Against Seven Iranian Citizens," Iranian Ministry of Foreign Affairs, March ٢٦, ٢٠١٦, http://mfa.gov.ir/index.aspx?fkeyid=&siteid=١&pageid=٢١٢٢&newsview=٣٨٥٧٣٥.

[ii] "Iran Unveils ١٢ Cyber Products," FARS News Agency, December ١٤, ٢٠١٣, http://en.farsnews.com/ newstext.aspx?nn=١٣٩٢٠٩٢٣٠٠١٣٢٢.

بەتایبەتی لەمەڕ چارەنووسی ونبوونی دیبلۆماتکارێک، سیخوڕی سایبیری بوو بە ئامرازی سەرەکی کۆکردنەوەی زانیاری بۆ تەهران.

جگە لە سعودیە، دانیمارک، ئەڵمانیا، ئیسرائیل و ئەمریکا لەنێو ئەو وڵاتانەن کە بەشێوەیەکی ئاشکرا هەوڵە سیخوڕیەکانیان لەلایەن گروپە ئێرانییەکانەوە دژی حکومەت، سوپا و دامەزراوە زانستییەکانیان بڵاوکردۆتەوە.[i] تەهران تەنیا ئەو وڵاتە زلهێزانە ناکاتە ئامانج، بەڵکو هەوڵی بێوچانی بەگەڕخستووە بۆ بەئامانجگرتنی وڵاتانی دراوسێی خۆی لە سەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئێستا با کەمێک لەسەر هەڕەشەکانی ئێران بۆسەر یەک بە یەکی ئەو وڵاتانە بدوێین و بزانین ئامانجی دەزگا سایبیرییەکانی ئەو وڵاتە تا چ ئەندازەیەک دەڕوات و کامە وڵاتی کردۆتە ئامانج.

ئەمریکا و ئەوروپا دوو شوێنن کە سوپای سایبیری ئێرانی بە بەردەوام هێرشیان کردۆتەسەر. لە ئەیلولی ٢٠١٢، گروپێک کە ناویان لەخۆیان نابوو شەڕڤانانی سایبیری *عزالدین القسام* ڕایگەیاند کە دەستی بە کەمپینێکی هێرشی سایبیری لەدژی سێکتەرە داراییەکانی ئەمریکای کردووە. بەرلە کەمپینەکە، ئەنجامدەرانی ئەم کارە لاوازی ئاساییشی هەزاران سۆفتوێری تریان قۆستبووەوە و خستبویانە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان. لەبەرئەوەی ئەم سوپایە سێرڤەر و شوێن و پێگەیان لەناو چەندین کۆمپانیای خۆجێیدا قایمکردبوو، هێرشبەرەکان دەیانتوانی بەلێشاو ئامانجەکانیان بپێکن. لەقۆناغە سەرەتاییەکانی ئۆپەراسیۆنی ئەبابیلدا، گروپەکە ژێرخانی سیستەمی بانقی ئەمریکای کردە ئامانج. بەنائامادەبوون بۆ بەرگەگرتنی هێرشێک بەم قەبارە مەزنە، داتابەیس و سیستەمی قوربانییەکانی ئەم هێرشە بەشێوەیەکی فراوان دەستی بەسەرداگیرا.

قۆناغەکانی دواتری کەمپینەکە کاریگەرییەکی کەمتری هەبوو چونکە بانقەکان سیستەمی بەرگری سایبیری خۆیان بەهێزتر کردبوو. بۆ هەوڵی چوارەمی هێرشەکە، لە تەمموزی ٢٠١٣، کاریگەرییەکی زۆر دەگمەنی جێهێشت. بەڵام هێشتاش، بەپێی

---

[i] "Verfassungsschutzbericht ٢٠١٥" (in German), German Ministry of the Interior, June ٢٠١٦, https:// www.verfassungsschutz.de/de/download-manager/_vsbericht-٢٠١٥.pdf

قسەکانی ئێف بی ئای، ئۆپەراسیۆنی *ئەبابیل* بووەهۆی داخستنی هەژماری سەدان هەزار کەس، ملیۆنان دۆلاری تێچووی دووبارە چاککردنەوەیان بوو. لە لێکۆڵینەوە لەم رووداوەدا لەلایەن ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی (NSA) ئەو وڵاتەوە، پاڵنەرەکانی پشت هێرشەکانی ئۆپەراسیۆنی ئەبابیل بەڕوونی خرانەڕوو: "[هەواڵگری هێمایی] ئاماژە بەوە دەدات کە ئەم هێرشانە لە تۆڵەی چالاکیەکانی خۆرئاواوە بوون لەدژی کەرتی ناوکی ئێران و بەرپرسە باڵاکانی حکومەتی ئێرانی ئاگاداری ئەم هێرشانە بوون."[i]

تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئۆپەراسیۆنی *ئەبابیل* بە وێرانکەرترین هێرشی سایبیری ئێرانییەکان بۆسەر ئەمریکا دێتە هەژمار. لەکاتێکدا ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی (IAEA) رایگەیاندووە کە تەهران لەرێگای چەند ئامێرێکەوە چاودێری بەسەر پشکنەرانی چەکی ناوکی کردووە لەساڵی ۲۰۱۱، بەڵام هێشتاش زانیاری کەم هەیە لەسەر ئەوەی ئێران تا چ ئەندازەیەک بەرلە ساڵی ۲۰۱۲ لەڕووی سیخوڕی سایبیری پێشکەوتوو بووە.[ii] هەر ئەو هاوینە بەشێوەیەکی ئاشکرا دەرکەوت کە هەڕەشەی سایبیری ئێرانی چەند هەڵمەتێکی تری رێکخستووە بۆ سیخوڕیکردن بەسەر نەیارانیدا. ڤایرۆسی سیخوڕی *مەهدی* زیاتر لە هەشت سەد دەزگا و دامەزراوەی لەماوەی یەک ساڵدا کردە قوربانی. ئەو دەزگا و دامەزراوانەی بوونە قوربانی

---

[i] U.S. National Security Agency, "Iran – Current Topics, Interaction With GCHQ," Intercept, written January ۸, ۲۰۰۷, published February ۱۰, ۲۰۱۵, https://theintercept.com/document/۲۰۱۵/۰۲/۱ iran-current-topics-interaction-gchq/.

[ii] David Crawford, "U.N. Probes Iran Hacking of Inspectors," Wall Street Journal,May۱۹,۲۰۱۱,http://www.wsj.com/articles/SB۱۰۰۰۱۴۲۴۰۵۲۷۴۸۷۰۴۲۸ ۱۵۰۴۵۷٦۳۳۱۴۵۰۰۵۵۸٦۸۸۳۰.

ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی دواتر کەوتەبەر شاڵاوێکی تری گروپی چالاکوانانی هاککەری ئێرانی بەناوی پەرەستوو لە نۆڤەمبەری ۲۰۱۲، کاتێک سێرڤەری وێبسایتێک دەستی بەسەرداگیرا، وە زانیارییەکانی تەواوی کارمەندانی ئەم دەزگایە ئۆنلاین پۆستکران. ئەمە جگە لەوەی هەڕەشەی ئەوەشیان کرد کە چاوەڕوانی هێرشێکی تریش بن بەناوی "هێرشی ئارامگۆ."

بۆ بینینی تەواوی راگەیەنراوی گروپی پەرەستوو، بڕوانە:

http://cryptome.org/۲۰۱۲/۱۱/parastoo-hacks-iae a.htm.

هێرشەکان بریتیی بوون لە کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا، بیریارانی ئەمریکا، دەزگا حکومییەکان، کۆمپانیاکانی ئەندازیاریی، دامەزراوە ئابوورییەکان، ئەکادیمیا.

چەندین ولاتی خۆرئاواییش بەڵگەی تەواویان پێشکەش کردووە لەمەڕ ئۆپەراسیۆنی سایبیری ئێرانی. لەساڵی ٢٠١٦دا، بەپێی راپۆرتی وەزارەتی ناوەخۆی ئەڵمانیا، حکومەتی ئەو ولاتە کەوتۆتەبەر شالاوێکی سیخوڕی سایبیری لەدژی ولاتەکەی، بەو پێیەی هەموو سەردانیکەرانی رۆژنامەی ئیسرائیلی ئۆرشەلیم پۆست بوونە ئامانجی ڤایرۆسێکی کوشندە.[1] ئێرانییەکان هەوڵیاندا دەستبەسەر هەژماری ئیمەیلی کەسیی ئەندامانی تیمی ئەمریکا لەماوەی گفتوگۆکاندا بگرن. بەهەمان شێوە، دوای هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمریکا لەساڵی ٢٠١٦، هەڕەشەی سایبیری ئێرانییەکان سەرنجی خستەسەر ستافی پێشووی سەرۆک ئۆباما، ئەندامانی کۆنگرێسی سەربە پارتی کۆماری، پشتیوانانی هەڵمەتی هەڵبژاردنی دۆناڵد ترەمپ، دامەزراوە میدیاییە کۆنزێرڤاتیزەکان، و ناوزەدەکان بۆ پێگە سیاسییەکان، هەموو ئەمانە چەند هەوڵێک بوون بۆ دەستخستنی زانیاری هەواڵگریی لەمەڕ ئیدارەی نوێی ئەو ولاتە. هەربەم دواییانەش، هەمان لەشکری ئێرانی لە کەمپینێکدا هێرشێکی سایبیری کردەسەر رەخنەگرانی ئێران لە کۆنگرێسی ئەمریکا لەوکاتەی خەریک بوون گەنگەشەی ئابڵوقەی نوێیان بۆسەر ئێران دەکرد.

ئامانجی تەهران هەموو ئەو کەسایەتی و دەزگایانەش دەگرێتەوە کە سەرنجیان لەسەر مەسەلەی ئێرانە، بەتایبەتی ئەوانەی لە ئەوروپا یان ئەمریکا کاردەکەن کە کار لەسەر سیاسەتی ئێران یان لەناو دەزگا میدیاییەکانی فارسی زمان کار دەکەن، وەک تەلەڤزیۆنی دەنگی ئەمریکا و رادیۆ فەردا. بزنسمان و کەسایەتی دیاری ئەمریکی- ئێرانی، هەڵگرانی دوو رەگەزنامە بێبەش نەبوون لەم جۆرە هێرشانە، بەتایبەتی

[1] ClearSky, "Jerusalem Post and Other Israeli Websites Compromised by Iranian Threat Agent CopyKitten," ClearSky Cybersecurity (blog), March ٣٠, ٢٠١٧, http://www.clearskysec.com/copykitten-jpost/; and "Brief Summary, ٢٠١٦ Report on the Protection of the Constitution: Facts and Trends," German MinistryoftheInterior,٢٠١٦,https://www.verfassungsschutz.de/embed/annual-report-٢٠١٦-summary .pdf.

ئەوانەی بە بەردەوامی لە میدیادا دەردەکەوتن لەبارەی سیاسەتی ئێرانەوە. دوابەدوای پەیمانی ناووکی ٢٠١٥، رووداوی چالاکی پەنهانی(٥) و هێرشی تۆڵەسێنی لەنێوان واشنتۆن و تەهراندا کەمبۆتەوە. ئەم جارە تەهران زیاتر سەرنجی خستۆتەسەر هێرشی سایبیری ناوخۆ و هەرێمی، وەک ئیسرائیل و سعودیە.[أ]

هیچ وڵاتێک وەک سعودییە نەکەوتۆتەبەر هێرشی سایبیری ئێران. هەردوو وڵات نەیاری ئەتنین(عەرەب و فارس)، سەربە دوو جەمەسەری تایەفیگەریین(شیعە و سوننە)، لەسەرووی هەمووشیانەوە دوو رکابەری جیۆپۆلیتیکین، بەتایبەتی لەمەڕ کێشەکانی جەنگی خوێناوی پرۆکسی لە ئێراق، سوریا، و یەمەن جەنگی توندوتیژی سیاسی لە بەحرێن و لوبنان. وەک ئاشکرایە پەیوەندییەکانی نێوان تەهران و ریاز لەکاتی شۆڕشی ئیسلامی ١٩٧٩وە گرژی بەخۆیەوە بینیوە، وە بەهۆی ناکۆکی سیاسییەوە پەیوەندی فەرمی دیبلۆماسی هەردوو وڵات بەبەردەوامی نارێک بووە. هەر لەم دواییانەش، لە کانوونی دووەمی ٢٠١٦، سعودیە باڵیۆزخانەکەی لە تەهران داخست دوای ئەوەی حکومەتی ئێران هەوڵی دزینی زانیاری لەنێو باڵیۆزخانەکەدا. لەکاتی دەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنە سایبیرییەکانی ئێرانەوە، دامەزراوە ئابووری و سیاسییەکانی سعودییە لەلایەن ئێرانەوە کراونەتە ئامانج بە هەردوو ئامانجی سیخوڕی و رێگرتن. لە چەندین راپۆرتدا لەمەڕ سیخوڕی سایبیری ئێرانی و کەمپینی دزینی زانیارییدا —بۆ بەدەستهێنانی ژمارەی تێپەڕ یان زانیاری هێنانەوەی هەژمار- سعودیە بۆتە سەرچاوەی هەرەسەرەکی قوربانیدان و ئامانجی سایبیری.

هێرشی ساڵی ٢٠١٢ی ئێران بۆسەر کۆمپانیای ئارامکۆی سعودیە لەکاتی جەژنی رەمەزاندا(وە هێرشێکی هاوشێوە بۆسەر کۆمپانیای راسگازی قەتەری دوای تەنیا دوو هەفتە) نموونەیەکی روونە کە چۆن ئێران هەموو هەوڵێکی بەگەڕدەخات بۆ پێکهێنانی هێرشی سیخوڕی سایبیری بۆ تۆڵەسێنی لەدژی نەیارە بیانییەکان. ئێرانییەکان چەندین دامەزراوەی ئابووری، سەربازیی، وە سیاسییان لە سعودییە

---

[أ]دوابەدوای کشانەوەی ئەمریکا، بەسەرۆکایەتی دۆناڵد ترەمپ، لە ئایاری ٢٠١٨، دەکرێت هێرشەکان دووبارە دەست پێبکەنەوە.

کردۆتە ئامانج، وەک کۆمپانیای ئارامکۆ، دامەزراوەی مەلیک فەیسەل، و وەزارەتەکانی بازرگانی و کاروباری دەرەوە، بازاڕی دراوی سعودیە، و تەنانەت بانگەشەکارانی مافی مرۆڤی سعودیش.

یەکێک لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران بریتیی بووە لە دژایەتیکردنی وجودی ئیسرائیل لەسەر نەخشەی جیهان و پشتیوانیکردنی ئەو گروپە چەکدارانە دژ بەو وڵاتە خەبات دەکەن، وەک حزب الله، حەماس، و جیهادی ئیسلامی فەڵەستینی. سەرەڕای ئەمەش، تەهران سەرکەوتنی کەمی بەدەستهێناوە لە بەئامانجگرتنی دامەزراوەکانی ئیسرائیل لەڕووی سیخوڕی سایبیرییەوە. لەماوەی ململانێی نێوان ئیسرائیل و غەززە لە هاوینی ٢٠١٤دا، دەسەڵاتدارانی ئیسرائیل ئاماژەیان بەوە کرد کە ژێرخانی هێزەکانی بەرگریی ئەو وڵاتە لەلایەن تەهرانەوە کراونەتە ئامانج. جگە لە پێکهێنانی چەندین ئۆپەراسیۆنی سیخوڕی سایبیری بۆسەر ئۆرشەلیم، تەهران هەرگیز ئەوەی فەرامۆش نەکردووە نەیار و هاوپەیمانەکانی خۆی لەژێر چاوی نادیاری سیخوڕی سایبیریدا بێبەری بکات.

ئێران تاڕاددەیەک هەموو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەفریقیا باکوور، و وڵاتانی هاوسنووری بەئامانج گرتووە. سیخوڕی سایبیری زانیاری وردی بە تەهران بەخشیەوە دەربارەی دراوسێ ناسەقامگیرەکانی لەڕووی سیاسییەوە، لەوانە هێرشی بەردەوامی پێکهێناوە بۆسەر رادیۆی نیشتیمانی ئەفغانستان، وەزارەتی پەروەردە، و تۆڕەکانی تری حکومەتی ئەو وڵاتە. جگە لە ئەفغانستان، ئێران بەبەردەوامی چاوی لە دامەزراوە بەرگرییەکانی پاکستانیش بووە. لە ئێراقیش، تۆڕی سیخوڕی سایبیری ئێرانی هەژماری تۆڕی کۆمەڵایەتی چەندین کەسایەتی دیاری ئەو وڵاتەی خستۆتە بن چاڤکرن، بەتایبەتی ئەو ئەندازیارانەی لەناو پێگەکانی گەیاندن و نوخبەی سیاسییدا کاردەکەن. گروپە ئێرانییەکان دامەزراوە سیاسییەکانی کوردستانی ئێراقیشیان لەم

هەڵمەتە بێبەری نەکردووە، بەبەردەوام لەشکرێک لە سیخوڕی مرۆیی و سایبیری چاودێری دۆخی ئەو ناوچەیە دەکەن.[i]

## گوێهەڵخستن

سیخوڕیکردن لەڕێگای ئامێری زیرەک و گوێهەڵخستن بریتییە لە چاودێری خستنەسەر تەلەفۆن و ئینتەرنێت لەکاتی بەکارهێنانیاندا لەلایەن لایەنی سێیەمەوە، بەزۆری لەڕێگای دەزگا هەواڵگرییەکان و بەشێوەیەکی نهێنیی. گوێهەڵخستنی یاسایی بەشێوەیەکی چڕ لەلایەن ژمارەیەکی زۆر وڵاتەوە کۆنترۆڵ کراوە، ئامانج لەم کارەشدا ئەوەیە نهێنی کەسەکان بپارێزرێت، ئەمە لە هەموو ئەو وڵاتانەدا ئەنجام دەدرێت کە لەڕووی دیموکراسییەوە پێشکەوتوون و پاراستنی نهێنی هاوڵاتیانیان لەکارە هەرە لەپێشینەکانیەتی. بەزۆری گوێهەڵخستن بۆ تەلەفۆن دەبێت لەلایەن دادگاوە ڕێگای پێبدرێت، وە بەشێوەیەکی تایبەتی ئەو کاتە ئەنجام دەدرێت کە بەڵگەی بخرێنە بەردەم دادگا کە کارێکی ئەستەمە بەبێ گوێهەڵخستن بۆ تەلەفۆنی تاوانباران بتوانرێت چالاکیەکە ئەنجام بدرێت.[ii] هەروەک ئاماژەی پێکرا، بەشێوەیەکی ئاسایی بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی دادگا گوێهەڵخستن بۆهەر تەلەفۆنێک وەک سەرپێچیکردنی یاسا دادەنرێت.

لە ئەمریکادا، لەژێر یاسای چاودێری هەواڵگری بیانی دەزگا هەواڵگرییەکان دەتوانن ڕەزامەندی لە دادگای هەواڵگری بیانی ئەمریکی وەربگرن، ئەم دادگایە سەرجەم کارەکانی بە نهێنی ئەنجامدەدات.[iii] هەرچەندە لە ماددەی چواری دەستووری ئەو وڵاتە مافی پاراستنی نهێنییە کەسییەکان پارێزراوە، کە ئەگەر کەیسێکی لەو جۆرە

[i] Anderson, C. and Sadjadpour, K. (٢٠١٦). Iran's cyber threat: espionage, sabotage, and revenge.
[ii] How Stuff Works: (http://www.howstuffworks.com/wiretapping.htm) A guide on wiretapping, how it works and links to other resources.
[iii] Stevens, Gina; Doyle, Charles (October ٩, ٢٠١٢). Privacy: An Abbreviated Outline of Federal Statutes Governing Wiretapping and Electronic Eavesdropping (https://fas.org/sgp/crs/intel/٩٨-٣٢٧.pdf) (PDF). Washington, DC: Congressional Research Service. Retrieved ٢٩ January ٢٠١٨.

هەبوو دەبێت سەرەتا ڕەزامەندی دادگا بەدەست بهێنرێت، بەڵام بەهۆی فراوانی دەسەڵاتی ئەمریکا لەجیهان و پێشکەوتنی خێرای ئەو وڵاتەوە ئەم بابەتە تائێستاشی لەگەڵدا بێت مشتومڕی زۆری لەسەرە. لە بەشێکی ویلایەتەکانی ئەمریکادا گوێهەڵخستن تەنیا پێویستی بە یەک لایەن هەیە بۆئەوەی کارەکە ئەنجام بدرێت ئەمەش وادەکات مشتومڕێکی زۆر لەسەر پێشێلکردنی ماددەی چواری دەستوور دروست ببێت.

مۆبایل یەکێکە لەو ئامێرانەی کە بەشێوەیەکی فراوان موعەڕەزە بۆ سیخوڕیکردن لەسەری و کەوتنەداوی دەزگا هەواڵگرییەکان. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، ساڵ لەدوای ساڵ مۆدێلی باڵاتری دەزگای مۆبایلی زیرەک دەکەوێتە بازاڕەوە، بێ خەبەر لەوەی بەکارهێنەران لە هەر ئانوساتێکدا بێت دەکەونەژێر چاودێری تەواوی ئەو دەزگایانەی لە بواری هەواڵگریی کاردەکەن. بەم دواییانە مۆبایلی نوێی نەوەی سێیەم (٣G)، (LTE)، (WiMAX) و نەوەی چوارەم (٤G) بەبازاڕ ناسێنران کە دەتوانرێت هەموویان لەرێگای ئینتەرنێتەوە وابەستەی یەکتر بکرێن. هەڕەشەی سەرەکی بۆ مۆبایل بریتییە لە کۆکردنەوەی داتای گەیاندن.[i] ئەم داتایانە تەنیا زانیاری دەربارەی کات، ماوەی قسەکردن، و وەرگری تەلەفۆنەکە بەدەستەوە نادات، بەڵکو ئەو شوێنەش دیاری دەکات کە تەلەفۆنەکەی لێوە دەکرێت کە دەبێتە مەترسی بۆسەر نهێنی کەسی هەردووکیان. ئەم داتایانە هەر هەموویان لە داتا بانقێکدا خەزن دەبن و لەکاتی پێویستدا دەزگا هەواڵگرییەکان هەموو زانیارییەکان بەئاسانی و بەبێ هیچ سانسۆرێک بەکاری دەهێنن. هەربۆیە، بەکارهێنانی مۆبایل، بەتایبەتی بۆ سیخوڕەکان، کارێکی گەمژانەیە و هەرزوو دەکەونەژێر چاوەدێری دەزگا هەواڵگرییەکان. هەربۆیە، واباشترە میتۆدی تری سیخوڕی بەکاربهێنرێت لەئەنجامدانی

[i] Kelly, John; Kepple, Kevin; Mosemak, Jerry; Loehrke, Janet; Dionise, Jeff. "Cellphone data spying: It's not just the NSA" (https://www.usatoday.com/story/news/nation/٢٠١٣/١٢/٠٨/cellphone-data-spying-nsa-police/٣٩٠٢٨٠٩/). USA Today. Retrieved ٢٢ July ٢٠١٤.

ئەرکەکانیان چونکە هاوڵاتی ئاسایی لەژێر چاودێری ئەواندایە چ جای بگاتە سیخوڕێک کە هەڕەشەی بۆسەر ئاسایشی نیشتیمانی وڵاتێک.

## دژەهەواڵگریی

مەزنترین دوژمنی دژەهەواڵگرییەکی سەرکەوتووبوونی سیخوڕ نییە،
بەڵکو تێگەیشتنی هەڵەیە دەربارەی دژەهەواڵگریی.[i]

دژەهەواڵگریی بریتییە لە پاراستنی ئاسایش وڵاتێک. بەمەش، چالاکییەکانی زیاتر جەخت دەکاتەسەر ئەو هەولانەی دوژمنان دەیگرنەبەر لەهەمبەر تێکدانی ئاسایشی وڵاتێکی دیاریکراو لەڕێگای دزینی زانیاری، هەڵخەڵەتاندنی کارمەندانی دەزگای هەواڵگری، سیخوڕیکردن، تێکدان و کردەی نهێنی. یان، هەروەک لە پێناسەیەکی تردا هاتووە، "بەشێوەیەکی گشتی، وەزیفەی دەزگای دژەهەواڵگری ناوەخۆ بریتییە لە پاراستنی حکومەتی یاسایی وڵاتێک لەدژی هەر هێرشێکی شاراوە." پێناسەگەلی زیاتریش بۆ ئەم چەمکە فراوانەی دژەهەواڵگریی کراون، دیارترینیان ئەو پێناسەیەی کە ئەبرام شەلسکی و گاری شمیت لە پەرتووکەکەیاندا بەناوی "جەنگی بێدەنگ"دا کە دەنووسن، "بریتییە لە کۆکراوە و شیکراوە، وە چالاکی ئەنجامدراو، بۆ پاراستنی نەتەوەیەک لەهەمبەر کردەی دەزگا هەواڵگرییەکانی دوژمندا. لەژێر ڕۆشنایی ئەم پێناسەیەدا، مەودای دژەهەواڵگریی وەک خودی هەواڵگریی فراوانە، لەبەر ئەوەی هەموو شێوازەکانی چالاکییە هەواڵگرییەکانی دوژمن دەبێت بەرگریان لە هەمبەر دابنرێت و بەرپەرچ بدرێنەوە. لە سیاقێکی تەسکتریشدا، دژەهەواڵگریی بریتییە لەڕێگرتن لە دوژمن لە بەدەستهێنانی زانیاریگەلێک کە کەڵکی پێ بگەیەنێت. ئێمە سەرەتا لە بیرۆکەی دژەهەواڵگریی دەکۆڵینەوە."

دەتوانین گفتوگۆکەمان بە جیاوازیکردن لەنێوان ڕێوشوێنی پاسیڤ و چالاک دەست پێبکەین. گرنگتری هەنگاوەکانی پاسیڤ، هەوڵدەدات ڕێ لە دوژمن بگرێت بۆ

---

[i] Kenneth A. Krantz, "Counterintelligence Support to Joint Operations," *Defense Intelligence Journal*, Vol. ٤ No. ١, spring ١٩٩٥, pg. ٢٢.

بەدەستهێنانی زانیاریی، ئەمەش لەڕێگای بلۆککردنی چوونەناو سیستەمەکەیەوە- بەدروستکردنی دیوارێک لە چواردەورەکەی- کە بە "ئاسایش" ناسراوە. سروشتی دیوارەکە-ڕێگاگرتن لە دەست گەیشتن بە زانیاری هەستیار لەلایەن ئەو کەسانەوەی کە جێگای متمانە نین، پاراستنی بەڵگەنامەکان وە پەیوەندیەکانی گەیاندن لە شوێنی سەلامەت وە بەهۆی کۆدکردنەوە- لە خوارەوە بەکورتی ئاماژەی پێدراوە. سەرەتا، حکومەتێک وەک بەشە جیاجیاکانی وە دەزگاکانی دەبێت بڕیار بدەن کە چ زانیارییەک زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بیپارێزن- واتە چ زانیارییەک دەبێت لەناو دیوارەکاندا بپارێزرێن.

## پۆلێنکردنی زانیاری

سیستەمی پۆلێنکردن بریتییە لەڕیزکردنی زانیاری بەپێی هەستیاریەکەیان، بە واتایەکی تر، گرنگترین ئەو زانیارییە کە ئەگەر بکەوێتە دەستی دوژمن.زیادترین زیان بە نەتەوەکەی دەگەیەنێت، دەبێت زۆرترین ڕێوشوێن بگیرێتەبەر بۆ پاراستنی ئەو زانیارییە. لە ئەمریکادا، یەکەم سیستەمی لەم جۆرە بۆ پاراستنی بەڵگەنامەی ئاسایش نیشتیمانیی لەلایەن وەزارەتی جەنگەوە لە ساڵی ١٩١٢ بە یاسایی کرا؛ وەزارەتەکانی جەنگ و هێزی دەریایی سیستەمی پۆلێنکردنی خۆیان دارشت لە سەردەمی جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەمدا.[i] سەرۆک هاری ترومان یەکەم سیستەمی سەرتاسەری نیشتیمانی پۆلێنکردنی زانیارییەکانی لە ساڵی ١٩٥١ دامەزراند. ئەم سیستەمەی ئێستا بەهۆی بڕیارێکی سەرۆکایەتی لەلایەن سەرۆک کلینتۆنەوە لە ساڵی ١٩٩٥ بەڕێوەدەبرا کە بە تێروتەسەلی باسی پێناسە، یاسا، وە ڕێوشوێنەکان دەکات. ئەمەی خوارەوەش کورتەیەکە لە پۆلێنی دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا بۆ زانیاری و پاراستنیان لە هێرشی دوژمنان —دژەهەواڵگری.

سیستەمی پۆلێنی ئەمریکی بۆ پۆلێنکردنی زانیاریی بەپێی ڕێژەی زیانگەیاندن بە ئاسایشی نیشتیمانی-ئەگەر بکەوێتە دەستی دوژمن- پۆلێن کراوە. تا زانیاریەکە

---

[i] Harold C. Relyea, "The Presidency and the People's Right to Know," in *The Presidency and Information Policy,* ed. Harold C. Relyea (New York: Center for the Study of the Presidency, ١٩٨١), ١١–١٩.

هەستیار بێت، زیاتر بەوریایەوە دەپارێزرێت وە کەسی کەمتر کە متمانەپێکراون دەتوانن دەستیان پێ بگات. لەژێر سایەی ئەم سیستەمی ئێستادا، ئاستی سەرەتایی پۆلێنکردن بریتیین لە نهێنیی (تەنیا رێگەپێدراو بۆ کەسانی متمانەپێکراو)، نهێنیی، وە زۆر نهێنیی، کە بەم پێیەی خوارەوە لەڕووی ئاستی زیانگەیاندن بە ئاسایشی نیشتیمانی دیاریکراون:

- زۆر نهێنیی: "زیانی کوشندە"
- نهێنیی: "زیانی جددی"
- نهێنیی رێگەپێدراو بۆ هەندێ کەسی تایبەت "زیان دەگەیەنێت"

سەرەڕای ئەمە، ژمارەیەکی زۆر وشیارکەرەوەی تریش بەکاردێن بۆ قەدەغەکردنی دەست گەیشتن بە زانیاری زیاتر. سەبارەت بە پرسە هەواڵگرییەکان، ئەو پرسانەی تایبەتن بە زانیاری دەربارەی تەکنیکەکانی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری تەکنیکیی: ئەم یاسا و رێسایانە لەلایەن بەڕێوەبەری هەواڵگریی ناوەندییەوە دەسەپێنرێن ($DCI$) بەسەر تەنانەت خودی کارمەندانیشیدا، چ جای بگاتە نەیارێک، ئەم کارە لەژێر یاسای ساڵی ١٩٤٧ی ئاسایشی نیشتیمانی ئەنجام دەدرێت، بۆ "پاراستنی سەرچاوەی هەواڵگریی و میتۆدەکان لە بڵاونەبوونەوەی رێگاپێنەدراو." بێگومان، لەوساوە تائێستا چەندین بەڵگەنامەی نهێنی گرنگ بڵاوبوونەتەوە بۆناو دەرەوەی کۆمەڵگای هەواڵگریی کە ئەوان پێیان وابووە لە ریزی زانیاری هەستیاردا بوون. هەربۆیە، بەشێوەیەکی خولّیی هەوڵی زۆر تەرخان دەکرێت بۆ بە سیستەمکردن و تەسککردنەوەی ئەم پرۆسەیە؛ دوایین یاسایی سەرۆکایەتی، هەر بۆ نموونە، باس لەوە دەکات کە ژمارەی ئەو کەسانەی دەستیان بە پرۆگرامی تایبەت دەگات دەبێت "تا ئەوپەڕی کەمترین" کەس بێت. وەک دیارە ئەمە هەوڵ و تێکۆشانێکی ناکۆتاییە، وە ئەو وریاکردنەوە یەک لەدوای یەکانە نەبۆتە هۆی دروستکردنی پۆلێنێکی نوێ کە بە تەواوی دزەکردنی زانیاری لە ئاستی هەستیاردا نەهێڵێت.

هەروەک لە سەرەوەدا تێبینی کرا، تا زانیارییەکە هەستیارتر بێت (لە ڕووی ئاستی پۆلێنکردنەوە)، ژمارەیەکی کەمتری خەڵک بۆیان هەیە لەبارەیەوە بزانن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا مۆڵەتی تایبەت بۆ هەندێ کەس بەس نییە بۆ پاراستنی زانیارییەکان. ئەو کەسانەی کە بەدوای دەست گەیشتن بە زانیارییەکاندا دەگەڕێن لەناو دەزگایەکدا دەبێت ئاگادار بکرێنەوە لەو زانیاریانە بۆ ئەوەی بە بەرپرسیاریەتی فەرمی خۆیان هەڵسن. ئەم سیستەمە کۆنترۆڵکراوەی زانیاری زۆر کەمتر فەرمییە بەبەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی متمانەکەیان پێدراوە؛ بەگشتی، هەرکەسێک کۆنترۆڵی زانیاری نهێنی بکات بەرپرسە بۆ لێکۆڵینەوە لەو کەسانەی کە داوای ئەو زانیاریە دەکات بەرلەوەی زانیارییەکەی پێبدات.

پرسێکی تری زۆر گرنگ هەیە کە دەبێت وەڵام بدرێتەوە، ئەوەیش ئەوەیە ئایا چ شتێک نهێنی بێت؟ وەڵامی سەرەتایی بۆ پرسیاری ئەوەی چ شتێک نهێنیی بێت، لە چوارچێوەی هەواڵگری حکومەتی ئەمریکادا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئایا پێناسەی ئاستەکانی نهێنیی چین. ڕەنگە ئەمە لە ڕووی پرەنسیپەوە ئاسایی بێت، هەرچەندە چەمکی سەرەکی "زیانگەیاندن"، "زیانی جددی" وە "زیانی کوشندە" ناڕوونن، لە خودی خۆیاندا وە لە جێبەجێکردنیان لە ئاساییشی نیشتیمانیدا.

با ئەو ڕاستیە وەک نموونە لەبەرچاوبگرین کە وڵاتە دیموکراتییەکان بەشێوەیەکی ئاسایی بڕی ئەو بودجەیەی کە تەرخاندەکرێت بۆ بەرگریی ساڵانە بڵاودەکەنەوە. هەرچەندە بە نهێنی هێشتنەوەی بودجەی بەرگریی وڵاتێکی دیموکراتی جێگای پرسیار نییە، حکومەتە نادیموکراتەکانیش هەمان کار ئەنجام دەدەن. بۆ نموونە، حکومەتی سۆڤیەتی جاران تا ساڵی ١٩٨٩ بڕی پارەی تەرخانکراو بۆ بەرگریی وەک نهێنی دەوڵەت سەیر دەکرد؛ بێگومان ئەمە بۆ حکومەتەکانی چین و کۆریای باکوور تائێستاش هەر ڕاستە، واتە بەهیچ شێوەیەک بڕی تەرخانکراو بۆ ئەم مەبەستە بڵاوناکەنەوە. هەواڵگریی ئەمریکا هەڵساوە بە تەرخانکردنی چەندین سەرچاوە بۆ بڕیاردان لەسەر قەبارەی ئەو بودجەی نهێنییەی بەرگریی؛ ئەگەر زانیاریەکە بە ڕێخۆشکەر دانەنرا بۆ حکومەتی ئەمریکا، سەرچاوە هەواڵگرییەکان ئەوا دەکرا بەسەر

ئەرکەکانی تریشدا جێبەجێی بکەن. بە هەمانشێوە، ئەگەر ئەمریکا بودجەی بەرگریی خۆی ئاشکرا نەکردبوایە، دەزگا هەواڵگرییەکانی تری دوژمن لە هەیبەت و گەورەیی توانا سەربازییەکانی ئەمریکایان کەم دەکردەوە. رەخنەیەکی زۆر لە حکومەتی ئەمریکا دەگیرێت لە سەرئەوەی کە برێکی زۆری زانیاری بە نهێنیی و ئاستێکی زۆر باڵا دەهێڵێتەوە. ئەم رەخنەیە نەک تەنیا لە کۆمیتەی کۆنگرێسیی و رەخنەگرە ناحکومیەکانی دەزگاکانی هەواڵگریی یان ئیدارەی تایبەتیەکانەوە دەگیرێت بەڵکو تەنانەت لەناو خودی دەزگاکەشدا ئەم رەخنەیە هەیە. بە جۆرێک لە جۆرەکان، هەروەک پێشتر باسکرا، نهێنیگەریی تایبەتمەندیەکی سروشتیی هەر حکومەتێکە. بەلەبەرچاوگرتنی گەورەیی و کراوەیی سیستەمی سیاسی ئەمریکا، ئەم مومارەسەیە زیاتر لەناو خودی ئەمریکادا رەخنەی لێدەگیرێت وەک لە هەر شوێنێکی تری جیهان. لەم ساڵانەی دواییدا، هەمان پرس لە وڵاتانی تریشدا سەری هەڵدا، بەتایبەتی لە بەریتانیا، کە تیایدا ئەو یاسایەی بڵاوکردنەوەی زانیاری حکومەت بەڕێوەدەبات زۆر توندترن لە هی ئەمریکا.[1]

جگە لە زیانگەیاندنی سەرەکی- نکۆڵیکردنی ناپێویستی زانیاری بۆ رای گشتی، کەمکردنەوەی تواناکانی بۆ تێگەیشتن وە گفتوگۆکردنی پرسی سیاسیی ئاسایشی نیشتیمانیی- زیادلەپێویست نهێنییکردن زیانی کەمکردنەوەی متمانەی سیستەمی نهێنیی هەیە، ئەمەش پەلدەکێشێت بۆ گوێنەدان بە یاساکان، ناوشیاریی، وە "دزەکردن"ی زانیارییەکان. ئەگەر ژمارەیەکی زۆری زانیاری بێ زیان بوون بە نهێنیی، رێگرتنەکان لە هەمبەر بڵاوکردنەوەی رێگاپێنەدراوی زانیاری نهێنیی لاواز دەبێت.

ئەو پرسەی کە ئایا ئەم زیادلەپێویست بە نهێنیدانانە لە حکومەتی ئەمریکادا هەیە یان نا، پرسیارێکە وەڵامەکە سەختە. لەکاتێکدا هەر سیستەمێک کە مامەڵە لەگەڵ ملیۆنان بەڵگەنامە دەکات لە هەر ساڵێکدا دەکرێت هەندێ جار بەرەو هەڵدێریش بڕوات. رەخنەیەکی باوی ئەو کەسانەی بڕوایان وایە زیادلەپێویست نهێنیی نابێت

---

[1] Rosamund Thomas, *Espionage and Secrecy: The Official Secrets Acts* ١٩١١–١٩٨٩ *of the United Kingdom* (New York: Routledge, ١٩٩١).

هەبێت بریتییە لەوەی کە پێیان وایە بەنهێنی دانانی ئەو بەڵگەنامانە تەنیا بۆ ئەوەیە بەرپرسەکانی حکومەت بپارێزێت لە لۆمە و هەرسانبوونیان لەلایەن ڕای گشتی هاوڵاتیانەوە. بەواتایەکی تر، ئەم کەسانە دەڵێن کە بەنهێنیکردن خزمەت بە داپۆشینی کەموکورتی بەرپرسان دەکات لە هەمبەر خەڵک بۆ ئەو کردەوانەی ئەنجامیان داوە. لەکاتێکدا ئەمە هاندەرێکی پەسەندنەکراوە بۆ بەنهێنیکردن، دۆخەکە زۆربەی جار لەمە ئاڵۆزترە؛ ئاشکرابوونی عەیبوعاری بەرپرسان تەنیا مەسەلەیەکی ناوخۆیی نییە، بەڵکو خودی حکومەتیش پێی هەراسان دەبێت لە بەرامبەر هێزە دەرەکییەکاندا.

هەروەک باسکرا، نهێنیگەریی هەندێ جار زیاتر بۆ هۆکاری دبلۆماسی بەکاردێت وەک لەوەی بۆ کاری ئۆپەراسیۆنیی پێویست بێت. هەمان شت ڕاستە سەبارەت بە چالاکیەکانی سیاسەتی دەرەوە بەشێوەیەکی گشتی. هەروەک لە کەیسی چالاکی پەنهانیدا هەیە، حکومەتەکان بەشێوەیەکی گشتی لەم ساڵانەی دواییدا مەیلیان زیاتر بۆ ئەوە چووە کە زیاتر کراوە بن دەربارەی چەندین سیاسەتی دەرەوە وە کەمتر نیگەرانی ورد و درشتی دبلۆماسین. حکومەتەکان ئێستا زیاتر لە پێشوو ددان بەوەدا دەنێن کە ئەوان خەریکی کاری سیخوڕیی و چالاکیە هەواڵگرییەکان بوونە. بەم شێوەیەش، بواری کەمتر هەیە بۆ پۆزش هێنانەوەی هەراسانکردنی حکومیی. هەربۆیەش، هۆکاری دیبلۆماسی ڕوون هەیە بۆ ئەم چەندە. بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٧٧دا ڕۆژنامەی *واشنتۆن پۆست* ڕوونی کردەوە کە مەلیک حوسێنی ئوردن لە سی ئای ئەیەوە هاوکاری دارایی وەرگرتووە، بانگەشەیەک کە تەنیا زیانی بە ناوبراو دەگەیاند لە ڕووی سیاسییەوە.[1] پاراستنی ئەم جۆرە پەیوەندییە نهێنییە بۆ خۆدورگرتن لە هەراسانکردن وە لاوازکردنی پێگەی سیاسیی سەرۆکی وڵاتێکی دۆست هاندەرێکی شەرعییە بۆ نهێنیگەریی هەرچەندە لەڕووی ئۆپەراسیۆنیشەوە پێویست نییە.

---

[1] Bob Woodward, "CIA Paid Millions to Jordan's King Hussein," *Washington Post*, February ١٨, ١٩٧٧, A١.

هەرچەندە زۆرجار دەوترێت کە حکومەتەکان بەشێوەیەکی سروشتی زیاتر مەیلیان لە نهێنیگەریی زیادلەپێویستە، بەڵام دەکرێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین کە ئایا دەکرێت پێچەوانەکەشی لە هەندێک بواری تایبەتیدا دروست بێت. دەکرێت ئەمە لەگەڵ ئەو زانیارییانەدا ڕوویدات کە لەدەرەوەی حکومەتدا پەرەیان پێدراوە کە تاڕاددەیەکی زۆر گرنگە بۆ ئاسایشی نیشتیمانیی بۆ ئەوەی وەک نهێنیی و کۆنترۆڵکراو لەقەڵەم بدرێت. ڕوونترین نموونەی ئەمەش بریتییە لەو زانیاریانەی پەیوەندییان بە تەکنەلۆژیای چەکی ئەتۆمیەوە هەیە. ئێمە پێشبینی ئەو زانیاریانە دەکەین کە ئاسانکاری بکەن بۆ تەشەنەکردنی ناوەکی دەبێت بە وریاییەوە کۆنترۆڵ بکرێن، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئایا ئەمە لە دەرەوە یان ناوەوەی حکومەتەوە سەرچاوەی گرتووە.

لە ئەمریکادا، ئەم پرسە لە یاسای وزەی ئەتۆمی ساڵی ١٩٥٤ بەڕوونی باسی لێوەکراوە، کە داتای قەدەغەی بەم شێوەیە پێناسە کردووە، "هەر داتایەک دەربارەی؛ یەکەم، دیزاین، بەرهەمهێنان، یان ئاسانکاری چەکی ئەتۆمی؛ دووەم، بەرهەمهێنانی ماددەی تایبەتی ناوەکی؛ یان، سێیەم، بەکارهێنانی ماددەی ناوەکی تایبەت لە بەرهەمهێنانی وزەدا." لەژێر ئەم یاسایەدا، ئەم جۆرە زانیاریانە ئامانجی کۆنترۆڵکردنن بەبێ گوێدانە ئەوەی ئایا لە دەرەوە یان ناوەوەی حکومەتدا پەرەیان پێدراوە.(هەروەها هەمان ماددە ڕێگا لە بڵاوبوونەوەی زانیاری نانهێنی دەگرێت دەربارەی دیزاین، وە ڕێوشوێنە ئاسایشیەکان بۆی، بنکەی جیاجیا بۆ بەرهەمهێنان یان سوودوەرگرتن لە ماددە ناوەکیەکان.) لەگەڵ ئەوەشدا، بڕێکی بەرچاوی زانیاری دەربارەی ماددەی ناوەکی وە چەک بۆ ڕای گشتی لە ئەمریکادا خراوەتەڕوو لەبەر ئەمە جاربەجار ئەو قوتابیانەی لە بەشی فیزیا دەخوێنن دەبردرێنە کتێبخانەی نهێنیی بۆ دەستکەوتنی سەرچاوەی پێویست لەم بوارەدا، وە دروستکردنی سەرەتاکانی بۆمبی ناوەکی.

زانیاری تر کە ناکرێت نهێنیی بن، بەڵام دەکرێت لەژێر هەندێ دۆخی تایبەتدا، بە جۆرێک لە جۆرەکان بپارێزرێن، لەمانە پێکدێن:

- ئەو زانیارییە ئابوورییانەی دەبنە هۆی ئەوەی وا لەکەسێک دەکەن سوودی یاسایی بەدەست بهێنن لە ڕووی دارایی وە بازاڕکارییەوە
- ئەو زانیارییە تەکنەلۆژیانەی کە نەتەوەیەک بیەوێت لە دوژمنەکانی بی پارێزێت لە بەدەستهێنانیان
- ئەو زانیارییە کەسیانەی کە دەکرێت وا لە دەزگایەکی هەواڵگریی دوژمن بکات بۆ تەجنیدکردنی بەرپرسە باڵاکانی حکومەت جا چ بەپێشکەشکردنی پارە بێت بۆ ئەوانەی کێشەی داراییان هەیە یاخود بە هەڕەشە بێت.

پاراستنی ئەم جۆرە زانیارییە پێکدێت لەئاسایشی گەیاندنەکان، هەروەک لە خوارەوە باس کراوە. هەرچەندە، جاروبار، لە پرسی تریش دەگرێتەوە. بۆ نموونە، زۆر هەوڵ لە ئەمریکا دراون بۆ جێبەجێکردنی چەندین یاساوڕێسا لە هەمبەر ناردنی تەکنەلۆژیا بۆ بڵاوکردنەوە لە چەندین توێژینەوەی زانستی لەم بارەوە؛ سەرەڕای ئەمەش، هیچ سیستەمێکی گونجاو بۆ ئەنجامدانی ئەمە نەخراوەتە بواری پەرەسەندنەوە. لەساڵی ۱۹۸۲دا جێگری بەڕێوەبەری هەواڵگریی ناوەندی، ئەدمیراڵ *بۆب ڕای ئینمان*، لە وتارێکیدا بۆ دەزگای ئەمریکا بۆ پێشڤەچوونە زانستیەکان ئامارەی بەم کێشەیەدا. دەربارەی لایەنی تیرۆری و کۆدگەرایی لێکۆڵینەوەکە، ناوبراو نیگەرانی خۆی دەربڕی "کە بڵاوکردنەوەی ئەنجامی هەمەجۆری ئەم توێژینەوانە سەرنجی حکومەت و پێکهاتە دەرەکیەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت وە، بەم شێوەیەش، زیانی لەبنەهاتوو وە ناپێویست بگەیەنێت بە بەرژەوەندییەکانی ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکا." لەنێو ئەو بوارانەی کە تیایاندا بڵاوکردنەوەی زانیاری تەکنەلۆژیی دەکرێت زیان بە ئاسایشی نیشتیمانیی بگەیەنێت، *ئینمان* پێی وایە کە ئەم بوارانە پێکدێن لە؛ "هاردوێر و سۆفتوێری کۆمپیوتەر، تەکنیکەکانی تری ئەلیکترۆنی، لیزەرەکان، وە ڕێکارەکانی بەرهەمهێنانی تەکنەلۆژیا."

لە ساڵانی دوای ۱۹۸۲، بڵاوبوونەوەی زانستی شیفرەسازیی بۆناو شەقام وای کرد کە ئەمریکا زیاتر ڕێوشوێنەکانی تووند بکات دەربارەی کۆنترۆڵی بەرنامەی سۆفتوێر کە دەتوانێت بەشێوەیەکی پێشکەوتوو شیفرەکان بشکێنێت. توێژینەوەی نۆد

ئەنجامدراون دەربارەی زانستی شیفرەسازیی لە کەرتی تایبەتیدا، بێگومان ئەمەش بەهۆی پێشکەوتنی بواری تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەرەوە ئەنجام دەدرا بۆ مەبەستی بازرگانیی. لەکاتێکدا ئەمە سودی زۆری هەیە لە بۆچوونی ئاساییشی نیشتیمانیەوە (بۆ نموونە، پەیوەندییە شیفرەکراوەکان دەکرێت ببنە هۆی پوچەڵکردنەوەی هەوڵەکان بۆ دزینی زانیاری تەکنەلۆژی لەڕێگای هاککردنەوە بۆناو ئیمەیلی کۆمپانیاکان یان سیستەمی پەیوەندی ترەوە)، نیگەرانی دروستکردووە کە تیرۆرستان، گروپی تاوانباری رێکخراو، ساختەکردنی پارە، بتوانن دەستیان بەو شیفرانە بگات کە دەبنە هۆی گیرۆدەکردنی هەوڵەکانی جێبەجێکردنی یاسا لەم بوارەدا.[i]

---

[i] Abram Shulsky and Garry Schmitt (٢٠٠٢), Silent Warfare Understanding the world of intelligence, third edition, Macmillan Press.

## پێشەکی

ئاشکرایە، دەزگا هەواڵگرییەکان بۆ دەستخستنی زانیاری، بەئامانجی پاراستنی بەرژەوەندی و ئاسایشی نیشتیمانی، هەموو کارێک ئەنجام دەدەن بۆئەوەی بتوانن وڵاتەکەیان بپارێزن. بەم هۆیەشەوە، تەنانەت بەرلە جەنگی جیهانیی یەکەم سیخوڕیکردن بەهۆی سێکسەوە لەلایەن ژاپۆنییەکانەوە ئەنجام دراوە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مێژووی ئەم پیشەیە دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە یەک سەدە. بەرلە دەستپێکردنی جەنگی جیهانیی دووەم (لەکاتی جەنگەکەشدا)، نازییەکان و سۆڤیەتییەکان ئەم تەکنیکەیان لەدژی یەکتر پەیڕە کرد، کە تەنانەت گەیشتە ئاستێک سۆڤیەت توانی بەرپەرچی هێرشێکی مەزنی نازییەکان لەساڵی ١٩٤٢ بداتەوە بەهۆی ئەو زانیارییانەی ئافرەتێک لە فەرماندە سەربازییەکان، بەهۆی سەرجێیکردن لەگەڵیدا، وەریگرتبوو. ئەمە پێمان دەڵێت، گرنگ نییە میتۆدەکانی پاراستنی وڵات چین، گرنگ ئەوەیە بە چ شێوەیەک ئەنجام دەدرێن. کچ و ئافرەتی جوان هەمیشە دەتوانن ڕۆڵی خۆیان بگێڕن لەم چەندەدا، بەتایبەتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا کە "شەرەفی سێکسی" تیایاندا بایەخێکی زۆری پێدەدرێت. سەرەڕای پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا، ئەم میتۆدە هێشتاش دەتوانێت ڕۆڵی باڵای هەبێت لە فریودانی کارمەندی هەواڵگریی، سەربازیی، و سیاسەتمەدار و دارێژەرانی سیاسەتی وڵاتێک. سروشتی ئەم میتۆدە بەشێوازێکە، ئەگەر ڕاهێنانی چڕی لەسەر کرابێت، کەسایەتی مرۆڤ بەتەواوی دەستەمۆ دەکات و هەرچییەکی هەیە بۆ فریودەرە سێکسیەکە دەیدرکێنێت. ڕۆڵی ئافرەت و کچانی جوان لەلایەک، پیاوە قۆز و سەرنجراکێشەکانیش لەلایەکی تر دەتوانن کاریگەرییەکی ئەرێنیان لەم بوارەدا هەبێت. لە جیهانی کۆن و نوێدا، بەزۆری ئافرەتان پیشەی سکرتێری بەرپرسە باڵاکانیان پێدەدرێت، هەربۆیە پیاوێکی قۆز دەتوانێت بەئاسانی ئەو ئافرەتانە فریوبدات، بەتایبەتی ئەگەر شوویان نەکردبێت، بەم پێیەش هەرچی زانیاری گرنگە لە نووسینگەی ئەو بەرپرسە بگوازێتەوە بۆ دەزگای هەواڵگری وڵاتەکەی. لەسەردەمی ستالیندا، دەزگای هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەت تەنانەت بەشێکی تایبەتی بەم بوارە لە دەزگاکەیدا کردەوە و بۆماوەی دوو

ساڵ راهێنانی پێکردن بۆنەوەی بە ئەورووپادا بڵاوببنەوە زانیاری گرنگ بۆ دەزگاکە بهێننەوە، وە سەرکەوتنی بەرچاویشی تۆمارکرد. هەربۆیە، نابێت گرنگی ئەم میتۆدە بەنادیدە بگیرێت، و دەزگا دژەهەواڵگرییەکانیش پێویستە ئاگاداری ئەو فەرمانبەرانەیان بن کە موعەرەزن بۆ ئەم میتۆدە چونکە هەرکە تێوەگلان، ئیتر میللەتێک دەکەوێتەژێر هەرەشەی دوژمنانەوە نەوەک تەنیا تاقە کەسێک. لەجیهانی هەواڵگرییدا ئەم هونەرەی سیخوڕی بە "تەڵەی هەنگوینی" ناسراوە. خودی چەمکەکە دەلالەتە لەوەی کە ئەم کردەیە بەرلە ئەنجامدانی وەک هەنگوین شیرین دیارە بەڵام خۆی لەخۆیدا تەڵەیەکە و هاتنەدەرەوەی تاڕاددەیەکی زۆر ئەستەمە. هۆکاری هەرەسەرەکی وروژاندنی باسێکی ئاوا لە بەشێکی تایبەتدا بۆ گرنگی ئەم تەکنیکە دەگەڕێتەوە. دەکرێت کوردستانیش، وەک نیشتیمانی دایک، تووشی ئەم جۆرە پیلانگێڕییە هەواڵگرییە ببێتەوە بەتایبەتی لەلایەن وڵاتی ئێرانەوە کە هەموو کارێک دەکات بۆ لاوازکردنی هەژموونی هەرێمی کوردستان. بەو هیوایەی ئەم بەشە ببێتە بەرچاوڕوونیەک کە ئێمەی کورد، لەبەر ئەوەی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە کۆمەڵگایەکی پارێزکارین، نەکەوینەنێو ئەم تۆڕە پڕ لە کێشەیەی هەواڵگرییدا کە ڕەنگە داهاتووی وڵاتی پێوەبەند بێت.

لەم بەشەدا، سەرەتا بە تیروتەسەلی باسی "تەڵەی هەنگوینی" دەکەین و پاشان دێینە سەر مێژووی سەرهەڵدانی سیخوڕی سێکسی لە جیهانی هەواڵگرییدا. جگە لەمەش، باسێکی ورد تەرخانکراوە بۆ بەکارهێنانی سێکس وەک میتۆدێکی سیخوڕی. وە لەکۆتاییشدا، بنچ و بناوانی جەنگی سیخوڕی سێکسی نێوان نازی و سۆڤیەتییەکان باسکراوە کە ئەمەی دواییان سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

## تەڵەی هەنگوینی

تەڵەی هەنگوینی لە پێناسەیەکی کورتدا بریتییە لە "تەکنیکی هەڵخەڵەتاندنی دوژمن لەرێگەی تەڵەیەکی سێکسییەوە کە تیایدا ئامانجەکە رووبەرووی بەڵگەی وێنەیی دەکرێتەوە، ئەمەش هۆکارە بۆ هەڕەشەکردن لە پیشە و نێوزڕاندنی کەسی ئامانج." بەرلە جەنگی جیهانیی یەکەم، ئەم کارەی فریودان یەکەمجار لەلایەن ئەڵمانەکانەوە بەدامەزراوەیی کرا، کە تیایدا هەڕەشە لەو کەسانە دەکرا دوای ئەوەی لەرێگای چەند لەشفرۆشێکەوە کاری سێکسیان لەگەڵدا دەکرا و بەبەڵگەی وێنەییەوە داوای درکاندنی زانیاری هەواڵگرییان لەو کەسانە دەکرد کە دەکەوتنە نێو ئەم تۆڕەوە.

لەماوەی جەنگی ساردا، سۆڤیەتییەکان سوودێکی زۆریان لە هونەری سیخوڕی تەڵەی هەنگوینی وەرگرت بۆ بەهێزکردنی زیاتری دەزگا هەواڵگرییەکانی لەکاتی ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنەکانیاندا، جا چ لەرێگەی هاورەگەزبازییەوە بوایە، وەک جۆن ڤاسال، یان بەهۆی هەوەسبازیی ئافرەتانەوە بوایە، وەک سێر جیۆفری هاریسن، باڵیۆزی بەریتانیا لە مۆسکۆ، و ئێدوارد ئێلیس سمیس لە سی ئای ئەی. لەکاتێکدا ڤاسال هەڕەشەی لێکرا بۆئەوەی فشار بکات و بەردەوام بێت لەسەر بەخشینی زانیاری نهێنی بۆ بەرژەوەندی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت تا دەستگیرکردنی لەساڵی ١٩٨١، باڵیۆزی بەریتانیا لە رووسیا پەیوەندییە سێکسییەکەی لەگەڵ خزمەتکارێکدا بە سەرووی خۆی راگەیاند لەساڵی ١٩٦٨ و بەم هۆیەشەوە کێشرایەوە وڵاتەکەی. لە نموونەیەکی تردا، پیشەی سیاسیی ئەندامێکی پەرلەمانی لەسەر لیستی پارتی پارێزکاران بەناوی ئەنتۆنی کۆنتی تووشی داڕمان بوو کاتێک چەندین وێنەی ناوبراو بەرلە پرۆسەی هاوسەرگیری بڵاوکرانەوە، کاتێک ناوبراو لە هۆتێلێکدا وێنەی لێگرا لەوکاتەی خەریکی گۆڕینەوەی سۆز و دڵداریی بوو لەگەڵ وەرگێڕێکی سەرنجڕاکێش لە مۆسکۆ. بەهەمانشێوە، چەندین هەوڵ بەگەڕخران بۆ خستنەداوی ئەندامانی مارینزی ئەمریکی لەوکاتەی لە ئەرکی پاسەوانیدا بوون لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە مۆسکۆ، وە یەکێکیان بەناوی کلەیتن لۆنتری کەوتەنێو داوەکەوە و لە ئابی ١٩٨٧ بەتۆمەتی ئاشکراکردنی زانیاری بۆ کچێکی شەنگی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت خرایە

بەندیخانەوە. لە چەند نموونەیەکی تردا، جۆن ستۆنهاوس لەساڵی ١٩٨٧ بووە قوربانی تەڵەی سیخوڕی هاوڕەگەزبازیی، مۆردیخای ڤانونو لەلایەن ئافرەتێکی جوانی ئەمریکییەوە قاییلکرا بۆنەوەی لە لەندەنەوە بەرەو ئیتاڵیا بڕوا، کە هەرلەوێشدا رفێنرا.

تەڵەی هەنگوینی تەکنیکێک بوو کە تایبەت بە دەزگا هەواڵگرییەکانی بلۆکی رۆژئاوا، وە ئۆلێگ لایلین یەکەم کەس بوو بە هاوکاریکردنی تیمێکی هاوبەشی دەزگای هەواڵگری نهێنی (MI٦) و (MI٥) کاتێک ناوبراو تووشی سەرسوڕمانی کرا کاتێک سکرتێرەکەی بەهۆی سەرنجڕاکێشی سێکسییەوە چووە ژێرباری هاوەسبازییەوە.

## مێژووی تەڵەی هەنگوینی

دەزگای هەواڵگری نهێنی بەریتانیا بەم دواییانە تووشی نیگەرانیەکی زۆر بووە لە بارەی گرفتی سیخوڕی سێکسی. لە بەڵگەنامەیەکی چواردەلاپەڕەییدا کە لەساڵی ٢٠٠٩ بەسەر سەدان بانق، کار، دامەزراوەی ئابووریدا لەژێر ناونیشانی "هەڕەشەی سیخوڕی چینی"دا بڵاوکردەوە، دەزگای ئاسایشی بەریتانی چەندین هەوڵی هەڕەشەئامێزی چینییەکانی بڵاوکردەوە بۆسەر کەسانی خاوەن کار بەهۆی پەیوەندی سێکسییەوە لەگەڵ کچانی شۆخ و شەنگی سەربە دەزگای هەواڵگری چینی. بەڵگەنامەکە، هەروەک رۆژنامەی تایمزی لەندەنی ئاماژەی پێکردەووە، بەشێوەیەکی تایبەتی وشیاری ئەوە دەدات کە دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتی چین هەوڵدەدەن پەرە بە "پەیوەندی درێژخایەن" بدەن بۆنەوەی هاوڵاتیانی بەناوبانگی ئەو وڵاتە لەڕێی هەوەسبازییەوە هەڵخەڵەتێنن و لەکۆتاییشدا بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەیان بەکاریان بهێنن.

راپۆرتەکەی ئەم دواییانەی دەزگای هەواڵگری بەریتانیا لەمەڕ هونەری سیخوڕی چینییەکان شتێکی نوێ نییە لە مێژووی رەشی سیخوڕی و سێکسدا. بۆماوەی چەند سەد ساڵێکە دەزگا سیخوڕییەکان سیخوڕەکانیان بەهەموو جۆرێک مەشق دەدەن بۆنەوەی ئەم هونەرە بەکاربهێنن بۆ بەدەستهێنانی زانیاری نهێنیی.

لە وشەسازیی هەواڵگریدا بەم جۆرە هونەرە دەوترێت "تەڵەی هەنگوینی." دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە مەبەستەکە لێرەدا هەر ئەوە نییە پیاوان بکەونە نێو ئەو تەڵەیەوە بەڵکو بەشێوەیەکی یەکسان ئافرەتانیش دەکەونە تەڵەی کوڕانی قۆز و شەنگ. سیخوڕەکان سێکس وەک هونەری کۆکردنەوەی زانیاری بەکاردەهێنن. بەشێوەیەکی سەرەکی، زیرەکیی، مەشق، کاراکتەر، و نیشتیمانپەروەری رۆڵێکی ئەوەندە باڵا ناگێڕن لە رێگرتن لەوەی کەسی ئامانج نەکەوێتە نێو تەڵەکەوە. هەروەک لەژیانی ئاسایی کەسێکدا، نازانرێت کە ئایا کە مرۆڤ دەکەوێتە داوی دڵدارییەوە بە چ ئامانجێک لایەنی بەرانبەر ئەو کارەی ئەنجامداوە، هەربۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە کە دڵسۆزترین کارمەندی هەواڵگری بکەوێتە ناو داوی ئەم جۆرە هونەرەی هەواڵگرییەوە. لەڕاستیدا، کاتێک تەڵەی هەنگوینی ئەڵمانیای رۆژهەڵات لەساڵی ١٩٩٧دا ئاشکرا بوو، ئەو ئافرەتەی کە تێوەگلابوو رەتی کردەوە بڕوا بەوە بهێنێت کە فێڵی لێکراوە، تەنانەت ئەو کاتەشی کە بەڵگەی ئاشکرای پێ نیشاندرا. ئافرەتەکە بە باوەڕەوە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە، "نا، ئەمە راست نییە، ئەو بەڕاستی منی خۆشدەویست."

ئەو دەزگایانەی بەڕاستی دەیانەوێت بەرپەرچی تەڵەی هەنگوینی لەداهاتوودا بدەنەوە، دەبێت سەرەتا هەڵسن بە خوێندەنەوەی مێژووی ئەم هوونەرە. بێگومان، ژمارەیەکی ئێجگار زۆر چیرۆکی فریودانی سێکسی، هاوسەرگیری ساختە، نامەی دڵداری فریودەر، و وێرانبوونی ژیان هەن کە رۆڵیان گێڕاوە لەم هونەرە فریودەرەدا.

لەساڵی ١٩٨٦، مۆردیخای ڤەنونو، تەکنیککاری ئیسرائیلی کە لە خانەی دیمۆنا بۆ دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی کاری دەکرد، بە رۆژنامە بەریتانییەکانی راگەیاند کە ئیسرائیل خەریکی پەرەپێدانی چەکی ناوەکییە. بانگەشەکەی بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ سیاسەتی فەرمی ئیسرائیل بۆ چەکی ناوکی یەکی نەدەگرتەوە، بەڵام ناوبراو چەندین وێنەی وەک بەڵگە پێشکەش کرد.

ماوەی گفتوگۆ لەنێوان رۆژنامەکان زۆر توند بوو، وە رۆژنامەی سەندەی تایمزی لەندەنی لەو ماوەیەدا ناچار بوو ڤەنونو لە شوێنێکی نادیاری لەندەن بشارێتەوە

لەوکاتەی هەوڵیاندەدا چیرۆکەکەی پشتڕاستبکەنەوە. بەڵام ڤەنونو لەو ماوەیەدا ئارامی خۆی لەدەستدا. ناوبراو بە سەرانی ڕۆژنامەکەی ڕاگەیاند کە ئەو چاوی بە کچێکی گەنج کەوتووە کاتێک سەردانی شوێنە سەرنجڕاکێشەکانی لەندەنی کردووە و هەردووکیان پلانی ئەوەیاندانا بۆماوەی یەک هەفتە بۆ ژوانێکی دڵداریی ڕوویکەنە شاری ڕۆمای ئیتالیا.

مۆردیخای ڤەنونو، زانای ئەتۆمی ئیسرائیلی

ڕۆژنامەکە هەستی بەوە کرد کە مافی ئەوەی نییە ڕێ لە ڤەنونو بگرێت. ئەمە هەڵەیەکی زۆر مەزن بوو: هەرماوەیەکی کەم دوای ئەوەی لەگەڵ هاوڕێ کچەکەی گەیشتنە ڕۆما، ئەفسەرانی مۆساد لەبۆسەدا بوون، دەستگیریان کرد، بەهێز ڕایانکێشایە نێو کەشتییەک و لە ئیتالیاوە بەرەو ئیسرائیل بردیانەوە، و هەر لەوێشدا بە تۆمەتی خیانەتی مەزن لە ئیسرائیل تۆمەتبارکرا. ڤەنونو بۆماوەی هەژدە ساڵ زیندانی کرا، یازدە ساڵیان لە زیندانی تاکەکەسی. ئەو لەساڵی ٢٠٠٤ ئازادکرا، وە

هێشتاش لەژێر قەیدوبەندی توندی ئیسرائیلدایە، کە بەهیچ شێوەیەک ناتوانێت چاوی بە کەسانی بیانی بکەوێت یان باس لە ئەزموونەکەی بکات. وڵاتی بەریتانیاش هەرگیز پەراوێزی لێکۆڵینەوەی لەم بارەوە نەکردەوە، و بێدەنگی هەڵبژارد.

ئەو ئافرەتەی تەڵەی هەنگوینی ئەنجامدابوو بریتیی بوو لە ئەفسەرێکی مۆساد بەناوی شێریل بێن تۆف، لەژێر ناوی نهێنی "سیندی." ئەو لەشاری ئۆرلاندۆ لەدایک ببوو، وە شووی بە ئەفسەرێکی دەزگای ئاسایشی ئیسرائیلی کردبوو. دوای ئۆپەراسیۆنەکە، ناسنامەیەکی نوێی پێدرا بۆ رێگاگرتن لە تۆڵەسەندنەوە، و لەکۆتاییدا ئیسرائیلی جێهێشت و رووی کردەوە ئەمریکا. بەڵام رۆڵەی ناوبراو لە پرسی ڤەنونودا پڕبایەخ و گرنگ بوو. مۆساد نەیدەتوانی پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی لەگەڵ بەریتانیا تێکبدات بە رفاندنی ڤەنونو لەسەر خاکەکەی، بۆیە دەبوایە ببردرێتە دەرەوە.[1]

## چەمکی سیخوڕی سێکسی

"سیخوڕی سێکسی" چەمکێکی بازاڕییە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری هەواڵگریی، بەبەکارهێنانی جۆرێکی تایبەت میتۆدی ئاژانسێکی هەواڵگریی، کە تیایدا ئەندامێک یان هەواڵدۆزێکی دەزگایەکی هەواڵگریی یان ئاسایش هەوڵدەدات زانیاری هەواڵگریی لە کەسێک بەدەستبهێنێت بە دروستکردنی پەیوەندییەکی سۆزداری یان پەیوەندییەکی سێکسی لەگەڵ کەسێک کە هەڵگری چەند زانیارییەکی دیاریکراوی هەواڵگرییە، وە لەهەمانکاتدا بنیادنانی متمانە کە ببێتە هۆی ئاشکراکردنی، جا چ بە ئاگایی یان بێ ئاگاییانە، زانیاری هەواڵگریی کە سوودیان هەبێت بۆ دەزگایەک یان هەڕەشەی ئەوە بکات کە ئەگەر کەسە سێکس لەگەڵ کراوەکە زانیارییە پێویستەکە

[1] Knightley, Walt, Traub, & Lewis. (٢٠١٨). The History of the Honey Trap. Retrieved from http://foreignpolicy.com/٢٠١٠/٠٣/١٢/the-history-of-the-honey-trap/

نەدرکێنێت تووشی تەنگوچەڵەمەی مەزنی دەکەن بەهۆی ئاشکرا کردنی ئابڕووچوونەکەی و خیانەتی نیشتیمانیی.[i]

## "سیخوڕی سێکسی" وەک میتۆدێکی هەواڵگریی و دەزگاکانی ئاسایش

چیرۆکی هەواڵگریی و دەزگاکانی ئاسایش بەدڵنیاییەوە دەکەوێتە خانەی کۆنترین و بابەتی هەرە ڕۆمانسی لە بواری ئاساییشدا. چەندین وتاری ڕۆژنامەڤانی، ڕۆمان و چیرۆک فیلمی هەواڵدۆزی هەواڵگریی بەرهەمهێنراون کە توانیویانە نەتەوەیەک، وڵاتێک یان تەنانەت هەموو جیهان بەهۆی ئەم کارەیانەوە ڕزگاربکەن. وە نابێت ئەوەش لەیاد بکەین کە هەر سێکسە بۆماوەی چەندین دەیە لە "بیردۆزی پیلانگێڕان"دا وەک میتۆدێکی کرداری بۆ درێژەدان بە دەسەلاتی چەند فەرماندارێک بەکاردەهێنرێت. ئەم ڕەوتە بەتایبەتی لەماوەی جەنگی ساردداا زیاتر پەرەی سەند کە تیایدا زلهێزەکانی جیهان، ململانێی سیاسیی، جەنگێکی ڕاگەیاندنیان بەرپاکرد بەهۆی نیشاندانی چەندین چیرۆک دەربارەی هەواڵدۆزی کاریگەریی، لەوانە کارەکتەری جەیمس بۆند، ماکس ئۆتۆ ڤۆن ستیرلیتز، و چەندان پاڵەوانی تری شاشەی تەلەڤزیۆنەکان بەڵگەی ئەو ئارگومێنتەن.

هەندێک لەم کارەکتەرانە هەر لەژیانی کردەییەشدا وجوودیان هەبوو و وەک "سیمبولی سێکس" یان "سیخوڕی سێکسی" مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، ئەمەش بەهۆی ئەو هێزە مەزنەیان کە لە بواری بەکارهێنانی سێکس بۆ فریودانی کەسانی باڵادەست بۆ بەدەستهێنانی چەند زانیارییەک هەیانبوو. لەگرنگترین ئەو فیلمە سینەماییە بەناوبانگانەی "سیخوڕی سێکسی" دەکرێت ناوی جەیمس بۆند لەسەرووی لیستدا بهێنیت، کە دەوترێت گوایە خودی کەسایەتییەکە لە واقیعدا لەگەڵ دەزگای هەواڵگری نهێنی بەریتانی (MI٦) کاری کردووە. لە ئافرەتانی بەناوبانگی "سیخوڕی سێکسی" دەکرێت جوانی و جەماڵی ماتا هاری، سەماکەری ئەڵمانی، وەک نموونە بهێنینەوە،

---

[i] Mijalković, S., ٢٠١٤. 'Sex-espionage' as a method of intelligence and security agencies. *Bezbednost, Beograd*, ٥٦(١), pp.٥-٢٢.

بەلام لەساڵی ١٩١٧ بەتۆمەتی سیخوڕیکردن بۆ ئەڵمانەکان بە فەرمانی دەسەڵاتدارانی فەرەنسیەوە گوللەباران کرا.

ماتا هاری

ئەم میتۆدە مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە لە هەردوو بواری زانستی هەواڵگریی و دەزگا هەواڵگرییەکان. لەکۆندا، دەزگا هەواڵگرییەکان بەشێکی تایبەت بوون لە پێویستی دەسەڵاتدارانی دەوڵەت بۆ دروستکردن و جێبەجێکردنی سیاسەتی دەوڵەت و پاراستنی بەهاکانی نەتەوە و بەرژەوەندییەکانی.

لەلایەکی ترەوە، دەزگایەکی ئاساییش ئاژانسێکی هەواڵگری ناوەخۆییە کە لە بوارەکانی دۆزینەوە و ڕێگرتن لەو چالاکیانە کاردەکات کە هەڕەشەن بۆسەر دەوڵەت و سیستەمی کۆمەڵایەتیی، لەدژی هەردوو نەیاری ناوەخۆ کە لە یاسا لادەدات و نەیاری نێودەوڵەتی، ئەمە جگە لەوەی هەر ئەم میتۆدە ڕۆڵێکی کارا دەگێڕێت لە بەرەنگاربوونەوەی چالاکییەکانی دەزگا هەواڵگرییەکان، بەتایبەتی لەڕووی دژەهەواڵگریی و سیخوڕەکانیان.

سەرەڕای ئەمانەی لەسەرەوە باسکران، دەزگا هەواڵگرییەکان چالاکانە کاردەکەن بۆئەوەی ڕێ لەو هێزانە بگرن کە هەوڵدەدەن سیستەمی وڵاتێک، حکومەت، دەستوور و سیستەمی کۆمەلایەتی سیاسیی بشێوێنن. ئەم جۆرە چالاکیانە لە دەزگا هەواڵگرییەکان زۆر بەربلاون و تاکە بەشێک هەموو ئەم کارانە ئەنجام نادات، دەکرێت زۆرجار دەزگایەکی هەواڵگری هەموو هەوڵی خۆی بەگەڕبخات بۆئەوەی پروپاگەندە لە وڵاتی نەیار پەرەپێبدات، ئامانجی تایبەت بڕفێنێت، غافڵکوژیی بکات، کردەی نابەجێ ئەنجام بدات لەڕووی سیخوڕییەوە، ئەمەش تەنیا بۆئەوەی پشتیوانی گروپێکی تایبەتی وڵاتێکی نەیار بکات بەئامانجی تێکدان و روخاندنی ڕژێمەکەی بەهۆی بەگەڕخستنی کودەتایەکەوە. دەبێت ئەوەش بڵێین کە تەنانەت کاری ئەو دەزگایانە دەگاتە ئاستێک کە هانی تێوەگلانی سوپای وڵاتێک دەکەن یان لەڕووی ئابوورییەوە وێرانی دەکەن تەنیا بۆئەوەی بکەوێتە ژێر رکێفی خۆیان.
هەموو ئەو چالاکیانەی بەهۆی هەواڵگریی و دەزگاکانی ئاساییش ئەنجام دەدرێن، دەبێت لەسەر بنەمای چەند زانیارییەکی وەدەستهاتوو لەڕێگای کاری هەواڵگرییەوە رۆبنرێن. یەکێک لە ڕێگاکانی بەدەستهێنانی هەواڵگریی بریتییە لە تەکنیکی فریودانی ئامانج لەڕێگای بەدەست هێنانی متمانەوە و دروستکردنی پەیوەندییەکی سۆزداری لەنێوان کارمەندێکی هەواڵگریی و ئەو کەسە ئامانجەی کە زانیاری هەواڵگریی پێیە، ئەم تەکنیکەش بە "سیخوڕی سێکسی" ناسراوە.[i]

## سیخوڕی سێکسی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت

یەکێک لە میتۆدە هەرە بەکارهاتووەکانی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB) لە کردەی سیخوڕیدا ئەو میتۆدە بوو کە پێی دەوترا "میتۆدی رۆمیۆ" کە تیایدا کوڕ و پیاوی قۆزی سۆڤیەتی بە ناسنامەی ساختەوە دەنێردرانە رۆژئاوا بۆئەوەی سکرتێرە ئافرەتەکان بەهۆی سێکسەوە لەخشتەبەرن و بەمەش دەستیان بەو زانیاریانە بگات

[i] Mijalković, S. (٢٠١٤). 'Sex-espionage'as a method of intelligence and security agencies. *Bezbednost, Beograd*, ٥٦(١), ٥-٢٢.

کە کۆمۆنیستەکان دەیانویست. هەروەها، دەزگاکە تەنیا بە بەکارهێنانی پیاوی قۆزەوە نەوەستا، بەڵکو ئافرەتانیش لەم نێوەندەدا رۆڵێکی بالایان گێڕا. ئەم میتۆدە هەروەک پێشتر ئاماژەی پێکرا بە "تەڵەی هەنگوینی" ناسرابوو.

پرڤادا ئاماژە بەوە دەکات کە "ئەوە یەکێتی سۆڤیەتی جاران بوو کە یەکێک لە دەزگا تایبەتییە هەرە پێشکەوتووەکانی جیهانی لەم رووەوە دامەزراند، کە هەڵسا بە مەشقپێدانی سیخوڕی ئافرەت بۆئەوەی لەڕووی سێکسەوە پیاوانی رۆژئاوایی بەهۆیەوە لەخشتەبەرن. لەم دواییانە پەرتووکێک لەچاپدرا دەربارەی سیخوڕی سێکسی. ئافرەتێک بەناوی ڤێرا چیرۆکەکەی دەربارەی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB) و چۆنیەتی تەجنیدکردنی کچی شۆخ و شەنگ گێڕاوەتەوە، تیایدا ئەوان بەڵێنی ئەوە بە کچەکان دەدەن کە ئەوان بەهەموو جۆرە کردەیەک کە بەمێشکدا بێت بۆ بەرژەوەندی سۆڤیەت بەکاردەهێنن و لەبەرامبەریشدا ئەو کچانە هەرچییەکیان لە دونیادا پێویست بێت بۆیان ئامادە دەکەن، ئەگەر ئەوان قابیل بن و ببن بە هەواڵدۆزی سێکسی. ئەوان بەهەموو شێوەیەک مەشقیان پێدەدا: دەرهێنانیان لە ژینگەیەکی شەرمنانە یان باشتر بڵێین داشۆرینیان لە شتێک بەناوی شەرم، فێرکردنیان بە بەکارهێنانی تەکنیکی سێکسی، نیشاندانی ڤیدیۆی پۆرنۆگرافیک، و هەموو ئەو تەکنیکانەی پێویست بوون لەم بوارەدا. تەنانەت کار گەیشتە ئەو رادەیەی کە تەکنیکی سێکسی لە هۆڵی مەشقپێدان تاقیدەکرایەوە و هەموو ئەو رەفتارانەش تۆمار دەکران بۆئەوەی شارەزایی تەواو لە جووڵە و چۆنیەتی ئەنجامدانی سەرجێی هەر یەکێک لەو ئەندامانەی دەزگاکە شیبکرێتەوە و رادەی وشیاریی هەر یەکێکیان بپێورێت."

ڤێرا لەسەر گێرانەوەکەی بەردەوام دەبێت و زیاتر دەڵێت، "ئێمە پێمان وترا کە سەربازیین و چەکی دەستی ئێمەش تەنیا جەستە و لەشی ئێمەیە. کاتێک مەشقەکە کۆتایی پێهات، ئێمە بووین بە جۆرە ئافرەتێک کە لەڕووی سێکسییەوە زۆر پێشکەوتین، ئێمە ئامادە بووین سەرجێی لەگەڵ هەر پیاوێکدا بکەین، بەبێ لەبەرچاوگرتنی تەمەن، جێندەر، رەنگی پێست، هتد... بەرلە ئەنجامدانی هەر

کردەیەکی سێکسی، ئێمە بە جۆرێک لێهاتووی بووین کە دەبوایە سەرەتا بزانین کەسی بەئاماجگیراو چ جۆرە جووڵەیەکی سێکسی دەوێت، ئینجا بەگوێرەی ئارەزووی ئامانجەکە رەفتارمان دەکرد، کە لە کردەکە دەبووینەوە ئینجا دەستمان دەکرد بە هەڕەشەکردن لە ئامانجەکە کە ئەگەر هاوکاری دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت نەکات، کارەکەی لەسەر ئاشکرا دەکرێت: بەمەش پیشە و ئابڕووی ئامانج دەکەوتە مەترسییەوە و ناچار دەبوو ملکەچی داواکارییەکانی (KGB) بێت."

سەرەڕای سەرکەوتوویی میتۆدەکە، جاربەجاریش حاڵەتی لەناکاو هاتۆتەپێش و شکستی هێناوە، هەروەک لە کەیسی سەرۆکی ئەندەنووسیا ئەحمەد سوکارنۆدا روویدا. ناوبراو بەوە ناسرابوو کە ئارەزوویەکی زۆری بۆ سێکس هەیە. دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB) نەیدەویست ئەم دەرفەتە زێڕینە لەدەست بدەن. هەربۆیە، دەزگاکە هەڵسا بە ئامادەکردنی کۆمەڵێک لە کچی جوانی رووسی لەکاتی گەشتەکەی بۆ شاری مۆسکۆ. ئەم کچانە لە گەشتەکەی ئەحمەد لەنێو فڕۆکەدا سەرنجی ناوبراویان راکێشا، لەژێر پیشەی خزمەتگوزاری نێو فڕۆکە، بێخەبەر لەوەی کە هەموو ئەمانە لەلایەن دەزگای سۆڤیەتەوە رێکخرابوو. ئەحمەد کە وای بەباش زانی ئەم دەرفەتە لەدەست خۆی نەدات، هەربۆیە لەکاتی هاتنەخوارەوەی لە فڕۆکەکە، هەموویانی بانگهێشتی ئەو هۆتێلە کرد کە ناوبراو لێی دەمایەوە. بەرلە گەیشتنی وەفدەکەی سەرۆک، هەواڵگری سۆڤیەت هەموو ئامادەکارییان بۆ ئۆپەراسیۆنەکە کردبوو، کامێرایەکیان خستبووە نێو ئاوێنەی ژوورەکە. بەمەش، هەموو ئەو دیمەنانەی تۆمارکرد کە ئەحمەد لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا ئەنجامی دەدا. واپێدەچوو ئۆپەراسیۆنەکە بەتەواوی ئامانجەکەی پێکابێت. بەرلەوەی هەڕەشە بکات، دەزگای (KGB) ژوورێکی بچووکی سینەمایی ئامادەکرد و جەنابی سەرۆکیان بانگهێشتی بینینی فیلمێکی سینەمایی کرد، کە سەرۆک سەیری کرد ئەمە هەمان ئەو دیمەنانەن لەگەڵ ئافرەتەکان ئەنجامی داوە. هەواڵدۆزەکانی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت پێیان وابوو ئیتر پاروویان کەوتۆتە ناو رۆن و وایانزانی ئەو زۆر دەترسێت، و دەستبەجێ ئامادە دەبێت هاوکاری دەزگاکە بکات، بەڵام هەموو شتێک بە

پێچەوانەوە روویدا: جەنابی سەرۆک پێی وتن کە ئەو شریتەی ئەوان نیشانیانداوە دیارییەکە لەلایەن حکومەتی سۆڤیەت، بۆیە داوای کرد چەند کۆپیەکی تری پێبدەن بۆئەوەی لەگەڵ خۆی بیانباتەوە بۆ ئەندەنووسیا و لە سینەمادا نیشانی خەڵکەکەی خۆی بدات. ئەحمەد بە هەواڵدۆزەکانیشی وت کە خەڵکی ئەندەنووسیا شانازی بەو کارەیەوە دەکەن کە دەبینن سەرۆکەکەیان ئەم جۆرە کارانە لەگەڵ کچی رووسیدا دەکات.

هەواڵگری ئەڵمانیای رۆژهەڵاتیش لە بەرەوپێشبردنی سیخوڕی سێکسی بەدەر نەبوو. ئەوان پلانێکی تیۆریتەسەلیان دانا بۆ لەخشتەبردنی (لەڕووی سێکسەوە) ئەو سکرتێرانەی هیچ یارێکیان نییە و لە دامەزراوەی گرنگی بەرلینی رۆژئاوا کاردەکەن. یەکەم پەیوەندی دەبوایە لەنێو پاس، کافێ، یان لەماوەی پشووی خواردنی نانی نیوەڕۆ ئەنجام بدرێت. پیاوێک دەستی بە گفتوگۆیەک دەکرد، و پاشان یاریەکەی دەستی پێدەکرد. بۆ نموونە، پیاوێکی رێکپۆش و قۆز بە چەپکێک گوڵەوە زەنگی دەرگای ئافرەتێکی تەنیای لێدەدا، دواتر وای نیشاندەدا کە بە هەڵە زەنگەکەی لێداوە. بەشێوەیەکی زۆر لێزانانە داوای لێبوردنی لێدەکرد، چەپکە گوڵەکەی پێشکەش دەکرد، و مەسەلەکە گەرم دەبوو! هەواڵدۆزەکان بەرلە ئۆپەراسیۆنەکان، زانیاری سەرتاپای ئافرەتەکەیان دەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا، سیخوڕێکی سێکسی پیاو پێویست نەبوو وەک ئەکتەرێکی هۆلیود جوان بێت و رەنگی ئەوان بدات، چونکە ئەوکاتە گومانی لێدەکرا. هەروەها، سیخوڕی سێکس کۆرسێکی پەروەردەییان دەبینی لەگەڵ ئافرەتی فێرکاردا. هەندێجار روویدەدا کە هەواڵدۆزێک هەر بەڕاستی دەکەوتە داوی خۆشەویستی ئامانجەکەی، وە ئەو دوو کەسی لەدەست دەردەچوون و کەس پێی کۆنترۆڵ نەدەکران. گرفتەکە لەگەڵ ئەو سکرتێرە ئافرەتانەی لە پێگەی بەرزی بەرلینی رۆژئاوا کاریان دەکرد بەشێوەیەک جددی بوو کەدەسەڵاتدارانی ناتۆ فەرمانێکیان دەرکرد کە هەموو نووسینگەکان دەبێت پۆستەرێک هەڵواسن و بە فەرمانبەرەکانیان بڵێن کە "دڵی خۆیان داخەن."

لەکۆتاییدا، جێی خۆیەتی ئاماژە بەوەش بدەن کە بەکارهێنانی سێکسی ئاسایی تاکە میتۆدی دەزگاکان نەبوو، بەڵکو هەواڵدۆزی هاورەگەزبازیش رۆڵێکی کارایان گێرا لەم پێناوەدا، بەلام ئەمە لەسەر ولاتەکە بەند بوو. لەیەکێک لە رووداوەکاندا، کاتێک هەواڵدۆزێکی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت(KGB) تێبینی ئەوەی کرد کە یەکێک لە دیبلۆماتکارە فەرەنسییەکان چاو دەبڕێتە پیاوێک لە دەزگای ئاساییشی حکومەت. کاتێک(KGB) وێنەی رووتی ناوبراوی نیشاندا، نوێنەرایەتی فەرەنسی بەدەنگێکی بەرزەوە دایانە قاقای پێکەنین —دواتر دەرکەوت کە هەموو کارمەندانی باڵیۆزخانەکەی دەیانزانی ناوبراو هاورەگەزبازە، ئەمەش بەهیچ شێوەیەک گرفت نەبوو.

بۆ زێتر ئاشنابوون دەربارەی چەکی نهێنی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت، بەپێویستی دەزانین زیاتر بچینە نێو تەکنیک و بنج وبناوانی ئەم "هونەرە." لەم نێوەندەدا ئافرەتان رۆڵی سەرەکیان هەبوو، چەکی نهێنی ئەمان بریتیی بوو لە سێکس. ئەوان توانیان سەدان کەسایەتی گرنگی سیاسیی لەم رووەوە فریوبدەن، وەک سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا جۆن پرفینیۆ و باڵیۆزی فەرەنسی مۆریس دیژۆ و فیدل کاسترۆی بچوک، تەنانەت ئەدۆلف هیتلەریش. هەموو ئەمانە بوونە قوربانی بەشێکی تایبەت لە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت لە سەردەمی ستالیندا، کە بە (NKVD) ناسرابوو. ئەم بەشە لە کردەی دژەهەواڵگریی هەرە کاریگەر تێوەگلابوو: سیخوڕی سێکسی. ئێمە لێرەدا هەڵدەستین بە باسێکی تێروتەسەلی ئەو ئافرەتانەی بەم جۆرە کارانە هەڵدەستان و باسی چەند کەسێکیش دەکەین کە لەم تەڵە هەنگوینیەدا تێوەگلاون. ئەو ئافرەتانەی بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکرابوون، ژمارەیەکی نهێنی و ناوێکی تایبەتییان بۆ دادەنرا، بەشێوەیەکی گشتی بەکۆی ئەو ئافرەتانە دەوترا (Swallows). ئەو بەشە نهێنییە لەساڵی ١٩٣٧ بۆ یەکەم جار لەسەر فەرمانی جۆزێف ستالین دروستکرا. کچ و ئافرەتانی سەرتاسەری سۆڤیەت هێنرانە مۆسکۆ بۆئەوەی جوانی خۆیان نمایش بکەن. هەڵبژاردنی ئەو ئافرەت و کچانەش لەلایەن لێژنەیەکەوە بوو کە پسپۆڕ بوون لە رووی جەستە و دەروونیەوە. نیکۆلای ئێرکۆف، بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتی ئەوکات، خۆی سەرپەرشتی پرۆسەی

هەڵبژاردنەکەی دەکرد. لەکۆی سەدان کەس کە ناونووسکرابوون، دەبوایە ناوبراو تەنیا بیست کەسیان هەڵبژێرێت بۆ ئەرکەکە، ئەم بیست کەسە دەبوونە یەکەم قوتابی فێرگەی سێکسی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت. بۆماوەی شەش مانگ مەشقی ئەو کەسانەی هەڵبژێردراون بەنهێنی و لەژێر قەیدوبەندێکی توندی ئاساییشدا بەردەوام دەبێت. ئارمانج لەم کارەش بۆ ئەوەیە تا هەموو ئەو گرفتانەی لەکاتی ئەنجامدانی چالاکییەکاندا دێتەپێشیان بەشێوەیەکی زانستیانە و بە هونەرێکی بەرزەوە چارەسەر بکەن. رووی جەستەیی ئەم بەربژێرانە زۆر گرنگ بوو؛ ئەمان ئافرەتانی سپی پێست و ناوقەد باریکی جوانکیلە بوون. ئێستاش لە خوارەوە بەتێروتەسەلی باسی میتۆد و مەشق و شێوازی فریودانی ئەو کەسانە دەکەین کە دەکەوتنەنێو ئەم داوە.

لەساڵی ١٩٣٧، یەکێتی سۆڤیەت لەژێر سەرۆکایەتی ستالیندا خەراپترین رۆژەکانی خۆی بەڕێ دەکرد: مامۆستا، فەرماندەی سەربازیی و پزیشک بێ ئەوەی کەس بزانێت تووشی چ نەهامەتییەک بوون، ون دەبوون، هەموو ئەم کارانەش لەژێر سەری دەزگای هەواڵگری ئەو وڵاتەدا بوو. بەشی ئەرشیڤی دەزگا هەواڵگریی رۆژانە سەدان فایلی بەدەست دەگەیشت کە بە مۆرێکی سوورەوە لەسەری نووسرابوو، "کەیسەکە داخرا." با ئێستا بزانین کە بیرۆکەی دروستکردنی ئەم بەشە نهێنییە تایبەتیە لەلایەن جۆزێف ستالین بۆچی دەگەڕێتەوە.

کچێکی سترانبێژی جوانی ئەڵمانی بەناوی جۆزفین هێنسی بەهۆی سەرنجڕاکێشی جەستە و خەندەی سەر لێوانیەوە توانی خۆی نزیک بکاتەوە لە مارشاڵێکی سەربازی لە سوپای سووری یەکێتی سۆڤیەت بەناوی توکوچێڤسکی. لەڕاستیدا، جۆزفین سیخوڕی نازییەکان بوو. توکۆچێڤسکی بەرلەوەی تەنانەت هەست بە کردە سیخوڕییەکەش بکات، چەند کارمەندێکی هەواڵگری نازی لێی وەژوور کەوتن و هەڕەشەی ئەوەیان لێکرد ئەگەر هاوکارییەکی تەواوی دەزگای هەواڵگری نازییەکان نەکات، ئەوان چارەنووسەکەی ئاشکراکردنی ئەو فەزیحەتە دەبێت بۆ سۆڤیەت. بەخوێندنەوەی راپۆرتەکانی دەزگای هەواڵگریی وڵاتەکەی، ستالین بۆی دەرکەوت کە بەکارهێنانی سێکس لە دەزگا هەواڵگرییەکان وڵاتەکەی چ بایەخێکی زۆری هەیە لە

کۆکردنەوەی زانیاری. بەهۆی ئەم ڕووداوەوە، ستالین بڕیاریدا کە ئەڵمانیا شایانی وەڵامێکی هاوشێوەیە و دەبێت بەهەمان تەکنیک تۆڵەی لێبکرێتەوە. هەربۆیە، دەستبەجێ بڕیاری دروستکردنی بەشی سیخوڕی سێکسی دەرکرد، کە تیایدا کچ و ئافرەتی جوان ڕۆڵێکی باڵای تیادا دەگێڕن. بەپشت بەستن بە بڕیارەکەی، دەزگای هەواڵگری بەناچاری کارێکی تریان بۆ دەزگاکەیان زیاد کرد بەناوی سیخوڕی سێکسی. بەگوێرەی بەڵگەنامەکانی نووسینگەی نیکۆلای ئێشۆف، بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (NKVD)، لەساڵی ١٩٣٧، هەموو کچە جوانەکانی سۆڤیەت بەخێرایی و بە وشیارییەوە هێنرانە مۆسکۆی پایتەخت. لە ڕووسیادا، دۆزینەوەی ئافرەتی لەم جۆرە لەلایەک کارێکی ئەستەم نەبوو چونکە ڕووسیا بە وڵاتی کچی جوان ناسراوە، وە لەلایەکی تریشەوە تەنانەت کچەکانیش ئارەزوویان ئەوەبوو بتوانێت بە هەر جۆرێک لە جۆرەکان خزمەتی نیشتیمانی خۆیان بکەن. لەو تاقیکردنەوەیەدا، تەنیا باشترینەکان دەگەنە قۆناغی بیست لە کەسە سەرکەوتووەکان. سەرەڕای جوانیەکەیان، کچەکان دەبوایە خاوەنی جەستەیەکی تەندروست، دەروونێکی بەهێز بوونایە، ئەم دوو تایبەتمەندییەش لەو دوو مەرجە سەرەکیانە بوون کە لێژنەی هەڵبژاردنەکە بایەخێکی سەرەکی پێدەدا. جەستەناس، دەروونناس و پزیشکانی لێهاتوو هەڵدەستان بە پڕکردنەوەی فۆرمی هەر یەکێک لەم کچانە.

ڤادیم کۆلێسنیکۆڤ، دەروونناس، ئاماژە بەوە دەکات کە، "بەهۆی سروشتی ئەو کارەی من هەمە، دەبێت چاوم بە چەندین ئەو ئافرەتانە بکەوێت کە لە پیشەسازی سێکسیدا کاردەکەن، دەبێت ئەوە بڵێم کە ئەوان زۆر بە لێزانانە ئەم کارە دەکەن، تۆ پێیان بڵێی 'بڕۆ'، ئەوان دەڕۆن، تەنانەت بەبێ ئەوەی پرسیار بکەن. بەکورتی، هەرچییەکیان پێ بڵێی بەبێ دوودڵی ئەنجامی دەدەن، چونکە شارەزان و ئەمە کاری خۆیانە. ئافرەتێکی لەم جۆرە بەئاسانی دەتوانێت ئارەزووەکانی پیاوێک تێربکات."

بەڵام خۆبەدەستەوەدان تاکەمەرجی سیخوڕی سێکسی نەبوو. سەرەڕای جوانی و ئارەزووی سێکسیان، نەدەبوایە بۆ یەک چرکەش ئەوە لەیاد بکەن کە بۆچی ئەم کارە دەکەن، واتە هیچ بەهانەیەک نابێت بەدەستەوە بدرێت بۆئەوەی لە ئامانجی

سەرەکی خۆیان، کە بەدەستهێنانی زانیارییە، لابدەن. هەربۆیە، زۆر گرنگ بوو جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە ئەو کەسەی لەم کردارەدا بەژدار دەبێت، لەڕووی دەروونییەوە جێگیرە. لێژنەکە کەوتبووە ژێر بەرپرسیاریەتییەکی مەزنەوە چونکە گرنگ بوو بژاردەی دروست بۆ ئەم کارە هەڵبژێرن. بەم هۆیەشەوە، و لەبەر گرنگی و هەستیاری بابەتەکە، سەرۆکی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت خۆی سەرپەرشتی لێژنەکەی دەکرد. نیکۆلای ئێرشۆڤ، سەرۆکی دەزگاکە، قسەوباسێکی زۆری لەسەر دەکرا لەناو حکومەت، هەربۆیە نەیتوانی لەسەر کارەکەی بەردەوام بێت و بە تۆمەتی هاوڕەگەزبازی، سیخوڕی و تیرۆریزم درایە دادگا و دوو لە دڵدارە هاوڕەگەزخوازەکانیشی ئامادەی گەواهیدانی دادگاکە بوون لەدژی ناوبراو. بەهۆی پاراستنی ئابڕووی دەزگاکە، ناوبراو بەبڕیاری ستالین بەبێدەنگی وەک سیخوڕی بیانی و تۆمەتباری دەوڵەت گوللەباران کرا.

لاڤرێنتی بێریا، بەبڕیای ستالین، شوێنی ئێرشۆڤی گرتەوە. ئەویش ناچاربوو خۆی سەرپەرشتی هەڵبژاردنی ئەو کچانە بکات کە دەبوایە بۆ سیخوڕی سێکسی هەڵبژێردرێن. ناوبراو تەنیا بەوە نەوەستا لێژنەکە چەند کچێک هەڵبژێرێت و تەواو بەڵکو هەر خۆیشی لەگەڵ چەند دانەیەکیان سەرجێی کرد بۆ زانینی ئاستی وشیاری و کارامەییان لەم ئەرکە نوێیەدا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەوانی تریش یەک بەیەک بۆ کاربەدەستە گرنگە سەربازییەکانی وڵاتە نێردران بۆئەوەی دڵنیابن لە سەرکەوتنیان. لە هەنگاوێکی کەم وێنەدا، دەزگاکە هەڵسا بەگەڕان و دۆزینەوەی ئەو کەسانەی کە زۆر شارەزاییان هەیە لە کاری لەشفرۆشی، بە پیاو و ئافرەتەوە، بۆئەوەی تەجنیدیان بکەن کە ببن بە مامۆستای تایبەتی ئەو کچانەی بۆ کارەکە هەڵبژێردرابوون. کچە هەڵبژێردراوەکانی لە وانەی ئەم مامۆستایانەدا، دەبوایە بەبێ جلوبەرگ لەسەر کورسی پۆلدا دانیشن. ئەوان فێردەکران کە چلۆن بەخێراییەکی زۆر خۆیان بۆ ئامانجەکە ئامادە بکەن. دەبوایە لەماوەی شەش مانگی سەرەتادا ئەو کچانە فێری چەند زمانێکی بیانی، ئەتەکێت و سەما ببونایە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەبوایە زانیاری گشتیان زیاتر پەرەپێبدەن. قۆناغی دووەم لە سێ بەش پێکهاتبوو. یەکەم، چارەسەرێکی دەروونیان

بۆ ئەنجام بدرێت. ئیگۆر گۆرچینپێنک، پسپۆڕی بواری سێکس، ئامارژە بەوە دەکات کە، "دەبوایە ئەو کچانە لەڕووی ڕۆحیەوە بەباشی ئامادە بکرێن." دوای کۆتایی هاتنی ئەم قۆناغە، کچەکانی لەسەر ئەوە رادەهێنران کە ئەو کارەی ئەمان دەیکەن بۆ خودی نیشتیمانە نەوەک بەرژەوەندی هیچ کەسێکی تر. دووەم، بریتیی بوو لە لێکۆڵینەوە لە ئارەزووی سێکسی ئەو بەربژێرانە. یەکێک لە دابونەریتەکانی پیاو و ئافرەتی سۆڤیەتی لەوکاتەدا ئەوەبوو کە لە سەرشۆرێکی گشتییدا بە یەکەوە سەریان دەشوشت. هەربۆیە، دەزگای هەواڵگری ئەو وڵاتەش، بۆ نەهێشتنی شەرم و حەیای ئەو ئافرەتانە کاتێک لەشوێنێکی گشتین، بۆماوەیەکی دیاریکراو هەموویانی هێنایە ناو ئەم جۆرە ژینگەیە، بەمەش لە ئەرکی داهاتوودا تووشی هیچ شەرمەزارییەک نابن. سێیەم، کە زەحمەتترینیان بوو، فریودانی سێکسی کەسانی نامۆ بوو کە بۆیەکەم جار بوو چاویان پێی دەکەوت. دەزگاکە قوربانیەکەی بۆ ئەو ئافرەتانە دیاری دەکرد و لەدوورەوە چاودێری رەفتارەکانیان دەکرد. ئەگەر ئەو ئافرەتە بە سەرکەوتوانە توانیبای ئارەزووی سێکسی ئەو پیاوە بوروژێنێت، ئەوە بە سەرکەوتوو لە تاقیکردنەوەکە دادەنرا. هەموو ئەو قۆناغانە لە ناملیکەیەکدا چاپکران بۆئەوەی لە بەرنامەکانی داهاتوودا لەسەری بخوێنرێت. ئەم نامیلکەیە لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکاندا کەوتەبەر دەستی لێکۆڵەران، واتە دوای نزیکەی پەنجا ساڵ.

لەدوای کۆتایی برینی هەموو قۆناغەکانی فێرگەی دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەت، ئەم جارە نۆرەی ئەوەیە چ جۆرە تەکنیکێک بەکاربهێنن بۆ فریودانی سێکسی کەسانی ئامانج و ئاشکراکردنی زانیاری لێیانەوە بەبێ ئەوەی خۆیان هەست بەم چەندە بکەن. سەرەتا، دەزگاکە هەڵسا بە ئامادەکردنی تیکەڵەیەکی گیایی: ڤابینا، لاڤاژ و روو. لەوکاتەدا، لەڕووی زانستییەوە ئەوە سەلمێنرابوو کە پێدانی ئەم جۆرە تێکەڵەیە دەبێتەهۆی وروژاندنی سێکسی پیاوان، تەنانەت ئافرەتانیش. ئەم حاڵەتە بەبێ ویستی قوربانیەکە روودەدات. ئەم پێکهاتەیە دەبێت لە پۆشاک، پرچ یان پێستی ئامانجەکە بدرێت. ئەگەر ئەو مەجالە نەبوایە تێکەڵەکە بەکاربهێنن، ئەوان ئافرەتەکان هەموو رێکاریکی تریان بەکاردەهێنا لەسەر ئامانجەکە، وەک وتنی قسەی وروژێنەر

لەبن گوێ کە ڕاستەوخۆ دەبێتەهۆی بەرزکردنەوەی ئارەزووی سێکسی و سەرجێیی. هەرکە ئەمە ئەنجامدرا، پیاوەکە بەتەواوی دەکەوێتەژێر رکێفی ئارەزووی ئافرەتەکەوە. قوربانیەکە ئامادەیە هەموو شتێکی پێبدات بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئافرەتەکە. ئەم میتۆدە بەشێوەیەکی بێخەوش بەڕێوەدەچوو جگە لە چەند حاڵەتێکی دیاریکراو نەبێت، وەک ئەوەی کە قوربانیەکە پەسیوی لێبێت. ئەگەر حاڵەتەکە بەم شێوەیە بوو، ئەو ئافرەتانە چەکێکی تریان لە جبەخانەکەیاندا مەڵاسدابوو: ماددەی بێهۆشکەری کۆکاینی تێکەڵکراو لەگەڵ کحول.

ئەم تێکەڵەیە هۆکارێکی گرنگە بۆ زیادکردنی ئارەزووی سێکسی، ئەمە جگە لەوەی دەبووە هۆی ئەوەی ئامانجەکە بەتەواوی بێهۆش بێت و یادگەی خۆی لەبیربکات. هەرکە ئامانجەکە دەگەیشتە لووتکەی چێژ (ئۆرگازم)، ئیتر ئامادەبوو هەرشتێک بداتە دەست ئافرەتەکە (سیخوڕەکە). دوای ئەوەی زانیارییەکانی بەدەستەوەدا، لەژێر کاریگەریی ئەو تێکەڵەیەی پێی دراوە، هیچ شتێکی لەیادگەدا نامێنێت، واتە نازانێت کە زانیارییەکی بە سیخوڕەکە بەخشیەوە. ئەگەر ئامانجەکە بەرلە کاتی چاوەڕوانکراو هۆشی هاتەوە سەرخۆی، ئافرەتەکانی پلانێکی تریان بۆ ئەم چەندە لە هەگبەدا هەبوو، ئەمەش تەنیا لەوکاتەدا ئەنجام دەدرا کە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ هەبوایە لەسەر ئەرکەکە. تەکنیکەکەش بریتیی بوو لەو کردەوانەی لەلایەن قوتابخانەی کونتۆیجی ژاپۆنییەوە بەکاردەهات. لەسەدەی شازدەهەمدا، ژاپۆنییەکان گوڵی ژەهرکراویان بەکاردەهێنا بۆ کووشتنی ئامانجەکەیان. ئەم ئافرەتە ژاپۆنیانە تەنیا لە کردەی سێکسدا شارەزا نەبوون، بەڵکو هەڵگری شەست و دوو تەکنیکی جیاجیابوون بۆ کووشتنی دوژمن، گرنگترینیان بەکارهێنانی تەوقەی سەریان بوو، کە سەرەکەی بە ژەهر ئاخنرابوو، هەرکە بەر جەستەی دوژمن دەکەوت، یەکسەر ئیفلیجی دەکرد و لەماوەی چەند خولەکێکدا دەیکوشت. ژنە سیخوڕەکانی سۆڤیەتیش بەشێکی هەرەزۆری ئەم تەکنیکانەیان بەکارهێنا، بەڵام چۆن؟ ئافرەتەکانی بەشێوەیەکی وا ڕاهێنران کە بەکارامەیی بتوانن پیاوان چەک بکەن.

وێنەی بەدەستکێشراوی ژنە سیخوڕێکی ژاپۆنی، دەلالەت لە بەکارهێنانی ئەوقەی سەر دەکات لەئەگەری کوشتنی ئامانجەکەدا.

لەڕاستیدا، سیخوڕە سێکسییەکانی سۆڤیەت پێویستیان بە بەکارهێنانی ئەم جۆرە تەکنیکانە نەبوو چونکە مەشقەکەیان بەجۆرێکی واپێشکەوتوو بوو کە ئەستەم بوو شکست بهێنێت، وە ئەگەر بیانویستایە کەسێک چەک بکەن تەنیا ئەوکاتە دەیانکرد کە زۆر پێویست بوایە. بەم جۆرە، یەکەمین خولی ڕاهێنانی ئەو سیخوڕە ئافرەتانە لەساڵی ١٩٣٩ کۆتایی پێهات. هەربیست دەرچووەکە ئامادەکران بۆئەوەی هەڵسن بە ئەنجامدانی یەکەم کاری خۆیان. بەڵام دەبوایە لە تاقیکردنەوەی کۆتایی دەرچن. دەبوایە لە سێکسی بەکۆمەڵیش دەرچن کە بەچڕیی لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکە چاودێری دەکرا و وێنەی دەگیرا. ئیگۆر گۆرپیچێنکۆ، پسپۆڕی بواری سێکسۆلۆژی، لەم بارەوە دەڵێت، "مەبەست لەم کارە بۆ ئەوە بوو کە ئەو ئافرەتانە بتوانن کردەی سێکس ئەنجام بدەن بەبێ ئەوەی تووشی هیچ ئیحراجیەک بن. دەبوایە هەستە

تاکەکەسیەکانی بنخۆڵ بکرێن. دەبوایە ئەنجامدانی سێکس لە ئەرکەکاندا لەهەستە سۆزدارییەکان جیابکرێنەوە بۆئەوەی تەنانەت لەگەڵ ئەو کەسانەشدا بخەون کە خۆشیان ناوێن یان لەڕووی جەستەییەوە خۆشیان لێ نایەت." ئەو ئافرەتانە لەگەڵ رێنماییکەرەکانیاندا سەیری گرتە ڤیدیۆکەیان دەکردەوە بۆئەوەی بۆ دوایین جار بزانن کە هەڵەکە لەکوێدایە و چۆن دەتوانن راستیان بکەنەوە. هەرکە ئەم قۆناغەش کۆتایی هات، ئیتر ئازاد دەبن و بەتەواوی بۆ ئەرکەکەیان ئامادەن.

هەموو ئەو کچانەی بەژداری بەرنامەکە ببوون ناوقەدباریک و سەرنجڕاکێش بوون بەڵام بەتەواوی لە هەست و سۆزداری راستەقینە داچۆڕدرابوون. ئەو مەشقە درێژەی ئەنجامیاندا، ئەوانی کردە ئافرەتی رۆبۆتئاسا. ئەوان بەتەواوی بوون بە سیخوڕی ئامادە، ئامادە بۆئەوەی بچن بۆ بەرەکانی جەنگی بێدەنگ لە بەرەنگاربوونەوەی ئەڵمانیای نازی. ئەو ئافرەتانە لەماوەیەکی زۆر کەمدا دەبن بە سکرتێر، خزمەتگوزار و تەنانەت رەبەنی کلێساش. هەروەکو نەخشەی بۆ دارێژرابوو، دەبوایە هەموویان دڵداری خۆیان بدۆزنەوە. وە بەم شێوەیە، دڵدارەکانیان دەگۆڕن تا دەگەنە نوخبەی هەرەسەرەوەی سیاسیی نازییەکان. ئەم ئۆپەراسیۆنە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە نهێنیپارێزی بۆ کرا لەناو دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت. رایخی سێیەم(هیتلەر) هیچ زانیاری نەبوو لەسەر تەنانەت وجودی ئەم بەرنامەیە چونکە لەنێو ئەواندا سیخوڕی سێکسی تەنیا لەنێوخۆدا بەکاردەهات بۆئەوەی بزانن کامە بەرپرسی پارتەکە ناپاکە.

لە هاوینی ساڵی ١٩٣٩دا، پۆلیسی بەرلین تەلەگرامێکی بەدەستگەیشت کە مۆری "نهێنی" بەسەرەوە بوو، لەسەری نووسرابوو "تایبەتە بە بابەتی گرنگی نیشتیمانی." لەسەر داوای هیتلەر، فەرمان بە پۆلیس کرابوو کە بیست لە جوانترین و متمانەپێکراوترین لەشفرۆش لە سەرتاسەری ئەڵمانیای نازییدا بدۆزنەوە. فەرمانەکە لەلایەن والتەر شێلنبێرگ، بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیا، واژوو کرابوو. پۆلیس هەرزوو توانی ئەو ئافرەتانە بدۆزێتەوە کە بۆی دەگەڕان.

لەشفرۆشەکان چاوپێکەوتنێکی کورتیان لەگەڵدا کرا و واژوویەکیان لەسەر ئەو کاغەزەکرد کە بۆ رەزامەندی ئامادەکرابوو. دوای ئەم چاوپێکەوتنە کورتە، ئافرەتەکان

نێردرانە خانەی لەشفرۆشی. کێتی سالۆن ئەو خانە لەشفرۆشیە بوو کە ئەو ئافرەتانەی بۆ نێردران، و لەوکاتەدا بەناوبانگترین خانە بوو لە تەواوی بەرلیندا. ئەوانەی لەوێدا کاریان دەکرد ئەلبومی ئەو کچانەیان نیشانی پیاوەکان دەدا کە لەوێدا بەردەست بوون. لەنێو ئەو ئەلبومانەدا، یەکێکیان زۆر تایبەت بوو. ئەو ئەلبومە تەنیا نیشانی ئەو کەسانە دەدرا کە زۆر بەناوبانگ و تایبەت بوون. ئەو میوانە تایبەتییە ئاگاداری ئەوە نەبوو کە هەرچییەک دەیکات و دەیڵێت لەلایەن دەزگای هەواڵگرییەوە تۆماردەکرێت و یەکسەر دەچێتەوە بەردەم خودی هیتلەر.

پلانی شێلنبێرگ ئەوە بوو کە ئافرەتە هەڵبژێردراوەکان بە خەندە و ئازادییەکی تەواوەوە لەگەڵ پیاوەکان دەدوێن، باسی پرسە سیاسییەکان دەکەن. ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو، خودی ئەو پیاوانەی دەچوونە خانە لەشفرۆشیەکەش کارمەندی باڵای حکومەتەکەی هیتلەر بوون، ئامانج لەمەش بۆئەوە بوو کە بزانرێت ئایا ئەو کارمەندانە خیانەت لە هیتلەر دەکەن یان نا، وە ئایا هیچ پیلانێکیان لە مێشکدایە لەدژی هیتلەر و هاوکارانی. سەرەتا، هەموو پیاوەکان لەکاتی دەستبازییدا لەگەڵ ئەو لەشفرۆشانە بەشێوەیەکی یەکسان رەفتاریان دەکرد، واتە گاڵتە و گەپیان دەکرد و پەسنی هیتلەر و ستافەکەیان دەکرد. جارێکیان زرکوڕی مۆسۆلینی سەرۆکی ئیتالیا لە سەرجێیەکدا بە لەشفرۆشێکی وت کە "هیتلەر گەمژەیە." لەمەوە، سیخوڕە ئافرەتە رووسیەکان توانیان زانیاری زۆر گرنگ لە کەسانی تایبەتی هیتلەر وەربگرن و یەکسەر دەیاننارد‌ەوە بۆ مۆسکۆ. بۆنموونە، ئەوان توانیان سۆڤیەت لە هێرشێکی نازییەکان ئاگاداربکەنەوە کە نیازیان وابوو داگیری بکەن.

لە هاوینی ١٩٤١دا، سیخوڕی بەرلین "ئەلفا" نامەیەکی بەپەلەی بۆ سۆڤیەت نارد: ئەڵمانیا ئامادە بوو بۆ داگیرکردنی یەکێتی سۆڤیەت. سوپای هیتلەر بۆ سێ گروپ دابەش دەکرێت، لەسێ ناوچەی جیادا: مۆسکۆ، کییێڤ و لینینگراد. ئەم پەیامە لەلایەن یەکێک لەو سیخوڕە سێکسیانەوە نێردرا کە سەریە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت بوو. ئەو ئافرەتە پەیوەندییەکی "سۆزداری" لەگەڵ کەسێکی زۆر نزیکی هیتلەردا هەبوو. "دڵدارەکە" کە متمانەی ئافرەتەکەی بەدەستهێنا، لەکۆتاییدا دەستی

کرد بە ئاشکراکردنی نهێنییەکانی ڕژێمی نازی. بەڵام ستالین هیچ دەنگی لەبەر ئەو هەواڵە زۆر گرنگە نەهێنا. هەرکە جەنگەکە دەستی پێکرد، بەتەواوی پشتی بەو ئافرەتانە بەست کە زانیارییان لەناو جەرگەی خاکی دوژمنەوە بۆ ڕەوانە دەکرد. زانیارییەکان تەنیا بەوە نەوەستان کە لە چەند سەرچاوەیەکی نزیک لە هیتلەرەوە بگەن، بەڵکو ئەمجارە سیخوڕە سۆڤێتییەکان چوونە سەرجێی خودی هیتلەریش.

ئۆلگا چیکۆڤا هاوڕێیەکی نزیکی هیتلەر بوو. هەرچەندە ئۆلگای جوان و سەرنجڕاکێش یەکێک نەبوو لە ئەندامانی بەرنامەی سیخوڕی سێکسی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت، بەڵام سێکسی بەکارهێنا بۆ خزمەتکردنی دۆزی نیشتیمانەکەی. لەبەرەبەیانیەکی بەهاری ساڵی ١٩٤٤دا لە بەرلین، ئۆتۆمبیلێکی پڕلە سەرباز وەستا و ڕایانکوتایە سەر خانووەکەی ئۆلگا. هاینریخ مولەر، بەڕێوەبەری گوستاپۆ، خۆی سەرپەرشتی ئۆپەراسیۆنەکەی دەکرد بۆ گرتنی سیخوڕێکی مەترسیدار. کە چووە ژوورەوە، بڕوای بەچاوەکانی نەکرد کە چی دەبینێت. هیتلەر لەگەڵ کچە ئەکتەرە ئەڵمانیەکەی بەڕەگەز ڕووسی خەریکی خواردنەوەی چایە. مولەر گومانی لێ هەبوو کە بۆماوەیەکی درێژ سیخوڕی سۆڤیەت بووە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەدژی نەبوو. هەربۆیە، بڕیاریدا دوای دەستگیرکردنی ئەشکەنجەی بدەن بەڵام لە تواناکانی ئۆلگای کەم کردبووەوە، نەیدەزانی کە خاوەنی چ توانایەکی ئارامگرتنە. هیتلەر لەم کارەی مولەر زۆر تووڕە بوو، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئۆپەراسیۆنەکەی دەرکرد. ڕایخی سێیەم دەیزانی کە ئەم ئافرەتە کاریگەرییەکی بێ ئەندازەی هەیە لەسەر ناوبراو.

لەکۆتاییدا، ماوەتەوە بڵێین کە سیخوڕی سێکسی سەر دەخاتە سۆزی هەموو ئەو کەسانەی کە لە بەرپرسی مەزنی وڵاتێکن. نموونەی ئەمەش، خودی هیتلەر و بێل کلینتۆن، سەرۆکی ئەمریکا، و سیلڤیۆ بێرلسکۆنی سەرۆکی ئیتالیان. دەکرێت بڵێین لە هەرسێ کەیسەکەدا قوربانیەکان نەکەوتونەتە نێو تەڵەی هەنگوینەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەرسێکیان لەو پۆستە باڵایانەدا قوربانی دەستی سێکسن.[1]

---

[1] YouTube. (٢٠١٤). *Sex-espionage a secret weapon of the KGB - Searching fortheTruth*.[online]Availableat:https://www.youtube.com/watch?v=R٠SMryF Wpc&t=٢١٢s&has_verified=١.

## لەپشت دەرگا داخراوەکاندا

"تا ئەوکاتەی پیشەی سیخوڕی هەبێت، ڕۆمیۆیەک[i] هەیە کە دەستی دەگاتە هەموو نهێنییەکان." مارکوس وۆلف

لەشفرۆشی و سیخوڕی دوو لەپیشە هەرەکۆنەکانی جیهانن. لەکاتێکدا ڕەنگە ئەمە وەک شتێکی ئاسایی لێکبدرێتەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە لەسەر حەقیقەت ڕۆنراوە. لەڕووی مێژووییەوە، هەم ئافرەت هەم پیاو جوانی و کەسایەتی کاریزمی وەک ئامرازێک بەکارهێناوە بۆ لەخشتەبردنی و خستنەتەڵەی کەسانی خاوەن دەسەڵات بۆئەوەی زانیاری لێیانەوە وەچنگ بخەن. زۆر قورسە وابیربکەینەوە کە لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی ساردی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەت(هەرچەندە بەجۆرێک لە جۆرەکان هێشتاش هەر بەردەوامە)، ئیتر بەکارهێنانی ئافرەت و پیاو وەک تەڵەی سێکسی کۆتایی پێهاتووە. واپێدەچێت شێوازی هەرەکۆنی سیخوڕی، بەتایبەتی هەواڵگریی مرۆیی، خەریکە دووبارە سەردەردەهێنێتەوە. بەشێکی هۆکارەکە ڕەنگە بۆئەوە بگەڕێتەوە کە وڵاتان توانیویانە بەشێوەیەکی پێشکەوتووانە پەرە بە دەزگا بەرگرییەکانی وڵاتەکەیان بدەن، بەتایبەتی وڵاتانی ڕۆژئاوا، ئەمەش دوژمنەکانیان ناچارکردووە بە گەڕانەوە بۆ میتۆدە کۆنەکانی سیخوڕی. بەگوێرەی ڕاپۆرتێک لەلایەن فیلیپ نایتلی لە گۆڤاری سیاسەتی دەرەوە (Foreign Policy magazine)، دەزگای هەواڵگری ناوخۆیی بەریتانیا نیگەرانییەکی زۆری لێنیشتووە بەهۆی سیخوڕی سێکسییەوە. لە ڕاپۆرتێکی چواردە لاپەڕەییدا کە بەسەر هەزاران بانق، بزنس و دامەزراوە داراییەکان لەساڵی ٢٠٠٩ بەناونیشانی "هەڕەشەی سیخوڕی چینی" دابەشکرا، وشیاریدایە ئەو دەزگایانە کە ئاگاداری پەیوەندی سێکسی بن لەگەڵ ئافرەت و پیاوانی چینیدا.[ii]

---

[i] "ڕۆمیۆ" دەلالەتە لە کارەکتەری ڕۆمانی "ڕۆمیۆ و جولیێت"ی ویلیام شەکسپیر، کە ناوەڕۆکێکی سۆزداریی لەخۆی دەگرێت.

[ii] Knightley, Phillip. "The History of the Honey Trap." *Foreign Policy*, ٢٠١٠: p.١.

دیاردەی تەڵەی هەنگوینی بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر بەکارهێنانی هەواڵدۆزی ئافرەت و پیاو رۆنراوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئامانجێک و پاشان بەکارهێنانی ئەو کردەیە وەک هەڕەشە لەبەرامبەر پێدانی ئەو زانیارییانەی پەیوەندییان بە ئاسایشی نیشتیمانییەوە هەیە. دەکرێت بڵێین کە بەناوبانگترین کەیسی بەکارهێنانی تەڵەی هەنگوینی بریتییە لە کەیسی کچێکی شۆخوشەنگی سەماکەر بەناوی ماتا هاری. یەکێک لە تایبەتمەندییە هەر دیارەکانی کەیسی ئەم ئافرەتە بریتیی بوو دڵسۆزیی دوولایەنە. لە دیاردەی بەکارهێنانی سێکس وەک ئامرازێکی سیخوڕیدا، دەکرێت بڵێین تەنانەت وڵاتپارێزترین، مەشقپێدراوترین ئەفسەری دەوڵەتێک موعەرەزە کە ببێتە نێچیری ئەم جۆرە ئافرەت و پیاوانە. هیچ دەزگایەکی تری هەواڵگری شان لەشانی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت لەم رووەوە نەداوە، کە بەشێکی تایبەت بەم جۆرە سیخوڕییە کردبووەوە. لە کولتوری هەواڵگری سۆڤیەتدا ئەم جۆرە ئافرەتانە پێیان دەوترا "پارووەکان" و پیاوەکانیش بە "قەڵەڕەشکەکان". رەنگە دیارترین تۆڕی بەکارهێنانی سێکس بۆ کردەی سیخوڕی ئەوە بێت کە لەلایەن مارکوس وۆلفەوە دروستکراوە، سیخوڕی ئەڵمانی و بەرپرسی پێشووی دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیای رۆژهەلات، ستاسی (StadtsSicherheitsDienst). بەگوێرەی وتەکانی نایتلی، وۆلف هەڵسا بە دروستکردنی بەشێکی تایبەت لەناو دەزگای ستاسی و هەرچی کوڕ و کچی ئەفسەری جوانی خۆی هەبوو گواستیەوە بۆ ئەو بەشە. ناوبراو ناوێکی تایبەتی لەو بەشە نا و پێی دەوت "سیخوڕەکانی رۆمیۆ."[i] ئەم سیخوڕانە بەرپرس بوون لە کۆکردنەوەی زانیاری پڕبایەخ. ئەوان بەشێوەیەکی ئاوا کارامە کاریان دەکرد کە تەنانەت چەندین لە قوربانیانەی کەوتبوونە داوی ئەمان رەتیان کردەوە بڕوا بە راستییەکە بهێنن تەنانەت دوای ئەوەی رووبەڕووی بەڵگەی حاشاهەڵنەگریش کرانەوە. بەگوێرەی راپۆرتێکی رۆژنامەی (Sabotage Times)، "بەلایەنی کەمەوە چل ئافرەت دادگایی کران بەتۆمەتی پێدانی زانیاری نهێنی بە دڵدارەکانیان، کە لەڕاستیدا

---

[i] Knightley, Phillip. "The History of the Honey Trap." *Foreign Policy*, ٢٠١٠: p. ٤

سیخوڕی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بوون – وە دزێژی و دڕندەیی ئەو فریودانانە جێگای سەرسوڕمان بوون."[i] دەزگای هەواڵگری ناوەخۆیی بەریتانیاش (MI٥) تەڵەی هەنگوینی لە ئۆپەراسیۆنەکانیدا بەکارهێنا، ئەمەش لەڕێگای سەرچاوەکانی یانەی شەوانەی ئیف لە شەقامی ریجینت، کە لەلایەن هێلێن کۆنستانتینێسکۆ، ئاوارەیەکی بەلجیکی، بەڕێوەدەبرا.[ii] دەزگای هەواڵگری سی ئای ئەی ڕەتیکردنەوە لە ئۆپەراسیۆنە هەواڵگرییەکانیدا هەڵسابێت بە بەکارهێنانی تەڵەی هەنگوینی، بەو پێیەی میتۆدەکەی وەک ئامرازێکی بێکەڵک لە بەدەستهێنانی زانیاری نهێنی دەبینێ. لێرەدا پرسیارێک خۆی قیت دەکاتەوە کە، ئایا چ هۆکارێک پاڵ بەو کەسانەوە دەنێت کە دەکەونە نێو ئەم تەڵە پڕمەترسیدارەی هەواڵگرییەوە؟ بەشێوەیەکی گشتی، هەر مرۆڤێک خودان کەسایەتییەکی تایبەت بەخۆیەتی. لە چەندین کەیسدا، وا دەردەکەوێت کە ئامانجەکە لەژیانی هاوسەرگیری شکستی هێنابێت، یاخود تەنانەت ژیانی هاوسەرگیری هەر پێک نەهێنابێت، یاخود دەکرێت ئامانجەکە تووشی گرفتی دارایی بووبێت لەم ڕێیەوە غەریزەی خۆی بەتاڵ بکاتەوە. ئەو کەسانە پێویستیان بە شتێکە و ئەو کەسانەی وەڵامی ئەو پێدوایستیەی ئەوانیان پێیە. کەیسەکانی کلەیتۆن لۆنتری، جۆن ڤاسال، ریجارد میلەر و گابرییل کلیێم، پێمان دەڵێن کە جوانی وای کردووە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بکەونە نێو باوەشی تەجنیدکەراندا. بەلێکۆڵینەوە لەچەندین نموونەی تەڵەی هەنگوینیدا، چەند ڕاستیەکمان بۆ دەردەکەوێت.

ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی کەوتونەتە نێو ئەم داوە، لەکاتی تەجنیدکردنیاندا، چەند کێشەیەکی تایبەت یان ئاماژەیەکیان هەبووە کە بۆتە هۆی ئەوەی بکەوێتە نێو ئەم تەڵەوە. ڕێنمایی هەڵە و نکۆڵیکردنی بەیەکەوە هۆکارن بۆئەوەی دەزگا

---

[i] Deeson, Martin. "Katia Zatuliveter and the Art of The Spy Honey Trap." *Sabotage Times*, ٢٠١١: p.٤ Stock, Jon. "A 'swallow' came to spy on us." *The Daily Telgraph National Edition*. London: The Daily Telegraph, December ١١, ٢٠١٠.

[ii] Trahair, Richard C.S. "Honeytrap Operations." *http://psi.praeger.com*. n.d. http://psi.praeger.com.ezproxy٢.apus.edu/doc.aspx?d=/books/dps/٢٠٠٠b٥٧d/٢٠٠٠b٥٧d-p٢٠٠٠B٥٧D٩٩٧٠١٢٧٠٠١.xml&browse=honey (accessed February ٠٩, ٢٠١٢).

ئەمنییەکان تووشی کارەساتی وێرانکەر ببنەوە. لە هەرچوار ئەو کەیسانەی لەسەرەوەدا باسکران، جۆرێک لە فەرامۆشکردن و دوورخستنەوە لە بەشێکی ئەو کەسانەدا هەبووە، ئەمە جگە لەوەی دەزگاکەش لە پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی ئەو کەسە وەک بەرپرسێکی سەرەکی دادەنرێت. مەرج نییە تەنانەت ئەمانە هۆکار بن، جارجاریش خودی کەسایەتی کەسەکە و وەفاداری بۆ دەزگاکەی گرفتەکەیە. ریچارد میللەر قەڵەو بوو، گرفتی هاوسەرگیری هەبوو، لێهاتوو نەبوو لەکارەکەی و لە چەندین بۆنەدا تەنانەت لەیادی دەکرد کلیلی ئۆفیسەکەی لە دەرگا دەربێنێت. ئەمە جگە لەوەی کە ناوبراو گرفتی داراییشی هەبوو، سێ هەزار دۆلار باجی لەسەربوو. لەکۆتاییدا، هەر ئەوە مابوو بە دەزگا سیخوڕەکان بڵێت "وەرن من تەجنید بکەن، من باشترین کەسەم بۆ ئەم مەبەستە."[i] ریچار میللەر لەکۆتاییدا حوکمدرا، دوای سێیەمین دادگاییکردنی، وەک یەکەمین هەواڵدۆزی ئێف بی ئای کە بەتۆمەتی سیخوڕی دادگایی کرابێت. دوای دوومانگ لە دەستگیرکردنی میللەر، کلەیتۆن لۆنتری لەساڵی ١٩٨٥ وەک سیخوڕ دەستبەکاربوو. بەهۆی گورجوگاڵی ژینگەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە مۆسکۆ، بووەهۆی دروستبوونی سستی ئاسایش، و چەندان سەرپێچی لەلایەن ئەو بنکە مارینزەی لەوێدا دانرابوو تۆمارکران. ئەمە بووەهۆی ئەوەی ناوبراو بکەوێتە داوی کچێکی جوانی سۆڤیەتەوە و بەمەش زانیاری زۆری هەواڵگریی بۆ ئەم ئافرەتە درکاند.[ii]

ئەی چی دەربارەی ئەو کەسانەی کارەکە ئەنجام دەدەن؟ ئەمانە کێن و خەڵکی کوێن و بۆچی ئەم کارە دەکەن؟ دەزگای هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەت (KGB)، لەماوەی جەنگی ساردا هەڵسان بە بەکارهێنانی چەندین کچ و ئەوانەی سەمای بالێیان

---

[i] Eaton, William J. "Leathernecks in Moscow Ran Roughshod, Diplomats Say: 'Marine House' Seen Steeped in Sex, Liquor, Marijuana." *Los Angeles Times*, ١٩٨٧: ٣.; Counterintelligence Briefing Center." *Department of Energy*.n.d.http://www.hanford.gov/c.cfm/oci/ci_spy.cfm?dossier=٧٢(accessed February ٠٧, ٢٠١٢).
[ii] Tweedie, Neil. "Vassall: Russians lured me into 'honeytrap.'." *The Telegraph*. London: The Daily Telegraph, June ٣٠, ٢٠٠٦.

ئەنجامدەدا بۆئەوەی ئەو بیانیانە بخەنە تەڵەوە کە سەردانی وڵاتەکەیان دەکرد. ئاسانی و زەحمەتی کەوتنەداوی خۆرئاواییەکان لەسەر نەتەوە ڕۆنرابوو. ئیتاڵییەکان و بەریتانییەکان نێچیری زۆر ئاسان بوون بۆ دەزگاکە. بەگوێرەی وتەکانی کێن سیلڤەرستەین، "دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت(KGB) پێی وابوو ئەمریکییەکان خەڵکی ماتریالیستی وابەستەن بە سێکسەوە وە دەتوانرا سیخوڕەکانی ئەو وڵاتە بەئاسانی هەڵخەڵەتێنرێن."[i] بەڵام خەڵکی وڵاتانی ئەسکەندەناڤی و هۆڵەندا لەلایەن دەزگاکە بە زەحمەتتر دەبینران.[ii] یەکێک لە قورسترین ئەو ئەرکانەی کە دەبوایە سیخوڕە سێکسییەکانی سۆڤیەت ئەنجامی بدەن بریتیی بوو لە تێکەڵکردنی هەست و سۆزیان لەگەڵ ئامانجەکەدا و هەڵوەستەکردن لەسەر ئەخلاقی خودی خۆیان. هەندێک لەم سیخوڕانە سەرکەوتوو بوون، هەندێکیشیان نا، و هەندێکیشان بەهۆی شکستەوە کوژران. بەشێکی کارەکە تەنیا وەک هی ئەو ئافرەتانە بوو کە شەراب لە هۆتێلەکاندا دابەش دەکەن. سەرەتا، تەنیا ئەوە بەس بوو ویست و ئارەزووی ئامانجەکە بجوڵێنن، دواتر بەئاسانی دەیان بردنە ئەو شوێنە کە پێویست بوو کارەکەی تیادا ئەنجام بدەن. زۆر گرنگە ئەوە لەیاد نەکەین کە ئەم کەسانە بە ویست و ئارەزووی خۆیان ئەم کارانەیان ئەنجام نەدەدا، بەڵکو لەلایەن ڕێنماییکەری(handlers) تایبەتەوە ڕێنماییان وەردەگرت کە بەزۆری بە "خاڵەکان" ناسرابوون.

دەربڕینێک لەم نێوەندەدا بەکاردێت کە "ژیان زۆربەی جار نامۆترە لە خەیاڵ،" جا ئەگەر ئێمە هەڵسین ئەم دەربڕینە بخەینە ژێر تەلەسکۆبی تاقیکردنەوەوە ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە ژمارەیەکی زۆری ئەم کەیسانە پێمان دەڵێن تا چ قوڵاییەک بەکارهێنانی سۆز، سایکۆلۆژیا و سێکس دەتوانێت بەرگە بگرێت! چەندین کەیسی سەرنجڕاکێش هەن لەم بوارەدا کە شایانی ئەوەن هەڵوەستەیان لەسەر بکرێت. تا

---

[i] Silverstein, Ken. "Sex and the C.I.A." *Harpers Magazine*, April ٢٠٠٧.

[ii] Trahair, Richard C.S. "Honeytrap Operations." *http://psi.praeger.com.* n.d.http://psi.praeger.com.ezproxy٢.apus.edu/doc.aspx?d=/books/dps/٢٠٠٠b٥٧d/٢٠٠٠b٥٧d-p٢٠٠٠B٥٧D٩٩٧٠١٢٧٠٠١.xml&browse=honey (accessed February ٠٩, ٢٠١٢).

ئەم دواییانەش ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنانە لە سنووری یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو(و رووسیای ئێستا) دەرنەدەچوو. هەردوو وڵاتی چین و کۆریای باکوور دوای ئەمان لە چەند کەیسێکدا سێکسیان وەک دەرچەی بەدەستهێنانی زانیاری بەکارهێنا، بەلام هیچیان وەک کەیسی دیبلۆماتکاری فەرەنسی، بێرنارد بۆرسیکۆت، کە کەوتبووە داوی چینییەکان، نامۆ و نائاسایی نەبوو. خودی سروشتی کەوتنە داوەکەوە نامۆ نەبوو؛ بەڵکو شی پی پو، سترانبێژی ئۆپێرای چینی، کە بۆ دەزگای هەواڵگری چینی کاری دەکرد خۆی لە بەرگێکی ئافرەتاندا نواند و قەناعەتی بە بۆریسکۆت هێنا کە ئەو بە منالّی ناوبراو سکی پڕبووە! پەیوەندییەکە بۆماوەی زیاتر لە بیست ساڵ بەردەوامی کێشا بەرلەوە هەردووکیان بە تۆمەتی سیخوڕی دەستگیر بکرێن. یان ئەوەتا بۆریسکۆت زۆر ساویلکە بووە یانیش هەردووکیان گەمژە بوون. واپێدەچێت جیهانی فریودانی سێکسی هیچ سنوور یان وابەستەیی جێندەریی نەبێت، هەربۆیە جۆن ڤاسال بەهۆی گرتنی وێنەی رووت لەگەڵ کەسێکی هاوڕەگەزی خۆی هەڕەشەی لێکرا و بەمەش بووە پارووپەکی ئاسانی تەجنیدکردن لەساڵی ١٩٥٤.

ئەو تاوەکو دەستگیرکردنی هەر بەردەوام بوو لە سیخوڕیکردن بۆ مۆسکۆ و دوای دەستگیرکردنی بۆماوەی حەوت ساڵ بەتۆمەتی سیخوڕی زیندانی بۆ بڕایەوە. جا مەسەلەکە هەر ئەوە نەبوو کە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت تەنیا پێی بڵێت ئەگەر سیخوڕیمان بۆ نەکەیت ئەوا خیانەتی ناوبراو ئاشکرا دەکرێت. لەبەر ئەوەی هاوڕەگەزبازیی لەوکاتەدا، لە بەریتانیا و یەکێتی سۆڤیەت، نایاسایی بوو، هەڕەشەی ئەوەشی لێکرا کە بەئەنجامدانی تۆمەتێکی نائەخلاقی سزا دەدرێت. کارەکە تەنیا بەم هەڕەشەیە کۆتایی نەهات، ناوبراو پێی راگەیانرا کە کەسایەتی راستەقینەی ئەو بۆ دایکی ئاشکرا دەکرێت و رووی کردە قێزەوەنەکە لەلایەن ماڵباتەکەیەوە بێگومان دەبێتە هۆی سەرشۆری بۆ خودی خۆی و خێزانەکەی، وە لەڕووی پیشەکەی خۆشیەوە ئەم هەواڵە بە سەرووی ئەو رادەگەینرێت، بەمەش شکۆی و پیشەی ناوبراو بەبێ گومانی دەکەونە ژێر مەترسییەوە. یەکێکی تری لە هەلاّتنەکانی هاوڕەگەزبایی بووە هۆی ئەوەی پەیامنێری رۆژنامەی دەیلی تەلەگرافی بەریتانی جێرێمی وۆڤەندەن

بکەوێتە نێو بازنەی سیخوڕییەوە، و ناچار بوو وەک سیخوڕی دووسەرەی هاوڕەگەزباز کاریکات تا ئەوکاتەی لە تەمەنی سی و یەک ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.[i]
یەکێک لە راستیە هەر سەرنجڕاکێشەکان کە لەم جۆرە کەیسانە سەر دەردەخات بریتییە لە کەمی بەڵگەی راست و رەوان. لە چەندین نموونەدا، بڕینەوەی سزای دادگا کەمکراوەتەوە بەهۆی لاوازی تەکنیکی لێکۆڵینەوە یان ڕێوشوێنی ڕێکوپێک. ئەم حاڵەتە لە کەیسی وەک لۆنتری، میللەر، ستۆنکرۆس و زوتلیفەتەردا بە روونی رەنگی داوەتەوە. هەربۆیە دەتوانرێت چەند هۆکارێک بۆ ئەم یەکە بخرێنە بەرچاو:

- دەزگا ئاسایشەکان کاری خۆیان بە دروستی ناکەن، یان پەلەیان لە کەیسەکە کردووە بۆئەوەی بەخێرایی سزایەکی بۆ ببڕنەوە.
- ئۆپەراسیۆنی فریودانەکە بەشێوەیەک سەرکەوتوو بووە کە ئەستەم بووە هەموو حەقیقەتەکانی ئاشکرا بکرێن.
- پلانەکە ئەوەندە نهێنی بووە کە تەنیا وەک سەرکەشییەک وێناکراوە.
- هەردوو بەژداربووەکە تۆمەتبارن و بەشێوەیەکی دوولایەنە هەوڵیانداوە عەیبوعاری یەکتر داپۆشن.

بەڵگەیەکی زۆر هەیە لەمەڕ ئەوەی تەڵەی هەنگوینی نەمردووە و ئێستاش خەریکە سەرهەڵدەداتەوە، بۆئەم چەندەش چەندین بەڵگەی نوێمان لەبەردەستە. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٨دا ئەفسەرێکی ئافرەتی سویدی بەتۆمەتی بەخشینی بەڵگەنامەی نهێنی بە دڵدارە/سیخوڕە سربییەکەی زیندانی کرا.[ii] لەساڵی ٢٠٠٦دا، راوێژکاری هێزەکانی بەرگری بەریتانیا لە ئیسلام ئابادی وڵاتی پاکستان بانگهێشتی وڵاتەکەی کرایەوە کاتێک زانرا کە ناوبراو خەریکی پەیوەندییەکی سۆزدارییە لەگەڵ ئافرەتێکی خۆجێی،

---

[i] Knightley, Phillip. "The History of the Honey Trap." *Foreign Policy*, ٢٠١٠: p. ٣-٤

[ii] O'Mahony, Paul. "Swedish soldier fed Secrets to Serbian lover." *The Local Sweden*. Stockholm: The local.se, May ١٧, ٢٠٠٧.

کە دواتر زانرا هەواڵدۆزێکی هەواڵگرییە.[i] لەساڵی ٢٠١١، یەکێک لە هاوکارەکانی گۆردن براونی سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتی بەریتانیا کەوتەنێو تەڵەیەکی هەنگوینییەوە. لەوکاتەی سەردانی دیسکۆیەکی دەکرد لە شاری شانگهای وڵاتی چین، دەرکەوت کە بەدبەختەکە لە بۆسەیەکی دەزگای هەواڵگری ئەو وڵاتە نزیک دەبووەوە. بەرەبەیانی دواتر دوای دەستبازییەکی کەم لەگەڵ ئافرەتێک، تەلەفۆنەکەی ون بوو. ئەمەش بەشێوەیەکی تیۆری بەو واتایە دەهات کە هەواڵدۆزێکی دەرەکی دەستی بەهەموو هەژماری ئیمەیلەکانی سەرۆکایەتی وەزیرانی ئەو وڵاتە دەگات. یەکێک لە رووداوە هەرە نوێکان بریتییە لە کچە شۆخوشەنگ و گەنجی رووسی بەناوی کاتیا زاتولڤیتەر، کە پەیوەندی هەبوو لەگەڵ دیبلۆماتکارە ئەڵمانی و هۆڵەندییەکان، ئەمە جگە لەوەی پەیوەندییەکی درێژخایەنی لەگەڵ ئەندامی پەرلەمان مایک هانکوک گرێدابوو، بێگومان پەیوەندی سۆزداری دەڵێین. لەوکاتەی *کاتیا* دان بەوەدا دەنێت پەیوەندی سێکسی هەبوو لەگەڵ هەرسێ پیاوە تەمەن ٣٠، ٥٠ و ٦٩ ساڵیەکە یەک بەدوای یەک، ئاماژە بەوەش دەدات کە ئەم کارەی تەنیا لەپێناو خۆشەویستی و حەزی کەسییەوە ئەنجامداوە. هۆکارەکە هەرچییەک بووبێت، ئەو ئافرەتانەی لە پێگەیەکی باڵای ئاساییشدان، تەنانەت ناتوانن یەک جووڵەی لەم شێوەیە بکەن کە ببێتە هۆی راکێشانی سەرنجی سۆزداری لایەنی بەرامبەر، مەگەر ئامانجەکە تەڵەی هەنگوینی نەبێت.[ii]

---

[i] Deeson, Martin. "Katia Zatuliveter and the Art of The Spy Honey Trap." *Sabotage Times*, ٢٠١١. p.٢

[ii] دوای دادگاییکردن، بێ تاوانی کاتیا سەلمێنرا و هەر لەو وڵاتەدا مایەوە.

کاتیا زاتولفیتەر لەگەڵ مایک هانکوک، ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی بەریتانیا، دەردەکەوێت

یەکێک لە پڕگەنگەشەترین و بەدحاڵیترین کەیسەکانی تەڵەی هەنگوینی بریتییە لە کەیسی کاترینا لیۆنگ. ئەم بە پاسپۆرتێکی تایوانی بەرەی ئەمریکا گەشتی کرد، لەکۆتاییدا لە ئۆپەراسیۆنێکی دەزگای دژەهەواڵگریی چینی تێوەگلا و کۆدێکی پێدرا بەناوی پارلۆر مەید. لەساڵی ٢٠٠٣، کاترین لیۆنگ لەگەڵ جەی جەی سمیس و بیل کلیڤلاند، هەردوو هەواڵدۆزی ئێف بی ئای کە کردەی سێکسیان لەگەڵ لیۆنگ ئەنجامدەدا، دەستگیرکران. ئەمیش لەبەرامبەردا زانیاری نهێنی دەگواستەوە بۆ دەزگای دژەهەواڵگری چین. جەی جەی سمیس لە پەرتووکەکەیدا بەناوی (Inside) بەم شێوەیە لیۆنگی وەسف کردووە، "ئەو ئافرەتێکی زۆر بە حەماسەتە، بەشێوەیەک کە هەرچیەک پێوست بێت ئەنجامی دەدات بۆئەوەی بە ئامانجەکانی بگات..."[i]

بەکورتی، دەبێت دووبارە جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە هەڕەشەی تەڵەی هەنگوینی هەڕەشەی راستەقینەن و بەهیچ شێوەیەک ناکرێت ئاوا بەئاسانی فەرامۆش بکرێت. زۆربەی هاندەر و مەترسییەکانی لەم سەردەمە بەنادیدە گیراون. ئەمە هەڕەشەیەکی راستەقینەیە بۆسەر ئاسایشی نیشتیمانی و پێویستی بەوەیە

[i] Smith, I.C. *Inside.* Nashville: Thomas Nelson, ٢٠٠٤. p. ١٢٤-١٢٦

بەشێوەیەکی شیاو باسی لێوە بکرێت. ئەم بابەتە بەوە چارەسەر ناکرێت کە فەرامۆش بکرێت و ئیتر وابزانرێت هەربەخۆی نامێنێت. تا پیاو و ئافرەت لەپێگەی بەرپرسیاریەتیدا بن و دەستی بە نهێنی تایبەتمەند بە ئاسایشی نیشتیمانی بگات، سیخوڕی سێکسی و بەکارهێنانی هەر دەمێنێتەوە. چەند هەنگاوێک هەن کە لێیانەوە دەتوانرێت پێش بەم دیاردەیە بگیرێت. وشیارکردنەوەی کارمەندانی دەزگا ئەمنییەکان هەروەک دەزگای ئاسایشی ناوخۆیی بەریتانیا ئەنجامیدا، هەنگاوێکی سەرەتایی باشە. هەروەها، دەبێت ئەوەش بزانرێت کە تەنیا ئەو کەسانە نین لە پێگەی ئاسایشی نیشتیمانیدان کە بە بەردەوامی لە مەترسیدان، بەڵکو کەسایەتییە بەناوبانگەکانی پیشەسازیی، سیاسیی و ئابووریش لەم چەندە بەدەر نین. سیلڤەرستەین بەجوانی ئەم خاڵەی ڕوونکردۆتەوە کاتێک دەنووسێت، "چ کاتێک سێکس دەبێتە گرفت؟ سی ئای ئەی لێکۆڵینەوە ئەنجامدەدات لە پاشخانی هەموو کارمەندانی و بەشێوەیەکی وەرزی تاقیکردنەوەی درۆگر(polygraph) ئەنجامدەدات، ئەمەش وەک هەوڵێک بۆ نەهێشتنی هەر گومانێک لەئەگەری کەوتنەداوی کارمەندان و ئەفسەرانی دەزگا هەواڵگرییەکان بۆناو تەڵەی هەنگوینی."[i] چاودێریەکی باش لەلایەک و ئاسایشێکی پێشکەوتوو لەلایەکی تر بەیەکەوە دەتوانن ئەم هەڕەشانە کەم بکەنەوە.

سەرەڕای ئەمەش، دەبێت ئاماژە بەوەش بکرێت کە پەیوەندی دوورمەودا و هاوڕێی کۆن دەکرێت هەڕەشە بێت بۆ ئەگەری تەجنیدکردن. ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیتر، کە ببێتە هۆی تێکەڵیەکی زۆر، دەکرێت چارەسەرێکی گونجاو بێت. ئەرکی هەر کارمەندێک، بەتایبەتی لەنێو دەزگا هەواڵگرییەکان، دەبێت بە بەردەوامی چاودێری بکرێت و هەر ڕەفتارێکی گوماناوی بنچاو بکرێت کە ئەنجامی دەدات. خاڵی کۆتایی چارەسەرەکە بریتییە لەوەی کە سەرکردایەتی دەبێت بەشێوەیەک ڕەفتار بکات کە هەڵسەنگاندنی ڕاستگۆیانە و تەواو بکاتە پێوەر بۆ کارمەندەکانی. ماوەتەوە بڵێین

---

[i] Silverstein, Ken. "Sex and the C.I.A." *Harpers Magazine*, April ٢٠٠٧.p.١

کە مەزنترین هێز دەکرێت بەئاسانی ببێتە مەزنترین لاوازی و دوژمنی هەرەمەزن ئەوەیە کە لەنێوخۆماندایە.

## پێشەکی

هەواڵگری و جەنگی زانیاری هەر لەوەدا قەتیس نامێنێت کە زانیاری لەڕێگای هەواڵگری کۆبکرێتەوە دواتر پێشکەشی کاربەدەستانی وڵات بکرێت بۆئەوەی لەسەر بنەمای ئەو زانیاریانە سیاسەتڤان و سەرکردەکانی وڵات ستراتیژیەتی خۆیان دابرێژن. زۆرجار، بەتایبەتی لەکاتی جەنگ و دروستکردنی چەکی ناووکیدا، دەزگا هەواڵگرییەکان دەتوانن دوژمن و تەواوی جیهان بەچەند تەکنیکێکی تایبەتی فریوبدەن کە لە بەرژەوەندی پاراستنی ئاسایشی نیشتیمانی وڵاتدایە. سون تزو، نووسەری چینی، پێنج سەد ساڵ بەر لەزایین درکی بە گرنگی ئەم هونەرە کردووە و هەڵسا بە نووسینی کتێبێک بەناوی "هونەری جەنگ" کە کرۆکی بابەتەکانی لە هونەری "فریودان"دا دەخولێنەوە. تائێستاشی لەگەڵدابێت، فەرماندە سەربازییەکان سوودی لێوەردەگرن. فریودان تەنیا لەحاڵەتی جەنگدا ئەنجام نادرێت، بەڵکو لە ئاشتیشدا رۆڵێکی باڵا دەگێرێت. دەزگا هەواڵگرییەکان تەنانەت رێگاپێدراون خودی سەرکردەی وڵاتەکەیان فریوبدەن ئەگەر خۆیان خەریکی کارێک بن نەکرێت سەرکردەکانیان تەواوی زانیاری دەربارەی ئەو پرۆژەیە هەبێت. بەمەش، ئەو سەرکردە و سیاسەتڤانانە هونەری تکۆڵیکردن تێکەڵکێش بە فریودان دەکەن و وڵاتانی خۆیان لەم رێگەیەوە دەگەیەننە کەناری ئارامی.

جەنگی دەروونی لەرێگای میدیا بەشێوەیەکی گشتی، و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان و تەلەفزیۆن بەشێوەیەکی تایبەتی، رۆڵێکی باڵا دەگێرن لە فریودانی تەواوی میللەتێک بەتایبەتی لەم سەردەمەدا. ئەمەش، بێگومان، دەبێت لایەنی فریودراو بەشی تایبەتی هەواڵگری بەم بوارەی هەبێت بۆئەوەی بتوانێت بە لێزانانە مامەڵە لەگەڵ دۆخەکە بکات. لایەنی فریودەریش بۆ شێواندنی دەروونی رای گشتی وڵاتێک چەندین تەکنیک بەکاردەهێنێت بۆ رووخاندنی و لاوازکردنی وورەی فەرماندە سەربازیی، سەرکردە و هاوڵاتیانی وڵاتێک کە دوای سەرکەوتنی تەکنیکەکە دەتوانێت بەئاسانی هەژموونی خۆی بەسەردا بسەپێنێت. دوای کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی دووەم، دەزگای هەواڵگری ناوەندی (CIA) هەڵسا بە کردنەوەی بەشێکی تایبەت بە جادوو و دەرمانی

کیمیایی و هەموو ئەو ڕێکارانەی وا لە وڵاتان دەکەن فریوبدرێن یان فریودان ئەنجام بدەن، پرۆژەکە ناونراو بە "بەرنامەی مکولترا" کە لایەن دکتۆر سیدنی گوتلیبەوە سەرپەرشتی دەکرا. دەروون بالآیی و هەواڵگرییش پەیوەندییەکی نەپچڕاویان لەگەڵ یەکدا هەیە، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی دەزگا زانیارییەکانیان بەهێزە، ئێران و ئەمریکا وەک نموونە. ڕۆڵی جەنگی دەروونی و چۆنیەتی کارکردنی لەم بەشەدا فەرامۆشنەکراوە و تیشکی خراوەتەسەر، ئەمەش بەئامانجی ڕوونکردنەوەی بەشێکی گرنگی کردەی فریودانە. بەکورتی، ئامانج لەم بەشە ئەوەیە ئێمەی کورد وشیاربین لەهەمبەر هەر کردەیەکی لەم چەشنە کە لەدۆخێکی هەستیاری وەک ئێستادا کە بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەنجام دەدرێت. ناکرێت بهێڵین میدیا و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان هەروا بەئاسانی گاڵتە بە ئەقڵی تاکی کورد بکەن، جگە لەمەش دەزگا هەواڵگرییەکانی ئێمەش بێنە مەیدان و بایەخێکی زۆر بە بواری فریودانی دوژمن بدەن چونکە بڕبڕەی پشتی سەرکەوتنی هەر جەنگێکە. ئەو بابەتانەی کە باسکران دەبنە ناوەڕۆکی ئەم بەشە و بەتێروتەسەلی باسیان لێوەدەکرێت.

## فریودان

"فریودان" بریتییە لەو هەوڵەی دەدرێت بۆ بەرێلادابردنی شیکردنەوەی هەواڵگریی دوژمن دەربارەی ئەو دۆخە سیاسیی، سەربازیی، یان ئابوورییەی تووشی دەبێت، بەو واتایەی کە لەسەر بنەمای ئەو زانیارییە هەڵەیە بەشێوەیەک هەنگاو دەهاوێژێت کە خزمەت بە لایەنی بەرامبەر بکات نەوەک خۆی. فریودان وەک جۆرێکی دژەهەواڵگریی لەقەڵەم دەدرێت چونکە هەوڵ دەدات ئامانجی سەرەکی ئۆپەراسیۆنەکانی هەواڵگری دوژمن پوچەڵ بکاتەوە؛ هەروەها، بەزۆری لە میتۆدی دژەهەواڵگریی پێکدێت، وەک ئۆپەراسیۆنەکانی سیخوڕی دووسەرە.

فریودان و شکستی هەواڵگریی لە چۆنیەتی کارکردندا پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە. لەڕاستیدا، سەرکەوتنی فێڵی لایەنێک بەواتای شکستی هەواڵگری لایەنی بەرامبەر دێت. بێگومان، بەپێچەوانەوە دروست نییە؛ دەکرێت لایەنێک هەڵەی گرنگ بکات لە شیکردنەوەی هەواڵگریی خۆیدا تەنانەت بەبێ هیچ فێڵێک لەلایەن لایەکەی ترەوە. سەرەڕای ئەمەش، دەکرێت، لەحاڵەتی شکستی هەواڵگرییدا، هەندێ هەوڵ دیاری بکەن لە فێڵدا لەلایەن لایەنی ترەوە. جا تا چ ئەندازەیەک ئەو هەوڵە بەرپرسە لە شکستەکە ئەمە پرسێکی ئاڵۆزترە.

دەتوانرێت تەکنیکی فریودان لەکاتی جەنگ و ئاشتیدا مومارەسە بکرێت، هەرچەندە، بەهۆی چەندین هۆکاری جیاجیاوە، دەکرێت کەسێک وا فێڵکردن لێکبداتەوە کە زیاتر لەکاتی جەنگدا باوبێت. فریودان لە تەکتیکیەوە بۆ ستراتیژیەت درێژدەبێتەوە. هەر جەنگێک کە بە فێڵێک لەسەر لایەک دەست پێبکات لەکاتێکدا قورسایی هێرشەکە بکەوێتەسەر یەکێکی تر، ئەوا بەدڵنیاییەوە پێی دەوترێت فریودانی تەکتیکی. نمونەکانی فێڵی ستراتیژیی کەمتر باون بەڵام بەزۆری زۆر گرنگن لەجەنگدا، وەک ئۆپەراسیۆنی فێڵاوی هاوپەیمانانی جەنگی جیهانیی دووەم کە ئەڵمانیای بەلاڕێدا برد دەربارەی شوێنی جێگربوونی کەشتیگەلی بەریتانیا لە *نۆرماندی*.

ئۆپەراسیۆنی فریودان لەکاتی ئاشتیدا زۆر باونییە، وە هەندێجار زۆر قورسە دەستنیشانی بکەین. لەنێو نموونە هەر سەرنجراکێشەکاندا ئەوەیە کە بە "متمانە"

ناسراوە، کە دامەزراوەیەکی سۆڤیەتی بوو وای نیشاندەدا دژایەتی رژێمی نوێی شوعیەت بکات کە لەڕاستیدا لەلایەن کەسێکی دەزگای سۆڤیەتی جارانەوە لەساڵی ١٩٢١ بۆ ١٩٢٧ دامەزرێنرا وە بەڕێوەبردرا. سۆڤیەت پەیوەندییەکی دروست کرد لەگەڵ ڕێکخراوە دەرەکیەکانی دژەشوعیەت وە دەزگاکانی هەواڵگری رۆژئاوا، بەم پێیەش زانین و ئاشکراکردنی هەر چالاکیەکی دوژمن کە گیرابوایەبەر ئاشکرا دەکرا؛ وە ناوی هەموو ئەو کەسانەی ئاشکرا کرد کە لەژێرەوە بۆ ئەو ڕێکخراوە کاردەکەن لەدژی سۆڤیەت وە زانیاری هەڵەی بۆ دەرەوە دەنارد دەربارەی دۆزی ناوەخۆی یەکێتی سۆڤیەت.[i]

لەماوەی ساڵانی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکاندا، یەکێتی سۆڤیەت چەندین تۆپەراسیۆنی فریودانی ئەنجامدا بۆ قەناعەت پێهێنانی ئەمریکا بەوەی کە یەکێتی سۆڤیەت خاوەنی هێزێکی مەزنتری ستراتیژیەتی هێرشی چەکی ناووکییە. لە یەکێک لە بۆنەکاندا، سۆڤیەت لە نماییشێکی سەربازییدا کە تیایدا بیست و هەشت فرۆکەی شەڕکەری تیادا نمایشکرا رەنگە زیاتر لەو ڕێژەیەی کە هەر هەیبوو بەهۆی چەندجار هاتنەوەی هەمان فرۆکە بۆ نمایشەکە.[ii] بەهەمانشێوە، لەکۆتاییەکانی ساڵانی پەنجاکاندا، سەرکردەکانی سۆڤیەت چەند بانگەشەیەکی زیاد لە پێویستیان کرد دەربارەی بەرنامە ناووکییەکانی. بەم رێگایە، سۆڤیەتیەکان ترسیان لەلای ئەمریکا دروست کرد. ئامانجی سۆڤیەت لەم چەندەدا بریتیی بوو لەوەی خۆرئاوا ناچار بە کشانەوەی سیاسیی بکات (بۆ نموونە، سەبارەت بە دۆخی بەرلین) کە بەڕێگای تر نەدەکرا ئەم فشارە سیاسییە دروست بکات.

وەک ئاشکرایە ناوەڕۆکی فریودان پشت بە بارودۆخەکە و ئەوەی کە چۆن کەسێک دەیەوێت دوژمنەکەی کاردانەوەی هەبێت، دەبەستێت. بۆ نموونە، لەکاتی جەنگدا رەنگە دەزگایەکی هەواڵگری بیەوێت هێرشێکی لەناکاو بۆسەر دوژمنەکەی ئەنجام

---

[i] John J. Dziak, *Chekisty: A History of the KGB* (Lexington, Mass.: Heath, Lexington, ١٩٨٨), ٤٧–٥٠, and Andrew and Gordievsky, *KGB: The Inside Story*, ٩٧–١٠٦.

[ii] John Prados, *The Soviet Estimate: U.S. Intelligence Analysis and Russian Military Strength* (New York: Dial, ١٩٨٢), ٤٢–٤٣.

بدات، لەم کەیسەدا ئەرکی سەرەکی هەواڵگریی بریتییە لەوەی کە دوژمنەکەی قەناعەت پێ بهێنێت کە هیچ هێرشێک لەگۆڕێدا نییە. هەندێجار دوژمن بە تەواوی پێشبینی ئەوە دەکات هێرشی بکرێتەسەر، وە کارێکی ئەستەمە کەسێک بتوانێت وایان لێبکات کە هیچ هێرش لەگۆڕیدا نییە. لەم جۆرە کەیسەدا، فریودان هەوڵ دەدات قەناعەتی پێبکات کە هێرشەکە لەکات و شوێن، یان شێوازێکی تر ئەنجام دەدرێت کە پلانی بۆ دانراوە.

لەکاتی ئاشتیشدا، کەمتر روونە کە ئامانجی فێڵکردن دەبێت بەرەو چ ئاراستەیەک بێت. دەکرێت دەزگایەک بیەوێت قەناعەت بە دوژمنێک بهێنێت کە دەزگایەک یان وڵاتێک بەهێزترە لەوەی دەردەکەوێت، تەنیا بۆ ئەوەی پاشەکشەی سیاسیی پێبکات کە بەپێچەوانەوە ناچار نەدەبوو ئەو کارە بکات. یان، کەسێک دەیەوێت توانا سەربازییە راستەقینەکانی یەکێک بشارێتەوە بۆئەوەی کات بە لایەنێکی تر بدات کە بەخۆیاندا بچنەوە وە لایەنی بەرامبەر کەمتەرخەم بێت لە بەهێزکردنی هێزە سەربازییەکانی خۆی. ئەگەر بەپێی رێککەوتنی کۆنترۆڵکردنی چەک هێزەکانی لایەنێک سنووردار بوون، ئەوەی تر دەتوانێت سەرپێچیکردنی رێککەوتننامەکە بشارێتەوە، بەم شێوەیەش وا لەلایەنی بەرامبەر دەکات بەردەوام بێت لە سنووردارکردنی هێزە سەربازییەکانی خۆی.[i]

---

[i] Shulsky, A. N., & Schmitt, G. J. (٢٠٠٢). *Silent warfare: understanding the world of intelligence*. Potomac Books, Inc...

## فریودان لە جەنگدا

'هەموو جەنگێک لەسەر فریودان رۆنراوە.
بۆیە، کە دەتوانن، لاوازیی نیشان بدەن؛
کە چالاکن، ناچالاکیی نیشان بدەن...
دوژمن فریو بدەن؛
بەنارێک خۆتان دەرخەن و هێرشی بکەنەسەر...
خۆتان بەنائامادە نیشان بدەن و لووتبەرزی دوژمن هانبدەن.'

(سون تزو)

هێرشی لەناکاو و کتوپڕ پرەنسیپی هەر جەنگێکە... دەبێت بەشێوەیەکی سەرەکی ئاراستەی بیروهزری فەرماندەی دوژمن بکرێت نەوەک هێزەکەی. ئامانج لەم چەندەدا دەبێت بریتیی بێت لە پەکخستنی ویستی فەرماندەکە. هێرشی لەناکاو مەزنترین هێزە بۆ چەندبارەکردنی توانای هێزەکانی هەر سوپایەک- ئەمە وادەکات کە هێزێک مەزنتر لە قەبارەی خۆی دەرکەوێت لە جەنگدا. هێرشی کتوپڕ لەرێی چەندان میتۆدەوە ئەنجام دەدرێت، لەوانە: چوونە جەنگێکەوە بەبێ خۆئامادەکردن کە دوژمن چاوەڕوانی نەکات، هێرشکردن لەکاتی چاوەڕواننەکراودا، گرتنەبەر و بەکارهێنانی رێگاگەلێک کە لە چاوەڕوانی دوژمندا نەبێت، بەشێوەیەک کە دوژمن پێی وابێت ئەو رێگایەی ئەوان گرتویانەتەبەر بەهیچ شێوەیەک مومکین نییە (هەروەک ئەڵمانەکان بەناو ئەردەنیسدا لە ئایاری ١٩٤٠)، بەهۆی هونەری پێشکەوتوو وە جەربەزەیی یاخود بەهۆی بەکارهێنانی چەکی نوێی پێشکەوتوو(بۆ نموونە، تانکی T-٣٤ لەساڵی ١٩٤١ لە یەکێتی سۆڤییەتەوە وەک هێرشێکی کتوپری وێرانکەر چووەناو ئەو وڵاتەوە). سەرەڕای ئەمانەی باسکران، لەنێو هەموو ئەو هۆکارانەی سەرکەوتن لە هێرشی کتوپڕدا، هیچ گومانی تیادا نییە کە گرنگترینیان فریودانە.

دەکرێت مشتومڕی ئەوە بکرێت کە تەنانەت ئاساییش گرفتێکی گرنگتریشە، بەڵام لە مەیدانی جەنگدا ناکرێت بەهیچ شێوەیەک فەرماندە بکەوێتە هەڵەوە چونکە بواری

مەڵە لە مەیدانی جەنگدا باجێکی گەورە بەدوادادێت؛ دەبێت ئەو فەرماندەیە چالاکانە کاریکات بۆئەوەی وا لە دوژمنەکانی بکات هەڵەبکەن. فریودان رێکارێکی کردەییە بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم ئامانجە، وە لەبەرئەوەی فریودان مێژووەکەی بە قەد خودی جەنگ کۆنە، کەواتە ئەو فەرماندەیەی ئەم هونەرە فەرامۆش دەکات، دەکرێت بە گێل و گەمژە دابنرێت لە بواری سەربازییدا. لەڕاستیدا، جەنەراڵە هەرە مەزنەکان لە مێژوودا بەهۆی ئەم هونەرەوە ناویان لە مێژوودا تۆمارکراوە، لەکاتێکدا زۆری تریش هەربەهۆی ئەمەوە خەجاڵەتی نەتەوە و مێژووی وڵاتەکەیانن.

هەموو کەسێک لەکاتی گونجاودا فریودان بەکاردەهێنێت، جا ئەمە یان بۆ سوودێکە یاخود بۆ چەند هۆکارێکی خۆنەویستییە. هەرچەندە دایک و باوک رێگرە لە منداڵەکەی بۆئەوەی فێرە درۆکردن بێت، بەڵام خۆشیان هەموو کاتێک درۆدەکەن، بەتایبەتی لەهەمبەر منداڵەکانیان. فریودان بەشێکی دانەبڕاوی ناخی هەر مرۆڤێکە کە ئێمە هەموو کاتێک هەستی پێ ناکەین. چەندین توێژینەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە سیاستەڤانان متمانەیان پێ ناکرێت چونکە ئەوان وەک فریودەر ناسراون، بەڵام هەموو کەسێک درک بەوە دەکات کە گرتنەبەری چەند رێکارێکی فریودەر بۆ ئەم پیشەیە پێویستە. ئەگەر سیاسەتڤانان هەموو کاتێک ئەوە بڵێن کە بیری لێدەکەنەوە، ئەوا تەمەنی پیشەکەیان زۆر کورت دەبێت.

هەروەک دەوترێت، هیچ شتێک لەژێر ئەم ئاسمانەدا نوێ نییە، وە کاتێک دەست دەکەین بە گەڕان بەناو لاپەڕەکانی مێژوودا دەربارەی پەرەسەندنی فریودان لەکاتی جەنگدا، ئەوا هەمان پلان و تەکنیکی دووبارە دەبینین لە فۆرمێکی نوێدا. ئەم باسە باسی گێڕانەوەی مێژوویی فریودان نییە- چونکە ئەرکێکی ئەوەندە قورسە، دەکرێت تا لەم جیهانەدا مابین کارەکە تەواو نەکرێت- بەڵکو ئەمە تەنیا وەک لێکۆڵینەوەیەکە بۆ هونەری فریودان. بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بێت، پێویستە فریودەر هزر و مێشکی فەرماندەی دوژمن بخوێنێتەوە و لەهەمان کاتدا بەشێوەیەک تێبگات کە بزانێت چ کاردانەوەیەک لەهەمبەریدا بگیرێتەبەر.

> پەلەپەل و جەریەزەیی زیادلەپێویست، ویستی بێ بیرکردنەوە یان گەمژانە هەمیشە بەئاسانی دەکەونەبەر تیری فریودانی دوژمن وە زیانگەیاندن بە هەر هاوپەیمانێک، جەنەراڵێک کە هەڵگری ئەم کەموکورتیانە بێت لەنێو کەسایەتییدا، بێگومان بە ئاسانی دەکەوێتە داوی پلانی فریودان، بۆسە، وە تەڵەکەبازیی جەنگیی.

پێگەی خود-فریودان لەم پرۆسەیەدا زۆر گرنگە. بیرکردەوەکانمان بەهۆی پرۆسەی فێربوونەوە گەشەدەکەن، بەڵام بەهۆی باری قورسی کۆمەڵایەتی و کولتوریەوە کە خزاوەتە نێو بیروهزرمان ئاراستەی دروست لەدەست دەدەین. زۆربەی هەرەزۆری کات ئێمەی مرۆڤ ئەزموونی خۆمان بەهۆی ئەم چوارچێوە ئەقڵیەوە سەیر دەکەین، وە هەرشتێک لەگەڵ ئەم قاڵبەدا نەگونجێت، یان ئەوەتا فەرامۆشی دەکەین یاخود بە نادیدە سەیری دەکەین.

مرۆڤە بەساڵاچووەکان لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا بەشێوەیەکی تەقلیدی وەک سەرچاوەی ژیریی دەستەجەمعی دادەنرێن، کە ڕێنیشاندەری سەرەکین لە بەهێزکردنی هزری هاوکۆمەڵگاکانیان. ئەم بیرکردنەوەیە تەنانەت لەکاتی گوشاری دەرەکی و کەسیدا خۆی زیاتر دەنوێنێت. ئێمە ڕقمان لە سەرلێشێوان و نارێکوپێکی دەبێتەوە، هەموو هەوڵەکانی مێشکمان بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچێت کە چارەسەرێک بۆ ڕووداوەکان بدۆزینەوە یاخود واتایەکی پێ ببەخشین؛ تەنانەت ئەوکاتەشی کە زانیارییەکان دژبەیەک و سنووردارن، ئێمە هەر پەرۆشین بۆئەوەی ڕێگاچارەیەک بدۆزینەوە. وە لەبەر ئەوەی مێشک تەنیا دەتوانێت لە یەک کاتدا خۆی لەگەڵ بڕێک زانیاری بگونجێنێت، ئێمە ناچارین باس لە هەموو زانیارییەکان نەکەین وە تەنیا لەوانە بدوێین کە زۆر گرنگ و پێویستن. هەربۆیە، دەکرێت بوترێت کە هەموو فریودانەکان لە جەنگدا دەبێت لەسەر بنەمای ئەوەی کە خودی دوژمن نەک تەنیا بڕوای بەچییە، بەڵکو هیوا بۆ چ شتێک دەخوازێت بنیادبنرێت.

زانیاریی بڕبڕەی سەرەکیە لە مەیدانی هەر جەنگێکدا وە بەدەستهێنانی زانیاریی پێویست بۆ جەنگێک پێویستی بە ئۆپەراسیۆنی سەرکەوتوو هەیە، کە لە چەندین

ئامراز پێک بێت بۆ کۆکردنەوە و دواتر بەگەڕخستنیان. لەئەنجامدا، ناردنی زانیاریی هەڵە بەشێوەیەکی لێهاتوو کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لەسەر هێزی هەر دوژمنێک وە ماوەی تۆپەراسیۆنەکە. لەکاتێکدا، دامەزراوە سەربازییەکان لەڕووی قەبارە، تەکنیکی جەنگ وە هێزی هەر سەربازێک دەڕوانن، هەر خودی ئەم پێکهاتنانەیە کە دەبنە بنەمای فریودانی دوژمن. ئەو زانیارییەی دوژمنێک پێویستیەتی بۆئەوەی بڕیاری لەسەر بدات دەکرێت بەشێوەیەکی کارامە بەکاربهێنرێت، ئەگەر کەسێک لەو ئامرازانە بگات کە بەکاری دەهێنێت. هەروەها، ناوبانگێک کە لایەنێک هەیەتی بۆ فریودان و کارامەیی دەبێتە هۆی زیادکردنی دڵەڕاوکێ و شلەژانیی لایەنی بەرامبەر.

زۆربەی مرۆڤەکان ناخوازن تووشی جەنگ بن چونکە بە یەکێک لە توندترین دۆخەکان هەژمار دەکرێت. ئەمە ڕێگایەک نییە کە مرۆڤ بتوانێت بەرەو پیری بچێت بەڵکو بۆ مانەوەی گەلێک یان کەسێک دەبێت ڕێوشوێنی بێبەزەییانە بگیرێتەبەر. هەربۆیە، شتێکی ئاساییە کە لەکاتی لاوازییدا فەرماندە سەربازییەکان سەرەتا بیر لە فریودان بکەنەوە وە ڕێگایەک بۆ دەربازبوون یان سەرکەوتن لە جەنگدا هەڵبژێرن. لە سیستەمی مارکسی لینینیدا، ئەوە پەسەندە کە هەر ئامرازێک بەکاربهێنرێت (وەک فریودان) لەکاتی ئاشتیی و جەنگدا بۆ ئەوەی لە نەهامەتی ڕزگار بن (هەروەک یەکێتی سۆڤیەت لە نێوان ساڵانی ١٩٤١ و ١٩٤٥دا نیشانیدا). لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، فریودان وەک کارێکی نائەخلاقی دەبینرێت، وە زیاتر لە یەک دەسەڵات بانگەشەی ئەمەی کردووە، ئەمریکییەکان حەزێکی سروشتیان نیشاندا لەماوەی جەنگی ناوخۆدا بۆ فریودان، ڕێک وەک ئەوکاتەی بەر لە هەشتا ساڵ لەکاتی شۆڕشدا ئەم کارەیان ئەنجام دەدا.

فریودان بۆماوەیەکی زۆر درێژ ڕۆڵی خۆی گێڕا لەپاراستنی شکۆی سەربازیی ئەمریکا. دوودڵیەکی نامۆ لەنێو ئەمریکییەکاندا هەبوو لەماوەی سەدەی بیستەمدا بۆئەوەی وەک بەشێک لەجەنگی هاوچەرخ پەسەندی بکەن، وە بەدڵنیاییەوە ئەمریکییەکان تەنیا لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا سیستەمی فریودانی گەڕاندەوە. سەرهەنگ ویلیام هاریس، سەرئەفسەری بەشی فریودانی ئەمریکا لە ئەورووپا، ناچاربوو بڕوا بە

بەهاکانی ئازایەتی باشوور بهێنێت (بەشێک لە هێزی شاراوەی فریودان بۆ نیشتنەوە لە نۆرماندی لەساڵی ١٩٤٤) دوای ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست هێنا. رەنگە ئەمە هۆکارێک بووبێت کە دوای ئەم رووداوە ئەمریکییەکان هەستیان بە بەهێزی کردبێت بۆئەوەی لەجەنگدا سەرکەون بەبێ گێڕانەوەی سیستەمی فریودان، کەچی بەر لەمە، کاتێک ئەوان لاواز بوون لە ئەنجامی هێرشی ژاپۆنییەکان بۆسەر پێرل هاربەر(لە بەشی داهاتوودا باسکراوە)، کەشتیگەلی ئەمریکی سوودی زۆری لەم سیستەمە وەرگرت.

بەریتانییەکان، سەرەڕای ناوبانگیان لە "یاری پاک" لەجەنگدا، بۆ ماوەیەکی درێژ سوودیان لە سیستەمی فریودانی جەنگ وەرگرتووە، وە بەکۆتایی هاتنی جەنگی جیهانیی دووەم بوونە خاوەنی مەزنترین سیستەمی فریودانی سەربازیی. بەپێچەوانەوە، کارامەترین مەکینەی سەربازیی سەدەی رابردوو- مەکینەی ئەڵمانەکان- بەشێوەیەکی بەرچاو بەرەو پووکانەوەیە لەرووی فریودانەوە، جگە لە شێوازی پیلانگێڕیەکانی هیتلەریی. لەکاتێکدا سوپای ئەڵمانەکان هەمیشە لە گرنگی هێرشی لەناکاو تێگەیشتووە، شێوازە هەرە ویستراوەکەی بەگشتی بریتیی بوو لەو شێوازەی کە لەلایەن فرێدریکی مەزنەوە بە "خێرایی و توونددڕۆیی" وەسف کراوە.

بەڵێ، ئەمە پرۆسەیەکی قورسە بەڵام بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی سەربازیی، تەنانەت سیاسیش، فریودان دەکرێت وەک تاکە رێگا دابنرێت لەم چەندەدا. دەبێت ئەمەش لەبەرچاو بگرین کە فریودان نەک تەنیا بۆ کاتی جەنگە بەڵکو ئامرازێکی گرنگیشە بۆ کاتی ئاشتی. فریودان دەکرێت زیاتر وەک هونەر لەقەڵەم بدرێت نەوەک زانست، هەرچەندە زانست بە بەردەوامی ئامرازی شیاو دەخاتە بەردەست بۆ پێشخستنی ئامانجەکانی فریودان. سەرکەوتووترین شێوازی فریودان تەنیا لەو کاتەدا بەرجەستە دەبێت کە بەکارهێنەرەکەی خاوەنی ئارامیەکی بەرچاو بێت، بە تەکنیکگەلێکەوە کە لەم بوارەدا ناوبانگی سەرکەوتنیان هەبێت. هەندێک کەس دەڵێن کە تەکنەلۆژیای مۆدێرن بۆتە هۆی ئەوەی فریودان قورستر بێت بەڵام بەدرێژایی مێژوو، فریودەرەکان سوودیان لە نوێترین و پێشکەتووترین ئامرازی تەکنەلۆژیا وەرگرتووە. ئەو شۆڕشە

زانیاریەی ئێستا دەقەومێت کاریگەریی هاوتای وەک شۆڕشی پیشەسازیی هەیە وە ئەگەرێکی کراوەیە کە هۆکارێکی سەرەکی بێت لە گۆڕینی سروشتی جەنگ؛ بەڵام فریودان بەبێ دوودڵی وەک ئامرازێکی جەنگ دەمێنێتەوە.

تەمەنی فریودان لە مەیدانەکانی جەنگدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتانەی کە یەکەمجار جەنگ لەنێوان دوو تیرەوە هاتە ئاراوە. یەکێک لە بەناوبانگترین نموونەکان مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٩٤ پ.ز، کاتێک فیرعەون رەمسیسی دووەمی میسر سەرکردایەتی سوپاکەی کرد لەدژی قەڵای هیتییەکان لەجەنگی قادش (سوریای ئێستا). دوو هەڵاتووی هیتی هاتنە لای فیرعەون وە پێیان وت کە ئەوان ئامادەن رێنمایی ناوبراو بکەن لەدژی نەتەوەکەیان. لەجیاتی رێنماییکردنیان، هەردوو هەڵاتووەکە فیرعەونیان خستە ناو بۆسەیەکەوە کە خەریک بوو کارەساتێکی مەزن روویدات.

دوای نزیکەی چوارسەد ساڵ، ئیسرائیلییەکان لەلایەن خەڵکی مەدینەوە (کە چەند پیاوێکی خێڵەکی کۆچەری عەرەبی بوون، مەڕوماڵاتیان بۆ لەوەڕ دەهێنایە ئەو دەشتاییانەی کە ئیسرائیلییەکان بەروبووم و دانەوێڵەیان تیادا چاندبوو) گیدیۆن، کوڕی یەحوشوا، توانی لەو شوێنە دەریان بکات. حەوت ساڵی پێشووتر ئیسرائیلییەکان هەڵسابوون بە دروستکردنی چەند گردۆلکەیەکی شاراوە لەسەر رێگای پیاوانی خێڵەکی مەدینە، بێگومان ئەمە ئەرکێکی قورس بوو کە چۆن گیدیۆن توانی نزیکەی سێ سەد پیاو کۆبکاتەوە بۆ ئەم ئەرکە. تەنیا فریودان و تەڵەکەبازیی دەتوانێت کارێک بکات کە ژمارەیەکی زۆری مرۆڤ ناتوانن پێی هەڵسن. پیاوانی گیدیۆن لە نیوە شەودا دەورەیان لە کەمپی مەدینییەکاندا، وە هەر کەسێک لەو سێ سەد پیاوە زوڕنایەک، ئینجانێک وە مەشخەڵێکی پێدرا. مەشخەڵەکان هەڵکران وە بەوریاییەوە لەژێر ئینجانەکاندا شاردرانەوە. ئەو سێ سەد کەسە بۆ سێ کۆمەڵە دابەشکران وە هەر یەکێکیان زوڕنایەکی بەدەستەوە بوو، هەموویان دەورەیان لە دوژمندا. لە نیوەشەودا، کاتێک مەدینەییەکان خەریکی گۆڕینی پاسەوان بوون، پیاوانی گیدیۆن هەموویان بە یەکدەنگ هاواریان کرد؛ 'شمشێری خودا و گیدیۆن!'

وە لەهەمانکاتدا ئەم زوڕنایەیان لێدەدا وە بەسەدان مەشخەڵیان دەجوڵاند. مەدینەییەکان وایانزانی کە ئەوان لەلایەن هێزێکی زۆرەوە هێرشیان کراوەتەسەر، وە بەترسەوە شوێنەکەیان بەرەو رووباری ئوردن جێهێشت، هەموویان بەکۆمەڵ هەڵاتن. گیدیۆن تەنیا بە راکردنیان نەوەستا بەڵکو بەدوایان کەوت تا ئەوکاتەی دڵنیابوو کە ئیتر ناگەڕێنەوە، وە 'رۆژی مەدینەییەکان' تا ئیمڕۆش بۆتە پەندێکی سەرکەوتنی ئیسرائیلییەکان لە کۆمەڵگای جوودا.

ناوی *سون تزو* لە سەردەمی ئیمڕۆدا هاوواتایە لەگەڵ چەمکی فریودان. پەرتووکەکەی لەژێر ناوی *هونەری* جەنگ سەرچاوەیەکی سەرەکی بوو بۆ داڕێژەرانی ستراتیژیەتی چینی وە سەرکردە سەربازییەکان بۆماوەی نزیکەی زیاتر لە دوو هەزار ساڵ، هەرچەندە لەسەرەتای سەدەدەی بیستەمدا بەشێوەیەکی پوخت وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی. بەکارهێنانەکانی جەنەڕاڵ (چی سون پین) لەساڵی ٣٤١ی بەر لە زایین نموونەیەکی دیاری سەرکەوتنەکانی تیۆری 'سون تزو'ە لە جەنگدا. بەر لە داگیرکردنەکەی ناوچەی 'وەی'، سون پین دۆخەکەی لەگەڵ راوێژکارێک خەملاند، کە وتی: "سەربازەکانی 'وەی' بێ بەزەیی و ئازان، وە دەبێت پیاوانی 'چی' وەک ترسنۆک ترۆ بکەی. ستراتیژیەتوانێکی کارامە دەبێت سوود لەمە وەرگرێت وە هەڵیان بخەڵەتێنێت... با سەد هەزار ئاگر بکەینەوە کاتێک سوپاکەمان دەگاتە 'وەی'، پەنجا هەزار بۆ رۆژی دواتر، وە تەنیا سی هەزار بۆ رۆژی سێیەم..." بەمەش جەنەڕاڵ 'وەی' پانگ چوان وادەزانێت کە سوپای 'چی' لەکشانەوەدایە وە ئەمەش هانی دەدات بۆئەوەی پەلە بکات لە هێرشکردن. پانگ چوان کەوتەنێو داوەکەوە، هێزەکانی خۆی بەناو گەلیەکی تەسکدا بەڕێکرد بۆ هێرشکردن، بەمەش کەوتەنێو بۆسەیەکی پلانبۆداڕێژراوی سون پین. بۆ کۆتایی هێنان بە پلانە کارامەکە، سون پین هێمایەکی هەڵواسی. کاتێک پانگ چوان گەیشتە شوێنی بۆسەکە، داوای مەشخەڵێکی کرد بۆئەوەی هێماکەی سون پین بخوێنێتەوە، کە تیایدا نووسرابوو: "پانگ چوان لەژێر

ئەم درەختەدا دەمرێت." رووناکی مەشخەڵەکە نیشانەیەک بوو بۆ تیربازانی سون پین بۆئەوەی بیکوژن.[i]

## فریودان لە سەربازییدا

فریودانی سەربازیی ئەو چالاکیانەن کە بەشێوەیەکی بەرنامەبۆداڕێژراو ئەنجام دەدرێن بۆ هەڵخەڵەتاندنی بڕیاردەرەکانی بواری سەربازی دوژمنێک لە بەرگ و نیاز و توانایەکی وادا کە ببێتە هۆی ئەوەی دوژمن چەند هەنگاوێکی تایبەت بهاوێژێت کە ببێتە هۆی سوود گەیاندن بە ئاسایشی نیشتیمانی وڵاتێکی دیاریکراو. دەکرێت فریودانی سەربازیی لەماوەی گشت قۆناغەکانی ئۆپەراسیۆنی سەربازییدا بەئەنجام بگەیەنرێت. فەرماندەیی هێزە هاوبەشەکانی ئەمریکا فریودانی سەربازی بۆ پێکانی ئامانجەکانیان بەهۆی هێرشی لەناکاو، ئاسایش، و هێزی ئابووری بەکاردەهێنن. لێرەدا ئێمە هەڵدەستین بە دەستنیشانکردنی شەش پرەنسیپی فریودانی سەربازیی بۆ ئەوەی وەک ڕێنماییەک سەیر بکرێن بۆ داڕشتنی پلان و جێبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنی فریودانی سەربازیی. ئەم پرەنسیپانە پێک دێن لە: سەرنج، ئامانج، کۆنترۆڵی نێوەندیی، پاراستن، بڕیاردان لەکاتی خۆیدا، و یەکخستن.

ئەوەی لێرەدا گرنگە ئاماژەی پێبکرێت بریتییە لەوەی کە لەکاتی دانانی پلانێکی سەربازیی بۆ فریودانی دوژمن دەبێت ئەوە لەبەرچاوبگیرێت کە هەماهەنگییەکی تەواو بکرێت لەگەڵ ئەو لایەنانەی پەیوەندیدارن بە خزمەتگوزاری مەدەنی دەوڵەت و بەتایبەتی ئەوانەی وابەستەن بە چالاکییەکانی ئۆپەراسیۆنی دەروونی بۆئەوەی دڵنیایی بدەن کە ئەو فریودانە کارناکاتە سەر پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دانیشتوانی مەدەنی یان دەسەڵاتداریەتی سەربازیی خۆجێی. ئەو ئۆپەراسیۆنە فریودەرانەی کە چالاکییەکانی بەئاشکرا بۆ میدیا و چاوی گشتی کراوەیە، دەبێت هەماهەنگییەکی باشی بۆ کرابێت لەگەڵ ئەفسەرانی کاروباری گشتی بۆ دەستنیشانکردنی هەر

---

[i] Latimer, J. (٢٠٠٤). Deception in war: the art of the bluff, the value of deceit, and the most thrilling episodes of cunning in military history, from the Trojan horse to the Gulf War. *Armor*, ١١٣(٢), ٤٩-٥٠.

گرفتێکی نادیار کە رەنگە بەرەنگاریان ببێتەوە. سون تزو لە کتێبەکەیدا بەناوی 'هونەری جەنگ' ٥٠٠ ساڵ بەرلە زایین نووسیویەتی، "هەموو جەنگێک لەسەر فریودان رۆنراوە." فریودان دەکرێت هەم هونەر بێت و هەمیش زانست، واتە ئەگەر بڵێین تەنیا زانستە یان هونەرە ئەوا نادروستییەک هەیە. بەکورتی، هونەرێکە کە وا لە دوژمن بکەی بڕوای بەوە بێت کە تەکنیکە جەنگییە دروستەکان نادروستن، وە بەپێچەوانەشەوە، ئامانج لەمەش بۆ بەرێلابردنی دوژمنە.

## سیستەمی فریودانی بەریتانیا

ئەو سیستەمە دژەسیخوڕی و ئۆپەراسیۆنە تەڵەکەبازییە بوو کە لەلایەن بەریتانییەکانەوە لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەم بەکاردەهات. کاتێک سیخوڕانی نازی لەو وڵاتەدا دەستگیردەکران، یان خۆیان رادەست دەکرد یان خۆیان ئاشکرا دەکرد، دواتر لەلایەن بەریتانییەکانەوە بەکاردەهێنران بۆنەوەی زانیاری هەڵە بە نازییەکان بدەن. ئۆپەراسیۆنەکانیان لەلایەن "کۆمیتەی بیست"ەوە بەسەرۆکایەتی *جۆن ماستەرمان* چاودێری دەکران.

یەکێک لە دیارترین نموونە باڵاکانی ئۆپەراسیۆنی مەزنی سیخوڕی دووسەرە بریتییە لە سیستەمی تەڵەکەبازیی، کە بەهۆیەوە بەریتانییەکان، لەماوەی نزیکەی تەواوی جەنگی جیهانیی دووەم، "بەشێوەیەکی چالاکانە سیستەمی سیخوڕی ئەڵمانیان بەڕێوەدەبرد و کۆنترۆڵیان دەکرد لەناو وڵاتی خۆیاندا." بەدەستپێکردن لە تاکە سیخوڕێکی ئەڵمانی کە لەکاتی گەڕانەوەیدا لە بەریتانیاوە بۆ ئەڵمانیا دەستگیرکرا لە سەرەتای جەنگەکەدا، بەریتانییەکان توانیان تۆڕێکی گەورە بەناو سیخوڕی ئەڵمانی بنیادبنێن وە وایان لە ئەڵمانەکان کرد بڕوایان پێیان بێت تا کۆتایی جەنگەکە. هەرکە سیخوڕی ئەڵمانەکان دەهاتنەنێو بەریتانیا، دەمودەست دەستگیردەکران وە بەکاردەهێنران لەدژی دەزگای هەواڵگریی وڵاتەکەیان بەپێدانی زانیاری هەڵخەڵەتێنەر دەربارەی ئۆپەراسیۆنی بەریتانییەکان. ئەمە تا کۆتایی هاتنی جەنگەکە بەردەوام بووە وە دەزگای هەواڵگری ئەڵمانی هەستی بە هیچ نەکرد.

جۆن *ماستەرمان*، بەڕێوەبەری سیستەمەکە پێنج ئامانجی سەرەکی دیاریکرد:

- کۆنترۆڵکردنی سیستەمی سیخوڕی دوژمن
- دەستگیرکردنی سیخوڕی تازەهاتوو بۆناو وڵاتەکەی
- بەدەستهێنانی زانیاری کەسایەتیەکان و میتۆدەکانی کارکردنی دەزگای نهێنی ئەڵمانیی
- دەستخستنی زانیاری دەربارەی کۆد و شیفرەی دەزگای نهێنی ئەڵمانیا
- بەدەستهێنانی بەڵگەی پلان و نیازەکانی دوژمن لەو پرسیارانەی لێیان دەکرا
- بۆ کاریگەری دانان لەسەر پلانەکانی دوژمن بەهۆی ئەو وەڵامانەی لەلایەن دوژمنەوە بەدەست دەگەیشت
- بۆ هەڵخەڵەتاندنی دوژمن دەربارەی پلان و نیازەکانی دوژمن.

سوودەکان بۆ حکومەتی بەریتانیا بێ هەژمار بوون. بۆ نموونە، لەساڵی ١٩٤٠، سیخوڕی یەکەم لەلایەن بەرلینەوە کۆدێکی پێدرا بۆ پەیوەندیگرتن لەگەڵ ئەڵمانیا لەبەر ئەوەی ئەم کۆدە بوو بە "بەردی بناغەی ژمارەیەک کۆدی تر کە لەلایەن دەزگای هەواڵگری سەربازیی ئەڵمانەکانەوە بەکاردەهاتن،" هەبوونی بووە هۆی ئەوەی بەریتانیا هەر لەسەرەتای جەنگەکەوە بتوانێت کۆدەکانی سیستەمی ئەو دەزگایە بشکێنێت. دواتر لە جەنگەکەدا، کاتێک بەریتانییەکان زیاتر متمانەیان بۆ دروست بوو لە سیستەمی دژەسیخوڕی تەڵەکەبازیی ئەو وڵاتەدا، ئەوان توانیان دوو کۆتا ئامانجەکانیان بپێکن، کە پێکهاتبوو لە هەڵخەلەتاندنی ئەڵمانەکان. لووتکەی سەرکەوتنەکان لەساڵی ١٩٤٤دا راگەیەنرا، کاتێک سیخوڕە دووسەرەکانی بەکارهێنران بۆ بەرەوپێشبردنی کەمپینی فێڵبازیی کە بووە هۆی قایلکردنی ئەڵمانەکان بۆ ئەوەی واپێشبینی بکەن بەریتانییەکان لە *کالێس* دادەبەزن نەوەک لە *نۆرماندی*، بەمەش سەرکەوتنی بەریتانییەکان مسۆگەر بوو.

بەهۆی سەرکەوتنەکانی خوێندنەوەی کۆدەکانیەوە، هەواڵگری بەریتانیا لە پێگەیەکی دروستدا بوو بۆ تێبینیکردنی پەرچەکرداری ئەڵمان بۆ ئەو زانیاری و زانیاری هەڵخەڵەتێنەرەی لەلایەن سیخوڕە دووسەرەکانەوە پێیان دەدرا. سەرەڕای ئەمەش،

دەزانرا کە کامە راپۆرتی گرنگ بەرزکراوەتەوە بۆ سەرکردایەتی باڵای بەرلین وە ئایا بڕوا بەو راپۆرتانە کراون یان نا. ئەم پێراگەیاندنەوەیە زۆر گرنگ بوو بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی فریودان، چونکە رێگای بە بەریتانییەکاندا بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەو خاڵانەی ئەڵمانەکان لەدەستیان دابوو یان بۆ گۆڕینی پەیامەکان بۆ نەهێشتنی هەر گومانێکی ئەڵمانەکان.

کۆنترۆڵکردنی تۆڕی سیخوڕی دوژمن بێگومان نرخی خۆی هەیە: تۆڕەکە دەبوایە ئەوەندە زانیاری هەواڵگری بەرهەمهێنابوایە کە بەشی ئەوەی کردبوایە ئەڵمانەکان وا لێ بکات بڕوای پێ بکەن. هەروەها، ئەو زانیاریانەی بەرهەمی دەهێنا نەدەبوایە هەروا بەئاسانی دژەیەک بن لەگەڵ ئەو زانیاریانەی ئەڵمانەکان بەدەستیان هێناوە لەرێی کەناڵە هەواڵگرییەکانیانەوە، تەنانەت دەبوایە حیسابی راپۆرتەکانی ئەو سیخوڕانەشیان کردبوایە کە هێشتا نەگیرابوون.(واپێدەچوو هیچ سیخوڕێکی دەستگیرکراو نەبووبێت، بەڵام بێگومان دەبوایە ئەمەشیان لەبەرچاو بوایە.) ئەمە باجێکی تارادەیەک قورس بوو؛ چونکە ئەڵمانەکان دەکرا تۆڕێکی سیخوڕیان لەناو بەریتانیا هەبوایە، وە ئەمە بۆ بەریتانییەکان جێگای تێرامان بوو، هەربۆیە دەبوایە هەموو ئەگەرەکان لەبەرچاو بگرن.

بەڕێوەبەری سیستەمی دژەسیخوڕی فریودان بڕوای وابوو کە خۆی و هاوڕێکانی زۆر وریا بوون، لەو ڕووەوەی کە بەریتانییەکان هەندێک زانیاری دروستتریان بەدەستەوەدا کە دەبوایە لەدەستی بدەن. ئەڵمانەکان نەک تەنیا خاوەنی کەناڵی هەواڵگری کەمتر بوون لە بەریتانییەکان، بەڵکو وادەرکەوت کە بەباشی متمانەیان بەو سیخوڕانە هەبوو کە پێیان وابوو کار بۆ ئەوان دەکەن.[i]

---

[i] Shulsky, A. N., & Schmitt, G. J. (٢٠٠٢). *Silent warfare: understanding the world of intelligence*. Potomac Books, Inc...

## نکۆڵی و فریودانی ستراتیژی

چەمکی نکۆڵی و فریودان بەیەکەوە بەکاردێت بۆ ئۆپەراسیۆنی زانیاری کە وڵاتێک دەیگرێتەبەر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی. نکۆڵیکردن بەو هەوڵە دەوترێت بۆ ڕەتکردنەوەی زانیاری کە دەکرێت لەلایەن دوژمنەوە بەکاربێت بۆئەوەی هەندێ ڕاستی بزانێت.[٦] فریودان، بەپێچەوانەوە، بریتییە لە هەوڵەکانی نەتەوەیەک بۆئەوەی وا لە دوژمن بکات بڕوای بەوە بهێنێت کە شتێک کە لە ئەساسدا بوونی هەیە، ڕاست نییە.

هەرچەندە هەردوو چالاکییەکە جیاوازن، لە کرداردا هەردووکیان بەیەکەوە بەستراون و وەک یەک چەمک کاردەکەن. بۆ فریودانی نەیارێک دەربارەی نیازی ڕاستەقینە یان ئامانجی فریودەرەکە، (وەک بەرنامەی پێشخستنی سەربازیی، سیاسەت) دەبێت زانیاری ورد بشاردرێتەوە یان نکۆڵی لە بوونی بکرێت. فریودان، ئەو هەوڵەیە دەدرێت بۆئەوەی وا لەدوژمن بکات بڕوا بەشتێک بێنێت کە ڕاست نییە، لەگەڵ ئۆپەراسیۆنی نکۆڵیدا بەیەکەوە کاریان پێدەکرێت. ئەمەش لە دزەپێکردنی زانیاری هەڵە، یان فریودان پێکدێت بۆ دروستکردنی بڕوایەک کە ڕاستیەکە بەشێوەیەکی ترە، بەمەش "حەقیقەتێکی بەدیل" دروست دەبێت بۆ ئامانجەکە. کاتێک فریودان و نکۆڵیکردن بەباشی کاری خۆیان دەکەن، فریودەرەکە واله ئامانجەکە دەکات بڕوای بە "چیرۆکێکی دروستکراو" هەبێت نەوەک خودی ڕاستیەکە. پاشان، ئامانجەکە بەشێوازگەلێک کاردانەوەی دەبێت کە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی فریودەرەکە بکات.

بەکارهێنانی چەمکی "ستراتیژیی" لێرەدا بۆ گرنگی ئاستی بابەتەکە بەکارهاتووە. ئەگەر هاتوو نکۆڵیکردن و فریودان بەشێوەیەکی ستراتیژی بەکارهێنران، ئەوا بەبێ دوودڵی کاریگەریی دەکاتە سەر داهاتوو و بەرژەوەندی نیشتیمانی هەر وڵاتێک. نکۆڵی و فریودانی ستراتیژی لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وێنە گەورەیەی دەلالەتی لێدەکەن. ئەمە پەیوەندی هەیە لەگەڵ سیاسەتی هەرەباڵای حکومەتێک، نەوەک تەنیا ناوەڕۆکی جێبەجێکردنی سیاسەت. هەربۆیە، فریودانی ستراتیژی ئاستی هەرەباڵای حکومەتێک یان بازنەی سوپای حکومەتێکی کردۆتە ئامانج. بابەتی هەوڵەکانی فریودان دەبێت شتێک بێت کە بەرپرسە باڵاکانی وڵات چارەسەری بکەن. بەهەمان شێوە، نکۆڵی

ستراتیژی ئەو هەوڵە دەبێت بۆ شاردنەوەی ئەو جۆرە زانیارییانەی کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەلایەن بەرپرسە باڵاکانەوە دراوە.
نکۆڵی و فریودانی دەرەکی لەوکاتەدا ئەنجام دەدرێت کە دەوڵەتێک یان چەند گروپێک (وەک گروپی تیرۆرستی، دامەزراوە تاوانکارییەکان، یان بزووتنەوەی جوداخوازی) نکۆڵی و فریودان بەکاردەهێنن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان لەدژی بەرژەوەندیەکانی وڵاتێک. چەندین کەناڵی پەیوەندی هەن کە بەکاردێن لەلایەن ئەو وڵات یان دەزگایانەی دەیانەوێت ئەم دوو ستراتیژیەتە بەکاربهێنن. هەندێجار سەرچاوەکانی هەواڵگری زانیارییەکان لە داڕێژەرانی سیاسەت دەشارنەوە و راستییەکەیان بۆ ئاشکرا ناکەن. سەرەڕای ئەمەش، هەندێک میتۆدی تری پەیوەندیش بەکاردێت لەم نێوەندەدا، وەک راگەیاندن (تەلەفزیۆن، رادیۆن و ئینتەرنێت)، پەیوەندی دیبلۆمسی، ئاڵوویێری ئەکادیمی، وە گەشتی نێودەوڵەتی و گەشتوگوزار. ستراتیژیەتی نکۆڵی و فریودان پێویستی بە کەناڵێکی پەیوەندی تەرخانکراو نییە. تەنیا لەوکاتە روودەدات کە رووداوێک سەرهەڵدەدات یاخود دوژمن چەند زانیارییەکی لەبارەی دامەزراوەکانی دەوڵەتێکەوە دەست کەوتووە.
بەپشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەکی مێژوویی و لۆژیکی ئەنجامدانی ئەم کارە، بۆمان دەردەکەوێت کە کەمپینی فریودان و نکۆڵیەکی سەرکەوتوو پێویستی بە چەندین پێکهاتە هەیە. یەکەم، وڵاتی فریودەر دەبێت پلانێکی گشتی لە مێشکدا هەبێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی؛ دەبێت پێشتر بڕیاری ئەوە بدات دەبێت ئامانجەکە چۆن رەفتار بکات وە رۆڵی فریودان چی دەبێت لە سەرئەنجامدا. هەروەها، فریودەرەکە دەبێت پێشبینی ئەوە بکات چۆن ئامانجەکە کاردانەوەی دەبێت لەکاتی هەردوو فریودانی سەرکەوتوو و شکستخواردوودا. ئەمە، بێگومان، ئەرکێکی سانا نییە. دەبێت ئەوانەی لە کردەکە بەژدار دەبن بیرکردنەوەیەکی روونیان هەبێت کاتێک پێشبینی سەرئەنجامەکانی دەکەن. جگە لەمەش، دەبێت فریودەرەکە کارەکانی تێکەڵ بکات لەگەڵ: هەوڵدان بۆ نکۆڵیکردنی زانیاری دروستی دوژمنێک؛ چیرۆکی فریودەر. ئەمە، دووبارە، ئەرکێکی سانا نییە. هەڵمەتی فریودان و نکۆڵیکردن

پێویستی بە کاری یەکگرتوو هەیە لەلایەن چەندین بەش، دەزگا و وەزارەتی حکومەتەوە. لێدوانی گشتی، گوتاری راگەیاندن، پەیوەندییەکانی ئینتەرنێت دەبێت ئامادە بکرێن بۆ پشتیوانی لە ئامانجەکانی نیازی دەوڵەت لە کردەی فریوداندا. هەرکە زانیاری هەڵە بڵاوکرایەوە، دەبێت چەند هەنگاوێک بگیرێنەبەر بۆ رێگاگرتن لە گەیشتنی زانیارییە دروستەکە بۆدەستی دوژمن.[i]

دووەم، فریودان ئەوکاتە پێشدەخرێت کە کولتوری ستراتیژی دوژمنەکە تێبگەین. بۆئەوەی لەم چەندەدا سەرکەوتوو بین، فرویدەرەکە دەبێت لە سیاقی رامانی نەیارەکەی تێبگات بۆئەوەی بزانێت کە کامە وێنەی دەتوانرێت بەشێوەیەک نیشانبدرێت کە شایانی قابیلکردن بێت بۆ لایەنی بەرامبەر.[ii] مێژوو، کولتور، باری گشتی دارایی و سیاسی هەموویان کاریگەرییەکی باشیان لەسەر رامانی ئامانجەکە هەیە.[iii] دەبێت زانیاری هەڵە لەگەڵ ستراتیژیەت و تەنانەت کولتوری ئەو وڵاتە خۆی بگونجێت بۆئەوەی بەباشی کاری خۆی بکات. هەر هەڵەیەک دەتوانرێت بەئاسانی لەلایەن وڵاتی ئامانجەوە هەستی پێبکرێت و لەسەرئەنجامدا ئەو فریودانە تەنانەت دەبێتە مایەی گاڵتەجاریی. هەربۆیە، فریودان پێویستی بە پلان و نەخشەی زیرەکانە هەیە: ئەزموونی ئەم هونەرە ئەوەی دەرخستووە کە پلاندارێژەرانی فریودانی سەرکەوتوو دەتوانن چەندین رێگا بەکاربهێنن کە لە هزری ئامانجەکە بەدوور بێت. بەکورتی، پلاندانەرانی فریودان "دەبێت زانیارییەکی بێ ئەندازەیان هەبێت دەربارەی

---

[i] Perception and Misperception in International Politics (Princeton, N.J.: Princeton University Press, ١٩٧٦); and James J. Wirtz, "The Intelligence Paradigm," Intelligence and National Security, Vol. ٤, No. ٣, October ١٩٨٩, pp. ٨٢٩-٨٣ ٧.

[ii] Gray, lvfodem Strategy (New York: Oxford University Press, ١٩٩٩

[iii] Alastair Ian Johnston, Cultural Realism: Strategic Culture and Grand Strategy in Chinese History (Princeton, NJ.: Princeton ·university Press, ١٩٩٥); Stephen Peter Rosen, Societies and Military Pmver (Ithaca,.Y.: Cornell University Press, ١٩٩٦); Peter Lavoy, Scott Sagan and James J. Wirtz (eds.), Planning the Unthinkable: New Powers and their Doctrines for Using Nuclear, Che١nical and Biological Weapons (Ithaca, Cornell University ٧forthcoming); and Elizabeth Kier, lmaging War: French and British Military Doctrine Betiveen the Wars (Princeton, N.J.: Princeton University Press, ١٩٩٧

تێڕامانی ئەو وڵات یان ئەو کەسانەی دەیانەوێت فریوی بدەن، وە جگەلەمەش ئارەزووی مرۆڤ بۆ خودفرویدانیش لەبەرچاوبگیرێت.(٧)

سێیەم، فریودان پێویستی بە کەناڵی زانیاری هەیە بۆ گەیشتن بە دوژمن. پێدانی زانیاری ساختە بەڕێگایەکی لێزانانە دەتوانێت زیاتر هاوکار بێت لە بەڕاست زانینی ئەو زانیارییە لەلایەن دوژمنەوە. هەربۆیە، داڕێژەرانی پلان پێوستیان بە دەسەلات و بیری نوێکارانە هەیە بۆئەوەی ئەو کەناڵە بەگەڕبخەن.

چوارەم، هەڵمەتێکی سەرکەوتووی فریودان و نکۆڵیکردن سوودی زۆر لە میکانیزمی "فیدباک" وەردەگرێت بۆ کۆکردنەوەی داتا دەربارەی رەفتاری ئامانجەکە. دەرککردن بەو رێگایەی ئامانجەکە چۆن ئەو داتایەی لێکداوەتەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە. چالاکی فریودان چالاکییەکی جووڵاوە: چیرۆکی پەردەپۆشی، کەناڵی گەیاندن، وە دەستپێشخەری تایبەتی پێویستیان بە پلانێکی باش هەیە بۆ سوود وەرگرتن لەو دەرفەت و گرفتانەی دێنەپێش. زانینی ئەو راستیەی کە فریودان سەرکەوتوو دەبێت دەکرێت خاڵێکی گرنگ بێت بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی زیاتر. ئەگەر ئەو پلانەی داتان رشتووە سەری گرت و دوژمن درکی پێنەکرد ئەوە باشە. ئەگەر هەر لەسەرەتاوە پلانی فریودانەکە شکستی هێنا، میکانیزمی "فیدباک" دەبێت سوودی لێ وەربگیرێت.[i]

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێبدرێت ئەوەیە کە تەنیا یەک جۆری فریودەر لەم بوارە رۆڵ ناگێرێت بەڵکو ئەمان بۆ چوار پۆلێن دابەش دەکرێن: دیموکراسییەکان؛ رژێمە داپلۆسێنەکان (دیکتاتۆرییەکان)؛ رژێمە ئینتیقالییەکان (گۆڕین لە رژێمێکی دیکتاتۆری بۆ دیموکراسی یاخود بەپێچەوانەوە)؛ ئەکتەرە ناحکومییەکان (رێکخراوی تاوانکاری، گروپە تیرۆرستییەکان، بزووتنەوە جیاخوازەکان). هەموو ئەو جۆرانەی باسکران، تووشی شکست و سەرکەوتنی کەمپینی فریودان دەبنە، کە بە شتێکی ئاسایی لەم بوارە لەقەڵەم دەدرێت. ئێستا با لەخوارەوە یەک بە یەک باسیان بکەین

---

[i] "Colloquium on Foreign Strategic Denial and Deception," Georgetown University, ١٢-١٣ July ١٩٩٩; and Barton Whaley, Stratagem: Deception and Surprise in War (Cambridge: MIT Center for International Studies, ١٩٦٩

و بزانین ئەم ئەکتەرانە کەی و چۆن و لەکوێدا ڕۆڵی خۆیان لە کردەی فریودانادا دەگێڕن.

یەکەم، وڵاتە دیموکراسییەکان بەزۆری لەکاتی جەنگدا هەڵمەتی فریودان و نکۆڵیکردن بەکاردەهێنن. بەڵام ئەمە بەو واتایەش ناهێت کە لەکاتی ئاشتیشدا فەرامۆشی بکەن. هەرلەکاتی جەنگی شۆڕشگێڕی ئەمریکاوە تا لەنگەرگرتنەکەی نازییەکان لە (D-Day) لە جەنگی جیهانی دووەم، تا هێرشی مارینزەکان لەماوەی جەنگی کەنداودا، مێژووی ئەمریکا پڕە لەو نموونانەی کە تیایدا فریودان بەکارهاتووە لەبەرژەوەندی سوپای ئەمریکادا. بەدرێژایی سەدەی بیستەم، بەریتانیا و وڵاتانی تری دیموکراسیش جاربەجار لەکاتی ئاشتی و جەنگدا ئەم ستراتیژیەتەیان بەکارهێناوە. بۆنموونە بەرنامەی ئیسرائیل، یان بەم دواییانە هی هیندستان، بۆ پەرەپێدانی بەرنامەی ناووکی سوودی لە فریودان و نکۆڵیکردنی پێشکەوتوو وەرگرتووە. بەڵام ئەمریکییەکان بەزۆری ئاگاداری سەرکەوتنی هەڵمەتی وڵاتانی تری دیموکراسی نین، بەتایبەتی لەکاتی ئاشتیدا.

دووەم، ڕژێمە داپلۆسێنەرەکان، بەپێچەوانەی دیموکراسییەکانەوە، فریودان و نکۆڵیکردن بەکاردەهێنن وەک ئامرازێکی ئاسایی حوکمکردنی وڵاتەکەیان.[i] ئەمە پشتبەستنیان زیاد دەکات بە تەکتیکی هاوشێوە لە سیاسەتی دەرەوە و پرسەکانی بەرگریی وڵاتدا. ئەوەی لەم جۆرە ڕژێمانەدا قێزەونە بریتییە لە مەیلی ئەو ڕژێمانە بۆ بەکارهێنانی نکۆڵی و فریودان بەئامانجی پشتیوانیکردنی دەستپێکردنی نەیاریی. بۆنموونە، تۆپەراسیۆنی باربارۆسا (لەبەشی چوارەمدا باسکراوە) و هێرشەکانی ژاپۆنییەکان بۆسەر ئەمریکا و بەریتانیا لە کانوونی یەکەمی ١٩٤١ سوودی زۆر لەو دوو هوونەرە وەرگیرا. هەروەها، ڕژێمە دیکتاتۆرەکان کارامەن لە بەکارهێنانی

---

[i] Roy Godson (ed.), Comparing Foreign. Intelligence (Washington, Pergamon-Brassey's, ١٩٨٨).

جۆرەکانی تری فریودان و نکۆڵیکردن، هەریۆ نموونە بڕوانە هەوڵە بەردەوامەکانی ئێراق بۆ خۆدزینەوەی لە پشکنینی نێوەدەوڵەتی و لەناوبردنی چەکی کۆمەڵکوژ.[i]

سێیەم، ئەکتەرە ناحکومییەکان بەشێوەیەک ئەم چالاکییەکانە ئەنجام دەدەن کە هەڕەشە بۆسەر ئەمریکا و تەواوی وڵاتە دیموکراسییەکان زیاد ببێت. دامەزراوەی نێودەوڵەتی، تیرۆریستەکان، و گروپە ئایینییەکان سروشتی ئامانجەکەیان بەشێوەیەکە کە دەبێت پەرەپۆشێکی بۆ بدۆزنەوە، ئەگەر بیانەوێت بەشێوەیەکی باش چالاکییەکانیان ئەنجام بدەن. بۆ تیرۆریست، یاخیبوو، وە تاوانکاران نکۆڵیکردن دەبێتە هۆکارێک بۆ مانەوەی خۆیان (raison d'etat). ئەو جیهانە لێڵەی تیرۆریست و تاوانکاران تیایدا چالاکییەکانیان ئەنجامدەدەن حەقیقەتێکی بەدیلە، نەوەک بەهانەیەکی کاتی بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی سنووردار. تاوانکاران لەجیهانی شاراوەی نکۆڵیکردن گەشەدەکەن، لەوکاتەی چەکبەدەستێک فریودان و نکۆڵیکردن بەکاردەهێنێت بە ئامانجی چوونەناو جیهانی دەسەڵاتی شەرعیەوە. بەنیسبەت گروپە نهێنییەکان، نکۆڵیکردن جیهانێکی هاوتەریب دروست دەکات کە ببێتەهۆی دروستکردنی شوێنێکی سەلامەت و پەرەپێدانی ئەو ژیانەی کە خۆیان بۆ تەرخانکردووە. دەکرێت ئاماژە بە چەند نموونەیەکی لەم جۆرە رەفتارە بکەین وەک مافیاکانی سیسیلیا، کە ئامانجیان گەڕانە بەدوای ڕێز، هێز، و پارە، و لە ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان کە ئامانجیان گۆڕینی ئاراستەی مێژووە لەڕێگای کردەی توندڕەوییەوە.

چوارەم، هەندێ لە ڕژێمەکان لەحاڵەتی ئینتیقالیدا لە حکومەتێکی دیکتاتۆری بۆ حکومەتێکی دیموکراسی، کە بەشتێکی ئاسایی دادەنرێت لە مێژوودا. هەندێک لەم حکومەتانە ئامانجیان ئەوەیە پرۆسەکە پێچەوانە بکەنەوە، لەکاتێکدا ئەوانی تر دەیانەوێت پەرە بە تواناکانی دەرەکی بدەن بۆ گۆڕینی دۆخی ئێستای وڵاتەکەیان لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتییدا. هەندێک هێز کاتێک دەیانەوێت پەرە بە هێزە

---

[i] David Kay, "Denial and Deception: The Lessons of Iraq," in Godson, May and Schmitt, op. cit., pp. ١٠٩-١ and Schuster, ١٩٩٩). and Scott Ritter, Endgame (New York: Simon and Schuster, ١٩٩٩).

سەربازییەکانیان بدەن، دەبێت هونەری نکۆڵیکردن و فریودان وەک ئامرازێک بەکاربهێنن بۆ پاراستنی نهێنی بەرەوپێشبردنی چەک و ژێرخانی سەربازیی بۆئەوەی هیچ وڵاتێکی دەرەکی پێی نەزانێت یاخود خۆی بەدوور بگرێت لە پەیمانە نێودەوڵەتییەکان. مێژووی ئەوەی چۆن هێزە ئینتیقالییەکان ئەم هونەرەیان بەکارهێناوە وێنەیەکی باشمان پێدەدات لە گرفتی خۆدزینەوەی پشکنینی نێودەوڵەتی، بەتایبەتی لە کەیسی پشکنینی چەکی کۆمەڵکوژی ئێراق لەساڵی ١٩٩٨.

بەهۆی چەندین هۆکارەوە، ئەمریکا ئامانجێکی مەزنی هەردوو هەڵمەتی فریودان و نکۆڵیکردنە، ئەمەش بەهۆی بوونی چەندین نەیار چ حکومەت یان ئەکتەری ناحکومی. دەکرێت هەڕەشەکانی فریودان و نکۆڵیکردن وەک شێوازێکی ناچونییەکی کاروباری جەنگی سەیربکرێت. ئەو وڵاتە نەیارانەی نیازیان هەیە لەم دووریگایەوە زیان بە سوپای ئەمریکا بگەیەنن دەبێت خودان توانایەکی باشی سەربازیی بن لە کاروباری جەنگیدا. ئەفسەر و داڕێژەرانی سیاسەت لە ئەمریکا بەزۆری ئەم هێرشانە بەهۆی تەکنەلۆژیا و چەکی نوێ بەرپەرچدەدەنەوە. بەرهەمهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ یەکێکی ترە لەو ڕێگایانەی کە دەتوانرێت فریودان و نکۆڵیکردنی تیادا بەکاربهێنرێت. بەڵام تەکنەلۆژیا و ماددەی پێوست لەم رووەوە پێویستە بۆئەوەی بتوانرێت چەکی وەک، کیمیایی، بایۆلۆژی، یان ناووکی بەرهەم بهێنرێت. زۆربەی وڵات و کارگەکانی ئەم بوارە ناتوانن ماددەی هەستیار لەم چەکانە بەکاربهێنن. هەربۆیە، نکۆڵی و فریودان رۆڵێکی باڵا دەگێرێت لەخۆدزینەوە لە ئیدانەکردن و ئابلوقەی نێودەوڵەتی کە پێویستی بە بەڵگەی روون دەبێت کە نەتەوەیەک پلانی داڕشتووە بۆ پەرەپێدانی جبەخانەیەکی نائاسایی. هەرەوەک هێرشی بەرگریکاری ئیسرائیل بۆسەر کۆمەڵگای ناووکی ئۆسێراک لە ئێراق نیشانی دەدات، ژێرخانێکی چەکی کۆمەڵکوژی کە پێشتر ئامادەکرابێت و لەهەمانکاتیشدا لەلایەن وڵاتانەوە ئاشکرابووبێت رووبەڕووی هێرشی راستەڕاست دەبێتەوە. هەڵمەتی نکۆڵی و فریودان هاوکارە لە شاردنەوەی

چالاکیەکانیان و دوورکەوتنەوە لە ئابلۆوقە و هێرشی سەربازی کە ئامانج لێیان ڕێگاگرتنە لە بەدەستهێنانی جبەخانەی کوشندە.
جگە لەمەش، ئەمریکا وڵاتێکە کە لە چەندین ڕێکەوتنی دوولایەنەی کۆنترۆڵکردنی چەک، مافەکانی مرۆڤ، و بازرگانی تێوەگلاوە. لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەم پەیمانانەی بەند و وابەستەبوونی ئاڵۆزی لەخۆگرتووە، وڵاتانی بەبەردەوام بەدوای ڕێگاچارەیەکن بۆ سەرپێچیکردن لەو پەیمانانە، بێگومان ئەم چەندەش لەڕێگای فریودان و نکۆڵیکردنەوە مەیسەر دەبێت. پەیمانی هەمەلایەنەش لەنێوان وڵاتاندا بەشێوەیەکی تایبەتی موعەرەزن بۆ ئەم جۆرە هێرشە. ئەزموونی مێژوو ئەوەمان پێ دەڵێت کە ئەگەر وڵاتێک پابەندی پەیمانێکی ئاوا نەبوو، ئەوا بەرەنگاری ئابلۆقەیەکی توندی نێودەوڵەتی دەبێتەوە، بەڵام بە پەیرەوکردنی هەڵمەتی فریودان و نکۆڵیکردن دەکرێت وڵاتێکی لەم چەشنە تووشی گرفتێکی ئاوا مەزن نەبێتەوە.
ڕاگەیاندنی ئەلیکترۆنی، بەتایبەتی تۆڕەکانی نووچەی تەلەفزیۆنی و ئینتەرنێت، دوو لە کەناڵی هەرە بەهێزن بۆ بەکارهێنانی نکۆڵی و فریودان. هەرچەندە ئەم ڕاگەیاندنە نوێیە ڕێگای بە ئەمریکییەکان داوە بۆئەوەی ئاگایان لە پێشکەوتنە جیهانییەکان بێت لەکاتی گونجاودا، ئەم کەناڵانە ڕێگایەکی ڕاستەوخۆن بۆئەوەی دوژمن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ هاوڵاتی و نوخبەی سیاسی ئەمریکا بکەن. ئەمە ڕەنگە ببێتە هۆی زیانگەیاندن بە حکومەتی ئەمریکا بۆئەوەی سیاسەتەکانی بەشێوەیەکی روون و رەوان بۆ رای گشتی جیهان بەیان بکات. رای گشتی، بەتایبەتی لەژێر حوکمی رژێمێکی تۆتالیتاریدا، بەدەگمەن دەتوانێت ئەو تەکنەلۆژیا نوێیە بەکاربهێنن. لە چەندین ڕووەوە، ئێستا ئەمریکا و کاربەدەستانی بەشێکن لە گوندێکی نیشتیمانی کە هەموو جیهان چاوی لەسەریانە، ئەمەش بەهۆی زۆروزەوەندی میدیای ئەو وڵاتەوە، بەتایبەتی لەکاتی ڕووداوی گرنگدا.
هەروەها، بڵاوکردنەوەی زانیاری پێشکەوتووی تەکنەلۆژیی دەربارەی تەکنەلۆژیای هەواڵگری و بوونی ئەو تەکنەلۆژیایە لەژێر دەستی نەیارانی ئەمریکا، هۆکارێکی ترە بۆ زیادبوونی هەڕەشە بۆسەر ئەمریکا. تا زیاتر ئەمریکا چیرۆک و میتۆدە

هەواڵگرییەکانی لەرێگای سیخورییەوە بڵاوبکاتەوە بۆ ناو ئەکادیمیا و وێبسایتەکان، زیاتر موعەرەز دەبێت لەئەنجامدانی فریودان و نکوڵیکردن لەسەری. بەجیهانیبوونیش کەناڵی زانیاری و ئابووری هەر وڵاتێک زیاد دەکات کە دەتوانرێت نکوڵی و فریودانی تیادا بەکاربهێنرێت. گەشتوگوزار، گەشتی کار، کۆچی یاسایی و نایاسایی، بازرگانی یاسایی و نایاسایی نێودەوڵەتی، وە ئەو بازارە جیهانییەی هەیە بۆئەوەی بتوانرێت لەرێیەوە وڵاتانی یەکتر فریو بدەن.

دوای باسکردنی هۆکار و هەڕەشەکان، دەبێت ئەمجارە بپرسین کە ئایا چۆن دەکرێت ئەم هەڕەشانە کەم بکرێتەوە. هەرچەندە ناتوانرێت بەتەواوی هەڕەشەی نکوڵیکردن و فریودان لەنێوببردرێت، چەند رێگایەک هەن بۆ کەمکردنەوەی کاریگەرییەکەی. یەکەم، پەرەپێدانی بەرنامەیەکی زیادکردنی وشیاریی لە بازنەی حکومەتدا لە بەکارهێنان و میتۆدەکانی هەڵمەتی فریودان و نکوڵی. دووەم، زیادکردنی وشیاری گشتی و میدیا لەم رووەوە. سێیەم: زیادکردنی وشیاری بازرگانیکردن. چوارەم: کردنەوەی خول بۆ کۆکەرەوانی زانیاری، شیکەرەوەکان، و بەرێوەبەرانی هەواڵگریی. پێنجەم: لێکدانی زانیاری بەردەست و ئامادەیی بۆ داهاتوو. ئەم رێگاچارانە رەنگە هەوڵ و ماندووبونێکی کەمی تێبچێت بەڵام بەدڵنیاییەوە بەرهەمی باشیان دەبێت.[i]

## جەنگی دەروونی و فریودان

جەنگی دەروونی و فریودان پەیوەندییەکی تۆندوتۆڵیان بەیەکەوە هەیە، تەنانەت بەشێوەیەک کە ناتوانین هەردووکیان بەشێوەی جیاجیا باس بکەین. لەسەرەوەدا باسی فریودان و جۆرەکانیمان کردووە، بۆیە لێرەدا هەڵدەستین بە پێناسەکردنی چەمکی "جەنگی دەروونی." بەهۆی ئەوەی تا ئەم دواییانە هیچ دامەزراوەیەکی ئەکادیمی هەڵنەساوە بە دانانی پێناسەیەکی ورد و دیاریکراو بۆ ئەم چەمکە، پسپۆرانی بواری جەنگ ئەم ئەرکەیان لەئەستۆ گرتووە. ئەمانیش بەشێوەیەکی

---

[i] Godson, R., & Wirtz, J. J. (٢٠٠٠). Strategic denial and deception. *International Journal of Intelligence and Counterintelligence*, ١٣(٤), ٤٢٤-٤٣٧.

ئەکادیمی ئەم ئەرکەیان ئەنجام نەداوە، بەڵکو زیاتر بیر و هزریان لە پاڵنەر و ئارمانجەکانی ئەوەک خودی هونەرەکە، یان باشتر بڵێین "زانستەکە." سەرەڕای ئەمەش، دەتوانین بڵێین کە جەنگی دەروونی بریتییە لە "هێرشبردن بۆسەر ئەو هۆکارە ناوەکیانەی جووڵە و رەفتاری مرۆڤ دیاری دەکەن بۆئەوەی شکست بە نەیار و دوژمنی لایەنێکی دیاریکراو بهێنرێت."

کە باسی چەمکی "جەنگی دەروونی" دەکەین، زۆرجار لەگەڵ چەند چەمکێکی تردا تێکەڵ دەکرێت وەکو جەنگی سارد (بەتایبەتی ئەوەی لەنێوان ئەمریکا و سۆڤیەت روویدا). جگە لەمەش، زۆر کەس پێی وایە کە ئەم چەمکە هاوواتایە لەگەڵ جەنگی راگەیاندن، بەڵام لە بنچینەدا ئەمانە دوو چەمکی جیاوازن. لەڕاستیدا، ئامانجی ئەم جەنگە بریتییە لە "فریودانی" دوژمن بۆئەوەی وای لێبکات رووەو چەند کاردانەوەیەکی ئاراستەکراو هەنگاو بنێت. لەژێر رۆشنایی ئەم لێکدانەوەیەدا، دەکرێت بڵێین کە جەنگی دەروونی بریتییە لە بەکارهێنانی پروپاگەندە لەلایەن دەوڵەتێکەوە، یاخود گروپێکەوە، کە ئاراستەی نەتەوەیەکی تر، دوژمنێک، دۆستێک یاخود بێلایەنێک دەکرێت، کە ئامانج لێی دانانی کاریگەرییە لەسەر هەست و بۆچوون و رەفتاری ئەو لایەنە دیاریکراوە.

رۆڵی ئەم جەنگە لە بواری سەربازییدا بۆ فریودانی دوژمن هیچی کەمتر نییە لە بوونی چەکی پێشکەوتووی سەردەم لەهەمبەر دوژمن. لەم نێوەندەدا، چەندین سەرکردەی جیهانی بایەخێکی بێ ئەندازەیان بەبەکارهێنانی ئەم هونەرە داوە. لەوانە، دومێل، سەرکردەی ئەڵمانی، ئاماژە بەوە دەدات کە رابەری سەرکەوتوو لە جەنگدا ئەو کەسەیە بەرلەوەی جەستەی دوژمن داگیربکات، دەست بەسەر ئەقڵ و هۆشیدا دەگرێت. جگە لەمەش، دیگۆل، جەنەراڵە بەنێوبانگەکەی فەرەنسی، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەگەر دەوڵەتێک سەرکەوتنی بوێت، بەرلەوەی هێزەکانی بەکاربهێنێت دەبێت هێزی جەنگی دەروونی خۆی بخاتە بواری جێبەجێکردنەوە.

وینستن چێرچل، رابەری بەریتانیا، پێی وای کە جاری وامەیە جەنگی دەروونی دەتوانێت ئاراستەی مێژوو بگۆڕێت.[i]

بەهۆی فراوانی چوارچێوەی جەنگی دەروونی بەمەبەستی فریودانی دوژمن، چەندین ڕێگا هەن بۆ مەیسەرکردنی ستراتیژیەتی ئەم ئامانجە. کوشت و کوشتار، هەروەک لە جەنگی داعشدا بینیمان، بە یەکێک لە سەرەکیترین جۆرەکانی ئەم جەنگە دادەنرێت بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کە کەناڵەکانی راگەیاندن بەشێوەیەکی ئێجگار زۆر بەرفراوانن کە دەتوانرێت لەڕێیانە کردەی "کووشتن" بەمەبەستی فریودانی دوژمن بەگەڕبخرێت. ئەم تەکنیکە دەبێتە هۆی لاوازکردنی دەروونی تاک بەگشتی و سەرباز و جەنگاوەرانی بەرەی جەنگ بەتایبەتی. سروشتی جەنگ و مرۆڤیش وایە کە ورە و رۆحیەتی سەرباز بە هۆکارێکی سەرەکی سەرکەوتنی لە جەنگ دادەنرێت. بە رووخاندنی ئەم ورەیە، ئیتر شکست لە جەنگەکەش مسۆگەر دەبێت.

جگە لە نیشاندانی کوشت و کووشتار، تێکدانی بواری ئابووریش کاریگەرییەکی بەرچاو لەم جەنگەدا دەگێڕێت. بڵاوکردنەوەی دەنگۆی برسییەتی و نەمانی بژێوی ژیان، وا لە کۆمەڵگا و سەرباز دەکات نەتوانن بەدڵێکی پڕلە جۆش و خرۆشەوە شەڕ بکەن لەلایەک. لەلایەکی ترەوە، جەنگی ئابووری بەو واتایەش دێت کە دوژمن نەهێڵێت، یان تۆ ئەم تەکنیکە بەکاربهێنیت، خۆراکی پێویست بگاتە دەستی هاوڵاتیان. ئەمەش، کاریگەرییەکی بێ ئەندازە بەجێ دەهێڵێت لەسەر دەروونی کۆمەڵگای بەئامانجگیراودا. ئابڵوقەی سیاسیش کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر دارمانی ورەی هاوڵاتیان لە پشتیوانیکردنی دەوڵەتەکەیان. ئەمەش لەڕێگای بڵاوکردنەوەی لێدوانی ورووژێنەر لەڕێگای راگەیاندنەوە بەرهەم دێت. پڕوپاگەندەش لەم نێوەندەدا بایەخێکی تایبەتی هەیە کە ئەمەشیان هەر لەڕێگای میدیاوە (بەتایبەتی لەئێستادا بەهۆی بوونی سۆشیال میدیا) ئەنجام دەدرێت. هەواڵی هەڵبەستراویش یەکێکی ترە لە جۆرەکانی جەنگی دەروونی کە وڵاتان بۆ فریودانی کۆمەڵگا بەکاری دەهێنن. هەواڵی هەڵبەستراو

---

[i] Stanford, M. (١٩٧٠). Black Guerrilla Warfare: Strategy and Tactics. *The Black Scholar*, ٢(٣), pp.٣٠-٣٨.

دژی وڵاتێک تەنیا لەڕووی سیاسییەوە ناکرێت، بەڵکو دەکرێت ئاراستەی کەسێک، ڕووداوێک، هزرێک، یان پرۆژەیەک بکرێت. بێگومان، هەموو ئەوانەی باسکران دەکرێت باسێکی سەربەخۆیان بۆ تەرخانبکرێت، بەڵام لێرەدا بواری باسێکی قووڵی ئەم بابەتە نییە. با ئێستا بە شێوەیەکی بەرفراوان لەخوارەوە باسی هەموو ئەو هۆکارانە بکەین کە جەنگی دەروونی لەسەر ڕۆنراوە. جگە لەمەش، کوردستان وەک نموونەیەکی زیندووی ئەم بوارە خراوەتەبەر تەلەسکۆبی لێکۆڵینەوە.

## جەنگی دەروونی و دۆخی ئێستای کوردستان لەم نێوەندەدا[i]

لەدوای ریفراندۆم، جەنگی دەروونی لەسەر کوردستان بە ڕووخسارێکی نوێ دەستی پێ کردووە، قۆناغێکی نوێ دەستی پێ کردووە و دەزگا میدیاییەکانی وڵاتانی دەوروبەر و هەندێک لە دەزگا خۆماڵییەکانیش ڕۆڵێکی ئێکجار گەورە لەم جەنگەدا دەگێڕن؛ تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بوونەتە بەرەی جەنگی سەرەکی و، لە هەمان کاتیشدا بوونەتە ئامرازی سەرەکیی جەنگ. ئەو لایەنانەی ئەم جەنگەیان بەرپا کردووە، مەبەستێکی سەرەکییان هەیە، ئەویش کوشتنی گیانی فیداکاری و بەرگری و ملکەچکردنیانە بەمەرج و داواکارییەکانی دوژمنان. لەدوای ریفراندۆم و بە دیاریکراوی لەڕێکەوتی ٢٩ی ئەیلولی ٢٠١٧دا عەبادی، سەرۆکوەزیرانی ئێراق، داوای کرد لەسەرجەم پێگە ئەلکترۆنییەکان و دەزگە میدیاییەکاندا وێنەی ئەو سوپایە بڵاوبکەنەوە و پشتیوانییان بکەن، کە بۆ داگیرکردنی خاڵە سنوورییەکان دەیاننێرێت، بۆ ئەوەی ترس و تۆقاندن لە دڵی کوردستانییەکاندا دروست بکات. ئەم داواکارییە، داواکارییەکی فەرمی و ئاشکرای سەرۆکوەزیرانی دەوڵەتێکە بۆ ڕاگەیاندنی جەنگی دەروونی دژی کوردستان. لەدوای ئەو ڕاگەیاندنە فەرمییە، زۆر پێویستە بەوردی

---

[i] ئەم بابەتە، بەسوپاسەوە، وەک خۆی لە پێگەی "پێنووس"وەرگیراوە. ناونیشانی بنەڕەتی بابەتەکە بریتییە لە "دەروازەیەک بۆ ناساندنی جەنگی دەروونی" کە لەلایەن (ئەمیرە عەبدوڵڵا جاف)، لێکۆڵەری ڕاگەیاندن/ زانکۆی سەلاحەددین، نووسراوە.

لەسەر جەنگی دەروونی رابوەستین و هەندێک بیرۆکەی پێویست بۆ بەرگریکردن دژی ئەم جەنگە بخەینەڕوو.

## یەکەم: جەنگی دەروونی؛ پێناسە و بنەما

جەنگی دەروونی، جەنگێکی تایبەت و ئاراستەکراوە بۆ کۆنترۆڵکردنی بنیادی دەروونیی تاکەکانی کۆمەڵگە بەپێی ئامراز و بنەما تیۆرییەکانی دەروونناسی، بە مەبەستی تێکدان و ڕووخاندنی هێزی بەرگریی ناوخۆیی و نەهێشتنی یەکانگیریی نیشتمانی. لەسەردەمانی پێشووەوە تاوەکوو ماوەیەکی نزیک، جەنگی دەروونی بەشێک بوو لە جەنگی سەربازی و تایبەت بوو بۆ ڕووخاندنی ورەی سەربازی لە بەرەکانی جەنگدا و، ئاراستەی سەرباز و جەنگاوەرەکان دەکرا بۆ ئەوەی نەتوانن لە بەرەی جەنگدا بەرگری بکەن و لەمێژوودا سەدان ڕێکار و ستراتیژیی جەنگی دەروونی تۆمار کراوە و لە چەندین وێستگەدا ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی لە ڕووبەڕووبوونەوەدا هەبووە. ئێستایش جەنگی دەروونی دژی هێزە سەربازییەکان، ئامرازێکی سەرەکیی جەنگە و لاپەڕەیەکی سەرەکییە لە لاپەڕەکانیدا. بەڵام لەم سەردەمەدا و بەتایبەت دوای ڕووخانی بلۆکی سۆسیالیستی، جەنگی دەروونی، زیاتر ئاراستەی ناو کۆمەڵگە دەکرێت بۆئەوەی لەناواخنی خودی ئەو کۆمەڵگەیەدا تۆی داڕمانی توانای بەرگری دروست ببێت، بەبێ ئەوەی دەستبەرداری بنەما سەربازییە سەرەکییەکەی جەنگی دەروونی ببنەوە. بەمەیش دەردەکەوێت کە جەنگی دەروونی، جەنگێکی مەترسیدارە و ئامانجی سەرەکییشی کوشتنی گیانی پابەندبوونە بە وڵات. دەکرێت بە شێوەیەکی گشتی و بەپێی بنەما زانستییەکان، ئامانجە سەرەکییەکانی جەنگی دەروونی بخرێتەڕوو:

١. لاوازکردنی هێزی بەرگریی میللەت بە ترساندنی لە پرسێکی دیاریکراو.
٢. دروستکردنی بشێوی و تێکدانی ڕەوشی گشتی.
٣. تێکدانی ڕەوشی پەیوەندیی نێوان تاک و دەسەڵاتی سیاسی لەناو ئەو وڵاتە.

٤. بلاوکردنەوەی هەر بیرۆکەیەک و پەنابردن بۆ هەر رستەیەک، یان هەڵوێستێک، کە رێز و باوەڕ لەناو کۆمەڵگەدا بکوژێت، یان لاواز بکات.
٥. دروستکردنی تاکتیکی لایەنگیر و جەنگاوەر لەناو خاکی دوژمندا، کە دژی هەر هەنگاوێک بوەستێت کە میللەتەکەی خۆی، بۆ بەرگریکردن لە هێرشی دوژمنەکانیدا دەینێت.

**دووەم: ئامرازەکانی جەنگی دەروونی**

جەنگی دەروونی بریتییە لە بەکارهێنانی پڕوپاگەندە دژی دوژمن، یان گرووپێکی مرۆیی، هاوکات لەگەڵ بەکارهێنانی کۆمەڵێک رێکاری دیکە (سەربازی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی) بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو پڕوپاگەندەیە. بەمەیش جەنگی دەروونی دەبێتە بەکارهێنانێکی بەپیلان بۆ پڕوپاگەندەیەکی پشتئەستوورکراو بە تۆڕێکی تەواوکار لە رێکاری جۆراوجۆر بە مەبەستی دروستکردنی کاریگەری لەسەر بۆچوون و هەست و هەڵوێست و رەفتاری گرووپێکی مرۆیی (نەیار، یان بێلایەن، یان دۆست)، بۆ ئەوەی ئامانجێکی دیاریکراوی پێ بپێکێندرێت. بەمەیش جەنگی دەروونی بە رەهەندی کات و شوێنەوە نەبەستراوەتەوە و، لە کاتی جەنگ و لە کاتی ئاشتیدا بەکار دێت .

**سێیەم: ئاراستەکانی جەنگی دەروونی**

**ا. جەنگی دەروونیی هێرشبەر**

ئەم جەنگە بۆ بەرپاکردنی هێرش دژی میللەتێک، یان سوپای میللەتێک بەکار دێت، تاوەکوو تواناى بەرگرییان نەمێنێت و لە بەرەکانی جەنگدا بڕووخێن، کە پێش هێرشی سەربازی بەکار دێت و، بەردەوام دەبێت لە کاتی هێرشی سەربازیدا. گرنگترین بنەماکانی بریتین لە:

- چاندنی ترس و دڵەڕاوکێ و داڕمان لە دەروونی ئەو لایەنەی هێرشی لەسەر دەکرێت.
- جەختکردنەوە لەسەر هێز و تواناى بێسنووری هێرشبەران.
- پەرتکردنی یەکانگیریی ناوخۆییی ئەو هێزەی هێرشی دەکرێتە سەر.

- دروستکردنی خەسڵەتی نەرێنی و ئاستنزم بۆ لایەنی بەرامبەر، بۆ ئەوەی سۆزیان بۆ نەچێت.
- دروستکردنی تەڵخی لەسەر ماناکان و گۆڕینی ئاراستەی وتارەکان، تاوەکوو متمانە لەناو هێزی بەرگریکاردا نەمێنێت.
- جەنگی دەروونیی هێرشبەرانە چەندین جۆری هەیە؛ هەموو جۆرە وتارێک لەم جەنگەدا بەکار دێت و هیچ سنوورێکی بۆ درۆ و بوختان و تۆقاندن و هەڵخەڵەتاندن تێدا نییە.

## ب. جەنگی دەروونیی بەرگریکار

ئەم جۆرە لە جەنگی دەروونی، لەسەر بنەمای بەرگریکردن بنیاد نراوە، دژی جەنگی دەروونیی هێرشبەر ڕێک دەخرێت و، دوو بنەمای سەرەکی لەخۆ دەگرێت:

- پووچەڵکردنی جەنگی دەروونیی هێرشبەر، بە وەڵامدانەوە و ئاشکراکردنی ئەو ڕێکارانە.
- چنینی تۆڕێک لە ڕێکاری کاریگەری دەروونی لەسەر هێزی هێرشبەر بۆ ئەوەی ورەی هێرشبردنیان بڕووخێنن.

## چوارەم: ئاستەکانی جەنگی دەروونی

ئاستی بەکارهێنانی سەربازی (جەنگی تەکتیکی) بە مەبەستی بەکارهێنانی هەموو ڕێکارێک، کە کاریگەری لەسەر بنیادی دەروونیی هێزی بەرامبەر دروست بکات، بۆ ئەوەی توانای بەرگریی لە جەنگدا لاواز بکەن. ئاستی ستراتیژی (گشتگیر)، بەکارهێنانی هەموو ڕێکارێکی دەروونییە بۆ ئەوەی باری دەروونیی میللەتێک، بۆ بەرژەوەندیی میللەتێکی دیکە ئاراستە بکەن. لە هەر دوو حاڵەتدا چەندین دامەزراوە و سوپای تایبەت ئەم کارانە ئەنجام دەدەن خەسڵەتە سەرەکییەکانی جەنگی دەروونی ئاستەکانی جۆراوجۆرە:

١. ئاستی تاک، دەستپێکی هەموو هێرشێکە.
٢. ئاستی دەوڵەت.

٣. ئاستی تایبەت بە دامودەزگەیەکی دیاریکراوی دەوڵەت.
٤. ئاستی تایبەت بە دامودەزگە سەربازی و ئەمنی و هەواڵگرییەکان.
٥. ئاستی تایبەت بە گرووپە کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکان.

## پێنجەم: ئامانجە هەنووکەییەکانی جەنگی دەروونی

### ١. ئامانجە سیاسییەکانی جەنگی دەروونی

لە بنەمادا جەنگ ئامرازێکی سیاسییە، بۆ مەبەستێکی سیاسی و بە بڕیارێکی سیاسی ئەنجام دەدرێت و جەنگی دەروونی، وەکوو بەشێک، یان لاپەڕەیەک لە لاپەڕەکانی جەنگ، ئامانجی سیاسی هەیە و مەبەستی سیاسیی لەپشتەوەیە، گرنگترینیان:

- تێکشکانی یەکدەنگیی ناو میللەت.
- دروستکردنی گومان لەناو دەستەبژێری سیاسیدا.
- تێکدانی ڕەوشی ژیانی سیاسیی ناوخۆ.
- تێکچوونی پەیوەندیی نێوان سیاسەتمەدارە ناوچەییەکان و سیاسەتمەدارە نیشتمانییەکان.
- دروستکردنی چینێکی سیاسیی بەکرێگیراو، کە دەبنە لایەنگری دوژمن و، دواتر ئاسانکاریی دەروونی بۆ داگیرکەران دەکەن.

### ١. ئامانجە ئابوورییەکانی جەنگی دەروونی

دروستکردنی گرانی و قاتی لەناو بازاڕەکاندا و سەرهەڵدانی مۆنۆپۆڵ و دڵەڕاوکێ و دارمانی دراو و نەمانی متمانە بە ئابووری و سەرهەڵدانی بێکاری و وەستاندنی پرۆژەکان و ڕاگرتنی سەرمایە و داخستنی کارگەکان؛ ئەمانە هەموویان ئامانجی ئابووریی جەنگی دەروونین، کە لە ئەنجامدا کاریگەری دەکەنە سەر دۆخی سیاسی و سەربازیش.

## شەشەم: مەبەستە سەرەکییەکانی جەنگی دەروونی

١. کاریگەری لەسەر بیروهۆشی لایەنی بەرامبەر.

٢. تێکشکاندنی گیانی بەرگری لەناو میللەتدا بەگشتی و لەناو سوپادا بەتایبەتی.
٣. دروستکردنی کاریگەریی نەرێنی لەسەر ڕەفتار و ئاراستەی تێگەیشتنی دەمەزراوەی سەربازی بە نەهێشتنی متمانە لە نێوان ئەفسەرەکانیاندا.
٤. دروستکردنی کێشە و کێشمەکێشی کۆمەڵایەتی و مەزهەبی و ئایینی.

## حەوتەم: ڕاگەیاندن؛ چەکی سەرەکیی جەنگی دەروونی

بەکارهێنانی جەنگی دەروونی و بەڕێوەبردنی، توانایەکی زۆری دەوێت، بەتایبەت لە بواری پڕوپاگەندە و نەخشاندنی سیاسەتی پاڵپشت بۆ بەهێزکردنی وێنای پڕوپاگەندەکان. ئامرازی سەرەکیی جەنگی دەروونی، ڕاگەیاندنەکانە، وەکوو: تەلەفزیۆن، ڕادیۆ، فیلم، ڕۆژنامە و ئینتەرنێت. جگە لەوەیش، چەندین کەسی نهێنی بۆ ئەوەی لەناو بنیادی کۆمەڵایەتیی پڕوپاگەندەکاندا بڵاوی بکەنەوە و، زەمینە خۆش بکەن تا خەڵک بڕوای پێ بکەن.

### ١. ڕۆڵی ڕاگەیاندنی بیستراو لە جەنگی دەروونیدا

ڕاگەیاندنی بیستراو ڕۆڵێکی ئێکجار زۆر بەهێزی لە جەنگی دەروونیدا هەیە و، بە هۆی کاریگەریی وشەی گوتراو لەسەر گوێگر، ئێکجار گرنگ دەبێت، بەتایبەت لە کاتی جەنگدا و لە کاتی نائاساییدا، کە تێیدا ڕاگەیاندنی بیستراو دەبێتە تاکە ئامرازی میدیایی، کە توانای هەیە بە ئاسانترین شێواز پەخش بکات و تاکەکان بەکاری بهێنن.

### ١. ڕۆڵی ڕاگەیاندنی بینراو لە جەنگی دەروونیدا

ڕاگەیاندنی بینراو بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیی گەیاندنەوە، بووەتە ئامرازێکی ئێکجار هەستیار و کاریگەری جەنگی دەروونی؛ بەڵکو بووەتە ئامرازێکی سەرەکی بەڕێوەبەرانی جەنگی دەروونی و، پسپۆڕانی بواری جەنگی دەروونی، سەرجەم تواناکانی ڕاگەیاندنی بینراو بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی پەیامەکانی جەنگی دەروونی بە کاریگەرییەکی ئێکجار زۆرەوە ئاراستە بکەن و سەدان وێستگەی تەلەفزیۆنی بە چەندین شێواز بەرنامەکانیان پەخش دەکەن و، توانایان هەیە گەورەترین و کاریگەرترین جەنگی دەروونی ئەنجام بدەن. دەرهێنانی فیلم و دراما و بەرنامەی

جۆراوجۆر و دەرهێنانی گۆرانی و سروودی جۆراوجۆر، پەخشی راستەوخۆ و رووماڵکردن و...، هەموویان وەکوو ئامرازی کاریگەر لە جەنگی دەروونیدا بەکار دەهێنرێن.

۱. رۆڵی رۆژنامە لە جەنگی دەروونیدا

رۆژنامە لە رێگەی وێنا نووسراوەکانی بابەت و راپۆرتەکانی و بڵاوکردنەوەی وێنە و دانانی کاریکاتێر و چەندین ئامرازی دیکەوە، توانایەکی زۆری لە بەڕێوبردنی جەنگی دەروونیدا هەیە. کاریگەریی رۆژنامەیش بەهێزتر دەبێت، کاتێک نووسەری بەتوانا تێیدا کار دەکەن.

۱. رۆڵی سۆشیال میدیا لە جەنگی دەروونیدا

جەنگی دەروونی لەسەر تۆڕەکانی سۆشیال میدیا زۆر بەتوندی و بە جۆراوجۆری و، بە چەندین میتۆد و پاڵنەر و چەندین دەزگەی میدیایی و هەزاران بەشدار و هەواڵی جۆراوجۆری دانراو و ئامادەکراو بۆ مەبەستی جەنگی دەروونی ئەنجام دەدرێت.

۱. رۆڵی تۆڕە کۆمەڵایەتییە ئەلکترۆنییەکان لە جەنگی دەروونیدا

هەزاران کەس راستەوخۆ بەشداری لەناو ئەو تۆڕە ئاڵۆزانەدا دەکەن و سەدان هەزار کەس رووبەڕووی کاریگەرییە راستەوخۆکانی دەبنەوە .لە سەردەمێکدا دەژین، پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی ئەلکترۆنی بووەتە بەشێکی دانەبڕاوی ژیانی رۆژانەمان. پێشکەوتنی تەکنەلۆژیی پەیوەندی، راستەوخۆ تاکی ئاسایی، بەستووەتەوە بە ئاڵۆزترین تۆڕی ئەلکترۆنی و سەرچاوەکانی زانیاریی کەسی و ناراستەکانی، کاریگەریی ئێکجار زۆری کردووەتەوە سەر تاکەکان و راستەوخۆ ڕووبەڕووی ئاڵۆزیی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و ئابووری و... ی تۆڕی ئینتەرنێت دەبنەوە لە کات و ساتێکی تایبەتدا کە تێیدا بەتەنها دەبێت. کەس نییە لەگەڵیدا یارمەتیی بدات بە بۆچوونێک، یان بە شرۆڤەیەک، یان بە بەرچاوڕوونییەک، یان بە وەبیرهێنانەوەیەک، تەنیا دیواری بەرگریی تاک لەناو ئاسۆی گریمانەییی ئینتەرنێتدا ویژدانی خۆیەتی و قەناعەتی خۆیەتی. ئەم دوو بەرگرییەیش، رەنگە بکەونە ژێر کاریگەریی پەیامە جۆراوجۆرەکان و گۆڕانکاری لەسەریدا دروست ببێت. هەر بۆیە

ئینتەرنێت و بەتایبەت تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، کە تاکەکان خۆیان لەناویدا بەشدارن، بووەتە یەکێک لە گرنگترین و کاریگەرترین ئامرازەکانی جەنگی دەروونی، کە لەم سەردەمەدا بە زۆری لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە ئەنجام دەدرێت؛ چونکە زۆر بەئاسانی بڵاودەکرێتەوە و، هەموو لایەنەکان درک بە کاریگەریی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن، بەتایبەت لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا. ئەم کاریگەرییەیش ڕەنگە نەرێنی بێت و زیانی ئێکجار زۆر بە کۆمەڵگە بگەیەنێت و یارمەتیدەر بێت بۆ بڵاوبوونەوەی چەندین خراپەکاری؛ هەر بۆیە هێرشبەرەکان، وەکوو بەرەیەکی کراوە دەیبینن بۆ ئەنجامدانی جەنگی دەروونی.

بەهۆی سروشتی بەکارهێنان و کارکردنی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بوونەتە گەورەترین پێگەی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و دروستکردنی هەواڵی درۆیینە بە خێراترین کات. لاوازیی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و ئاستی نزمی ڕۆشنبیریی تاک و لاگرەیی بنیادی ئەخلاقی، وەها دەکات سەرنج و سۆز بۆ هەواڵی سەرزارەکی و بێبنەما لای ئەو ببێتە تێگەیشتن و، بە هۆی دووبارەکردنەوەی بەبەردەوامی و لەسەر زاری کەسانی جۆراوجۆر لای ئەو، دەبێتە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر و زۆر توندڕەو دەبێت بۆ پشتیوانیکردنی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا، تاک ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئەو جەنگە دەبێتەوە و لەگەڵیدا کاریگەری دروست دەکات، پێش ئەوەی بتوانێت لە لایەکی دیکەوە شتێکی دیکە ببیستێت.

**هەشتەم: هۆکاری بەرفراوانبوونی ڕۆڵی پێگەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە جەنگی دەروونیدا**

لەم سەردەمەدا زۆر کەس دەرفەتی بۆ نووسین و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و بیروبۆچوون و ڕاپۆرت و... هەیە و، زۆریش توانای هەیە وێنای مەبەستدار بڵاوبکاتەوە و یاری بە ڕاستییەکان بکات، یان گومان لەسەریان دروست بکات، بۆ هەر مەبەستێک بێت. ئەگەر جاران سیخوڕەکان ئەرکی بڵاوکردنەوەی پڕۆپاگەندەیان زۆر بەسەختی ئەنجام دەدا و مەترسییەکی زۆری لەسەر ژیانیان دروست دەکرد، ئێستا لە پشتی کیبۆردەکانەوە، دەتوانن ئەو کارە بە کاریگەرییەکی زۆرتر و مەترسییەکی کەمترەوە

ئەنجام بدەن. هەربۆیە زۆرێک تواناکانی خۆیان بۆ مەبەستی ماددی، یان بۆ هەر مەبەستێکی دیکە بێت دەخەنە خزمەتی بەڕێوبردنی جەنگی دەروونییەوە. زانایان جەخت دەکەنەوە لەسەر ئەوەی کە ئەم جەنگە بە چەند جۆرێک لە کەسایەتییە سایکۆپاتییەکان ئەنجام دەدرێت؛ ئەو کەسایەتییانە کە کێشەیەکی پڕقینیان لەگەڵ وڵاتانی خۆیان هەیە، بۆیە ئامادەن وتاری جەنگی دەروونی وەربگرن و قبووڵی بکەن و دواتر دژی هاووڵاتییانی خۆیان بەکاری بهێنن. لە هەر وڵاتێکیش کەسانی دووڕوو و خراپکار و ئاستنزم لە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی بەهێز بن، ئەوە کاریگەریی جەنگی دەروونی و پاشکەوتەیی بۆ دوژمنەکانیان ئێکجار زۆر دەبێت، بەمەیش وەکو بەکرێگیراو خۆیان دەخەنە خزمەتی دوژمنەکانیان. بۆیە، لەناوەندی ئەوانەی دەبنە بەشێک لە جەنگی دەروونی، چەندین کەسایەتیی جۆراوجۆر لە چینی کۆمەڵایەتیی جیاجیا و بۆچوونی سیاسیی جیاواز بەدی دەکرێت، کە خاڵی هاوبەشیان دەگەڕێتەوە بۆ هاوبەشیی دۆخی سایکۆپاتییان، کە پاڵنەری سەرەکیی بەشداربوونیانە لەم جەنگەدا.

بەهۆی خەسڵەتی متمانە بە هاوڕێیەتیی لەلایەن تاکەکانەوە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەبنە سەکۆیەکی پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لەنێوان تۆڕی هاوڕێیەتیدا و، ڕاستەوخۆ پڕوپاگەندەکانی جەنگی دەروونی تیایدا بڵاودەبێتەوە وکاریگەریی زۆریش دەکات. بە خوێندنەوەی ئەو هەواڵانە و کۆمێنتکردن و هاوبەشیکردنی، ماوەی مانەوەی ئەو هەواڵە و سنووری بڵاوبوونەوەی ئێکجار زۆر دەبێت و، لەبەر ئەوەی حکوومەتەکان خۆیان جەنگی دەروونی هەڵدەگیرسێنن، دەبینرێت ڕێکاری پراکتیکی و پشتیوان بۆ پڕوپاگەندەکان لەسەر ئەرزی واقع جێبەجێ دەکرێت بۆ ئەوەی پڕوپاگەندەکان بەهێز بکات.

لەسەرئەنجامدا، جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەین کە بەپێی خاڵەکانی سەرەوە، کوردستان ڕووبەڕووی جەنگی دەروونیی ستراتیژی (گشتگیر) دەبێتەوە. سروشتی ئەم جەنگە، هێرشبەرانەیە و ئاستەکانی جۆراوجۆرە، سەرجەم ئامرازەکانی جەنگی تێدا بەکاردێت و سەرجەم دامودەزگە فەرمی و نیمچەفەرمییەکان تێیدا بەشداری

دەکەن. دامودەزگەکانی راگەیاندن و میدیاکاران، بوونەتە ئامرازێکی زۆر گرنگ لەم جەنگەدا. هەندێ دامودەزگەی میدیایی و هەندێ میدیاکار، بە پاڵنەری بزنسەوە بەشداری لەم جەنگەدا دەکەن؛ بەتایبەت ڕۆژاواییەکان کاریگەریی سیاسی و ئابووری، ئامانجی هەنووکەییانە بۆ ئەوەی بتوانن گیانی تەبایی و بەرگری لەناو کوردستان بڕووخێنن. ترسناکترین لایەنەکانی ئەم جەنگە، لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەنجام دەدرێت. بۆ ئەم مەبەستەیش هەموو تیۆرە سایکۆلۆژییەکان بەکار دەهێنرێن و دەیان هەزار کەس بەئاگابوون، یان بەبێ ئاگابوون، بوونەتە سەربازی ئەم جەنگە. زۆر گرنگە بە بەکارهێنانی شێوازی هێرشبردنی پێچەوانە، بەرپەرچی ئەم جەنگ دەروونییە بدرێتەوە، کە بۆ مەبەستی بەرگری، دامودەزگەکانی راگەیاندنی کوردستان ئەم جەنگە بەڕێوە ببەن.

## مکولترا[i] و ئامیلکەی جادوویی ونبوو

لەساڵی ٢٠٠٧، کۆمەڵێک نووسەر چەند بەڵگەنامەیەکی کۆنی ونبوویان دۆزیەوە، سەردەمانێک بە نهێنی هەرەباڵا لەقەڵەم دەدرا، کە چەندین وردەکاری دەربارەی پەیوەندی سی ئای ئەی بە جیهانی جادوویی بەرلە چەندین دەیە ئاشکراکرد. بەڵگەنامەکان، وەک بەشێک لە پرۆژەی مکولترا، ڕۆشناییان دەخستەسەر چەندین تۆپەراسیۆنی شاراوە و سەرنجڕاکێش- وەک دامەزراندنی جۆن مولهۆلاند وەک یەکەم جادووگەری دەزگای هەواڵگری سی ئای ئەی. جۆن مولهۆلاند نووسەری دوو ئامیلکەی گرنگ بوو بۆ فێرکردنی ئەفسەرانی سی ئای ئەی کە چۆن بتوانن لێکۆڵینەوە لەسەر پێکهاتەکانی کارزانیی جادووگەرەکان بکەن بۆ ئۆپەراسیۆنی نهێنیی. بەهۆی ئەو ئاستە باڵا نهێنییەی پرۆژەی مکولترا هەیبوو، ئامیلکەکان زۆر بە نهێنی دادەنران و دەبوایە هەروا بەئاسانی نەکەونە ژێر دەستی هەموو کەسێک وە دەڵێن هەموو نوسخەکانی لەساڵی ١٩٧٣دا لەنێوبردراون. نزیکەی پەنجا ساڵ دوای نووسینیان، هێشتا دەنگۆی بوونی کۆپی بەڵگەنامەکانی فایلی "جادوویی" لەنێو مەمەڕی

[i] MK Ultra

لانگلیدا (باڵەخانەی سی ئای ئەی) هەر دێت و دەچێت، بەڵام چەندین ئەفسەری هەواڵگری پێیان وابوو ئەم فایلانە تەنیا ئەفسانەیەک بووە. بۆ تێگەیشتن لە یەکەمین جادووگەری سی ئای ئەی، و چۆن ئەو نامیلکە جوانەی هێنایە وجوود، پێویستە باسی یەکێک لە ترسناکترین ماوەکانی مێژووی ئەمریکا بکەین.

بەدامەزراندنی لە حەزیرانی ١٩٤٧، سی ئای ئەی دوو ئەرکی گرنگی پێسپێردرا – ڕێگاگرتن لە هێرشی کتوپڕ لەدژی ئەمریکا و بەگژداچوونەوەی پێشڕەوییەکانی کۆمۆنیزمی سۆڤیەت بۆناو ئەوروپا و میللەتانی جیهانی سێیەم. ئەفسەرانی دەزگاکە، دەزگای سی ئای ئەی، لەبەری پێشەوە جەنگی ساردد دەبن بۆماوەی چوار دەیەی پڕ لە جەور و توونڕ، پڕ لە گێژاوی چەکی ناووکی، ئایدۆلۆژیەتی تێکهەڵچوو، و حکومەتێکی سۆڤیەتی پڕلە نهێنیگەرا. لەنێوخۆدا، دەزگا ئەمنی و هەواڵگرییەکانی سۆڤیەت، (KGB) و ئەوانەی بەرلەوکاتە هەبوون، دانیشتوانی وڵاتەکەیان بە بیری کۆمۆنیستی گۆش دەکرد، و لەدەرەوەشدا هەوڵیاندەدا ئەو حکومەتە بیانییانە لاواز بکەن کە هاودید بوون لەگەڵ خۆرئاوا.

تاقیکردنەوە سەرکەوتووەکەی سۆڤیەت لە بواری چەکی ناووکی لەساڵی ١٩٤٩ ئەمریکای تووشی سەرسوڕمانی کرد و ناچار بوو دوو هێزی ناووکی دروست بکات کە ڕکەبەری بکات لە فەزای نێودەوڵەتی پڕلە ترس و نادڵنیایی. سەرۆک ئایزنهاوەر لەساڵی ١٩٥٤ زانیاریگەلی زۆر نهێنی پێگەیشت لە کۆمسیۆنێکەوە کە لەلایەن جەنەراڵ جەیمس دوولیتل سەرپەرشتی دەکرا کە بڕوای وابوو، "ئەگەر ئەمریکا بیەوێت لەم نێوەندەدا بمێنێتەوە، دەبێت بیر لە ڕێکار و فرتوفێڵی لێزانانەتر بکاتەوە. ئێمە دەبێت فێرببین بە چ شێوەیەک هەژموونی سیستەمی حوکمداری وڵاتانی نەیار بڕوخێنین و نەیارانمان بە شێوازگەلی زیرەکانەتر و کاریگەرتر تێکبشکێنین بە بەراورد لەگەڵ ئەو میتۆدانەی دوژمن لە هەمبەر ئێمەدا بەکاری دەهێنێت. وە دەکرێت پێویست بێت کە خەڵکی ئەمریکا لەگەڵ ئەم میتۆدەدا ئاشنا بن، تێبگەن یان پشتیوانی ئەم فەلسەفە نوێیە بکەن."

راپۆرتەکە هەرەشەیەکی پشتڕاستکردەوە بۆ دیموکراسیەتی ڕۆژئاوایی لەلایەن سۆڤیەتەوە و داوای کرد هەموو ئامرازە هەواڵگرییەکانی بەکاربهێنێت بۆ پاراستنی ئەمریکییەکان، بەشێوازێک کە وەک هیچ کردەوەیەکی هەواڵگریی نەبێت کە لەڕابردوودا لەکاتی ئاشتیدا ئەنجام دراوە. لەئەنجامدا، ڕۆڵی چالاکی پەنهانی سی ئای ئەی لە ئەورووپاوە درێژبووەوە بۆناو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەفریقیا، ئەمریکای لاتین، و ڕۆژهەڵاتی دوور. وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، هێنری کسینجەر، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە لەماوەی دەیەی ساڵانی پەنجاکان تەنیا ئەمریکا لەنێوان شوعیەتی سۆڤیەتی و ئازادی جیهاندا وەستاوەتەوە.

سی ئای ئەی لەوەتەی دروستبوونیەوە خەریکی ئەنجامدانی بەرنامەی کردەی نهێنیی بووە وە لەساڵی ١٩٥١ هەڵسا بە دروستکردنی بەشێکی تایبەت بەناوی ستافی دەزگای تەکنیکی (TSS) بەمەبەستی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی ئەمریکی لە پشتیوانیکردنی ئۆپەراسیۆنە سیخوڕیەکاندا. یەکێک لە کارمەندە هەرە سەرەتاییەکانی دکتۆر سیدنی گوتلیب بوو، کە بڕوانامەی لە پەیمانگای کالیفۆرنیای تەکنەلۆژی لە بەشی کیمیا بەدەست هێنابوو. سەرەتا، ئەو بەشەی ناوبراوی تیادابوو چەند فۆرمولایەکی دروست کرد و دواتر تاقی کردنەوە بەمەبەستی نووسینی نهێنی کە بەهۆیەوە سیخوڕەکانی سی ئای ئەی توانیان پەیامی نادیاری پێ بنووسن. بۆ شاردنەوەی مەرەکەبی سەر کاغەز، دەزگاکە دووبارە شلەکەی فۆرموله کردەوە بۆسەر فۆرمێکی ڕەق کە وەک حەبی ئەسپیرین وابوو وە دووبارە حەبەکانی خستەنێو قوتووی خۆیەوە کە کەس پێی نەدەزانی. کاتێک سیخوڕێک زانیارییەکی هەبوایە کە بیگەیەنێتە سەرووی خۆی، حەبەکەی لەناو ئاودا یان کحولدا شیدەکردەوە بۆئەوەی دووبارە مەرەکەبی لێدروستبکاتەوە بۆ نووسینی نامەی نهێنییەکەی.

دەزگاکە پشتیوانی چەندین چالاکی تریشی دەکرد: ساختەکردنی بەڵگەنامەی گەشت و ناسنامە بۆ هەواڵدۆزەکان کە لەژێر ناوی نهێنی کاریان دەکرد، چاپکردنی نامیلکەی بانگەشە و پروپاگەندە، دانانی مایکرۆفۆنی نهێنی و کامێرا، و دروستکردنی شوێنی شاردنەوەی کەلوپەلی سیخوڕی وەک، جانتا و مۆبیلیات و پۆشاک. واپێدەچوو کە

ئەم کارانە لەپیشەی سیخوڕیدا جێی خۆیان دەگرن. دەزگاکە سەرکەوتنێکی یەجگار مەزنی بەدەستهێنا لەڕووی بەکارهێنانی زانا و ئەندازیارەکانی بۆ ئەنجامدانی کاری نهێنیی مەحاڵ. لەڕاستیدا، ئەم ژمارە کەمەی زانایان لە دەزگای سی ئای ئەی بووە هۆی ئەوەی ئارسەر کلارک چەندین شتی تر بدۆزێتەوە. ناوبراو لە یەکێک لە گێڕانەوەکانیدا دەڵێت، "هەر تەکنەلۆژیایەکی پێشکەوتوو لە جادوو جیاناکرێتەوە و دەکەونە نێو یەک فۆرمەوە."

دکتۆر سیدنی گوتلیب، بەرپرسی بەشی دەزگای تەکنەلۆژی سی ئای ئەی لەساڵی ١٩٦٦-١٩٧٣.

دکتۆر گوتلیب و کیمیاگەرەکانی لەماوەی ساڵی ١٩٥٣دا پەرەیان بە توێژینەوەکەیاندا بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەیەکی چاوەڕواننەکراوی تری سۆڤیەت. جەنگی سێ ساڵەی کۆریا بووە هۆی ئەوەی کۆریای باکوور، چین و یەکێتی سۆڤیەت ببن بە پێشڕەوی "کۆنترۆڵکردنی مێشک." ئەم جۆرە توانا هزرییە دەکرێت ببێتە هەڕەشە بۆسەر مێشکی سەرباز، و تەنانەت تەواوی دانیشتوان، ئەمەش زیاتر کاریگەریی و پروپاگەندەی شوعیەتی بەرەو پێشەوە دەبرد. چەند راپۆرتێک گەیشتنە دەستی سی ئای ئەی لەبارەی سەرکەوتنە نهێنییەکانی سۆڤیەت لە کۆنترۆڵکردنی مێشک و

دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی کیمیایی لە مێشک شووشتنەوە، تەجنید، و کارپێکردنی هەواڵدۆزەکانی بەهاوکاری چەند دەرمانێکی تایبەت.

کۆنترۆڵی مێشک پێدەچوو رێگا بە کۆمۆنیستەکان دابێت، بەبەکارهێنانی تێکەڵەی تەکنیکی سایکۆلۆژیی و پێکهاتەی دەواسازیی، بۆئەوەی لە دوورەوە بتوانن مێشکی کەسێکی دیاریکراو بە ویستی خۆی کۆنترۆڵ بکەن. سەرەرای توێژینەوەی سنووردار لەمەڕ هەمان بابەت لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم و سەرەتای سالانی پەنجاکان، هۆکارەکانی سەرکەوتنی زانستی سۆڤیەت هەر بە نادیاری مانەوە. ئەمریکا پێوستی بەوە بوو لە بنچینەی زانستی کۆنترۆڵکردنی مێشک و بەکارهێنانی دەرمانی کیمیایی تێبگات.

لەمانگی ئازاری ١٩٥٣دا، ئالێن دولێس، بەرێوەبەری هەواڵگری نهێنیی، متمانەی بە سیدنی گوتلیبی تەمەن سی و چوار ساڵ کرد بە یەکێک لە نهێنیترین و هەستیارترین نهێنی بەرنامەی جەنگی سارد، بۆ دامەزراندنی بەشێکی تایبەت کە پێی دەوترا مکولترا.[i] دولێس رێگای بە ستافی دەزگای تەکنیکی (TSS) و ستافی کیمیایی دکتۆر گوتلیبدا بۆئەوەی دەست بکەن بەکارکردن لەسەر چەندین پرۆژە بە مەبەستی "توێژینەوە و پێشخستنی کیمیایی، بایۆلۆژی، ماددەی رادیۆلۆژی (زانستی تیشک) بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی نهێنی کۆنترۆڵکردنی رەفتارەکانی مرۆڤ."

---

[i] MK Ultra

Boston

DRAFT- A
9 June 1953

MEMORANDUM FOR THE RECORD

SUBJECT: Project MKULTRA, Subproject 8

1. Subproject 8 is being set up as a means to continue the present work in the general field of L.S.D. at [redacted] B until 11 September 1954.

2. This project will include a continuation of a study of the biochemical, neurophysiological, sociological, and clinical psychiatric aspects of L.S.D., and also a study of L.S.D. antagonists and drugs related to L.S.D., such as L.A.E. A detailed proposal is attached. The principle investigators will continue to be [redacted] C [redacted] all of [redacted] B

3. The estimated budget of the project at [redacted] B is $39,500.00. The [redacted] will serve as a cut-out and cover for this project and will furnish the above funds to the [redacted] as a philanthropic grant for medical research. A service charge of $790.00 (2% of the estimated budget) is to be paid to the [redacted] for this service. B

4. Thus the total charges for this project will not exceed $40,290.00 for a period ending September 11, 1954.

5. [redacted] (Director of the hospital) are cleared through TOP SECRET and are aware of the true purpose of the project. C

for [redacted] A
Chemical Division/TSS

APPROVED:

Chief, Chemical Division/TSS

PROGRAM

بەڵگەنامەی دەربڕینی ڕەزامەندی لەسەر پرۆژەی مکولترا لەلایەن دەزگای هەواڵگری ناوەندیی

لەکۆتاییدا، مکولترا نزیکەی ١٤٩ پرۆژەی بچوک بچوکی دەست پێکرد. ئەم کارەی بۆماوەی بیست ساڵ بە یەکێک لە نهێنیترین بەرنامەکانی مایەوە. مەبەست لە پرۆژەکانی بریتیی بوو لە تێگەیشتن لەوەی چۆن دەرمان و کحول دەتوانن رەفتارەکانی مرۆڤ بگۆرن و ئەو کەسانە بپارێزن کە سوودیان بۆ ئەمریکا هەیە لەو هەرەشە سۆڤێتییە سایکۆلۆژییەی یان تێکەڵەی کیمیایی و سایکۆلۆژیی کە دەکرایە سەریان. لێکۆڵینەوەکە پێکهاتبوو لە بەدەستهێنانی دەرمانی نهێنی، تاقیکردنەوەی تاقیگەیی نهێنی لەسەر مرۆڤەکان، تەنانەت هەندێکیان پێیان نەوترا کە دوای تاقیکردنەوەکە چیان بەسەر دێت، وە پێدانی چەندین گرێبەستی حکومی بە نەخۆشخانە و کۆمپانیا و کەسایەتی تایبەتی. زانایانی ئەو بوارە هەڵسان بە لێکۆڵینەوە لە بابەتگەلێک لە تێکەڵکردنی ئاوگی وتنی راستی تا دەگاتە پەرەپێدانی رێگایەکی مرۆڤانە بۆ لاوازکردنی هەستی بۆنکردنی سەگی پاسەوان بەبەکارهێنانی ئارامکەرەوەیەکی بەهێز لەگەڵ پارچە گۆشتێک. چەندین پرۆژە بۆئەوە تەرخانکران کە چۆن بتوانرێت لەرێگای دەرمانەوە مێشکی مرۆڤەکان بگۆردرێت و دەرمانی (LSD) و حەشیش دروست بکەن. لەکۆتاییدا، لێکۆڵینەوەکە گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە چەندین ماددەی ژەهراوی، و کوشتن و لاوازکردنی هەستی بۆنکردنی بەرهەمهێنا.

106 1

PROPOSAL

It is proposed to continue research on problems critical to a clarification of the fundamental aspects of the stimulus-response relationship in biological systems. Studies will be conducted utilizing chronic animal preparations with permanent septal electrodes. Investigations will be conducted utilizing chronic electrode preparations coupled with selected classical types of conditioning. Studies will be conducted on the geography of the brain in selected species of animals to determine the locus in which stimulations will produce specific reactions.

A careful literature survey, especially of the Russian literature, of foreign research in this area will be conducted.

DEC 84

RELEASED

بەڵگەنامەی دزەپێکراوی پێشنیاری دروستکردنی پرۆژەی مکولترا

حەبی ئارامکەرەوەی بێ ئازار، کە تێکەڵ دەکرا لەگەڵ پارچە گۆشتێک بۆ سەگەکان. بۆدوورکەوتنەوە لە گومانبردن، ئەو دەرمانەی پێی دەدرا ماوەکەی کاتی بوو، هەرکات چالاکییەکەی کۆتایی دەهات سەگەکە دەهاتەوە باری ئاسایی جارانی.

سەرەڕای ئەمەش، نەبوونی داتای زانستی لەسەرەتای ساڵانی پەنجاکان دەربارەی ئاستەکانی خواردنی ئەو دەرمانە نوێیانە کێشەکەی بەرچاوی بۆ توێژەرانی پرۆژەی مکولترا دروست کرد. لەئەنجامدا، گوتلیب و ئەندامانی تیمەکەی تاقیکردنەوەیەکیان لەسەر خۆیان ئەنجامدا کە پێکهاتبوو لە خواردنی دەرمانەکان و چاودێریکردن و تۆمارکردنی کاردانەوەکانی خودی خۆیان. لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٣، تاقیکردنەوە لەسەر دەرمانی (LSD) دەرئەنجامێکی کارەساتباری لێکەوتووە و چەندین زانای حکومەت بوونە قوربانی. پرۆژەکە لەماوەی کارکردنی خۆیدا دەستی بۆ دروستکردنی چەندین ماددەی برد، کە ئەمانەی خوارەوە بەشێک لەو ماددانەی بەمەبەستی ڕێگرتن لە پێشرەوییەکانی سۆڤیەت پەرەیان پێدرا:

دەمانچەی دووربین، قاوغی هەویری ددان بۆ بەکارهێنانی وەک دەمانچەی یەک گولە، و بەکارهێنانی پێڵاوی ژەهراوی و دەرمانی ئەسپیرین و جگەرەی ژەهراوی و بکوژ بۆ غافڵکوژی فیدل کاسترۆی سەرۆکی کوبا).

## پاراسایکۆلۆژی و سیخوڕی

دەروون باڵایی (پاراسایکۆلۆژیی) مانای بەکارهێنانی توانای سەرووی ئاسایی مێشکە کە کارتێکردنی مێشکە لەسەر دەوروبەر بەگشتی و هەستپێکردنی هەستەکانی ناوەوەی مێشکە بە دەوروبەر. ئێمەی مرۆڤ توانای دەروون باڵایی یان ڕەوانباڵاییمان هەیە. واتە، توانای سەرووی ئاسایی مێشک کە ئەم توانایە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، بەڵام بە ڕاهێنان دەتوانرێت گەشەی پێبدرێت و شێوازی بەکارهێنانی بدۆزرێتەوە و پێی ئاشنابێت و لە مێشکتدا بەکاری بهێنیت. ئەلبەتە توانای سەرووی ئاسایی بەتایبەتی هەستکردن و پێشبینی لە گیاندارانداا هەیە. باڵندە و گیانەوەر توانای هەستکردن و پێشبینیان لە مرۆڤ پترە. مێشکی مرۆڤ ئەو بیرکردنەوەی کە تێیدا هەیە ڕای بگرێ و بیهێنێ و بیبات لە قووڵایی مێشکیدا بە ویست و ئارەزووەوە

ئەوا لە دەرەوەی مێشکیدا لە دەوروبەردا دەبێت بە کردەوە یان لە هۆشی ئاگاییدا بیردەکاتەوە بەشتێک ناگات بەڵام لە نەستیدا ویست و ئارەزووی دەبێتە کردەوە لە دەرەوەی مێشکدا. ئەمە لەکاتێکدا کە هەست و نەست جیابن لە یەکتری بەڵام ئەگەر هەردووکیان تێکەڵ بەیەکتری بوون و مرۆڤەکە لە ناخ و مێشکیدا ژیا، ئەوا هەست و نەست تێکەڵ دەبن و لەماوەیەکی کەمدا بە ویست و حەزەوە دەبێت بە کردەوە کە بەشێوەی هزرە. یان، بە بارێکی تردا، نەست زاڵترە بەسەر هەستدا و مرۆڤەکە لەناخی خۆیدا، واتە لە مێشکی خۆیدا، دەژیت بەڵام ئەو کەسانەی هەستیان، واتە هۆشی ئاگاییان، پتر بەکاردەهێنن ئەوان نەستیان کەمتر بەکاردەهێنن لە توانای سەرووی ئاساییدا. دەربارەی سیخوڕی، مانای ئەوەیە کە دەزگای هەواڵگری وڵاتێک یان پارت و رێکخراوێک بە کەسەکانی زانیاری کۆدەکاتەوە و بڵاودەکاتەوە بەسەر دۆست و دوژمنەوە (بڵاوکردنەوەی بەسەر دوژمندا، مەبەست لێی "فریودانە").

دەزگای هەواڵگری پێویستی بە زانیاری دروستە کە کۆیبکاتەوە و بەدەستی بگات، بۆ ئەمەش کەسانی لێهاتوو و زیرەک و ئامێرکاریزانی سیخوڕی پێویستە، و کەسانێک پێویستن کە توانانی تێگەیشتن و هەستکردنیان پتر بێت یان توانای کارتێکردنیان لەسەر خەڵکی تر هەبێت بەشێوەی ئاسایی و سەروویی ئاسایی. توانای چالاکی تێگەیشتنی بە بەراورد لەگەڵ ئەو ناوەندەی تێیدا دەژیت، هەروەها دەزگای هەواڵگری سیخوڕی بەسەر سیخوڕەکانیەوە دەکات تا بیانناسێت تا چەند دڵسۆزن و زانیاری دروست دەهێننەوە یان زانیاری راسپاردە بڵاودەکەنەوە بە مەرامی پێشکەشکردنیان بە دەزگا هەواڵگرییەکانیان. دەزگای هەواڵگریی بۆ کارە نهێنی و نیازی مێشکی خەڵکی و شوێنێک کە دەستی نایگاتی سیخوڕەکانی لەناودا بێت یان ئامێرکاریزانی سیخوڕی دەستی نەیگاتی، ئەوا کەسانی خاوەن رەوان باڵایی بەکاردەهێنن بۆ زانیاری وەرگرتن یان کارتێکردن لە ناوەندی بڕیار و کەس و شوێنی ئامانجی دەزگای هەواڵگریی.

بۆ ئەمەش، کەسانێک پێویستن کە توانای بیرخوێندنەوەی خەڵکیان لە دوورەوە هەبێت. هەروەها، دەبێت روونبینیان هەبێت و توانای دەروونە کارتێکردن و دەروونە

جووڵاندنیان هەبێت یان پسپۆڕ بێت لە خەواندنی موگناتیسیدا کە بە مێشکی خەولێخراوێکی بەتوانا لە کەس و شوێنی دوور و نزیک نەناسراوەوە. لە ڕۆژەڤدا زانیاری وەربگرێت. بەڵام گرفتێک هەیە لە کۆکردنەوەی زانیاری بە کەسانی پسپۆڕ لەبواری پاراسیکۆلۆژییدا، ئەویش ئەوەیە کە دەزگای هەواڵگریی دەبێت هەڵوەستەی لەسەر بکات و پێداچوونەوەی بۆ بکات بزانێت تا چەند زانیارییەکان دروستن. بۆ نموونە، دەزگای هەواڵگری بەهۆی کامێرای وێنە و دەنگی تۆمارکەری نهێنییەوە زانیارییەکان بە بەڵگەی وێنە و دەنگەوە بەدەست دەگات بەڵام لەڕێگەی کەسانی شارەزا و پسپۆڕ لە بواری سایکۆلۆژییدا بەڵگەی وێنەی و دەنگیی دەست ناکەوێت و گومان دەکات کە زانیارییەکە وەک خۆی نەبێت کە هەیە. بەڵام ئەگەر شارەزای پاراسایکۆلۆژیی چەند جارێک لەلایەن هەواڵگرییەوە زانیارییەکانی پشتڕاستکرایەوە کە داویەتی، ئەوا دەبێتە جێگای متمانە لەسەر کۆکردنەوەی زانیارییە هەمەچەشنەکان.

دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتانی خاوەن تەکنەلۆژیا و هاوپەیمانەکانیان سەرەڕای بوونی ئامێرکاریزانی سیخوڕ یان خەڵکانی خاوەن توانای سەرووی ئاسایی مێشک بەکاردەهێنن بۆ کاری هەواڵگری و خزمەت بە هەواڵگریی و هەروەها دەترسن و بەدوای ئەو خەڵکانەشدا دەگەڕێن کە پسپۆڕن لە پاراسایکۆلۆژییدا و توانای سەرووی ئاسایی مێشکیان بەکاردەهێنن. دەزگای هەواڵگری ناوەندیی (سی ئای ئەی) چەندەها کەسی شارەزای لە بواری پاراسایکۆلۆژیدا کڕیوە، فریوداوە و بردوویانە بۆ ئەمریکا. بۆ نموونە، ئەحمەدی مامۆستا سەلاح، کە کوردە و خەڵکی شاری کەرکووکە و تەمەنی نزیکەی سی ساڵێک دەبێت. ناوبراو توانای ڕوون بینی هەیە و نادیار ئاشکرا دەکات. واتە، ئەو شتەی دوورە و بەچاو نابینرێت و لە شوێنێکی ترە. هەروەها، وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا، ئەمریکا، ڕوسیا، ژاپۆن، ئیسرائیل، چین و هەندێ وڵاتانی تر ئامێرکاری سیخوڕی زۆر پێشکەوتوو بەکاردەهێنن کە بەهۆی ئاوێتەیەکەوە کە ڕەنگی سووربارە لەڕێگەی پزیشکانی هەواڵگرییەوە بە دەرزی لە کەسی مەبەست دەدرێت و بەهۆی ئاوێتەکەوە لە ڕێگای دەزگای زاڵبونن بەسەر مێشکدا و دەزگای

چاوەدێری بەسەر مێشکدا زانیاری و هەواڵ بەشەپۆل دەنێرێت بۆ مێشکی ئەو کەسەی کە ئاوێتەکەی لێ بەکارهێنراوە و مێشکی ئاراستە دەکەن بۆ کار و مەبەستی خۆیان و زانیاری لەسەر خۆی و هاوزمانەکانی پێ کۆدەکەنەوە.

نموونەیەکی کارتۆنی لەکاتی بەکارهێنانی پاراسایکۆلۆژییدا لەلایەن چەند ئەفسەرێکی هەواڵگرییەوە

ئەگەر بەرلە جەنگی جیهانیی دووەم هەواڵگری لە هەستەکانی دەرەوەی مێشک کرابێ، ئەوا دوای جەنگەکە سیخوڕی بە توانای هەستەکانی ناوەوەی مێشکیش ئەنجام دراوە بۆ وەرگرتنی زانیاری و کارتێکردن لە دۆست و دوژمن بەتوانای سەرووی مێشک. لەو جەنگەدا، دەزگای هەواڵگری سەربازیی بەریتانیا سێ کەسی پسپۆڕیان هێنا، یەکیان بەناوی فیکی، لەدوای گرتنی فەڕەنسا، دوو کەسی تریش کە هەر سەر بەو دەزگایە بوون بەرپرس بوون و جیاجیا دانیشتن. پرسیارەکە ئەوەبوو کە ئایا هێرشی داهاتووی هیتلەر بۆ یۆنان دەبێت یاخود بەریتانیا. فیکی دەنووسێت کە هێرشەکە بۆ بەریتانیا نییە. خوێندنەوەی هەر هەموویان راست دەرچوو و هێرشێکی مەزن کرایە سەر یۆنان. چەندین نموونەی لەم جۆرە لە مێژوودا تۆمارکراون. لەوانە، بەکارهێنانی ئەحمەدی مامۆستا سەلاح لەلایەن دەزگای هەواڵگری ئێراق، کە لە ژووری کۆبوونەوە دانرابوو

بۆ خوێندنەوەی بیری ئامادەبووان. هەروەها یوری گیلەر، کە کەسێکی جووە، بۆ هەواڵگری ئەڵمانیا و ئیسرائیل و ئەمریکا کاری کردووە. ڤۆلف میسینگ لەگەڵ هەواڵگری سەربازی سۆڤیەت و هێزی سەربازی سۆڤیەت و لەگەڵ ستالیندا بووە. گریگۆری راسپۆتین، قەشەی ئەرسۆدۆکسی فەلە، بەرلە کوژرانی لەگەڵ قەیسەری رووسیادا لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا دژی هێزی سەربازیی ئەڵمانیا بەتوانای سەرووی ئاسایی مێشک جەنگاوە.[i]

## پێنووسی ژەهراوی

لەهەمان ئەو کاتەی کە سەرۆک جۆن کەنەدی لە دالاس-٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣-غافڵکوژکرا، ئەفسەرێکی سی ئای ئەی بەنهێنی چاوی بە رۆلاندۆ کوبێلا، هەواڵدۆزی کوبی لە پاریس، کەوت و پێنووسێکی ژەهراوی ئاخنراو بە دەرزیەکی زێرپێستی پێدا بۆئەوەی فیدل کاسترۆی پێ بکوژێت. سەری ئەو قەڵەمە سرنجێکی بچووکی رووپۆشکراو بە ژەهری پێوە بوو. هەرکە دەستت، تەنانەت بەشێوەیەکی زۆر کەمیش، بەر ئەو شوێنە کەوتبا، بەدڵنیاییەوە دەیکوشتی، سەرەڕای ئەمەش هەواڵدۆزەکە کاتی ئەوەی دەبوو بۆئەوەی رابکات بەرلەوەی کاریگەرییەکانی هەستی پێ بکرێن. دوای زانینی مردنی جۆن کەنەدی، کوبێلا بە پلانەکەدا چووەوە و بەرلە گەڕانەوەی بۆ کوبا پێنووسەکەی فرێدا. دوای یەک دەیە، لەساڵی ١٩٧٦، سیاسەتڤانانی ئەمریکی کردەی بەکارهێنانی ژەهریان لەدژی رابەرانی بیانی بەهۆی فەرمانێکی سەرۆک فۆرد بەژمارە ١١٩٠٥ قەدەغە کرد.

[i] پاراسایکۆلۆژی، رێگای فێربوون و بەکارهێنانی، ئاماژ جاف، خانەی چاپ و پەخشی رێنما، چاپی چوارەم، ٢٠١٦. لاپەڕە ٨٣-١٧.

پێنووسی ئاخنراو بە سرنجێکی ژێرپێست بۆ تۆپەراسیۆنی غافڵکوژی فیدل کاسترۆ.

هەر لە ڕۆژانی سەرەتای پرۆژەی مکولترا، دکتۆر سیدنی گوتلیب درکی بەوە کردبوو کە دەرمان و ماددە کیمیاوییەکانی سی ئای ئەی، سەرەڕای مەبەستە سەرەکیەکەی، هیچ سوودێکیان نابێت ئەگەر ئەفسەرانی بەکارهێنەر و هەواڵدۆزەکان نەتوانن بەنهێنی بەکاریان بهێنن. لەماوەی هەمان مانگدا، مکولترا ڕێگای پێدرا، گوتلیب پەیوەندی بە جۆن مولهۆلاندەوە کرد، کە دواتر بوو بە بەناوبانگترین جادووگەری ئەمریکی لەم بوارەدا. جۆن کەسێکی زۆر کارامە و لێهاتوو بوو لە بەکارهێنانی دەستەکانی بەئامانجی جادووگەریی لەبەرامبەر چەندین ئامادەبوویدا. بەوەدا، گوتلیب بۆی دەرکەوت کە ئەم لێهاتووییەی جۆن لە فێڵبازی بەکارهێنانی دەستەکانیدا دەکرێت بەهەمان شێوە بەکاربهێنرێت لە دەرمان و ژەهردا بەبێ ئەوەی ئامانجەکە هەستی پێبکات.

بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، ئەفسەرانی مەیدانیی سی ئای ئەی پێویستیان بەوە دەبێت فێربکرێن کە فێڵەکانیان خۆیان ئەنجام بدەن، وە جۆن، کە نووسەری چەندین پەرتووکە لەبارەی ئەنجامدانی جادوو، پێدەچوو باشترین بژاردەی دەزگاکە بێت. کاتێک دەزگای سی ئای ئەی لێی نزیک بووەوە، جۆن هەرزوو قابیل بوو کە پەرە بە

"نامیلکەیەکی ڕێنمایی سیخوڕی" بۆ گوتلیب بدات کە تیایدا وەسفی "لایەنە جۆربەجۆرەکانی هونەری جادووگەریی دەکات،" کە دەکرێت سوودی هەبێت لە ئۆپەراسیۆنی پەنهانیدا. ڕێنماییەکان زانیاری دەبەخشنە ئەفسەرانی مەیدانی "بۆئەوەی پەرە بە کارامەییەکەیان بدەن بۆئەوەی حەب یان ماددەیەکی تر بەشێوەیەکی نادیاری بخەنە ناو خواردنەوەیەک یان خواردنێک بۆئەوەی لەلایەن ئامانجێکەوە بخورێتەوە یان بخورێت." لە بەرواری ٤ی ئایاری ١٩٥٣، جۆن بڕی سی هەزار دۆلاری لەلایەن سی ئای ئەی لەسەر حیسابی پرۆژەی مکولترا بۆ بڕایەوە.

جۆن مولهۆلاند

## نووسین بە مەرەکەبی نهێنی

نامەکان بە کۆنترین هۆکارەکانی پەیوەندیکردن دێنە ئەژمار و رۆڵێکی گرنگ ئەگێڕن لە گەیاندنی زانیاریدا، سەرەڕای پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای هەواڵگری لەبواری گەیاندنی زانیارییەکان بەڵام تا ئێستاش نووسینی نامە بە مەرەکەبی نهێنی پێگەیەکی دیاری هەیە لەکاری هەواڵگرییدا، بەڵام لەئێستادا بەکارهێنانی (مەرەکەبی نەبینراو) بۆ نووسینی نامە بە کارێکی درووست دانانرێت لەبەرئەوەی چەندین ئامێری پێشکەوتوو داهێنراون کە لەتوانایاندا هەیە ئەو نووسینانەی کە بە مەرەکەبی نهێنی نوسراون ئاشکرا بکات، هەربۆیە تاقیگەی دەزگا هەواڵگرییەکان بەردەوام لە پێشبڕکێدان بۆ ئەوەی جۆرێک لە مەرەکەبی نهێنی دابهێنن کە بەئاسانی ئاشکرا نەکرێت و

نەخوێندرێتەوە. ئەتوانرێت زۆرێک لە شلەمەنیەکان وەک مەرەکەبی نهێنی بەکاربهێنرێن وەک شلەمەنی ئاژەڵ و رووەک و ئاوی میوە و تەنانەت میزیش، ئەگەر نامەیەک بە بەکارهێنانی یەکێک لەو شلەمەنیانە بنوسرێت ئەوا چاوی ئاسایی ناتوانێت نووسینەکە ببینێت، لەم کاتەدا ئەوەی نووسینەکە دەردەخات گەرمایە، کاغەزی نامەکە لە سەرچاوەیەکی گەرمی وەک مۆم یان گڵۆپ نزیک دەکرێتەوە و لەم کاتەدا نووسینە نەبینراوەکە رەنگی قاوەیی وەردەگرێت، بەڵام دەبێت بەوریاییەوە ئەم کارە بکرێت لەبەرئەوەی گەر کاغەزەکە گڕ بگرێت دەبێتە هۆی لەناوچوونی زانیارییەکانی ناو نامەکە.

ئاشکراکردنی نامەی نووسراو بە مەرەکەبی نهێنی

جۆرێکی تر لە مەرەکەبی نهێنی هەیە کە تەنانەت بە سەرچاوەی گەرمیش ناخوێنرێتەوە بەڵکو بە بەکارهێنانی ماددەیەکی کیمیایی کە دەکرێت بەسەر نامەکەدا دەخوێنرێتەوە، وەک (سۆلفاتی ئاسن) کە بە تواندنەوەی بڕی (٨/١)ی کەوچکێکی چا لە لە دەفرێکی ئاودا و ئەو نامەیەی کە بە بەکارهێنانی ئەم ماددەیە ئەنوسرێت لەرێگەی ماددەیەکی کیمیایی کە پێی دەوترێت کاربۆناتی سۆدە یان (سۆدەی

شوشتن) دەخوێنرێتەوە، کە پاش ئەوەی ئەم ماددەیە کرا بەسەر نامەکەدا و دوای وشکبوونەوەی نووسینەکانی ناو نامەکە بەڕەنگێکی قاوەیی دەردەکەوێت.
هەروەها، دەتوانرێت مەرەکەبی نهێنی دروست بکرێت لەڕێگەی تواندنەوەی حەبی (ئیسپرین) لەناو کحولدا، لەم کاتەدا دەرخستنی نووسینی ناو نامەکە لەڕێگەی هێنانی لۆکەیەکی تەڕکراو بە کحول دەبێت بەسەر نامەکەدا.
دەزگا هەواڵگرییەکان زۆر بە پەلەن تا بتوانن ماددەیەکی کیمیایی دابهێنن کە بتوانێت هەموو جۆرە مەرەکەبێکی نهێنی ئاشکرا بکات، تا ئەو کاتەی توانیان هەڵمی بۆیەی (یۆد) بدۆزنەوە کە کاتێک دەکرێت بەسەر ئەو نامەیەی کە بە مەرەکەبی نهێنی نووسراوە بەئاسانی و پاش وشکبوونەوەی نامەکە نووسینەکان دەردەخات.
سیخوڕەکان زۆرجار پەنا بۆ فێڵی جۆراو جۆر دەبەن بۆ شاردنەوەی نووسینە نهێنییەکانیان کە بەمەرەکەبی نهێنی نوسیویانە وەک نووسینی زانیارییەکان لە گۆشەیەکی بچووکی نامەکە یان نووسینی لەسەر زەرفی نامەکە نەک خودی نامەکە.
جگەرە بە ئامرازێکی باش دادەنرێت بۆ شاردنەوەی نامە کورتەکان. نامەکان لەسەر کاغەزێکی تەنک بە مەرەکەبی نهێنی دەنوسرێن کە بە هیچ شێوەیەک بە گەرما کاریگەر نابن، دواتر لە شێوەی جگەرەدا لوول دەکرێت و ناوەکەی پڕ دەکرێت لە تووتن، بەشێوەیەک دەتوانرێت لەکاتی مەترسی ئاشکرابوون لەناو ببرێت لەڕێگەی داگیرساندنی جگەرەکە و کێشانی. بەتێپەڕبوونی کات هەڵگرتن و بەکارهێنانی مەرەکەبی نهێنی لەلایەن سیخوڕانەوە مەترسی پەیدا کرد، ئەگەر سیخوڕێک شوشەیەک لەو مەرەکەبە نهێنییە لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێت ئەوە بەسە بۆئەوەی گومانی لێبکرێت و دەستگیر بکرێت، لەبەرئەوە هەندێک لە سیخوڕەکان مەرەکەبە نهێنیەکەیان لەناو گۆرەوی یان بۆینباخ یان قۆبچەی داپۆشراو بە قوماش دەشاردەوە.
هەندێک لە سیخوڕەکان ئەمڕۆ هەوڵ دەدەن مەرەکەبی نهێنی لە ناو شوشەی دەرمان یان شووشەی بۆن هەڵبگرن تا لەو ڕێگەیەوە پیاوانی ئاسایش فریوبدەن و لەکاتی پێویستدا بەکاری بهێنن، بۆیە زۆر گرنگە نموونەی ئەو شلەمەنیانەی کە لە شووشەی

دەرمان و بۆن دان رەوانەی تاقیگە بکرێت بۆئەوەی ئاشکرا بێت کە ئایا ئەوە مەرەکەبی نهێنیە یان نا.

بەگشتی، بەکارهێنانی مەرەکەبی نهێنی بەشێوەیەکی گونجاو کارێکی ئاسان نییە و پێویستی بەڕاهێنانە، بەڵام لەمڕۆدا بەکارهێنانی مەرەکەبی نهێنی وەک جاران ئاسان نییە و بەڵکو چەندین هۆکاری تر جێگەی گرتووەتەوە وەک: ئامێری بێتەڵ و قوبچەی موگناتیسی و چەندین جۆری تری ئامێری پەیوەندیکردن، بۆیە زۆرجار بەکارهێنانی مەرەکەبی نهێنی بووەتە هۆی لەناوچوونی سیخوڕ و تۆڕەکەی لەبەرئەوەی تائێستا مەرەکەبێکی نهێنی نەدۆزراوەتەوە کە نەتوانرێت ئاشکرا بکرێت.

## سیخوڕی بە ئاوێتەی کیمیایی مێشکگر

مەبەست لە بەکارهێنانی ئاوێتەی سیخوڕی مێشکگر سێ ئامانجی سەرەکییە: سیخوڕیکردن لەسەر خۆی و خەڵکی؛ لێکۆڵینەوەی زانستی لە مێشک و ئاوەز و فەرهەنگ و تەندروستیی؛ ئەنجامدانی کاری پاراسایکۆلۆجی بە مێشک بۆ مەبەستی سیخوڕی و زانیاری وەرگرتن. دەزگا هەواڵگرییەکان کە ئاوێتەی کیمیایی مێشکگری سیخوڕی لە مرۆڤ بەکاردەهێنن بۆ ئەنجامدانی کاری سەرووی ئاسایی بە مێشک لە بوارە جیاجیاکاندا بۆ مەبەستە جیاکان لە لقەکانی پاراسایکۆلۆژیدا)، کە مەبەست لە سیخوڕیکردن و زانیاری وەرگرتنە بە هەستەکانی ناوەوەی مێشک و توانای سەرووی ئاسایی مێشک کە وەرگرتنی زانیارییە و کردنی بیرۆکە و ئاوەز و تێگەیشتنە لە دەرەوەی مێشک بە کردەوە لەڕێگای توانای سەرووی ئاسایی مێشکەوە کە زانیاری وەردەگرێت وەک چۆن مێشک دەتوانێت بە پێنج هەستەکەی دەرەوەی مێشک زانیاری لە دەرەوە وەربگرێت و بیدات بە مێشک و بەهەمان شێوە بە هەستەکانی ناوەوەی زانیاری لە دەرەوەی مێشک وەردەگرێت.

لەم کاتەدا، کەسی بەکارلێهێنراوی ئاوێتەی کیمیایی مێشکگر ئەو زانیارییەی کە مێشکی بە هەستەکانی ناوەوەی وەریدەگرێت بە شەپۆل دەگوێزرێتەوە بۆ ناوەندی سیخوڕگە بۆ دەزگای چاودێریکردنی مێشک لەبەر دەستی پۆلیسی نهێنی دیاری

مێشکدا. هەروەها، دیسان بە دەزگای زاڵبوون بەسەر مێشکدا مێشک فەرمان دەدات کە زانیاری وەربگرێت یان بیر بنێرێت یان کارتێکردن بکات. خۆ ئەگەر کەسێکی پسپۆڕی بەتوانا و لێهاتوو لە بواری پاراسایکۆلۆژیدا هەبوو، دەتوانێت مێشکی خۆی بەکاربهێنێت بۆ کارتێکردن و بیری و وەرگرتنی زانیاری خۆی ئەنجام بدات لەجیاتی ئەو دەزگایانەی فەرمان بە مێشک دەدەن.

## هاوبیریی (Telepathy)

"هاوبیریی" بریتییە لە ناردنی بیر لەلایەن نێرەری بیرەوە و وەرگرتنی بیرە لەلایەن کەسی ترەوە کە بیرەکە وەردەگرێت، هەروەها دەکرێت کەسی پسپۆڕ لە هاوبیریدا رۆڵی نێرەر و وەرگر بگێڕێت. کەسێک کە لەم بوارەدا پسپۆڕە و کار بۆ دەزگایەکی هەواڵگریی بکات، بەبێ بەکارهێنانی ئاوێتەی کیمیایی مێشککر ئەو بیرۆکە و تێگەیشتن و داواکاری و فەرمانانەی دەزگای هەواڵگریی بۆی دیاری دەکات و پێی دەڵێن بۆ کەسی ئامانج بینێرە، ئەوا پسپۆڕی هاوبیری لەسەر داخوازی دەزگای هەواڵگریی بۆ کەسی مەبەستی دەنێرێت، ئینجا پسپۆڕ رەنگە بتوانێت بزانێ بیرەکەی پێگەیشتووە یان نا بەڵام کەسی بەکارلێهێنراوی ئاوێتەی کیمیایی مێشککر، دەزگای هەواڵگریی راستەوخۆ بیرۆکەکەی بۆ دەنێرێت بۆ ئەوەی بیگوێزێتەوە بۆ کەسی مەبەست لە هەرشوێنێک تەنانەت دەزگا هەواڵگرییەکان ئاگاداری ئەوەشن کە ئایا کەسی بۆ نێردراو پەیامەکە کاری لێدەکات و بە باشی پەیرەوی دەکات یان نا.

هاوبیریی (Telepathy)

## ئۆپەراسیۆنەکانی ئەمریکا لە ئەڵبانیا

یەکەمین ئەو هەوڵە نهێنییانەی بەپشتیوانی ئەمریکا بۆ رووخاندنی حکومەتێک ئەنجامدراوە لەماوەی جەنگی ساردا لە وڵاتی ئەڵبانیا بووە. لەماوەی ساڵانی سەرەتای جەنگی سارددا، بەرپرسە باڵاکانی هەواڵگری ئەمریکا هەوڵیاندا رێ لە پێشکەوتنە هەژمونکارییەکانی یەکێتی سۆڤیەت بگرن. فرانک وینسەر، بەرپرسی بەشی چالاکی نهێنی دەزگای هەواڵگری ناوەندی(CIA)، پەرەی بە بیرۆکەی سەپاندنی هێزی ئەمریکا لەو ناوچانەی رۆژهەڵاتی ئەوروپادا کە کەوتبوونە ژێر هەیمەنەی سۆڤیەت، بە ئامانجی ئەوەی بتوانێت لێکترازانێکی قووڵ دروست بکات. لەساڵی ١٩٤٩ بۆ ١٩٥٢، وینسەر بە هەماهەنگی لەگەڵ بەریتانییەکان لە هەوڵێکی شکستخواردوودا ویستیان ئەو هاوڵاتییە ئەڵبانیانە بهێننە سەر دەسەڵات کە ماوەیەکی درێژ بوو لە دەرەوە بوون وە بیانهێنێتەوە بۆناو ئەو وڵاتە بۆئەوەی رژێمی داپڵۆسێنی ئەنفەر هۆکسا بڕووخێنێت.

ئەڵبانیا، سەرەڕای ئەوە وڵاتێکی هەژار و دوورەپەرێز بوو، وەک وڵاتێکی گرنگ لەرووی ستراتیژیەوە سەیرکرا. لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٦دا، بەریتانییەکان بیرۆکەی بەکارهێنانی چالاکی پەنهانیان لە ئەڵبانیا لەمێشکدا گەلاڵە بوو. حوکمڕانی ئەڵبانەکان وەک دوژمندارییی بۆ هۆکسا لێکدرایەوە؛ بەریتانییەکان هەر بەردەوام بوون لەسەر پشتیوانیکردنی حوکمی پێشووی نەفیکراوی ئەڵبانەکان، مەلیک زۆگ؛ وە لەهەمووشی گرنگتر، بەریتانییەکان هیواخواز بوون بۆئەوەی بەردەوام بن لەسەر کاریگەرییە ستراتیژییەکەیان لە دەریای ناوەڕاست. دەزگای هەواڵگری نهێنی بەریتانیا (SIS) دەستی کرد بە داڕشتنی پلان بۆ چەند ئۆپەراسیۆنێک بۆئەوەی پەیوەندی بە گروپە خەباتێرەکانەوە بکەن لەنێو ئەڵبانیادا، بەڵام پارەی تەواویان لەژێر دەست نەبوو بۆ راپەراندنی ئەو ئەرکە. لەئەنجامدا، بەریتانییەکان رووی خۆیان دایە ئەمریکا بۆ پشتیوانیکردنیان.

بۆ مانگی ئازاری ١٩٤٩، بەرپرسە هەواڵگرییەکانی بەریتانیا و ئەمریکا گەیشتە ئەو ئەنجامەی لەسەر بەرەوپێشبردنی پلانێک بەردەوام بن بۆ جیاکردنەوەی ئەڵبانیا لە هەیمەنەی سۆڤیەت. لەچوارچێوەی ئۆپەراسیۆنەکەدا، لەژێر ناوی نهێنی (BGFIEND)، ئەمریکا هەڵسا بەدابینکردنی دارایی پێویست، لەوکاتەی بەریتانییەکان شارەزایی و کارمەندانی خۆیان پێشکەشی ئەمریکا کرد. پەیوەندی سەرەکی دەزگای هەواڵگری بەریتانیا لەگەڵ ئەمریکییەکان بە کیم *فیلبی* (لە بەشی داهاتوودا باسکراوە) سپێردرابوو. بەهاوکاری لیژنەی نیشتیمانی ئەڵبانیا، ئۆپەراسیۆنە هاوبەشەکە ئاسانکاری بۆ ئەندامانی دەرەوەی ئەو وڵاتە کرد بۆئەوەی لە هەموو ئاراستەکانەوە خۆیان بخزێننە نێو وڵاتەکەیانەوە.
دوای چەندین مانگ لە مەشق لە کەمپێکی سەربە دەزگای هەواڵگری بەریتانیا لە وڵاتی ماڵتا، لەماوەی تشرینی یەکەمی ١٩٤٩، بیست هاوڵاتی ئەڵبانی خۆیان خزاندە کەناراوەکانی نیمچەدوورگەی کارابێرنی ئەو وڵاتە. لە بەدبەختی خۆیان، سوپاس ئەڵبنای خۆیان بۆ ئەو پەلامارە ئامادەکردبوو، بەمەش کەوتنەنێو بۆسەوە. هەرچەندە هەوڵەکە شکستی هێنا، بەڵام دەزگای هەواڵگریی بەریتانیا لەلایەن ژمارەیەکی کەمی ئەو ئەڵبانیانەی لە بۆسەکە رزگاریان بوو هاندرا کە دەکرا هەوڵی جددی بدرێت بۆ رێکخستنی جوڵانەوەیەکی خەباتگێریی. بەهۆی چەندین رووداوی دزەکردنی زانیاری هەستیار لە کۆمەڵگای ئەڵبانیەکانی شاری رۆمای ئیتاڵیاوە، وەجبەی دووەمی مەشقپێدانی خەباتگێرانی ئەڵبانیا لەدەرەوەی شاری هایدلبێرگ دەستی پێکرد. ئەمجارە ژمارەی ئەڵبانەکان ٢٥٠ کەسێک دەبوو لەرێگای ئاسمان و زەوییەوە. ئەمجارەش، هێزەکانی هۆکسا بەپەرۆشەوە چاوەڕوانیان بوون!
شکستە بەردەوامەکان وای کرد بەریتانییەکان بگەنە ئەو بڕوایەی کە هەوڵەکان بێسوودن، و بۆیە بۆ ساڵی ١٩٥١ کشانەوەی خۆیان راگەیاند. واڕێککەوت کە کۆتایی هاتنی بەریتانییەکان لەگەڵ ئاشکرابوونی کیم فیلبی وەک سیخوڕی سۆڤیەت بکەوێتە یەک کاتەوە. لە حەزیرانی ١٩٥١، دەرکەوت کە تەواوی دەزگای هەواڵگری بەریتانیا لەلایەن کیم فیلبیەوە فریودراوە. سەرەڕای ئەمەش، ویسنەر ئۆپەراسیۆنەکانی لەدژی

ئەڵبانیا بەردەوامی پێدا —بەشێک لە هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵگیرسانی جەنگی کۆریا، وە بەشەکەی تریش بۆ بڕوای خودی ناویراو بە توانای ئۆپەراسیۆنی نهێنی بۆ جیاکردنەوەی ئەو وڵاتە لە یەکێتی سۆڤیەت. لەساڵی ١٩٥٢، شەست پەرەشوتڤانی تر خۆیان گەیاندنە ئەڵبانیا. تا کۆتایی هێنان بە ئۆپەراسیۆنەکە زیاتر لە ٢٠٠ هاوڵاتی ئەڵبانی کوژران یان دەستگیرکران. هەرچەندە *فیلبی* دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتی لە ئۆپەراسیۆنەکە ئاگادارکردەوە، ئەڵبانەکان بەهۆی دزەپێکردنی چەند زانیارییەک لە ڕێکخراوە ڕەوەندەکانی دەرەوەی وڵات و نەتوانایی بۆ پاراستنی ئارامی وڵات، شکستیان هێنا.[i]

## دزینی بەڵگەنامەی چەکی ناووکی ئێران لەلایەن مۆسادەوە

چەند ڕۆژێک بەرلەوەی سەرۆک دۆناڵد ترەمپ بڕیاربدات کە ئایا لە ڕێککەوتنی ناووکیی لەگەڵ ئێران بکشێتەوە یانا نا، بنیامین ناتانیاهۆی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل چەند تۆمارێکی لە گرتەیەکی تەلەڤزیۆنیدا نیشانی جیهاندا کە تیایدا چەند کۆگایەکی نهێنی لە تەهران دەردەخست. ئامانجی ناوبراو لەم کارەیدا بریتیی بوو لە دروستکردنی کەیسێک کە ڕابەرانی ئێرانی ئاژانسی ناووکی نێودەوڵەتیان فریوداوە کاتێک جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە بەرنامە ناووکییەکەیان تەنیا بۆ مەبەستی ئاشتیانە بووە. بەرپرسێکی باڵای ئیسرائیلی ڕایگەیاند کە سیخوڕە ئیسرائیلییەکان توانیویانە لە ئۆپەراسیۆنێکدا لە نیوەشەو نزیکەی نیو تۆن بەڵگەنامە بدزن. بەڵام ناتانیاهۆ هیچ بەڵگەیەکی نەدا بەدەستەوە لەسەر ئەوەی کە ئایا ئێران سەرپێچی

---

[i] -Barnes, Trevor. "The Secret Cold War: The CIA and American Foreign Policy in Europe, ١٩٤٦–١٩٥٦. Part I," The Historical Journal ٢٤ (١٩٨١), ٣٩٩–٤١٥.
- Barnes, Trevor. "The Secret Cold War: The CIA and American Foreign Policy in Europe ١٩٤٦–١٩٥٦. Part II," The Historical Journal ٢٥ (١٩٨٢), ٦٤٩–٦٧٠.
- Holzman, Michael. James Jesus Angleton, the CIA, and the Craft of Counterintelligence. Amherst, MA: University of Massachusetts Press, ٢٠٠٨.
- Thomas, Evan. The Very Best Men: Four Who Dared: The Early Years of the CIA. New York: Simon & Schuster, ١٩٩٦.

پەیمانەکەی کردووە کە لەسەرەتای ٢٠١٦ کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە. ئەمەش پێمان دەڵێت کە ناوبراو هەر لەسەرەتای پەیمانەکە دژی بووە و بەو هیوایە بوو کە ئاشکراکردنی ئەم بەڵگەنامانە ببنە هۆکارێک بۆ هاتنەدەرەوەی ئەمریکا لە پەیمانەکە، کە سەرئەنجامەکەشی هەروابوو: سەرۆک ترەمپ لە ١٢ی ئایاری ٢٠١٨ بڕیاری هاتنەدەرەوەی لە پەیمانەکە ڕاگەیاند.

ئەم کارەی سەرۆک ترەمپ بەیەکێک لە بڕیارە هەرەگرنگەکانی سەردەمی سەرۆکایەتی ناوبراو سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە لەقەڵەم دەدرێت. ڕێبەرانی وڵاتە ئەورووپییەکانی وەک ئیمانوێل ماکرۆن، سەرۆکی فەرەنسا و ڕاوێژکاری ئەڵمانی ئەنگێلا مێرکل بەتووندی دژی ئەو بڕیارە وەستانەوە و بڕیاری مانەوەیان لە پەیمانەکە ڕاگەیاند. سەرۆک ترەمپ ڕایگەیاند کە، "لەماوەی حەوت ساڵدا، کاتی ئەو پەیمانە هەر کۆتایی دەهات، و ئێران ئازاد دەبوو لە دروستکردنی چەکی ناووکی." ناوبراو زیاتر وتیشی کە، "حەوت ساڵ بەیانییە." عەباس ئەرغەچیل جێگری وەزیری دەرەوەی ئێران، کە یەکێکیش بوو لە گفتوگۆکەرانی سەرەکی پەیمانەکە، لە وەڵامی لێدوانەکانی ناتانیاهۆدا وتی، "لێدوانەکانی ناوبراو زۆر مناڵانەن و ئەو یارییە جێگای پێکەنینە." ناتانیاهۆ لەو پەخشە تەلەڤزیۆنیەدا زیاتر وتی، "ئەم فایلانە ئەوە دەسەلمێنن کە ئێران بەئاشکرا درۆ دەکات کاتێک وتی ئەوان هەرگیز بەرنامەیەکی چەکی ناووکییان نەبووە." هەر لەو لێدوانەیدا ڕایگەیاند کە وڵاتەکەی توانیویەتی دەست بەسەر زیاتر لە ٥٥ هەزار نوسخەی چاپکراو و زیاتر لە ١٨٣ دیسک دەربارەی شوێنی بەرهەمهێنانی چەکی ناووکی بگرێت. ئەو زیاتر وتی کە، "ئەمان زانیاری ئەو بەڵگەنامانەیان بۆ ئەمریکا ناردووە بۆئەوەی بتوانن ڕاستی بەرنامەکە بسەلمێنن."

زانیاری ئۆپەراسیۆنەکە تەنیا بۆ چەند کەسێکی سنووردار بوو، تەنانەت ناتانیاهۆ بەشانازییەوە دەڵێت، "ژمارەیەکی زۆری کەمی ئێرانییەکان، زۆر کەم دەیانزانی شوێنەکەی کوێیە، جگە لەوەی کە تەنیا بەشێکی کەمی ئەو کەسانەی لەنێو خودی دەزگای مۆسادیش بوون، ئاگاداری کردەکە بوون." یەکێک لە بەرپرسە باڵاکانی ئیسرائیل، کە بەمەرجی ئاشکرانەکردنی ناسنامەکەی دەربارەی ئەرکەکەی قسەی

کرد، وتی کە دەزگای هەواڵگری مۆسادی ئیسرائیلی ئەو کۆگایەی لە مانگی شوباتی ۲۰۱٦ دۆزینەوە، وە لەوکاتەوە باڵەخانەکەی خستبووە ژێر چاودێرییەوە. سیخورەکانی مۆساد لە شەوێکی مانگی کانوونی یەکەمدا هەڵیانکوتایە سەر باڵەخانەکە، هەموو بەڵگەنامە ئەسلییەکانیان برد و دواتر هەر لەو شەوەدا بەقاچاغ لە وڵاتی تورکیەکسانەوە رەوانەی تەلئەڤیڤ کران.

سەرۆک ترەمپ لەلایەن بەڕێوەبەری مۆساد، یۆسی کۆهێن، لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکە ئاگادارکرایەوە، ئەمەش دوای سەردانەکەی هات بۆ واشنتۆن هەر لەو مانگەدا. ئەو بەرپرسە هۆکاری گیرۆکردنی ئاشکراکرنی ئەو بەڵگەنامانە بۆ رای گشتی بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە کاتێکی زۆری ویست تا توانیان ئەو بەڵگەنامانە وەرگێڕنە سەر زمانی ئینگلیزی و شیان بکەنەوە چونکە بە زمانی فارسی نووسرابوون.

نەخشەی هەموو ئەو شوێنانەی کاری بەرهەمهێنانی چەکی ناووکی ئێرانی تیادا ئەنجام دەدرێت

دەبێت ئاماژە بەوە بدرێت کە بەرنامەی ناووکی ئێرانی شتێکی شاراوە نەبوو. تەنانەت جۆرج بوش و باراک ئۆباما چەندین جار ئاماژەیان بە بوونی بەرنامەیەکی لەم جۆرە کردووە، بەڵام ئامانج لە ئەنجامدانی ئەم ئۆپەراسیۆنە نیشاندانی بەڵگەیەک بوو بۆ ئەمریکا بۆئەوەی لە پەیمانەکە بکشێتەوە کە سەرۆک ئۆباما بە "کارەساتبار" ناوی بردووە.[i]

## ئۆپەراسیۆنی باربارۆسا

ئۆپەراسیۆنی باربارۆسا مەزنترین ئۆپەراسیۆنی سەربازیی بوو لە مێژوودا. لەم هێرشە لەناکاوەدا سۆڤیەت تووشی سەرئەنجامێکی وێرانکەر بووەوە. هێرشەکە بەتەواوی لەناکاو نەبوو چونکە ستالین پێشتر ئاگادارکرابوەوە بەڵام ئەو زانیارییە هەواڵگریانەی رەتکردەوە کە وەریگرتبوون. ستالین بەبێ ئاگایانە متمانەیەکی بێ ئەندازەی بە رێککەوتنی (Molotov-Ribbentrop) هەبوو کە لە٢٢ی ئابی ١٩٣٩ واژووکرابوو، ئەم پەیمانە هەردوو وڵاتەکەی وەک هاوپەیمان بەیەکەوە گرێدابوو. ئۆپەراسیۆنی باربارۆسا (بەزمانی ئەڵمانی، Unternehmen Barbarossa) ناوی نهێنی نازییەکان بوو بۆ داگیرکردنی یەکێتی سۆڤیەت کە لە بەرواری ٢٢ی حەزیرانی ١٩٤٢ دەستی پێکرد. ئۆپەراسیۆنەکە لەلایەن خودی هیتلەرەوە پلانی بۆدارێژرابوو، کە ناوی ئەو ئۆپەراسیۆنەی لە ئۆپەراسیۆنی فریتز (Fritz) بۆ باربارۆسا گۆڕی.

هۆکاری ناونانی ئەم ئۆپەراسیۆنە دەگەڕێتەوە بۆ ئیمپراتۆری رۆمانی فرێدریکی یەکەم (١١٢٣-١١٩٠)، کە بە "باربارۆسا" ناسرابوو، بەزمانی لاتینی ناوەڕاست بەمانای "ریشی سوور" دەهات. ناوبراو لە ئەفسانەی ئەڵمانیدا ناوبانگی هەیە بەوەی کە دەوترێت ناوبراو لە ئەشکەوتێکدا بووە دواتر کە زانیویەتی ئەڵمانەکان لە جەنگێکی مەزندان، لە ئەشکەوتەکە هاتۆتە دەرەوە و یارمەتی داون.

---

[i] Halbfinger, D., Sanger, D. and Bergman, R. (٢٠١٨). *Israel Says Secret FilesDetailIran'sNuclearSubterfuge*.[online]Nytimes.com.Availableat:https://wwwnytimes.com/٢٠١٨/٠٤/٣٠/world/middleeast/israel-iran-nuclear-netanyahu.html.

چەندین سەرچاوەی هەواڵگریی زانیاری گرنگیان بە ستالین بەخشی کە ئاگاداری ئۆپەراسیۆنێکی لەم چەشنە بێت، بەڵام ئەو بڕوای خۆی بەوە هێنا کە هیتلەر هەرگیز هێرش ناکاتە سەر سۆڤیەت بەرلەوە بەریتانیا ببەزێنێت، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی زانیاری وردی هەواڵگریی لە تەواوی ئەوروپا، تەنانەت ژاپۆنیش، گەیشتە بەردەستی مۆسکۆ. دوایین وشیاریی هەواڵگری لەلایەن چاوەشێکی ئەڵمانییەوە بوو کە بەرەو لای سۆڤیەت هەڵاتبوو، زانیاری بە سۆڤیەتدا کە لەماوەی چەند کاتژمێرێکی تر هێرشەکە دەست پێدەکات. ئەم زانیارییە هەواڵگرییە دادی دەردی کەللەرەقیەکەی ستالینی نەدا کە پێی وابوو هیتلەر هێرش ناکات.

سەرەڕای ئەم ئاگادارکردنەوانەش، ستالین فێڵی لێکرا بە ئۆپەراسیۆنی فریودانی نازییەکان، بەناوەکانی (Haifisch) و (Harpune)، کە لەنیسانی ١٩٤١ تا دەستپێکردنی باربارۆسا بەکارهێنران. ئامانجی ئەم ئۆپەراسیۆنانە بریتیی بوو لەوەی کە کۆمەڵگا زۆرەملێکانی هێزەکانی نازی لە پۆلەندا وەک هەنگاوێکی بەرگرییانە نیشان بدەن بۆئەوەی بیانخەنە پشت بۆردومانەکانی بەریتانیی. سەرەڕای ئەمەش، ئەڵمانەکان هەڵسان بە مەشقی چڕوپڕی داگیرکاریی بۆ ئەوەی وێنەیەک دروست بکەن کە ئەوان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ داگیرکردنی ئینگلتەرا.

ستالین هەموو زانیارییە هەواڵگرییەکانی لە بەکرێگیراوانی سۆڤیەت پشتگوێ خست. ریچارد سۆرج (بابەتێکی تایبەت لە بەشی داهاتوودا بۆ ناوبراو تەرخانکراوە)، کە بەنهێنی وەک نوێنەری سەربازی ئەڵمانیا لە تۆکیۆ کاری دەکرد، زانیاری زۆری گرنگی هەواڵگریی بە سۆڤیەت بەخشی. سۆرج سیخوڕی دەزگای هەواڵگری سەربازیی سۆڤیەت (Glavnoye Razvedyvate'noye Upravleniye) بوو. ناوبراو زانیاری گرنگی دەستخست دەربارەی ئۆپەراسیۆنی باربارۆسا بەرلە چەند مانگێک کە هێرشەکە روویدات. ئەو زانیاری لەرێگای تەلەگرامەوە گەیاندبووە مۆسکۆ، بەڵام ستالین رەتی کردەوە کە بڕوای پێ بهێنێت.

یەکێک تر لە سەرچاوەکان بریتیی بوو لە ئۆرکێسترای سوور (Rote Kapelle) کە ناوێکی نازی بوو بۆ بازنەی سیخوڕی سۆڤیەت، ئەوانەی کە لە ئەڵمانیای و وڵاتانی

دەوروبەری چالاکییان ئەنجامدەدا. بەرپرسی ئەم تۆڕە سیخوڕیە لەیبا دۆمب، لیۆپۆلد ترێپەر و چەند هاوڕێیەکی تریان بوون. ئەوان چەند سەد سیخوڕێکیان لە شوێنە گرنگەکانی ڕژێمی نازیدا بەڕێوە دەبرد. لەنێو ئەم سیخوڕانەدا، چەندین کەسایەتی بەسوودی تیادا بوو، لەوانە هارۆ شولزە-بۆیسەن، نەوەی ئەدمیرال ڤۆن تیرپیتز، لە بارەگای لوفتوافی (Luftwaffe) لە بەرلین، و ئارڤید هارناک، خوارزای ئەدۆلف ڤۆن هارناک، کەسایەتی بەنێوبانگی ئایینی. میدرێد هارناک، هاوسەرەکەی، کە ئەمریکی بوو، وە زۆربەی هەرەزۆری بازنەکە لە ئابی ۱۹٤۲ دەستگیرکران و دواتر کوژران.

هەروەها، لەنێو وەزارەتی گشتی بۆ کاروباری ئاسایشی یەکێتی سۆڤیەت (Narodnyj Komissariat Vnutrennikh Del)-دەزگات هەواڵگری سۆڤیەت لە سەردەمی ستالیندا- بەرپرسی هەواڵگری بیانیی، پاڤێل فیتین، بەبەردەوامی ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە ئەو ئەنجامە هەواڵگرییانەی ئەوان شیکردنەوەیان بۆ کردووە، ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەڵمان بەتەمای بوو هێرش بکاتەسەر سۆڤیەت. ناوبراو ڕزگاری بوو، بەڵام ئیڤان پروسکرۆڤ، ئەفسەرێکی هێزی ئاسمانی و بەرپرسی هەواڵگریی سەربازیی لەساڵی ۱۹۳۹ بۆ ۱۹٤۰، لە تشرینی یەکەمی ۱۹٤۱ کوژرا، هۆکارەکەشی تەنیا ئەوە بوو کە ناوبراو هەقیقەتی بە ستالین دەوت. ئەفسەری تری هەواڵگری سۆڤیەت، وەک فیلیپ گۆلیکۆڤ، کە داتا هەواڵگرییەکانی بەشێوەیەک ڕێکدەخست بۆئەوەی لەگەڵ بیرۆکەکەی ستالین دەربارەی ئۆپەراسیۆنی باربارۆسا یەک بگرێتەوە، خۆی لەنێوچوو لەکاتێکدا ستالین ژیا.

چەند زانیارییەکی تری هەواڵگریش ئاماژەیان بە هێرشە چاوەڕوانکراوەکە دابوو. ئارنێ کارل-ئۆگەست بیولینگ (۱۹۰۵-۱۹۸٦) بیرکاریزانێکی سویدی بوو کە توانی کۆدێکی نازی بشکێنێت بەناوی (Geheimfernschreiber)، واتە "شیفرەی ماسی،" کە لەلایەن نازییەکانەوە بەکاردەهات بۆ بۆ ناردنی لەڕێگای سویدەوە بۆ ناوچە داگیرکراوەکانی نەرویج. زانیارییەکانی بیرکاریزانەکە بووەهۆی ئەوەی زانیاری پێشوەختە بدەن بە سویدییەکان دەربارەی ئۆپەراسیۆنی باربارۆسا. لە بەرواری یازدەی حەزیرانی ۱۹٤۲،

ئەوان هەموو هەوڵێکی خۆیان خستەگەڕ بۆ شکاندنی ئەو پەیامەی کە فەرماندار‌ی هێزە داگیرکەرەکانی نازی لە نەرویج کۆنترۆڵی ناوچەی لاپلانی فینلەندی کردووە وە کە ژمارەیەکی زۆری سەرباز لەو شوێنەدا کۆکرونەتەوە. ویسنتن چێرچل زانیارییەکی گرنگی هەواڵگریی جووڵە سەربازییەکانی نازی بۆ ستالین نارد. وشیارکردنەوەکە زانیاری وردی تیادا بوو کە لە (Ultra)وە هەڵێنجرابوون. بەریتانییەکان پێشتر توانیبوویان ئامێری ئێنیگمای نازییەکان بشکێنن و و بە زانیارییە شکێنراوەکانی ئەو ئامێرەیان دەوت (Ultra). چێرچل زانیاری زۆر پشتڕاستکەرەوەی بە ستالین وت دەربارەی هێرشەکە، کە پێی وت ئەو زانیارییانە لە سەرچاوەیەکی پشتپێبەستراوەوە دەستی کەوتووە، کە مەبەست لێی ئەو پەیامانە بوو کە لە ئامێرەکەوە دەستیان کەوتووە. هەروەها بەریتانییەکان (ساندۆر ڕۆدی)یان بەکارهێنا کە ئەندامێکی هەنگاری بازنەی "Lucy " سیخوڕی سۆڤیەت بوو کە چالاکییەکانیان لە وڵاتی سوید بوو، بۆ ناردنی زانیاری ورد بۆ سۆڤیەت. سەرچاوەی زانیارییەکە لە پەیامە شکێنراوەکانی (Ultra)وە بوو. "Lucy " لەبەرواری ١٤ی حەزیرانی ١٩٤٢ بە ستالینی ڕاگەیاند کە هێرشەکە لە ٢٢ی هەمان مانگ ئەنجام دەدرێت، واتە دوای تەنیا هەشت ڕۆژ. نزیکەی سەد ئاگادارکردنەوەی پشتپێبەستراو گەیشتنە مۆسکۆ، کە چەندینیان زانیاری وردی تیادا بوو دەربارەی ئۆپەراسیۆنی باربارۆسا، بەڵام هەموویان لەلایەن ستالینەوە ڕەتکرانەوە. ئەو گوێی بە هیچ یەکێک لەم زانیارییانە نەدا و وتی کە ئەم زانیارییانە تەنیا پروپاگەندە، زانیاری هەڵە، وە دەکرێت فرتوفێڵ بن. ئامانجی فریودانەکە لە مێشکی ستالیندا ئەوە بوو کە بەریتانییەکان بۆیە ئەم زانیارییانە دەدەن کە جەنگی نازییەکان لە کۆڵ خۆیان بکەنەوە، سۆڤیەت تووش بکەن. بەمەش، بەریتانییەکان دەتوانن خۆیان ڕێکبخەنەوە.

هەروەها، باڵیۆزی ئەڵمان لە یەکێتی سۆڤیەت، کاونت فرێدرچ ڤۆن شولنبێرگ، زانیاری گرنگی لەمەڕ ئۆپەراسیۆنەکە بە حکومەتی سۆڤیەت بەخشی. ناوبراو کە دژی جەنگەکە بوو، بە ڤلادیمێر دیکانۆزێڤ، باڵیۆزی سۆڤیەت، ڕاگەیاند کە هێرشێک لە ئارادا بووە. ستالین زانیارییەکەی وەک زانیاری هەڵە وەسف کرد.

بەپێچەوانەی ئەو زانیارییەی کە ستالین بەدەستی فەرامۆشی کرد زانیارییەک بوون کە هیتلەر هەرگیز بەدەستی نەهێنان. ناوبراو زانیاری هەواڵگری راستەخۆی زۆر سنوورداری هەبوو لەمەڕ یەکێتی سۆڤیەت. پێدەچوو ئەڵمانەکان ئەوەندە گرنگییان بە زانیاری هەواڵگریی نەدابێت وەک ئامرازێک بۆ دانانی پلانی ئۆپەراسیۆنی سەربازیی. ئەمانیش، لەئەنجامی ئەم کەمتەرخەمییەدا، لە چەندین جەنگدا شکستیان هێناوە.[i]

## ئۆپەراسیۆنی چەناگەی هەڵۆ

دوای ٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧٩، قوتابیانی شۆڕشگێڕی ئێرانی دەستیان بەسەر باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تەهراندا گرت. پلاندانەرانی وەزارەتی بەرگریی یەکسەر فەرمانیان بە هێزەکانی دەلتا و یەکەی ئۆپەراسیۆنە تایبەتییەکانی سوپای ئەمریکاوە کرد بۆئەوەی فەرمانبەرانی رزگاربکەن. کێشەی هەری مەزن ئەوە بوو کە سی ئای ئەی هیچ ئەفسەرێکی نهێنی لەو شوێنەدا نەبوو چونکە ئەوانیش لە باڵیۆزخانەکەدا بە بارمتە گیرابوون. بەڵام لەکاتی ئەرکەکەدا بەلایەنی کەم حەوت پۆلیسی نهێنی ئەمریکی هاوکاربوون لە ئاسانکاری بۆ ئۆپەراسیۆنەکە.

ریچار میدۆ، ئەفسەری خانەنشین لە هێزەکانی تایبەتی سوپای ئەمریکا و تازەدامەزراو وەک راوێژکاری هێزەکانی دەلتا، خاڵی پەیوەندی سەرەکی بوو. سی ئای ئەی پێی وابوو ئەو پیاوە ناتوانێت ئەرکەکە بەجێ بگەیەنێت، بەڵام بەدوودڵیەوە هەڵیبژارد دوای ئەوەی سەرهەنگ چارلس بێکویس، بەرپرسی هێزەکانی دەڵتا و ئۆپەراسیۆنی

---

[i] Fowler, Will. Barbarossa: The First ٧ Days. Havertown, PA: Casemate, ٢٠٠٤.
-Grant, Gordon R. Barbarossa: The German Campaign in Russia: Planning and Operations, ١٩٤٠– ١٩٤٢. Victoria, BC: Tafford Publishing, ٢٠٠٦.
-Murphy, David. What Stalin Knew: The Enigma of Barbarossa. New Haven, CT: Yale University Press, ٢٠٠٦.
-Pleshakov, Constantine. Stalin's Folly: The Tragic First Ten Days of WWII on the Eastern Front. Boston: Houghton Mifflin, ٢٠٠٦.
-Stephan, Robert W. Stalin's Secret War: Soviet Counterintelligence against the Nazis, ١٩٤١–١٩٤٥. Lawrence, KS: University of Kansas, ٢٠٠٤.
-Whaley, Barton. Codeword Barbarossa. Boston: MIT Press, ١٩٧٤.

زەمینی چەناگەی هەڵۆ، روونی کردەوە کە ئەو ئەرکەکە جێبەجێ ناکات تاکو یەکێک لە پیاوەکانی سەرەتا نەچێت.

میدۆ لەژێر ناوی ریچارد کیس، هاوڵاتیی ئێرلەندی لە کۆمپانیایەکی ئۆتۆمبیلی ئەورووپی، بەرەو ئێران بەڕێکەوت. ئەرکە ناوبراو بریتیی بوو لە دیاریکردنی حەشارگەیەک لە یەکەم قۆناغی ئەرکەکەدا، دۆزینەوەی شوێنێک بۆ نیشتنەوەی هەلیکۆپتەرێک، ئەنجامدانی چاودێریکردنی دەرووبەری باڵیۆزخانەکە بە دووری بازنەیی ٢٧ هێکتار، وە ئەگەر بکرێت بزانێت شوێنی دروستی هەر ٥٣ بارمتەکە دەکەوێتە کوێ. هەروەها دەبوایە چەند ئۆتۆمبیلێکیش بکرێت بۆ گواستنەوەی تیمی ١٠٦ کەسی هێرش بردن لە دووری پەنجا میل لە شوێنی دەستپێکردنی قۆناغی یەکەم بۆ باڵیۆزخانەکە.

ئەرکەکە لەنیوەی شەودا بەهۆی ئەوەی لەکۆی هەشت هەلیکۆپتەر سیانیان تووشی گرفتی میکانیکی بوون، دووانیان بەهۆی کاریگەری گەردەلولێکی تۆزەوە، تووشی گرفت بوو. لەماوەی خۆئامادەکردن بۆ فڕین، پەروانەی هەلیکۆپتەرێک خۆی کێشا بە فڕۆکەیەکی پێدانی بەنزین، ئەمەش بووە هۆی تەقینەوەیەکی گەورە و بەهۆیەوە هەشت ئەمریکی گیانیان لەدەستدا. لەم سەینوبەینەدا، خەریک بوو کارەکەی میدۆ بکەوێتە مەترسییەوە چونکە ئەو دوو هەلیکۆتەرەی لە ژاپۆندا جێهڵرابوون بەڵگەنامە و کاغەزی ئەرکەکەیان هێشتا تیادا بوو، تەنانەت ئەو نەخشەیەشی تیادا بوو کە شوێنی نیشتنەوەی هەلیکۆپتەرەکەی تیادا دەستنیشانکرابوو. لەبەختی خۆی، دوو رۆژ دواتر میدۆ توانی لە تەهرانەوە بەبێ هیچ کێشەیەک بە فڕۆکەیەکی بازرگانی سویسری ئەو وڵاتەی جێبهێڵێت.[i]

---

[i] Griswold, Terry, and D. M. Giangreco. Delta, America's Elite Counterterrorist Force. Osceola, WI: MBI Publishing Company, ١٩٩٢.
-Martin, David C. "Inside the Rescue Mission," Newsweek (July ١٢, ١٩٨٢), ١٦–٢٠, ٢٢, ٢٥.

## بەکارهێنانی باڵۆن بۆ سیخوڕی

باڵۆن شێوازێک بوو لە کۆکردنەوەی هەواڵگری ئاسمانیی کە بەتایبەتی بەکارهات لەماوەی جەنگی نێوخۆیی ئەمریکا و دواتر وەک بەشێک لەفەیلەقی سوپای هێمایی رۆڵێکی کارای گێڕا. لەماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا بەکارهێنانی باڵۆن بەهۆی داهێنانی فڕۆکەوە بایەخی خۆی لەدەستدا.

باڵۆن بەمەبەستی چاودێری و کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی لەلایەن هەردوو بەرەی هێزی *یەکێتی* و *کۆنفیدراڵی* لەماوەی ساڵانی سەرەتای جەنگی ناوخۆیی بەکار دەهاتن. سوپای یەکێتی (Union) لەم نێوەندەدا زۆر سەرکەوتووتر بوو لە هێزەکانی کۆنفیدراڵی (Confederate). بۆیە، بەرلە چەندین ساڵ لە "جەنگی نێوان ویلایەتەکان،" بەکارهێنانی باڵۆن بۆ سیخوڕیکردن بوو بە دامەزراوەیەکی گرنگ، بەتایبەتی لە ئەوروپا. لەماوەی شۆڕشی فەرەنسیدا یەکەیەکی تایبەت بە باڵۆن بەناوی (Iter Compagnied' Aerostiers) دروستکرا، و لەماوەی جەنگی فلیوروس (Battle of Fleurus)ی ساڵی ١٧٩٤ بەکارهێنرا. بەشێوەیەکی گشتی، بەکارهێنانی کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبوو لە بەدەستهێنانی زانیاری گرنگ و پێویست، بەڵکو زیاتر دەبووە هۆی تێکدانی ورەی دوژمن. سەرەڕای تێکردنی هەوا و گواستنەوەی و ئەو ئەرکە هێواشەی ئەنجامیدەدا، کێشەکە لەڕووی هەواڵگرییەوە ئەوەنەبوو کە چاودێری چ شتێک دەکرێت، بەڵکو زیاتر بریتیی بوو لە رێگاگرتن لەوەی کە لەڕووی ستراتیژ و تەکنیکەوە لە بەرەکانی دوژمندا دەگوزەرا.

کاتێک ئەگەری جەنگی نێوخۆیی تا دەهات زیاتر دەبوو، چەندین کەسایەتی لە سەرەتای مانگەکانی ساڵی ١٨٦١ پەنایان بردە بەر وەزارەتی جەنگی ئەمریکا بۆئەوەی هانی بدەن باڵۆن وەک سەرچاوەیەکی هەواڵگریی بەکاربهێنن. ئەو کەسایەتیانەش بریتیی بوون لە تادۆس لوی، جۆن وایز، وە جۆن لامۆنتێن، کە

بەنەبراوەیی هانی ئیدارەی سەرۆک (لینکۆڵن)یان دەدا بۆئەوەی فەیلەقێکی باڵۆن دروست بکات وەک بەشێک لە ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی بەرەی جەنگ[1]

تادیۆس لوی چاودێری جەنگێکی ناوخۆیی لە باڵۆنەکەیەوە لە شاری ڤێرجینیا لە مانگی ئایار تا ئابی ١٨٦٢، دەکات. (وێنەکە لە پەرتوکخانەی گشتی کۆنگرێس وەرگیراوە)

## بازنەی سیخوڕیی لوسی

بازنەی سیخوڕیی لوسی ئۆپەراسیۆنێکی دژە-ئەڵمانی بوو کە سەرنجی دەخستە سەر ڕێگاگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئایدۆلۆژیای فاشیزم لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەم. ئەم بازنەیە زانیاری زۆر گرنگی بە سەرکردەکانی کۆمارەکانی سۆشیالیستی یەکێتی

[1] Brown, J. Willard. The Signal Corps, U.S.A. in the War of Rebellion. Boston: U.S. Veteran Signal Corps Association, ١٨٩٦.
-Coggins, Jack. Arms and Equipment of the Civil War. Wilmington, NC: Broadfoot Publishing, ١٩٩٠.
-Haydon, F. Stansbury. Aeronautics in the Union and Confederate Armies with a Survey of Military Aeronautics to ١٨٦١. Baltimore, MD: The Johns Hopkins University Press, ١٩٤١.

سۆڤیەت (USSR) بەخشی. ناوی بازنەی سیخوڕیی لوسی لە ناوی شیفرەداری "لوسی"یەوە هاتووە کە رودۆلف رۆیسلەر بەکاریدەهێنا بۆ چالاکییە سیخوڕییەکانی.
بەسەرپەرشتی رودلف، بازنەی سیخوڕیی لوسی زانیاری زۆری کۆکردەوە دەربارەی ئۆپەراسیۆن و ستراتیژیەتی ئەڵمانەکان. ئەم بازنەیە پێکهاتبوو لە بازنەیەکی ئاڵۆزی پەیوەندی هەواڵدۆزەکان لە دەزگا هەواڵگرییەکانی یەکێتی سۆڤیەت، بەریتانییەکان، و سویسرا. بازنەکە لە سێ تۆڕی سەرەکی سیخوڕیی پێکهاتبوو، وە ئەدۆلف کەسی سەرەکی بوو لە بەیەکەوە بەستنی ئەو تۆڕە سیخوڕیانە. ئەدۆلف لەساڵی ١٨٩٧ لە شاری کوفبیورن، ئەڵمانیا، لەدایک بووە. بەرلەوەی بچێتەناو جیهانی سیخوڕیەوە، ناوبراو وەک بەڕێوەبەر لە دەزگایەکی ئەڵمانی شانۆی میللی کاری دەکرد. لە میانەی کارکردن لەم پێگەیەدا توانی پەیوەندی لەگەڵ چەندین کەسایەتی لە هەردوو پارتی لیبراڵ و کۆنزێرڤاتیز لەسەرتاسەری ئەڵمانیا پەرەپێبدات. هەروەها، چەند کەسێکی لەناو سوپای ئەڵمانیا دەناسی کە هاوسۆز بوون لەگەڵ دۆزی دژەفاشیزمی و بەم هۆیەوە زانیاری گرنگیان بە ئەدۆلف بەخشی.
یەکێک لە تۆڕەکان لەلایەن ساندرۆ رادۆ سەرپەرشتی دەکرا کە ناوە نهێنییەکەی "ئەلێکس" بوو. ناوبراو جوگرافیناسێکی هەنگاری بوو، کە لە شاری بوداپێستی پایتەختی ئەو وڵاتە لەساڵی ١٨٩٩ لەدایک ببوو. ناوبراو لەوکاتە پەیوەندی بە سوپای سووری هەنگارییەوە کرد کە شۆڕش هەرەسی هێنا و بەمەش ناچاربوو رابکات. لەوکاتەی زانستی جوگرافیای لە زانکۆدا دەخوێند، ناوبراو هەڵسا بە دروستکردنی ئەتڵەسێکی زۆر وردی یەکێتی سۆڤیەتی ئەوکات کە بووە هۆی پێدانی زانیاری گرنگ بۆ بازنەی سیخوڕیی لوسی و هاوپەیمانەکان. لەساڵی ١٩٣٥، رادۆ پەیوەندی بە سووپای سوورەوە کرد وە چووە وڵاتی سویسرا. پەیوەندییە بازرگانییەکانی لە ئەمریکادا و زانیارییە جوگرافییەکانی وایلێکرد ببێت بە سەرمایەیەکی بەهادار بۆ بازنەی سیخوڕیی لوسی. لەوکاتەی وەک هەواڵدۆزێک لە بازنەکەدا کاری دەکرد، رادۆ لەژێر لەژێر پیشەیەکی نهێنییدا کاری بۆ گۆڤارێکی

جوگرافی دەکرد. ئەمە بووەهۆی ئەوەی بتوانێت لەسەرتاسەری ئەورووپا و یەکێتی سۆڤیەت کاربکات بەبێ ئەوەی تووشی هیچ گرفتێک ببێت.

ئالان فوتی سەرکردایەتی دووەم تۆڕی دەکرد لە بازنەکەیدا و سەرەتا کارەکەی لە سیخوڕیدا دەگەڕێتەوە بۆ هاوینی ١٩٤٧. لە نێواراندا، زانیارییەکانی دەگواستەوە بۆ پەیوەندییەکانی بۆنەوەی بە حکومەتی سۆڤیەت بگەن. رادۆ گومانی هەبوو لە دڵسۆزی فوتی و گومانەکەشی لەوە سەری هەڵدابوو کە ناوبراو سیخوڕی دووسەرەیە، و کاردەکات بۆ هەواڵگری بەریتانی. سەرەڕای ئەمەش، بازنەی سیخوڕیەکەی بەردەوام بوو لە پشتبەستن بەناوبراو چونکە ئەویش لەبەرامبەردا سلی نەدەکردەوە لە پێدانی زانیاری بەهادار و متمانەپێکراو. بەهۆی ئەو خزمەتی لە جەنگی جیهانی دووەمدا پێشکەشی کرد، فوتی پلەی رائیدی لە سوپای سۆڤیەتی پێبەخشرا و چوار سوپاس و پێزانینی فەرمی بەهۆی کارە ناوازەکانی وەرگرت.[i]

سێیەم لقی لەلایەن کۆمۆنیستی بەناوبانگ راشێک دوبندۆرفەر سەرپەرشتی دەکرا. ئەو ئافرەتە بەهۆی ئایدۆلۆژیەتی کۆمۆنیزمەوە هاندرابوو، ئەمەش رێگاخۆشکەر بوو بۆ رێگرتن لە بڵاوبوونەوەی فاشیزم.

بەبەکارهێنانی ئەو تۆڕانە، رۆیسلەر پەیوەندی بە رادۆ کرد بۆنەوەی ئەمیش پەیوەندییەکانی بەکاربهێنێت لە سویسرا بەهۆی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت. پاشان، رادۆ زانیارییەکانی گواستەوە بۆ سۆڤیەتییەکان. ئەو زانیارییانە بەو مەرجەی پێشکەشی سۆڤیەتییەکان دەکرا کە هەوڵنەدەن سەرچاوەی ئەو زانیارییانە ئاشکرا بکەن. ئەمە مەرجێکی سەرەکی بوو کە بووە هۆی پاراستنی سیخوڕەکانی بازنەی سیخوڕیی لوسی و هەواڵدەرەکانیان. بازنەکەی پەیوەندی لەگەڵ ناوەندی سۆڤیەت گرێدا، کە دەزگای سەرەکی بوو بۆ کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاری بۆ سەرکردەی سۆڤیەت لە هەواڵگری ئەو وڵاتەدا. جگە لەو زانیارییانەی لەلایەن سیخوڕانەی بازنەکە دەدرانە مۆسکۆ، جاری واش هەبوو سۆڤیەت داوای زانیاری تایبەتی لە بازنەکە دەکرد

---

[i] Brown, Paul. "Report on the IRR File on the Red Orchestra," The U.S. National Archives & Records Administration. http://www.archives.gov/iwg/research-papers/red-orchestra-irr -file.html (accessed December ٢١, ٢٠٠٦).

دەربارەی نەیارەکانیان، وەک زانیاری ورد دەربارەی شوێن و پێگەکانی سوپای ئەڵمانی.[i]

یەکێک لە نموونە هەرەدیارەکانی پێدانی زانیاری گرنگ بە سەرکردە سۆڤیەتییەکان بریتیی بوو لە پەیامێک کە لەلایەن (دۆرا)ی سیخوڕەوە پێشکەش کرا. لەسەرەتای ئابی ١٩٤١دا، دۆرا پەیامێکی نارد کە تیایدا سەرکردەکانی سۆڤیەتی ئاگادارکردەوە لەوەی ژاپۆنییەکان هێرش ناکەنەسەر یەکێتی سۆڤیەت. هۆکاری گەیشتنی سەرکردە ژاپۆنییەکان بەم بڕیارە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە چونکە ئەڵمانیا بەسەرکەوتوانە لە چەندین جەنگدا نەیتوانیبوویان شکست بە سۆڤیەت بگەیەنێت. ئەم زانیارییە گرنگە بوو بە بنچینەی بڕیاری سۆڤیەت بۆئەوەی هێزەکانی بجوڵێنێت لە نزیکترین شوێن لە ژاپۆنەوە بەرەو ئەو ناوچانەی نزیکتربوون لە بەرەی خۆرئاوا و مۆسکۆوە. دواتر ئەم هێزانە بایەخێکی زۆریان هەبوو لە بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی ئەڵمانیا. ئەم زانیارییە گرنگەی لەلایەن بازنەکە پێشکەشکرا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر دەرئەنجامەکانی جەنگی جیهانیی دووەم.

بازنەکەش بێ گرفت نەبوو، جارجارە تووشی گرفتی ناردنی زانیارییەکان دەبوو. ئەوان بەشێوەیەکی فراوان پشتیان بە رادیۆ دەبەست بۆ ناردنی پەیامەکانیان بۆ حکومەت. لەکاتی گواستنەوەی پەیامێکی گرنگ لە ئۆکتۆبەری ١٩٤١ بۆ مۆسکۆ، سیگناڵەکە لەپڕەوە بڕدرا. پەیامەکە نەگەیشتە شوێنی مەبەست چونکە لەوکاتەدا مۆسکی لەژێر ئابڵووقەی سوپای ئەڵمانیا بوو. دەکرێت هۆکارەکە هەر ئەوە بووبێت کە ئەو کەسەی لە حکومەتی سۆڤیەت سیگناڵەکانی وەردەگرت ناچاربووبێت ئەو باڵەخانەیە چۆڵبکات کە ئامێری وەرگرەکەی لێبووە.

دوابەدوای کارەساتە سەربازییەکەی ساڵی ١٩٤٢ لە خارکۆف، ستالین لۆمەی ناوەندی هەواڵگری سۆڤیەتی کرد بەوەی زانیاری هەڵەیان پێدراوە. لە وەڵامدا، ناوەندەکەش لۆمەی هەواڵدەرەکەیان کرد لە بازنەی سیخوڕیی لوسیدا. بەم هۆیەوە، بازنەکە لە

---

[i] Mulligan, Timothy P. "Spies, Ciphers and 'Zitadelle': Intelligence and the Battle of Kursk, ١٩٤٣," Journal ofContemporary History ٢٢ (١٩٨٧), ٢٣٥–٢٦٠.

مۆسکی پێگەکەی لەدەستدا. بازنەکە هۆکاری ئەم چەندە دەگەڕێنێتەوە بۆ پچڕاندی پەیوەندی لەناو دەزگای هەواڵگری بەریتانیەوە. بەبێ ئەم پەیوەندییە گرنگانە، سیخوڕەکانی بازنەکە نەیاندەتوانی زانیاری گرنگ وەچنگ بخەن. دوای ئەوەی بازنەکە زانیاری وردی دەربارەی جووڵەکانی سوپای ئەڵمانی بەخشی، پشتیوانییەکەی لەلایەن سۆڤیەت بۆ گەڕایەوە.
بەئاگاداربوون لە هەڕەشەی بازنەی سیخوڕیی لوسی، ئەڵمانیا بەبێ وچان کاری دەکرد بۆ لەناوبردنی. بەئاشکرابوونی فوتی وەک هەواڵدۆزە سەرەکییەکە، ئەڵمانیا هەموو چەندین هەوڵیدا بۆ رفاندنی ناوبراو. کاتێک حکومەتی سویسرا بە شوێنی بازنەکەی زانی لەنێو وڵاتەکەیدا، تۆرە سیخوڕییەکە داخرا. چەندین سیخوڕی بازنەکە دەستگیرکران، یەکێک لەوانە فوتی بوو. دوای زیندانیەکی کورت، فوتی بەهۆی داپێدانانێکی ناڕوونەوە ئازادکرا.[i]

## تونێلی بەرلین

تونێلی بەرلین ئۆپەراسیۆنێکی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی هاوبەش بوو لەنێوان ئەمریکا و بەریتانیا. ئامانجی ئەم ئۆپەراسیۆنە لێدانی تونێلێک بوو لەژێر بەرلین بۆئەوەی ئەو کێبلە ژێرزەمینانەی پەیوەندییە گەیاندنەکانی سۆڤیەتییان دەگواستەوە بتوانرێت گوێی لێ بگیرێت و ببڕدرێن. بەرلین شوێنێکی سەرنجڕاکێش بوو، نەک تەنیا بەهۆی کۆنترۆڵی سۆڤیەت بەسەر خۆرهەڵاتی بەرلین، بەڵکو چونکە بەرلە جەنگەکە وەک پایتەختی ئەڵمانیا خاڵی سەرەکی بوو بۆ پەیوەندییەکانی نێوان پایتەختە ئەورووپییەکانی وەک وارشۆ، پۆلەندا، و بوخارێست، رۆمانیا.

---

[i] Read, Anthony. Operation Lucy, Most Secret Spy Ring ofthe Second World War. London: Hodder & Stoughton, ١٩٨٠.

تونێلی بەرلین لەکاتی دروستکردنیدا

کۆکەرەوەکانی زانیاری هەواڵگریی دەستیانکرد بەسەرنج خستنەسەر کۆنترۆڵکردنی ئەم کێبلانە لەساڵی ۱۹٥۲ لەوکاتەی ئەم جۆرە پەیوەندییە بەخێرایی جێگای پەیوەندی وایەرلێسی وەک سیستەمی گەیاندن دەگرتەوە. ئەم چەشنە بەرنامەیە پێشتر لە ڤییەننا هەبوو بەڵام سروشتی بەرزونزمی بەرلین کارەکەی زۆر قورستر کردبوو. بڕی تێچووی ئۆپەراسیۆنە بە شەش ملیۆن و پێنج سەد هەزار دۆلار خەملێنرا. پرۆژەکە لەلایەن بەڕێوەبەری هەواڵگریی ناوەندی، ئالێن دولێس، لە ۲۰ کانوونی دووەمی ۱۹٥٤ ڕەزامەندی لەسەردرا. بنیادنانەکە هەر لە مانگی دواتردا دەستی پێکرد، و لە کۆتایی شوباتی ۱۹٥٥ کۆتایی پێهات. قەبارەی ئەو زانیارییەی لەم ڕێیەوە بەدەستیان گەیشت پڕبایەخ بوو. نزیکەی چل هەزار کاتژمێر قسەکردنی تەلەفۆن تۆمارکرا، و نزیکەی شەش ملیۆن کاتژمێر بروسکە بەکۆی گشتی تۆمارکرا. لە ۲۱ نیسانی ۱۹٥٦ دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت زانی کە شتێکی لەم باباتە بوونی هەیە.

وەک ئۆپەراسیۆنێکی هەواڵگریی، پرۆژەی تونێلی بەرلین چەندین مشتومڕی لەخۆگرتبوو. یەکەمیان پەیوەندی بە بنەڕەتی پلانەکە هەیە. هەندێ لە گێڕانەوەکان سەرەتای بەکارهێنانی ئەم پلانە دەگەڕێننەوە بۆ ڕینهارد گیهن، کە کەسایەتییەکی

گرنگ بوو لە سیستەمی هەواڵگری ئەڵمانیای نازی و ئەمەش یارمەتی ئەمریکای دەدا بۆئەوەی رێکخراوێکی هەواڵگری ئەڵمانیای غەربی دابمەزرێنێت بەم بیرۆکەیە. لەکاتێکدا هەندێک گێرانەوەی تر ئەم بۆچوونە رەتدەکەنەوە، ئاماژە بەوە دەدەن کە بەریتانیا لەساڵی ١٩٤٨ لە ڤییەننا ئەم کارەی کردووە و رووسەکانیش کێبلی سوپای ئەمریکایان بڕیبوو لە پۆست دام، هەربۆیە ئەمە بیرۆکەیەکی تەواو نوێ نەبوو. دووەم، ئایا تا چ ئەندازەیەی ئەو زانیارییانە بەدەست هاتبوون لەو ئۆپەراسیۆنە گرنگی خۆیان هەبوو لە رووی هەواڵگرییەوە.[i]

## ئۆپەراسیۆنی ئەڵماس

لەماوەی شەستەکانی سەدەدەی رابردوودا، جەنگی سارد لەنێوان هەردوو زلهێزەکەی جیهان، یەکێتی سۆڤیەتی جاران و ئەمریکا، بەدژواری روویدا. بەم هۆیەشەوە، هەر یەکیان دەیویست دۆست بۆلای خۆی رابکێشێت، چەکی مۆدێرن بەرهەم بهێنن، و جبخانەکانیان پڕکەن لە چەکی پێشکەوتوو. بەم بۆنەوەیەوە، یەکێتی سۆڤیەت لە پەنجاکان و شەستەکانی سەدەدەی رابردوودا هەڵسا بەدروستکردنی فڕۆکەیەک بەناوی میگ-٢١. پێکهاتەی ئەم فڕۆکەیە بە تەکنیکێکی وابەرز بەرهەمهێنرابوو کە چەندین نهێنی مەزنی لەخۆگرتبوو. تەنیا وڵاتانی پەیمانی وارشۆ و هەندێ وڵاتی وەک ئێراق، میسر و سووریا ببونە خاوەنی ئەم جۆرە فڕۆکەیە، هۆکاری ئەوەی کە ئەم وڵاتانەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەم چەکانەیان کڕیبوو بریتیی بوو لە دوژمنایەتی نەیارێکی نوێی لەناوچەکەدا کە ئەویش ئیسرائیل بوو.

دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل (مۆساد) و ئەمریکا بەلێبڕاوانە کاریان دەکرد بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر ئەم فڕۆکە نوێیەی سۆڤیەت. بۆ ئەم مەبەستەش،

---

[i] Murphy, David, Sergei Kondrashev, and George Bailey. Battleground Berlin: CIA vs. KGB in the Cold War. New Haven, CT: Yale University Press, ١٩٩٧.
-Stafford, David. Spies Beneath Berlin. New York: The Overlook Press, ٢٠٠٣.
-Steury, Donald (ed.). On the Front Lines of the Cold War: Documents on the Intelligence War in Berlin, ١٩٤٦ to ١٩٦١. Washington, DC: Center for the Study of Intelligence, ١٩٩٩.

ئیسرائیل یەکەم هەنگاوی خۆی لەساڵانی شەستەکاندا خستەگەڕ بەهۆی چەند ئەفسەرێکی سەربازی سیخوڕی بەکرێگیراو لە میسر و نزیکەی یەک ملیۆن دۆلاری بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکرا. سەرئەنجام، کارەکەیان شکستی هێنا و ئەنجامدەرانی ئۆپەراسیۆنەکەش بەسزای سێدارە گەیەنران. مائێر عامێت، کە تازە سەرۆکایەتی دەزگای مۆسادی گرتبووە دەست، هەموو هەوڵێدەدا پێگەی دەوڵەتی تازەی ئیسرائیل لە جیهاندا لەڕووی هێزەوە پەرەپێبدات. دەوترێت کە پێشتریش عزارا وایزمان، فەرماندەی هێزی ئاسمانی ئیسرائیل، هەوڵی دەستخستنی ئەم فڕۆکەی داوە بەڵام شکستی هێناوە. لە سەردانێکیدا بۆلای لیڤی ئەشکۆل، وەزیری بەرگری، مۆردیخای هود پرسیاری لێکردووە کە پێویستی بە چی هەیە. ئەمیش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: "من تەنیا پێویستم بە فڕۆکەی مێگ-٢١ە." پلانی سەرەتای ناوبراو بریتیی بووە لەوەی کە فڕۆکە میسری و سوورییەکان ناوچاربکات لە فڕۆکەخانەی تەل ئەبیبدا بنیشنەوە بەڵام بەهۆی تەکنیکی خێرای ئەو فڕۆکەیە بیرۆکەکە نەچووە باری جێبەجێکردنەوە.

هەروەک باسکرا، مائێر عامێت ئەوکات تازە سەرۆکایەتی مۆسادی گرتبووە ئەستۆ، چەندین هەوڵیدا بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر ئە فڕۆکەیە، بەڵام هەموو هەوڵەکان شکستیان هێنابوو. بۆیە، ئەمجارە هەڵێکی تری بۆ هاتەپێشەوە کە لەڕێی سیخوڕێکی ئافرەتی جوانەوە بەناوی لیزا دەستیان بە مونیر رەدفا بگات و بەمەش ناوبراو کەوتەناو داوی مۆسادەوە. چەند سەرچاوەیەکیش ئاماژە بەوە دەکەن کە مونیر بەهۆی ئەوەی لە ئاییندا مەسیحی بووە و ناڕەحەت بووە لە مامەڵەی عەرەبە موسڵمانەکان و تۆپبارانکردنی ناوچە کوردنشینەکانی کوردستان، بۆیە هەڵساوە بە بەستنی پەیوەندییەکی سۆزداری لەگەڵ بارباڕای (ئەمە بەگوێرەی سەرچاوەیەکەی ناو باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا) هاوسەرۆکی کۆمپانیای نەوتی ئێراقی، ئامانج لەمە کارەی ناوبراو تەنیا راکردن بوو لە ئێراق. بەڵام، مۆساد بەهۆی سیخوڕێکەوە لە بەغدا بەناوی یوسف مەنشۆ ئەم دەرفەتەی قۆستەوە. چیرۆکی ژیانی مونیر رەدفا بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەست پێدەکات.

ناوبراو ناوی تەواوی مونیر جەمیل حەبیب رەدفا بوو، کە لەساڵی ١٩٢٤ لە بەغدا لەدوایيک ببوە، وە لەساڵی ٢٠٠٠ کۆچی دوایی کردووە. ناوبراو بەهۆی گەشتێکی بۆ پاریس کەوتە داوی خۆشەویستی کچێکی شۆخوشەنگی جووی ئەم وڵاتەوە کە ئەرکی تەنیا تەجنیدکردنی مونیر بوو لەو شارەدا. کاتێک زانرا ئەو کچە جوانە توانیویەتی مونیر بخاتەنێو داوی خۆیەوە (بەهۆی چەند جارێک سەرجێیکردنەوە)، سەرانی مۆساد لەخۆشیان باڵیان گرت. مونیر فڕۆکەوانێکی لێهاتووی ئێراقی بوو کە پلەکەی سەربازییەکەی نەقیب بوو. رەچەڵەکی ناوبراو دەگەڕێتەوە بۆ رۆژهەڵاتی تورکیا کە کۆچیان کردبوو بەرەو شارۆچکەی تلکێف و لەسەر باوەڕی ئایینی مەسیحی بوون. باوکی ناوبراو فەرمانبەری کشتوکاڵ بوو، بەهۆی وەرگرتنی بەرتیلەوە لەسەرکار دەرکرابوو. چیرۆکی کەوتنەنێو داوی مۆساد لەساڵی ١٩٦٤ دەست پێدەکات.

بەهەڵوەستەکردن لەسەر فڕۆکەی مێگ-٢١ و هۆکارەکانی فڕاندنی ئەم فڕۆکەیە لەلایەن دەزگای مۆسادەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم فڕۆکەیە داهێنانێکی هەرەپێشکەوتووی یەکێتی سۆڤیەت بووە لەبواری سەربازیی چونکە خێرایی و زۆری ئەو سووتەمەنییەی لەو فڕۆکەیە بەکاردەهات زۆر جیاواز بوو لەوانەی ئێشتر. خێرایی ئەم فڕۆکەیە نزیکەی ٢٠٦٢ کیلۆمەتر بوو لە کاتژمێرێیدا، بەمەش خێراییەکەی زیاتر بوو لە فڕۆکەکانی فانتۆم، سکای هۆکی ئەمریکی، میراجی فەڕەنسی. لەڕووی قەبارەشەوە، باڵەکانی ٧,٤٠ مەتر پان و ١٥,٧٠ مەتر درێژ بوو کە هیچ کام لە فڕۆکە ئەمریکیی و فەڕەنسییەکانی بەم قەبارەیە نەبوون.

هەندێک لە شرۆڤەکارانی سیاسیی و دیرۆکڤانان ئەم ئۆپەراسیۆنە ئاماژە بەوە دەدەن کە فڕاندنی ئەم فڕۆکەیە تەنیا بەهۆکاری بەدەستهێنانی زانیاری و تەکنەلۆژیای ئەم فڕۆکەیەوە نەبوو کە کەوتبووە ژێر دەستی نەیارانی ئیسرائیل، بەڵکو مەبەست لەوە بوو کە ئەو وڵاتە لەجەنگێکی دژواردابوو لەگەڵ هاوسێ عەرەبەکانی و بەمەش لەڕووی سەربازییەوە ئەوان تووشی شکست دەبوون.

دوای ئەوەی مونیر کەوتەناو داوی دەزگای مۆساد، مەرجێکی بۆ ئەو دەزگایە دانا بۆئەوەی ئۆپەراسیۆنەکە ئەنجام بدات: رزگارکردنی ژن و منداڵەکانی. ئەمانیش بەڵێنی

ئەوەیان بە مونیردا کە لە تەل ئەبیب بە خێزانەکەی شاد دەبێتەوە. لەکاتی ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنەکە، دەزگای هەواڵگری بەهۆی چەند سیخوڕێکەوە توانیان خێزانەکەی بە شارۆچکەی قەرەداغی کوردستانی باشوور، بەهاوکاری کوردەکان، بگەیەننە ئێران، دوای ماوەیەکی کەم لە ئیسرائیل بە رەدفا شاربوونەوە. پلان و ناوەڕۆکی ئۆپەراسیۆنەکە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو.[i]

لە بەرواری ١٦ی ئابی ١٩٦٦، ئەو رۆژەی تیپێک فڕۆکەی مێگ لەسەر راڕەوی فڕۆکەخانەی رەشید ئامادەبوون بۆ چەند کردەیەکی راهێنانی ئاسمان، کە یەکێکیان مونیر بوو، دەرفەتەکە هاتەپێش و نەدەبوایە بەفیڕۆبدرێت. مونیر بە تانکێکی پڕ لە سووتەمەنییەوە بەرەو سنوورەکانی باکوری ئوردن فڕی، ناوبراو لە کۆمەڵەکەی جیابووەوە کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی رادارەکانی ئوردن هەست بە مەترسی بکەن، هەربۆیە چەندین پەیامیان بۆنارد کە سنوورەکانی ئەو وڵاتە نەبەزێنێت بەڵام هیچ وەڵامی نەبوو. بەمەش، دوو فڕۆکەی ئوردنی فڕین بۆئەوەی بەهەر رێگایەک بێت بیوەستێنن. بەهۆی خێرایی فڕۆکەی مێگ، دوای دەربازوون لە سنووری ئاسمانی ئەو وڵاتە، نەیانتوانی چیتر بەدوایدا بچن و گەڕانەوە. دوای ئەوەی مونیر دەگاتە فڕۆکەخانەیەکی ئیسرائیل، دان بەوەدا دەنێت کە فڕۆکەکە دوا دڵۆپی سووتەمەنی خۆی سەرف کردووە، واتە ئەگەر ئەوکاتە نەگەیشتبایە ئیسرائیل، چانسی کەوتنی فڕۆکەکە بەهۆیکاری نەمانی سووتەمەنی سەدا سەد بوو.

ئەو هەواڵتنە بووە سەردێڕی تەواوی رۆژنامە جیهانی، ئێراقی و سۆڤیەتییەکان، کە ئەمەی دوای زۆر داوای کرد فڕۆکەکە بگەڕێننەوە. بەڵام، دەسەڵاتدارانی ئیسرائیلی داواکارییەکەیان رەتکردەوە. لەماوەی چەند هەفتەیەک، فڕۆکەکە لەلایەن فڕۆکەوان دانی شاپێرا فڕێنرایە ئەوپەڕی بەرزی ئاسمان وەک گاڵتەجاڕییەک بە فڕۆکەی میراجی فەرەنسی. لەکۆتاییدا، فڕۆکەکە بەشێوەیەکی زانستیانە شیکرایەوە و لەساڵی ١٩٦٨ تەکنیکی دروستکردنی بەرەو ئەمریکا نێردرا. ئێستا هەمان فڕۆکە لە مۆزەخانەی

---

[i] *عوسمان عومەر: ٤٩ ساڵ تێپەڕ بوون بەسەر فڕاندنی فڕۆکەی مێگ ٢١ ی هێزی ئاسمانی ئێراقی*
[online] wtarikurd. Available at: http://www.wtarikurd.info

بنکەی هێزی هێزی هاتزەریم دانراوە بۆ ئەوەی گەشتیاران سەیری بکەن. لەم نێوەندەدا مونیر رەدفا پاداشتێکی یەک ملیۆن دۆلاری پێبەخشرا و ژیانی خۆی و منداڵەکانی لەلایەن ئیسرائیلەوە دابینکرا. رفاندنی ئەم فرۆکەیە هاوکارییەکی باشی ئیسرائیلی کرد لە جەنگی شەش رۆژەی ساڵی ١٩٦٧ لەدژی هاوسێ عەرەبەکانی.[i]

## ئۆپەراسیۆنی مۆساد لە ئەرژەنتین

دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٨ دا دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزرا، یەکێک لەو ئەرکانەی ئەم دەوڵەتە تازەکە بەرگریکردن بوو لە دەستکەوتەکانی ئیسرائیل کە ئەم ئەرکەش دەکەوتە سەرشانی سوپای ئیسرائیل بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەزگای هەواڵگری ئیسرائیلی (مۆساد) ئەرکێکی گرانی کەوتەسەرشان کە ئەویش بەرەنگار بوونەوەی پلانی دوژمنانی ئیسرائیل بوو لە وڵاتە عەرەبییەکان و بەتایبەتی فەڵەستین، سوپای ئیسرائیل توانی کارامەیی خۆی بسەلمێنێت لە بەرگری کردن لە نیشتیمانەکەیان، بەڵام مۆسادیش توانی بەرەنگاری زۆربەی پلانە هەواڵگرییەکانی وڵاتە عەرەبییەکان ببێتەوە و شکست بە زۆربەیان بهێنێت، بێگومان ئەمە تاکە ئەرکی مۆساد نەبوو لەبەرئەوەی مێژووی ئەم دەزگا هەواڵگرییە دەگەڕێتەوە بۆ بەرلە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل و تەنانەت لە دامەزراندنی ئەو دەوڵەتەدا رۆڵی گرنگ و کاریگەری بینیوە. ئەفسەرانی مۆساد دوای دامەزراندنی ئیسرائیل سەرەڕای ئەوەی خاوەنی نەخشەی تایبەتی بوون بۆ پاراستنی ئیسرائیل لە هێرشە تیرۆرستیەکان لەگەڵ ئەوەشدا یەکێک لەو بنەمایانەی کاریان لەسەر دەکرد تۆڵەسەندنەوە بوو، کە ئەمەش لەمێژووی جوولەکاندا شتێکی تازە نییە و بنچینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ یاسای "چاو بەچاو، ددان

---

[i] Iraq, O. and Dsouza, +. (٢٠١٨). *Operation Diamond: The time Israel stole MIG-٢١ from Iraq*. [online] Defence Aviation. Available at: https://www.defenceaviation.com/٢٠١٦/٠٥/operation-diamond-the-time-when-israel-stole-mig-٢١-from-iraq.html [Accessed ٧ Jul. ٢٠١٨].

بە ددان"[i]ی پێغەمبەر موسا کە لە تەوراتدا ئاماژەی پێکراوە و تائەمڕۆش جووەکان پەیڕەوی دەکەن. بۆ ئەم مەبەستە مۆساد لیستێکی لە ناوی بەرپرسانی پارتی نازی ئەڵمانی ئامادە کردبوو کە لە سەردەمی فەرمانڕەوای نازییەکان دەستیان هەبوو لە پاکتاوی رەگەزی جووەکان، لەنێو ئەو لیستەشدا یەکێک لە دیارترین ئەندامانی پارتی نازی ئەڵمانی هەبوو ئەویش سەرهەنگ ئەدۆڵف ئایخمان بوو. ئایخمان لەساڵی ۱۹۱٦ لە رایلاند لەدایک بووە لە بنەماڵەیەکی مەسیحی کە بڕوایان بە مەزهەبی ئیفانجیلی هەبوو. ناوبراو لەساڵی ۱۹۳۲ دەچێتە نەمسا و پەیوەندی دەکات بەڕیزەکانی پارتی نازییەوە و هەرزوو توانی بەهۆی چالاکیەکانی دژی جوو ناوبانگ دەرکات و ل ئەنجامدا پلەی بەرزکرایەوە تا لە سەرەتاکانی جەنگی جیهانی دووەمدا ئەرکی چارەسەکردنی کێشەی جووەکانی ئەڵمانیایان بەو سپارد، ئەویش بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە خێراترین رێگەی دۆزیەوە بۆ کۆمەڵکوژکردنی جووەکان و بۆ ئەم مەبەستە فڕنی گازی دامەزراند کە تێیدا جووەکان کۆدەکرانەوە و بە گازێکی خنکێنەر لەناودەبران. [ii]

لە ١٦ حەزیرانی ساڵی ١٩٤٢، دوای ئەوەی فەرەنسا لەلایەن سوپای ئەڵمانیای نازیەوە داگیرکرا، نزیکەی حەوت هەزار ژن و منداڵی جوو لە یاریگای فلدون هیفر لە پاریس نیشتەجێبوون دوای ئەوەی نەیان توانی بوو لە فەرەنسا هەڵبێن، بۆماوەی پێنج رۆژ بەبێ خواردن و ئاو مانەوە. دوانزە کەسیان لەو ماوەیەدا شێت بوون و سی کەسیان مردن. دواتر منداڵەکان لەدایک و باوکیان جیاکرانەوە و بە سەرپەرشتی ئەدۆڵف ئایخمان بە شەمەندەفەر گوازرانەوە بۆ سەربازگەکانی مەرگ تا لەوێ بە گازی کوشندە لەناو ببرێن، ئایخمان زۆر خۆشی لەو کارانەی وەردەگرت تا ئەو رادەیەی کە یەکێک لە هاوڕێکانی دەربارەی ئەو دەڵێت: "گرنگ نییە بەلایەوە ئەڵمانیا لە جەنگی جیهاندا بدۆڕێت یان نا ئەو بە ئاسوودەیی دەچێتەناو گۆڕەکەی لەبەرئەوەی کوشتنی ٥٠٠٠ جوو دڵی ئەویان بەپێی پێویست خۆش کردووە."

---

[i] الْعَيْنَ بِالْعَيْنِ، وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ... لە قورئانی پیرۆزیش لە سورەتی "المائدة"، ئایەتی ٤٥ باسی ئەم بابەتە کراوە.

[ii] Longerich, Peter (٢٠١٠). Holocaust: The Nazi Persecution and Murder of the Jews. Oxford; New York: Oxford University Press. *ISBN* ٩٧٨-٠-١٩-٢٨٠٤٣٦-٥.

دوای ئەوەی ئەڵمانیا لە جەنگدا دۆڕا، ئایخمان توانی زیرەکانە خۆی لە ئەڵمانیا دەربازبکات و کەسیش تا ماوەیەکی زۆر نەیتوانی هیچ هەواڵێک دەربارەی بزانێت تا ئەوەی هەندێک لەو بڕوایەدا بوون کە ناوبراو لە ژیاندا نەماوە. بەڵام مۆساد بەردەوام بوو لەگەڕان بە دوایدا، وڵاتی ئەرجەنتینیش کە دوای جەنگ ببوە پەناگەیەکی ئارامی نازییەکان لە پێش هەرجێگایەکی تر گومان دەکرا کە ئایخمان بۆ ئەوێ رایکردبێت. بۆیە، مۆساد سیخوڕگەلێکی زۆری لەو وڵاتەدا بڵا کردەوە و بەڵام لەسەرەتادا هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەهێنا. لەکۆتاییدا، بۆیان دەرکەوت کە ناوچەیەکی سنوری هەیە لە بۆینس ئایرسی پایتەخت کە جێگای کۆبوونەوەی کۆنە نازییەکانە و گومان دەکرێت ئایخمان لەوێ بێت. بەمەش مۆساد چەندین سیخوڕی خۆی نارده ئەوێ کە وەک نازی خۆیان پیشان دەدا، بەڵام نەیان توانی هیچ ئەنجامێک دەربارەی ئایخمان بەدەست بهێنن. رۆژێک یەکێک لەو سیخوڕانە کە ئامادەی ئاهەنگێکی مەی خواردنەوە بوو گوێی لە یەکێک بوو کە دەیووت: "ئایخمانی بەدبەخت دوێنێ بەرپرسێکی گەورەی پارتی نازی بوو بەڵام ئەمڕۆ کاری فیتەری دەکات." لەژێر رۆشنایی ئەم زانیاریانە، بازنەی گەڕان بەدوای ئایخماندا تەسک بووەیەوە بۆ وەرشەکانی چاککردنەوەی ئۆتۆمبیل، تا ئەو کاتەی یەکێک لە سیخوڕەکانی مۆساد توانی ئایخمان بناسێتەوە هەرچەندە لەسەرەتادا گومان دەکرا کە ئەوە ئەو بێت، بەڵام پێشتر مۆساد بەرواری هاوسەرگیری ئایخمان و خێزانەکەی دەزانی و کە لەو رۆژەدا بە یادی هاوسەرگیریان ئایخمان بەو بۆنەیەوە چەپکێک گوڵی بۆ هاوسەرەکەی کڕی بوو. کاتێک ئایخمانیان بینی بەو چەپکە گوڵەوە ئیتر هیچ گومانێک نەما کە ئەوە خۆیەتی. سەرۆکی ئەو کاتەی مۆساد، ئیسەر هارێل، لەگەڵ ئەفسەرانی مۆساددا کۆبونەوەی کرد و بڕیاریاندا ئایخمان بفرێنن بۆ ئیسرائیل و لەوێ دادگایی بکەن و دواتر بەسزای خۆی بگەیەنن. بەڵام ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو لەبەرئەوەی لەنێوان ئیسرائیل و ئەرجەنتیندا هیچ رێکەوتننامەیەک نەبوو بۆ گواستنەوەی تاوانبارانی جەنگ، بۆیە کردەی رفاندنەکە ئەگەری ئاڵۆز بوونی پەیوەندیەکانی ئەو دوو وڵاتەی لێدەکەوتەوە بەڵام لەکۆتاییدا بڕیاردرا کردەکە ئەنجام بدرێت.

ئەدۆلف ئایخمان لەبەردەم دادگای ئیسرائیلدا

لە رۆژی ١١ ی ئایاری ساڵی ١٩٦٠ کە رۆژی یادکردنەوەی سەربەخۆیی ئەرجەنتین بوو، فرۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی ئیسرائیلی تەرخان کرا بۆ گواستنەوەی ئایخمان. لەو رۆژەدا ئایخمان لەسەرکار دەگەڕایەوە و ماندوو بوو، رۆژێکی باراناوی بوو، شەقامەکانی بۆینس ئایرسی پایتەخت چۆڵ بوون، کاتێک ئایخمان بەپێ بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە لەناکاو ئۆتۆمبیلێک لە تەنیشتیەوە وەستا چەند کەسێکی تێدا دابەزین و چواردەوریان گرت، ئایخمان ویستی رابکات بەڵام نەیان هێشت و دوای ئەوەی بێهۆشیان کرد بەسەیارە گواستیانەوە بۆ ناوچەیەکی سنوری شار و لەوێ دوای ئەوەی ژمارەی ئۆتۆمبیلەکەیان گۆڕی بە ژمارەیەکی تر بەرەو فرۆکەخانە بەڕێکەوتن. لەو رۆژەدا کارئاسانیەکی زۆر دەکرا بۆ گەشتیاران و پشکنینی کەلوپەلەکان لە فرۆکەخانە کەم کرابوونەوە بەهۆی یادی سەربەخۆیی ئەرجەنتینەوە، لەبەرئەوە توانرا ئایخمان بەبێهۆشی بگوێزنەوە بۆ ناو یەکێک لە فرۆکەکانی کۆمپانیای عالی ئیسرائیلی و دواتر بەرەو ئیسرائیل بەڕێککەوت.

لە رۆژی ٢٣ی ئایاردا حکومەتی ئیسرایل رایگەیاند کە دادگاییکردنی ئایخمان دەست پێدەکات، بە پێی یاسای دادگایی کردنی تاوانبارە نازییەکان، دوای ئەوەی لە دادگایەکی تایبەتیدا دادگایی کرا، حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا سەپێنرا و دوای جێبەجێ کردنی حکومەکەش لاشەکەیان سوتاند و خۆڵەمێشەکەیان فڕێدایە ناو دەریاوە.[i]

## ململانێی جەنگی زانیاری لە ئەفریقیا

لەساڵی ١٩٦٠ سی ئای ئەی هاتەنێو گۆڕەپانی ململانێ لە جیهانی سێیەمدا لە دەروازەی کۆنگۆوە، کە ئێستا بە زائیر دەناسرێت، لە دوو توێی دەرکردنی بەلژیکییەکان لەو وڵاتە لەساڵی ١٩٦٠، ڕێبەری نیشتیمانی لومومبا توانی پۆستی سەرۆکایەتی حکومەت لە هەڵبژاردنێکی جەماوەریدا بباتەوە کە لە کەشوهەوایەکی ناڕێک و پڕلەترس و دڵەڕاوکێدا ئەنجامدرا، بەڵام شکستی هێنا لە سەقامگیرکردنی حوکمەکەی و سەپاندنی دەسەڵاتی بەسەر سەرتاسەری خاکی کۆنگۆدا. لەدوای جیابوونەوەی هەرێمی کاتنگا بەڕێبەرایەتی موسی تشوجی، ئەمە وایلێکرد لومومبا و سەرۆک کۆمار لەوکاتەدا، جۆزێف کازافوبو، داوا لە نەتەوەیەکگرتووەکان بکەن دەست وەربداتە کاروباری کۆنگۆ و هەموو وڵاتەکە لەژێر یەک دەسەڵاتداریەتی سیاسییدا کۆبکەنەوە، نەتەوەیەکگرتووەکان لەلایەن خۆیانەوە هێزی ئاشتی پارێزی ناوچەی سنووری ململانێکەی بۆ پاراستنی هێمنایەتی و رژێم بەڵام، وەک هەمیشە ئەرکەکانی لە جیاکردنەوەی هێزە ناکۆکەکان لەیەکدی تێپەڕی نەدەکرد، ئەم حاڵەتە هانی سەرۆک کۆماریدا داوای هاوکاری سەربازیی و ئابووریی لە سۆڤیەت بکات لەپێناو دووبارە کۆنترۆڵکردنەوەی هەرێمی کاتنگا.

بەگەیشتنی داواکاری هاوکارییەکە بە کرملین، مۆسکۆ لە ٢٦ی ئابی ئەو ساڵەدا ١٠٠ پسپۆڕی تەکنیکی و ١٠ فڕۆکەی گواستنەوەی جۆری ١١-١٨ بەچەک و کەرەستەی

---

i Staff (١ June ١٩٦٢). *"Israel Supreme Court Names Justices to Hear Eichmann's Appeal"*. Jewish Telegraphic Agency. *Retrieved* ٢٧ *March* ٢٠١٨.

سەربازییەوە رەوانەی کۆنگۆ کرد. لە واشنتۆن کۆشکی سپی بە وردی و ئاگاییەوە چاودێری جموجۆڵەکانی سۆڤیەتی دەکرد، ئەخاسمە لە وڵاتی کۆنگۆی دەوڵەمەند بە سامانە سروشتییەکان، هەروەها سی ئای ئەی لەلای خۆیەوە دەستی کرد بە توێژینەوە لە مەلەفی لومومبا و کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی ناوبراوەوە، وەک یەکێک لە رێبەرانی جیهانی سێیەم کە دژن بە سیاسەتی ئەمریکا و هاوپەیمانی سۆڤیەتن، ئەوەی زێتر گومانی لە رۆڵی سەرۆک کۆمار هەڵسان ئەو زانیارییانە بوو کە لە راپۆرتێکی لۆرێنس دفلن، کە ناوی سیخورییەکەی ڤیکتۆر هێجمن، هاتبوو کە تیایدا ناوبراو دەڵێت: کۆنگۆ بزاڤێکی هەڵگەرانەوە بەرەو کۆمۆنیزم بەخۆیەوە دەنێت، تا ئێستاش هەڵ گونجاوە بۆ دوورخستنەوەی کوبایەکی تر لە ئەفریقیادا.

ئەم راپۆرتە بەس بوو لای سەرانی سی ئای ئەی بۆ دەرکردنی فەرمانی جفرەیی بۆ دفلین "تۆ ئەرکی دەستپێکردنی پرۆسەی هەڵگەرانەوەی رژێمت لەئەستۆ نراوە... دوا مەکەوە."

رۆژێک بەرلەوەی پسپۆرە سۆڤێتییەکان بگەنە کۆنگۆ، کۆبوونەوەیەک لە واشنتۆن گرێدرا بە ئامادەیی ئالن دالێس، بەڕێوەبەری سی ئای ئەی، گۆردن گرەی، یاریدەدەری سەرۆکایەتی بۆ کاروباری ئاسایشی نیشتیمانیی، جۆن ئیروین، دووەم یاریدەدەری وەزیری بەرگریی، بەرپرسێکی دیکەی سی ئای ئەی بەناوی تۆماس باروت، کۆبوونەوکە بۆ تاوتوێکردنی دۆخی کۆنگۆ رێگاکانی بەرەنگاربوونەوەی تەرخانکرا.

لەوکاتەدا ئەندامە کۆبووەوەکان رێککەوتن لەسەر ئەوەی کە "ئەو ئامادەباشیانەی سی ئای ئەی لە کۆنگۆ پێی هەڵدەستێت هیچ پلانێک هەڵناوێژێت بۆ رزگاربوون لە لومومبا و رژێمەکە... لە ئاکامی ئەو رێککەوتنەدا، ئالن دالێس پەیامێکی جفرەیی نارد بۆ دفلین لە پایتەختی کۆنگۆ، لیوبۆلدفیل، تیایدا دەڵێت: "تۆ دەسەڵاتی فراوانترت خراوەتە بەردەست بە جێبەجێکردنی کردەوە هێرشبەرانەشەوە لەکاتی پێویستدا، بەمەرجێک کردەوەکان بە نهێنیی بمێننەوە". هەروەها دالێس لە هاوپێچی ئەم پەیامەدا سەد هەزار دۆلاری ئەمریکی رەوانەکرد بۆ جێبەجێکردنی کردەوەکەی کۆنگۆی ئەفریقی.

هەر دوایەدوای بەدەست گەیشتنی پەیامی بەرپرسیاریەتی، دفلین دەستی کردە چالاکییەکانی لەنێو کەسایەتی و گروپە رامیارییە نەیارەکانی لومومبادا، نەخاسمە کە زۆرێک لەو کەسایەتییانە پلانی تیرۆرکردنی لومومبایان خستبووە بەردەستی سەرۆک کۆماری کۆنگۆ، کازافوبو، بۆ دەربازبوون لە قەیرانەکە، بەڵام کازافوبو پرۆژەی پلانەکەی رەتکردەوە، پێی باشتر بوو لومومبا لە پۆستەکەی دەربکات. ئەوە بوو لە ٥ی ئەیلولی ١٩٦٠دا ناوبراو لەسەرکار لادرا، دوای ئەوەی ژەنەراڵێکی سەربازیی بەناوی مۆبۆتو بۆکۆتا جار دەربازبوون لە لومومبا و نفوزی سۆڤیەت کە لەو وڵاتەدا لومومبا بەرجەستەی دەکرد، بەتایبەت لەکاتێکدا نەتەوەیەکگرتووەکان هەوڵی دەدا بۆ دووبارە گەڕاندنەوەی ژیانی پەرلەمانی بۆ کۆنگۆ و دەسەڵاتدانە پەرلەمان بۆ یەکلاییکردنەوەی مەسەلەکە، ئەمەش بەواتای دووبار هەڵبژاردنەوەی لومومبا دەهات کە جەماوەرێکی فراوانی هەبوو. هەروەها، سی ئای ئەی دەترسا لە ئەگەری هەستانی سۆڤیەت بە کردەوەیەک کە ببێتە هۆی گەڕانەوەی لومومبا بۆسەر کورسی دەسەڵات و داڕنینی رکابەرەکەی، موبوتو، لە سەرکردایەتی سوپا.

بەهۆی ئەم ترس و دڵەڕاوکێیانە، سی ئای ئەی بڕیاریدا لومامبا بە چەکە خەیالیەکەی، ژەهری کوشندە، تیرۆر بکات. هەربۆیە، داوای لە کیمیازان، سیدنی گوتلیب، راوێژکاری زانستی بەڕێوەبەری پلاندانان، ریچارد بێڵ، کرد کە ماددەیەکی ژەهراوی ئامادەبکات کە پێکهاتبێت لە ڤایرۆسێکی ئەفریقی کوشندە بۆ ناردنی بۆ کۆنگۆ تاکو کردەوەکەی پێ جێبەجێ بکرێت. لەدواییدا گوتلیب خودی خۆی چووە پایتەختی کۆنگۆ و ماددە کوشندەکەشی لەتەک خۆید هەڵگرتبوو تا لەوێ دفلین، بەڕێوەبەری سی ئای ئەی لە کۆنگۆ، لەسەر بەکارهێنانی رابهێنرێت، یاخود یەکێک لە بەکرێگیراوانی دفلین بەم ئەرکە هەڵسێت بۆ بەکارهێنانی لە تیرۆرکردنی لومومبادا، لێ ئەم جارە سی ئای ئەی وەک رێوشوێنێکی یەدەگ لە ئەگەری هەرەسهێنانی پلانی ژەهرخواردنەکەدا دوو پیاوی کۆماندۆسی ئەمریکی بەناوەکانی روج و وین بۆ جێبەجێکردنی پلانەکە ناردە کۆنگۆ. ئەو دەمەی دفلین و گوتلیب مشتومڕیان دەکرد لەسەر چۆنیەتی گەیاندنی ژەهرەکە بە گەدەی لومومبا، بڕوایەکیان بۆ دروست بوو کە سەرۆک ئایزنهاوەر خودی خۆی

تێوەگلابێت لەم پرۆسەی تیرۆرکردنەوە، ئەرکەکەی سروشتێکی نیشتیمانی رامیاری هەیە پتر لەو بڕوایە دڵنیابوون، بەڵام ئەم دوو پیاوە شکستیان هێنا لە گەیاندنی ژەهرەکە بە ناوبراو، بەرلەوەی ژەهرەکە کارایی خۆی لەدەست بدات لە کوشتنی ئەو کەسەدا کە بیخوات. گوتلیب بەتایبەت لەوکاتەدا نەی دەتوانی ئەم ژەهرە بپارێزێت لەنێو پلەیەکی زۆر بەرزی گەرمای ئەو وڵاتەدا، هەربۆیە لە ٥ی تشرینی یەکەمدا گەڕایەوە بۆ واشنتۆن بۆئەوەی جارێکی تر دووپاتی بکاتەوە کە پلانەکەی سی ئای ئەی لەمەڕ بەکارهێنانی ژەهر پلانێکی خەیاڵین و ئەم بەکارهێنانە تەنیا لە بەرنامەکانی تەلەفزیۆندا نەبێت ئیدی دروست نین. لەگەڵ ئەوەشدا، دفلین هیوابڕوا نەبوو، پلانەکەی گۆڕی و بڕیاریدا بەهۆی پیاوانی کۆماندۆسەوە لومومبا تیرۆر بکات. بۆ راپەڕاندنی ئەم ئەرکەش، جەستن ئۆدنال،ی دەستنیشانکرد. ئەو بەگومانەوە هاتبوو بۆ کۆنگۆ گوایە ئەرکەکەی بریتیی دەبێت لە دەرکردنی لومومبا. بۆجێبەجێکردنی ئەم ئەرکە، جەستن داوای گەورە پیاوی کۆماندۆس، وێنی، کرد بۆ یارمەتیدانی لە دەرکردنی لومومبا. کەچی لومومبا ماڵەکەی خۆی جێهێشتبوو، رووی کردبووە ناوچەی ستانلی فیل کە نفوزێکی زۆری تیادا هەبوو لە هەوڵێکدا بۆ دووبارە دەسەڵات گرتنەوەی دەستی لە وڵاتدا. دواتر سی ئای ئەی بەهاوکاری سەربازەکانی مۆبۆتۆ هەموو رێگەکانی ستانلی فیلیان بڕی و توانیان لومومبا دەستگیربکەن کە بڕیاربوو ماوەی زیندانێتی لەناوچەی بکوان بەسەر. رۆژی حەڤدەی کانوونی دووەم ئەو فڕۆکەی لومومبای دەگواستەوە لەبری بکوانە رووی کرد کاتانگا و لەوێش هەوڵی کوژرانی لومومبا بڵاوکرایەوە بەبێ ئەوەی هۆکارەکانی روون بکرێنەوە. ناسنامەی بکوژەکانیش لە کردەوەکەیان جێبەجێ کرد تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت نەزانراوە... هەرچەندە زۆرینەی بەڵگەکان ئاماژە دەکەن بۆ سەرۆک ئایزنهاوەر وەک کەسایەتی یەکەم لە مەسەلەکەدا. بێگومان، لایەنی جێبەجێکار و پلاندارێژەری مەسەلەکەش هەر سی ئای ئەی بوو.

ئامادەکاریی بۆ ناشتنی تەرمی لومومبا

بەم جۆرە، سی ئای ئەی رزگاری بوو لە رابەرێکی جەماوەریی وەک لومومبا، لە جێگەیەشیدا دیکتاتۆرێکی سەربازی پێشێلکەری مافەکانی مرۆڤ وەک جەنەراڵ مۆبۆتۆی دانا. ناوبراو دوای ماوەیەکی کەم لە گرتنەدەستی دەسەڵات بوو بەیەکێک لە دەوڵەمەندەکانی جیهان و سامانەکەی بە سێ ملیار دۆلاری ئەمریکی مەزەندە دەکرا.[i]

## پێرل هاربەر

هێرشی ژاپۆنییەکان بۆسەر پێرل هاربەر، لە بەرواری ٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤١، بووە جێگای سەرسوڕمانی بۆ سوپای ئەمریکا و رای گشتی ئەو وڵاتە، بەڵام ئەم کارە لەئەنجامی چەندین ساڵی ئامادەکاریی لەلایەن ژاپۆنییەکان بەئەنجام گەیەنرا، لەوانە بەکارهێنانی باشترین سیخوڕی ئەو سەردەمە.

بیرۆکەی بنەڕەتی هێرشەی پێرل هاربەر بریتیی بوو لە تێکدانی کەشتیگەلی ئەمریکا لە زەریای هێمن و بەمەش ژاپۆنییەکان لە دەریاکەدا باڵادەست بن بۆ داگیرکردنی

[i] Ekpebu, L.B., ١٩٨٩. *Zaire and the African revolution*. Ibadan University Press.
-De Witte, L., ٢٠٠٢. *The assassination of Lumumba*. Verso.

باشوری رۆژهەڵاتی ئاسیا. بیرۆکەکە هاوشێوەی کردەوەکانی ژاپۆنییەکان بوو لە جەنگی روسۆ کاتێک ئەوان بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە توانیان کەشتیگەلی رووسەکان لە پۆرت ئارسەر وێران بکەن، ئەمەش بووەهۆی بەدەستهێنانی کاتی تەواو بۆ بنیادنانی هێزە زەمینییەکانیان. بیرۆکەی هێرشی پێرل هاربەر لەلایەن سیخوڕێکی جەنگی جیهانی یەکەمی بەریتانیا پێشبینیکرابوو، کە لە لەندەن لەداییک بوو بەڵام هەندێ تەمەنی منالّی خۆی لە کەمبریدج، ماساچوسێتس، بەسەر بردبوو و باوکی لە بەشی دەزگای نهێنی هێزەکانی یەکێتی خزمەتی سەربازیی کردبوو، کە خۆیشی دواتر لە شاری نیۆیۆرک کاری کرد بەرلەوەی ببێتە سیخوڕێکی بەریتانی. بایوۆتەر کارمەندی کەشتیگەلی بەریتانی بوو لە واشنتۆن، کە دواتر پەرتووکێکی نووسی لەژێر ناونیشانی "جەنگی گەورەی زەریای هێمن (١٩٢٥)" کە تیایدا ناوبراو ئەوەی نیشاندا کە هێرشێکی ژاپۆنییەکان بۆسەر کەشتیگەلی ئەمریکا لەو زەریایە دەکرێت ببێتە هۆی سەرکەوتنیان لە جەنگی زەریای هێمندا. گرنگی ئەم پەرتووکە هەرزوو لەلایەن هەواڵگری ژاپۆنییەکانەوە هەستی پێکرا، وە ئەدمیرال یامۆتۆ، سەرلەشکری کەشتیگەلی ژاپۆنییەکان، دواتر ئەم پەرتووکەی کردە بناغەی پلانەکانی. جەنەراڵی ئەمریکا، بیلی میشێل،یش وشیاری دابوو لە ئەگەری هێرشێکی ژاپۆنییەکان بەڵام ئامۆژگارییەکانی فەرامۆشکران.[i]

لەساڵی ١٩٣٢، ئەدمیراڵی ئەمریکی یارنێل دەستی بە مانۆڕێکی کەشتیگەلی کرد کە ئامانج لێی بەرەنگاربوونەوە بوو لەگەڵ هەر دۆخێکی نەخوازراو کە تیایدا ئەمریکا دەبوایە شاری هاوای بگرێتەوە. هەربەم بۆنەیەوە، ناوبراو پلانی دارشت کە چەند کەشتییەکی فڕۆکەهەڵگری هەبێت، وە ئەو فڕۆکانە بەکاربهێنێت بۆ هێرشکردن. ئەمە تەنیا مەشقێکی سەربازیی بوو کە لەلایەن ژاپۆن بەجیددی وەرگیرا.

ژاپۆنییەکان هەندێک لە باشترین هەواڵدۆزەکانی خۆی ناردا هاوای کە تیایدا هەندێ لە ئەندامانی رەوەندی ژاپۆنییەکان لەوێ داوای یارمەتیان لێکرا، بەزۆری بەشێوەیەکی

[i] Andrew, Christopher. For the President's Eyes Only: Secret Intelligence and the American Presidency from Washington to Bush. New York: HarperCollins, ١٩٩٥.

نارەزامەندیخوازانە. هەرچەندە زانیاری بنەڕەتی هەواڵگری دەربارەی پێرل هاربەر زۆر بەئاسانی بەدەست دەهات، ژاپۆنییەکان شوێنی دروستی جووڵەی کەشتییەکانی ئەمریکایان لە هەر ڕۆژێکی دیاریکراودا دەزانی. جگە لەوەش، تەنانەت ئاشنای شوێنی چەکی دژە فڕۆکەش بوون. دەسەڵاتدارانی ئەمریکا توانیان جیفرەی ژاپۆنییەکان بشکێنن وە چەند تیۆریکیش هەن کە ئەوان، یان هەواڵگری بەریتانیا، بەدەستگەیشتن بە پەیامی شکێنراوی ئەڵمانیا، دەربارەی هێرش بۆسەری پێرل هاربەر پێشەوەختە دەزانی، بەڵام ئەمەیان ئاشکرا نەکرد چونکە هێرشێک ئەمریکا ناچار دەکات بچێتە نێو جەنگەکە. سەرەڕای ئەمەش، واپێدەچێت کە ژاپۆنییەکان پێشبینیان کردبێت کە هەندێک لە جیفرەکانیان دەکرێت شکێنرابن و بەم هۆیەشەوە یەکێک لە باشترین سیخوڕەکانیان بەناوی تاکیۆ یۆشیکاوا ناردە هاوای، بەبەکارهێنانی ناوی نهێنی یاتۆ مۆریمورا.

کاتێک ناوبراو لە ئابی ١٩٤١ گەیشتە هاوای، سێ هەواڵدۆزی ئەڵمانی بۆماوەی چەندین ساڵ بوو خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بوون. ئەو سێ کەسەش بریتیی کوینس، دکتۆر بێرنارد کیوسی خێزانی، وە ئافرەتێکی تر کە دەڵێن کچیان بووە، بەڵام لەڕاستیدا خزمی یەکتر نەبوون. ئەو هەرسێ کەسە ئەندامی دەزگای نهێنی ئەڵمانیا بوون کە لە شاری هونولولو نیشتەجێ بوون، ویستی هەرسێکیان بۆ مێژووی کۆنی ئەو ناوچەیە وایلێکردن بەئاسانی دەستیان بەتەواوی ناوچەکەدا بگات. هەرچەندە کیوس تۆڕێکی باشی دامەزراندبوو، لەگەڵ "کچەکە" کە بەهۆی جوانیەکەوە سەرنجی زۆری کاربەدەستانی ئەو شوێنەی بۆخۆی ڕاکێشابوو، بەمەش ڕۆژانە گوێی لە قسە و دەنگۆی ئەوان دەبوو، ژاپۆنییەکان هەستیان بەوە کرد کە ئەوان پێویستیان بە هەواڵدزۆی خۆیان هەیە، وە هەرلەبەر ئەوەش بوو یۆشیکاوا نێردرایە ئەو شوێنە. پێشتر نزیکەی ٢٠٠ هەواڵدزۆی قونسڵیەکەی لەوێدا بوون، ئەمەش بەهۆی ئەو ڕێژەی زۆرەی بوونی هاوڵاتیانی ژاپۆنی، کە زۆربەیان لە کردەی سیخوڕیدا تێوەگلابوون.

یۆشیکاوا بەخێرایی ئەو زانیارییەی دەست خست کە پێویست بوو، وە گومانی لەوە کرد کە ئەمریکیەکان دەیانزانی کە ئەو سیخوڕ بووە، هەرچەندە ئەوان هەرگیز

درکیان بەوە نەکرد رۆڵی ناوبراو چەند گرنگ بوو لە ئۆپەراسیۆنەکانی ژاپۆنییەکانی لە دوورگەکانی هاوای. یۆشیکاوا بە دوو رێگای کاری کرد بۆ فریودانی ئەمریکییەکان. ئەو سەرەتا هەڵسا بە زیادکردنی ئەو پەیامانەی ناوبراو بەهۆی کەناڵی ئاسایی قونسوڵەوە دەیناردن، بەمەش وا لە هەواڵگری ئەو وڵاتە دەکات سەرنجی زۆریان لەسەر ئەو کەناڵە بێت، لەلایەکەی تریشەوە پەیامی پڕلەزانیاری گرنگیشی بەرێگایەکی جیاواز دەنارد. ئەمریکییەکان تەواوی چالاکییەکانی ناوبراویان خستبووە ژێر کۆنترۆڵ و سەرجەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەویان خستبووە ژێر چاوەدێریی.[i]

لە بەرواری ٥ی کانوونی یەکەم، تەنیا دوو رۆژ بەرلە هێرشی راستەقینەی ژاپۆنییەکان بۆسەر پێرل هاربەر، یۆشیکاوا توانی بەردەوام بێت لەسەر ناردنی پەیامەکان بۆ تۆکیۆ، وە تیایاندا رایگەیاند کە سێ کەشتی جەنگی گەیشتونەتەوە بەندەرەکە، بەڵام ناوی یەکێکیانی بەهەڵە وت وەک ویۆمینگ، لەکاتێکدا کە ناوە دروستەکەی ئوتا بوو. هەروەها، ناوبراو نەیتوانی چاودێری گەیشتنی دوو کەشتی کروز بکات. تەنیا یەک شەو بەرلە هێرشەکە، یۆشیکاوا، کە چاوەڕوانی هێرشی ژاپۆنییەکانی دەکرد، هەڵسا بە لەنێوبردنی سەرجەم کۆد و تۆمارەکانی. کیونس کەمتر ئامادەبوو وە بێرنارد کیون خەریکی ناردنی پەیام بوو لە ماڵەکەی خۆیەوە بۆ ئۆتۆجیرۆ ئۆکودای سەرقونسڵی ژاپۆنییەکان لەماوەی هێرشەکەدا. ئەفسەرانی هەواڵگری ئەمریکا هەستیان بەمە کرد، هەربۆیە ئێف بی ئای دەستبەجێ هەڵسا بە دەستگیرکردنی کیۆنس و حکومی کوشتنی بۆ دکتۆر بێرنارد بڕیەوە، دواتر کەمکرایە بۆ زیندانی تاهەتایی. بەهۆی هاوئاهەنگیەکەی لەگەڵ دەسەڵاتداران، ناوبراو لەساڵی ١٩٤٦ ئازادکرا، بەڵام خێزان و "کچەکەی" هەردووکیان لەکۆتایی جەنگەکەدا دیپۆرتکرانەوە. یۆشیکاوا

[i] Deacon, Richard. A History of the Japanese Secret Service. London: Frederick Muller Limited, ١٩٨٢.

بەئاڵوگۆڕێکی دیبلۆماسی نێردرایەوە ژاپۆن، وە تەواوی ژیانی خۆی لەکارکردن بۆ هەواڵگری کەشتیگەلی ژاپۆنییەکان سەرف کرد.[i]

هەریەکسەر دوای هێرشەکە بۆسەر پێرل هاربەر، دوابەدوای نیگەرانی دەربارەی نادڵسۆزی رەوەندی ژاپۆنی لە ئەمریکا، سەرۆک فرانکلین رۆزڤێلت بڕیارێکی واژوو کرد بۆ هێشتنەوەی ژاپۆنییەکان لە زیندان. هەندێک لە دانیشتوانی هاوای گومانی سیخوڕیان لێدەکرا و یەکێک لەوانە بەناوی دکتۆر مۆتۆکازۆ(١٨٩٠-١٩٥٨) کە پیشەی پزیشکی ددان بوو، بەبەردەوامی بەهۆی پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەگەڵ تۆکیۆ کە تیایدا باسی چەپکە گوڵی دەکرد، بەمەش تووشی لێکۆڵینەوەیەکی چڕ بوو لەلایەن ئێف بی ئای، کە ئەوەی دوایی پێ وابوو بەکارهێنانی ئەم دەستەواژانە پەیامی جیفرەداری زۆر مەترسیدار بوون.[ii]

## ژووری رەش

ژووری رەشی ئەمریکی، بە (MI-٨)یش ناسراوە، کە لەژێر ناوێکی نهێنیی کاری دەکرد و لەژێر رێنماییەکانی شیفرەناس هێربێرت یاردلی بەڕێوەدەچوو، بارەگاکەی لە شاری نیۆیۆرک بوو(٥٢ Vanderbilt Avenue in Manhattan) لەساڵی ١٩١٩ تا ١٩٢٩ ئۆپەراسیۆنی هەواڵگری شکاندنی شیفرەی ئەنجامدەدا. ژووری رەش بە پایەی هەرەسەرەکی ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی(NSA) دادەنرا. لەماوەی کارکردنیدا، ژووری رەش زیاتر لە چل و پێنج هەزار تەلەگرامی چارەسەرکرد کە هەر هەموویان جیفرەدار بوون. ئەم تەلەگرامانە لەم وڵاتانەی خوارەوە بوون: یەکێتی سۆڤیەتی جاران، ئیسپانیا، مەکسیک، وە چەندین وڵاتی تری ئەوروپا و ناوەڕاست و ئەمریکای باشوور.

---

[i] Honan, William H. Bywater: The Man Who Invented the PacificWar. London: Futura Publications, ١٩٩١.
[ii] Prange, Gordon. At Dawn We Slept: the Untold Story ofPearl Harbor. New York: McGraw-Hill, ١٩٨١.

هۆکاری دامەزراندنی ژووری رەش لە شاری نیۆیۆرک بریتیی بوو لە شاردنەوەی وجوودی خۆی و یاساکان لە واشنتۆن هیچ پارەیەکی لە بودجەی وەزارەتی دەرەوە تەرخان نەدەکرد بۆ ئەم جۆرە چالاکیانە لە پایتەختدا. هەربۆیە، بەناچاری، لەژێر ناوێکی نهێنیدا وەک کۆمپانیایەکی بازرگانی دەستی بەکارەکانی کرد، کە شوێنەکەی کەوتبووە خواری خوارەوەی باڵەخانەیەک کە ژووری رەش نووسینگەکانی تیادا دانابوو. ئەو کۆمپانیایە هەڵدەستا بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری شکاندنی کۆد بۆ هەموو کارە بازرگانییەکان لە سەرتاسەری نیۆیۆرک.

یەکێک لە مەزنترین سەرکەوتنەکانی ژووری رەش بریتیی بوو لە کەیسی لاسار ویتکی (هەروەها بە پابلۆ وابریسکیش ناسرابوو). ناوبراو لە شوباتی ۱۹۱۸ لە مەکسیکەوە خۆی خزاندە ناو شاری نۆگالیس، ئەریزۆنا. پابلۆ پارچەکاغەزێکی پێبوو، کە بە قۆڵی چەپی پاڵتۆکەیەوە دوورابوو، و پابلۆ بێ خەبەری خۆی لەم پارچە کاغەزە راگەیاند. ناوبراو نێردرایە شاری فۆرسام هیوستن و پارچەکاغەزەکەش تەسلیمی شیکەرەوەکانی کۆدی یاردلی کرا. ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو پارچەکاغەزەکە بۆماوەی چەندین ساڵ خرایە لایەک بەبێ ئەوەی کەسێک توخنی خوێندنەوەی بکەوێت، تەنانەت یاردلیش. لە نیسانی ۱۹۱۸، پارچەکاغەزەکە کە تێبینییەکی لەسەر بوو، خرایەبەر شیتەڵکردن و زانینی رازی نێو پەیامەکە و لەکۆتاییدا توانییان نهێنی پشت نووسینەکە ئاشکرا بکەن. ئەو نامەیە بۆ باڵیۆزی ئەڵمانیا لە شاری مەکسیکۆ ئاراستەکرابوو، تیایدا پابلۆی وەک سیخوڕێکی هەواڵگری ئەڵمانیا ناساندبوو. لە پەرتووکەکەیەدا کە دواتر لەژێر ناوی *ژووری رەشی ئەمریکی* چاپکرا، یاردلی نوسخەی وەرگێڕدراوی ئەو تێبینییەی خستبووەڕوو: "بۆ کاربەدەستانی راوێژکاری ئیمپریالی لە کۆماری مەکسیک. زۆر نهێنیی! هەڵگری ئەم پەیامە وەک هاوڵاتییەکی ئیمپراتۆریایە کە وەک هاوڵاتییەکی رووسی لەژێر ناوی پابلۆ وابێرسکی گەشت دەکات. ئەو سیخوڕێکی نهێنی ئەڵمانییە. تکایە هاوکاری تەواوی بکەن و بیپارێزن، وە تکایە بڕی هەزار پیزۆی (پیزۆ: دراوی مەکسیک) زێڕی مەکسیکی پێبدەن و پەیامی کۆدەکەی بنێرن بۆ ئەم باڵیۆزخانەیە وەک نێردەی راوێژکاری

فەرمی، ڤۆن ئیکهارت." ڤۆن وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا بوو. سەرهەنگ رالف ڤان دێمان، ئەفسەری هەواڵگری پێشکەوتووی سوپای ئەمریکا بە یاردلی وت، "ئەگەر تۆ هیچ کارێکی ترت نەکردبێت، شکاندنی ئەم پەیامە بەڵگەیە لەسەر گرنگی نووسینگەکەی تۆ، ژووری رەش."

دوای دادگایەکی سەربازیی، پابلۆ بڕیاری کوشتنی لە ئەمریکا بۆ دەرچوو بەهۆی رۆڵی ناوبراو لە پشێوی و تەقینەوەی عەمباری تەقەمەنی بلاک تۆم لەشاری نیۆیۆرک لەساڵی ١٩١٦. پابلۆ تاقە سیخوڕی دوژمن بوو لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەم کە دادگا بڕیاری کوشتنی بەسەردا بدات(هەرچەندە دواتر بڕیارەکە بۆ زیندانی تاهەتایی کەمکرایەوە).[i]

## پرسی بارمتەی ئێرانی

لە چواری نۆڤەمبەری ١٩٧٩، گروپێکی مەزنی قوتابیانی پشتیوانی ئایەتوڵا خومەینی دەستیان بەسەر باڵیۆزخانەی ئەمریکادا گرت و بۆماوەی ٤٤٤ رۆژ ئەم پرسە بەردەوامی کێشا. لەنێو بارمتەکاندا چوار ئەندامی دەزگای سی ئەی ئەی تیادا بوون، گرنگترینیان تۆم ئاهێرن، بەرپرسی ژووری هەواڵگری باڵیۆزخانە. ئەوانی تریش بریتیی بوو لە ویلیام دۆگێرتی، مالکۆلم کالپ، و ئەفسەرێکی پشتیوانی ئۆپەراسیۆنەکان. وە پێنجەمیان، لە بەختی خۆی، چەند رۆژێک بەر لەو کاتە چووبووە پشوو.

---

[i] Corson, William. The Armies of Ignorance: The Rise of the American Intelligence Empire.New York: Dial Press, ١٩٧٧.
-Khan, David. The Reader of Gentlemen's Mail: Herbert O. Yardley and the Birth of American Codebreaking. New Haven, CT: Yale University Press, ٢٠٠٤.
-Richelson, Jeffrey T. A Century of Spies: Intelligence in the Twentieth Century, New York: Oxford University Press, ١٩٩٥.
-Wrixon, Fred B. Codes, Cyphers, & Other Cryptic & Clandestine Communication,New York: Black Dog & Leventhal Publishers, Inc., ١٩٩٨.

ئەمریکییەکان بۆماوەی ٤٤٤ رۆژ لەلایەن ئێرانی نوێوە بە بارمتە دەگیرێن

لەکۆتاییدا، هەموو بارمتەکان ئازادکران، هەندێکیان چەندین مانگ لە بەندیخانەی تاکەکەسیدا بوون و لێدانی زۆریان خوارد، ئەمەش بێگومان دوای ئەوەهات قوتابییەکان دەستیان بەسەر هەزاران بەڵگەنامەی هەواڵگری لەنێو باڵەخانەکەدا گرت، هەندێکیان زۆر نهێنیی بوون. پاشان بۆئەوەی سەرۆک جیمی کارتەر هەراسان بکەن، ئێرانییەکان لە سی بەرگدا هەموو ئەو بەڵگەنامانەیان وەرگێڕایەسەر زمانی فارسی و لە کتێبێکدا بڵاویان کردەوە.

## کۆنستانس بابینگتن (١٩١٢-٢٠٠٠)

کۆنستانس وەرگێڕێکی بەناوبانگی چاودێری وێنەیی ئاسمانی بوو لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم، کە لەلایەن هێزە ئاسمانییەکانی پاشایی بەریتانیەوە ئەنجام دەدرا. ناوبراو ناوبانگی بەوە دەرکردبوو کە توانایەکی باشی هەیە لە دیاریکردنی بنکەی رۆکێتەکانی ڤی-٢ی ئەڵمانیا لە پاموندە لە کەناری بەلتیق. هەروەها ناوبراو ئەو پێگە تاقیکردنەوانەشی دیاریدەکرد کە ئەڵمانەکان لێیەوە فرۆکەی جێتیان تاقی دەکردەوە. ناوبراو لەبەرئەوەی قۆناغی پەروەردەی لە هەردوو شارەکانی پاریس و لەندەندا بڕیبوو، ئیتر هیچ کێشەیەکی نەبوو لە دۆزینەوەی کار؛ بەمەش سەرەتا رووی کردە نووسین لە چەند گۆڤارێکی بەناوبانگدا. دواتر، ئارەزووی زیاد بوو لەسەر فڕۆکە و هەر بەم بۆنەشەوە لە چەندین وتاری لە گۆڤاری ئەیرۆپلەین نووسی. لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٠ ناوبراو پەیوەندی بە هێزی ئاسمانی یەدەگی ئافرەتانەوە کرد. دوای کەوتنی فەرەنسا لە حەزیرانی ١٩٤٠ هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیی بایەخێکی زۆری بە چاوەدێریی ئاسمانیدا، هەربۆیە هەڵسا بە دامەزراندنی یەکەی ناوەندی وەرگێڕانی هاوپەیمانان کە بارەگاکەی لە مێدمێنهام بوو، کە بەشێکی تایبەتمەندی کردەوە لەسەر هێزە ئاسمانییەکانی ئەڵمان لەژێر ناوی لوفتوافی. لە کانوونی دووەمی ١٩٤١، کۆنستانس بوو بە لێپرسراوی ئەم بەشە، کە شتێکی زۆر نامۆ بوو لەو سەردەمەدا ئافرەتێک ئەم بەرپرسیارەتییەی پێبدرێت. دەستکەوتەکانی لەماوەی جەنگدا لەلایەن حکومەتی بەریتانیەوە لەساڵی ١٩٤٥ بەرز نرخێنران کاتێک ئەو وەک ئەندامی بڕیاری ئیمپراتۆریای بەریتانی (MBE) دەستنیشانکرا. دوابەدوای کۆتاییهاتنی جەنگ لە ئەورووپا، ناوبراو خرایە سەر یەکەی هەواڵگری هێزە ئاسمانییەکانی سوپای ئەمریکا لە وەزارەتی بەرگریی ئەو وڵاتە. حکومەتی ئەمریکا لەساڵی ١٩٤٥ خەڵاتی رێزلێنانی پێ بەخشی بۆ ئەو خزمەتەی کە بە وڵاتەکەی کرد.

دوای جەنگ، ناوبراو دەستی بەکارکردن کرد لەگەڵ گۆڤاری *لایف*، کەتیایدا چەندین وتاری نووسیی دەربارەی کەسایەتییە ئەدەبییە بەنێوبانگەکانی ئینگلیزی.[i]

## عەبدول قەدیر خان

خان فیزیاناسێکی پێشووی بواری ناووکی خەڵکی پاکستان بوو کە توانی بەرنامەی پیتاندنی یۆرانیۆم بۆ پرۆژەی بۆمبی ئەتۆمی پاکستان دابمەزرێنێت. لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤، حکومەتی پاکستان بانگهێشتی خانی کرد بۆ لێکۆڵینەوە لەو رۆڵەی ناوبراو گێڕابووی لە بەرنامەی ناووکی وڵاتانی تر دوای ئەوەی ئەمریکا چەندین بەڵگەی پێشکەش بە حکومەتی ئەو وڵاتە کرد. دوای یەک مانگ، خان بەشێوەیەکی فەرمی دانی بەبوونی چالاکیگەلی لەم جۆرە دانا.[ii] دوای یەک ساڵ لە بەندکردن هەر لە ماڵەکەی خۆیدا لەماوەی لێکۆڵینەوەکەی، دادگای باڵای ئیسلامئاباد لە ٦ی شوباتی ٢٠٠٩ رایگەیاند کە خان هاوڵاتیەکی سەربەستە لە پاکستان. لە ئەیلولی ٢٠٠٩، ئەمریکا وشیاریدا کە خان هێشتا مەترسییەکی جددیە بۆسەر ئاسایشی پاکستان و جیهان بەگشتی.[iii]

سەرەتای ژیانی خان لە پاکستان دەست پێناکات بەڵکو مێژوویەکی درێژی هەیە لەخوێندن لە وڵاتانی ئەوروپا و جیهان، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە باس بکرێت رۆڵی

---

[i] Babington-Smith, Constance. Evidence in Camera: The Story of Photographic Intelligence in World War Two. London: Chatto and Windus, ١٩٥٨.
-Nesbit, Roy Conyers. Eyes of the RAF: A History of Photo-Reconnaissance. London: Sutton, ١٩٩٦.
-Powys-Lybbe, Ursula. The Eye of Intelligence. London: William Kimber, ١٩٨٣.

[ii] "A.Q. Khan & Iran" (http://www.globalsecurity.org/wmd/world/iran/khan-iran.htm). Global Security. Retrieved ٢٤ November ٢٠١٤.
-NY Times Staff (April ١٦, ٢٠٠٦). "Chronology: A.Q. Khan" (https://www.nytimes.com/٢٠٠٦/٠٤/١٦/world/asia/١٦chronkhan.html?pagewanted=all). NY Times. Retrieved ٢٤ November ٢٠١٤.

[iii] Warrick, Joby Warrick (٧ February ٢٠٠٩). "Nuclear Scientist A.Q. Khan Is Freed From House Arrest" (https://www.washingtonpost.com/wp-dyn/content/article/٢٠٠٩/٠٢/٠٦/AR٢٠٠٩٠٢٠٦٠٢٧٣٠.html). The Washington Post. Retrieved ٢ October ٢٠١٦.

ناوبراوە لە کەیسی بەرنامەی ناووکی ئەو وڵاتە و فرۆشتنی بە چەند وڵاتێکی تر.
لەساڵی ١٩٧٥، خان گەڕایەوە پاکستان و بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بکات یان پشوو وەربگرێت، یەکسەر تەکسییەکی گرت و چووە سکرتاریەتی سەرۆک وەزیران.
کۆبوونەوەیەکی زۆر نهێنی لە کۆشکی سەرۆکایەتی وەزیرانی ئەو وڵاتە گرێدرا لەنێوان خان و بهوتۆ، سەرۆک وەزیران، مونیر ئەحمەد و موبەشیر حەسەن، راوێژکاری زانستی سەرۆک وەزیران. لە کۆبوونەوەکەدا، خان بە تێروتەسەلی باسی لە گرنگی یۆرانیۆم کرد لەجیاتی پلوتۆنیۆم، بەڵام سەرۆک وەزیران قایل نەبوو لەجیاتی پلوتۆنیۆم یۆرانیۆم بەکاربهێنێت بۆ پەرەپێدانی بۆمبێکی ئەتۆمی. هەرچەندە بهوتۆ کۆبوونەوەکەی بەخێرایی کۆتایی پێهێنا بەڵام پێی وابوو "قسەکانی خان مەعقوڵن."
دوای چەند کۆبوونەوەیەکی یەک لەدوای یەک، لەکۆتاییدا زولفیقار بهوتۆ قایل بوو، بەمەش ناوبراو دەستی بە کارەکەی بکات.
چیرۆکە سەرسوڕهێنەرەکی خان بەم شێوەیە دەست پێدەکات کاتێک لەساڵی ٢٠٠٤، هەروەک باسکرا، حکومەتی پاکستان رایگەیاند کە دکتۆر خان بەڕاستەوخۆ لە تەلەفزیۆن دەردەکەوێت و دان بەو کرەوانەدا دەنێت کە ئەنجامی داون. بۆئەوەی بینەرێکی زۆری سەیری ئەو پەخشە راستەوخۆیە بکات، خان بڕیاریدا بەزمانی ئینگلیزی بدوێت. ئەو بەم شێوەیە دەستی پێکرد، "خوشک و برا ئەزیزەکانم، خودا وڵاتی پاکستان بپارێزێت و هەربژین پاکستان!" بۆ دڵنیاییکردنەوەی ئەوەی کە ئەو شتەی ناوبراو ئەنجامیداوە بەتەواوی لەلایەن رۆژئاواوە جێگای قبوڵە، سوپای پاکستان چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامدابوو لەگەڵ خان کە تیایدا خۆی بێ بەری کردبوو لەو کارانەی ناوبراو ئەنجامی دابوون، رایگەیاند کە ئەوکارانەی ئەو کردویەتی هیچ پەیوەندی بە حکومەتەوە نەبووە. خان تەکنەلۆژیای چەکی ناووکی بە وڵاتانی وەک لیبیا، ئێران، وە کۆریای باکوور فرۆشتبوو، کە هەر هەموویان لەلایەن ئەمریکاوە لەژێر هێڵی سووردا بوون.
دیبەیتی زۆر گەرموگوڕ لەسەرتاسەری جیهان ئەنجامدران لەسەر ئەوەی کە دەبێت چ پاڵنەرێک وای لە خان کردبێت ئەم کارە بکات- پاڵنەری سیاسیی و ئایینی، یان

تەنیا ئارەزوویەک بووە؟ تۆ بڵێی هەر لە سەرەتاوە ئامانجی ئەوە نەبووبێت ئەو بەرنامەیە پێشکەشی جیهادییەکانی ئەفغانستان، ئوسامە بن لادن یان رەنگە تیرۆرستەکانی جیهان نەکات بۆئەوەی ئەو ئامێرە ناوکیە لە ئەورووپا یان ئەمریکادا بتەقێننەوە، ئەمە پرسیارێکە و وەچنگ کەوتنی وەڵامەکەی کەمێک ئەستەمە، بەڵام رێی تێدەچێت. دوای چەند رۆژێک سەرۆک بوش رایگەیاند کە، "خان دانی بە هەموو تاوانەکانیدا ناوە و هەموو ئەو کەسانەی هاوکار بوون لە تاوانەکانیدا دەستبەسەر کراون." خان و باندە بچووکەکەی تاوانی زۆر قێزەوەنیان درابووە پاڵ، بەڵام پێویستی بەوە نەدەکرد بدرێنە دادگا. بوش رووونی کردەوە، "سەرۆک پەرویز موشەرەف بەڵێنی پێداوین کە هەر زانیارییەکیان دەستکەوێت دەربارەی تۆڕەکەی خان پێمانی دەدەن، وە دڵنیایی کردینەوە کە وڵاتەکەی هەرگیز دووبارە نابێتە سەرچاوەیەکی ئەم جۆرە کارانە."

لەڕاستیدا، دانپیانانەکەی خان فریودانێکی زۆر زیرەکانە بوو. ئەم کارەی ناوبراو پێویستی بە زیاتر لە کەسێک هەبوو بۆئەوەی فەوازیەکی وا مەزن کپ بکرێتەوە. خان ئەرکەکەی خۆی بەجێهێنا و کارەکەی بووەهۆی دروستکردنی سروشتێک یان حەقیقەتێک کە زۆربەی شارەزایانی ئەو بوارە پێیان وایە سەرچاوەیەکی سەرەکی تاوانی ناووکی تەواوی سەردەمی ئێمەیە و بەبێ گومانیش سەرچاوەیە بۆ جەنگەکانی داهاتوو. ئەو بازاڕە ناوکییەی خان لە دانپیانانەکەیدا باسی کرد، بەدڵنیاییەوە بوونی هەبوو، بەڵام ئەو تەکنەلۆژیایە بەکارهاتبوو لەو بەرنامەیە و ئەو هێزەی پێوسیتی بوو بۆ کارپێکردنی بەبێگومان کاری یەک تاقە کەس نەبوو، بەڵکو ئەمە سیاسەتی دەرەوەی نەتەوەیەک بووە، کە لەلایەن پاکستان و سوپاکەیەوە سەرپەرشتی دەکرا، گوایە هاوپەیمانێکی سەرەکی ئەمریکاش بووە لە جەنگی دژەتیرۆردا. هونەری ئاشکراکردنی ئەو فەزاحەتە لەلایەن و رۆڵی سوپای پاکستان تیایدا لەلایەن چەند بەرپرسێکی باڵای ئەمریکا و ئەورووپاوە ئاشکرابوو، بەڵام هونەرەکە لێرەدایە کە چۆن و لە کەیەوە توانیوایە بەم شێوەیە نهێنییە تەواوی جیهان، بەتایبەتی ئەمریکا، فریوبدەن.

بۆماوەی سێ دەیە، ئیدارە یەک لەدوای یەکەکانی ئەمریکا، بە دیموکرات و کۆمارییەکانەوە، وە حکومەتەکانی بەریتانیا و وڵاتانی تری ئەورووپی، ڕێگایان بە پاکستان دا بۆئەوەی تەکنەلۆژیای قەدەغە بەدەست بهێنن. جگە لەمەش، بۆچی ئەم حکومەتانە مانەوەی ڕژێمێکی سەربازییان لە پاکستان خستەپێش سەلامەتی و ئاسایشی تەواوی جیهان. ئەمەش پرسێکە وەڵامەکەی بۆ ئەو فریودانە مەزنەی وڵاتەکە دەگەڕێتەوە کە متمانەی تەواوی جیهانی بەدەست هێنابوو. دوای گەڕانەوەی خان لەساڵی ١٩٧٥ بۆ ئیسلامئاباد بە سێ جانتای پڕلە زانیاری دزراوەوە، هەروەک باسکرا، چاوی بە زولفیقاری بهوتۆی سەرۆک وەزیران کەوت دەربارەی بابەتەکە. هەر یەک ساڵ دوای گەڕانەوەی، هەوڵدۆزە پاکستانییەکان دەستیان کرد بە کڕینی کەلوپەلی پێویست لە ئەورووپا و ئەمریکا باشوور کە بۆ پڕۆژەکە پێویست بوو، پرۆسەیەک کە لەلایەن خانەوە ئاسانکاری بۆکرا چونکە توانیبووی پەیوەندی هاوڕێیەتی زۆر لەگەڵ فیزیازانەکانی بواری ناووکی ئەورووپی، ئەندازیاران و شارەزایانی ئەم بوارە بنیاد بنێت —هەروەها شارەزاییەکی باشیشی هەبوو لەگەڵ بەرنامەکانی بۆمبی نهێنی حکومەتە خۆرئاواییەکان.

شیکەرەوە هەواڵگرییەکانی ئەمریکا و بەریتانیا هەر لەسەرەتاوە درکیان بەم چالاکییە کردبوو. لە یەکەمین ڕاپۆرتەکانیاندا خان وەک فەرمانبەرێکی حکومەت لەقەڵەم درابوو کە لە پرۆژەیەکی سڤیلی سەربە سەرۆک وەزیرانی ئەوکات، زولفیقار عەلی بهوتۆ، کاردەکات. کاتێک لە کودەتایەکی سەربازییدا لەساڵی ١٩٧٧ بهوتۆ لەسەرکار لادرا، سی ئای ئەی وشیاریدا کە خان و پڕۆژەی ناووکی دەچنەژێر دەسەڵاتی دیکتاتۆری نوێی پاکستان، جەنەڕاڵ زیاء الحق. هەواڵدۆزەکانی خان، لە ئەرکەکەیاندا بۆ کڕینی مەوادی پێوستی چەکی ناووکی، لەژێر فەرمانی جەنەڕاڵ و کاربەدەستانی هەواڵگرییدا کاریان دەکرد.

سەرەڕای ئەمەش، زانیاری زۆر دەربارەی بەرنامەی بۆمبی پاکستان بەخێرای بوو بە خەراپ شکایەوە. لەساڵی ١٩٧٩، سەرۆک جیمی کارتەر، کە لەساڵی ١٩٧٧ هاتەسەر دەسەڵات و بەڵێنی کەمکردنەوەی ژمارەی چەکی ناووکی لەسەر رووی زەویدا، لەلایەن

زبیگنیڤ برژێنسکیەوە، راوێژکاری ئاسایشی نیشتیمانی سەرۆک، هاندرا بۆئەوەی بەبڕیارەکانیدا بچێتەوە. سۆڤیەت دەستی وەردەدایە کاروباری ئەفغانستانی دراوسێی پاکستان و واپێدەچوو کە دەکرا بگەنە ئێرانیش، کە تیایدا شا، هاوپەیمانی سەرەکی ئەمریکا، بەو سەرئەنجامە هەیشتبوو. ئامۆژگاری کارتەر کرا کە پاکستان بەربەستێکی پێویست بوو لەدژی کۆمۆنیزم و دەبوایە پشتیوانی بکرێت. لەبەرامبەر بەرپەرچدانەوەی پێشڕەوییەکانی سۆڤیەت، واشنتۆن لاری نەبوو لە خۆگێلکردن دەربارەی ویستە ناوکییەکانی جەنەرال زیاء.

لەوکاتەی وجوودی سۆڤیەت بەتەواوی باڵی بەسەر ئەفغانستاندا کێشا، بە داگیرکردنی کابول لەلایەن سوپای سوور لە کرێسمەسی ١٩٨٠دا، کارتەر لەلایەن رۆناڵد رەیگانەوە جێگای گیرایەوە. ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتیمانی و نووسینگەی راوێژکاری ئاسایشی نیشتیمانی هەرزوو دەسەڵاتیان کەمکرایەوە، لەوکاتەی سی ئای ئەی، لەژێر سەرپەرشتی ویلیام کەیسی، هەڵسا بەجێبەجێکردنی ئەجێندای رەیگان. هەردووکیان پێیان وابوو کە ئەفغانستان تەنیا سیناریۆیەک بووە کە ئەمریکا دەکرا جەنگێک بباتەوە بەبێ ئەوەی شەڕ بکات، ئەمەش بە فودانی موجاهیدەکانی پاکستان بۆ راوەدوونانی سوپای سووری سۆڤیەت. بەرپرسانی ئەمریکا چەندین پەیامیان بۆ پاکستان نارد کە تیایاندا ئەوەی بەئاشکرا راگەیاندبوو ئەمریکا پێشڤەچوونی بەرنامەی ناووکی ئەو وڵاتە فەرامۆش دەکات. سەرەڕای ئەم پەیامانەش، لە ئەمریکا، سەرۆک رەیگان وای بە رای گشتی ئەمریکا دەوت کە ئەو سوورە لەسەر نەهێشتنی چەکی ناووکی و ئەمە وەک سیاسەتی ئیدارەکەی دەمێنێتەوە.

هەرکە بەرنامەی بۆمبی پاکستانی پەرەی سەند، ئیتر توانای لەنێوبردنی تا دەهات ئاڵۆزتر دەبوو. پاکستان ئەم جارە لە بازرگانیکردن بەو جۆرە تەکنەلۆژیایە هیچ چارەسەرێکی بۆ ئەمریکا نەهێشتەوە. حکومەتی ئەمریکا، بەتایبەتی بەرپرسانی وەزارەتی دەرەوە، کەوتنەنێو پیلانگێڕییەکی چارەسەرنەکراو دەربارەی پاکستان. چەندین بەڵگەنامەی سەبارەت بە بەرنامەکە لەنێو بردران، فایلی تاوانکاری بێدەنگیان لە ئاستدا دەنوێنرا، کۆنگرێس بە بەردەوامی درۆی لەگەڵدا دەکرا، وە لە چەندین

کەیسدا، لەساڵەکانی ١٩٨٦ و ١٩٨٧، فەرمانبەرانی ئەمریکی لەلایەن پاکستانەوە بەرتیلیان پێدەدرا بۆئەوەی لە گومرگەکانی ئەمریکا بەئاسانی بپەڕنەوە لەکاتی کڕینی پێکهاتەکانی بەرنامەی ناووکی لە ئەمریکا.

ئەگەر ئەو کەسانەی لەم بەرنامەیەدایە تێوەگلابوون هەرزوو دوورخرابوانەوە تووشی چارەنووسێکی رەش دەبوون لەدادگادا، ئەمە رێک وەک مەسەلەی کۆنترا-ئێران بوو کە تیایدا جۆن پۆندێکستەر راوێژکاری ئاسایشی نیشتیمانی و سەرهەنگ ئۆلیڤەر نۆرت ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایش لە ئۆپەراسیۆنی رەشدا تێوەگلابوون کە لەبارەی بوونیەوە درۆ لەگەڵ کۆنگرێس کرا و بەمەش خۆیان لە یاسای فیدرالی دۆزیەوە بۆئەوەی چەک بە ئێران بفرۆشن و بارمتە ئێرانییەکان ئازاد بکەن. بەڵام چالاکییە "نهێنییەکانی" لەبارەی بەرنامەی ناووکی بەردەوام بوون، بەواتایەکی تر، فریودانەکە بەردەوام بوو.

بەهاوکاری وڵاتی چین، پاکستان لەساڵەکانی ١٩٨٤ و ١٩٨٣ لەسەر یەک تاقیکردنەوەی چەکی ناووکی ئەنجامدا. دیسان، ئەم پەیوەندییە ناووکییەی نێوان پاکستان و چین لەلایەن ئیدارەی رەیگانەوە پەردەپۆش کرا، جگە لەوەی کە پەکین چەندین هاوکاری لەڕووی پێکهاتەکانی ناووکی پیشکەشی ئیسلامئاباد کرد. لەبەرامبەردا، کۆمپانیا ئەمریکییەکان چەند گرێبەستێکی ملیۆنان دۆلاریان بەدەستهێنا لە گرێبەستکارانی وزەی ناووکی چینی.

سەرۆکایەتی رەیگان لەساڵی ١٩٨٩دا کۆتایی هات، کە پاکستان بووە خاوەنی ئامێری ناووکی تاقیکراوە، تەنانەت بەشێکی زۆری ئەو بەرنامەیە لەلایەن ئەمریکاوە پارەدار کرا، بەسەدان ملیۆن دۆلار لەو پارەیە لەلایەن سوپای پاکستانەوە بردرا. کۆماری ئیسلامی خاوەنی بۆمبێکی ناووکی بوو کە دەتوانرا بەهۆی فرۆکەیەکی شەڕکەری ئێف-١٦ هەڵبگیرێت، ئەم فرۆکەیەش لەلایەن رەیگانەوە لەساڵانی هەشتاکاندا پێشکەشی کرابوو، وە بەرنامەی چەکە ناوکییەکانی ببووە بازاڕێکی گەرم بۆ ناسەقامگیرترین هێزەکانی جیهان.

لەسەرەتادا، سەرۆک جۆرج بوشی باوک بەردەوامی بە فریودانەکەدا. بەرپرسانی پینتاگۆن بوون بە پاسەوانی پاکستان، ئەمەش بە دووبارە نووسینەوەی خەملاندنی هەواڵگری بە ئامانجی دروستکردنی بەربەست لەبەردەم توانا ناووکییەکانی کۆماری ئیسلامی تەنانەت لەوکاتەشدا کە ئیسلامئاباد و نیودەلهی خەریکی بەدەستهێنانی چەکی ناووکی بوون. کاتێک جەنگ لە ئەفغانستان کۆتایی هات، سەرۆک بوش لە بڕیارێکدا هاوکارییەکانی بۆ پاکستان بڕی، بەمەش پەیوەندی نێوان ئەمریکا و پاکستانێکی ناووکی کۆتایی هات تا موشەکی کروز کەوتنە دەستی ئوسامە بن لادن لەساڵی ١٩٩٨ لە ئەفغانستان. هەموو ئەو چیرۆکە سەیرە لەوکاتەوە دەستی پێکرد کە پیاوێکی گەنج نائومێد بوو لە بەدەستهێنانی کارێک، بۆیە بڕیاریدا کارێک بکات کە جیهان بەخۆیەوە سەرقاڵ بکات. ئەو وانە گرنگەی لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەوەیە کە توانای یەک تاقە مرۆڤی زانا و پسپۆڕ لە بوارێکی زانستی وەک فیزیادا دەتوانێت تەواوی جیهان بخاتەنێو گێژاوێکی پڕمەترسیی سەرهەڵدانی جەنگێکی جیهانییەوە. ئێستا، لەسایەی سەری خاندا کۆریای باکوور، ئێران، لیبیا لەسەردەمی قەزافیدا، هەموویان خەریکە دەگەن بە چەکی ناووکی (ئەگەر رژێمی قەزافی بەهاوکاری ئەمریکا نەڕوخایە ئەمیش ئێستا دەگەیشتە ئاستی ئێران و کۆریای باکوور)، ئەگەر پێشووتر نەگەیشتبن.[i]

---

[i] Levy, A., & Scott-Clark, C. (٢٠٠٧). *Deception: Pakistan, the United States, and the secret trade in nuclear weapons*. Bloomsbury Publishing USA.

## ئەیمەن دین

ئەیمەن، کە زیاتر بە ناوی (رەمزی) دەناسرێت، پیاوێکی بەڕەگەز سعودییە و یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی رێکخراوی تیرۆرستی قاعیدە.[i] لەساڵی ١٩٩٨، ناوبراو پەیوەندی بە دەزگای هەواڵگری نهێنی بەریتانییەوە (MI٦) کرد و بوو بە سیخوڕی دەزگاکە.[ii] دین لە ولاتی سعودیەدا هاتۆتە دنیاوە.[iii] لەتەمەنی دوازدە ساڵیدا ناوبراو تەواوی قورئانی لەبەرکردووە وە بۆتە حافیز. دوای بەدوای مردنی دایکی ناوبراو زۆر گیرۆدەی بیرۆکەکانی سەید قوتب بووە بەتایبەتی لە پەرتووکەکەیدا بەناوی "لە سێبەری قورئاندا." ئەو یەکێک بەشێک بووە لە بازنەی "وشیاری ئیسلامی" لە مزگەوتی عومەری کوڕی عبدالعزیز لەشاری خۆبار، کە تیایدا یەکێک لە مامۆستاکانی یوسف العەیری بوو. لەساڵی ١٩٨٩ برا گەورەکەی، محیەدین، بۆماوەی سێ مانگ بۆ شەڕکردن چووە ئەفغانستان. لە تەمەنی پازدە ساڵیدا لەگەڵ هاوڕێیەکی بەناوی خالید عەلی حاج، کە لە ئەفغانستان گەڕابووەوە، بەرەو ولاتی بۆسنیا گەشتی کرد بۆئەوەی بەژدار بێت لە جەنگی بۆسنیا. لە ولاتەدا، ناوبراو بوو بە بەشێک لە فەیلەقی موجاهیدینی بۆسنی کە زیاتر لە ٢٠٠ کەسی سەربڕی دوای جەنی ڤۆزوشا. ئەو تەنانەت گەواهیدەری خالیدی هاوڕێی بوو کە سەری یەکێک لە گیراوانی بە چەقۆی راوکردن دەپەڕاند. ماوەیەکی کەم پێش کۆتاییهاتنی جەنگەکە، ناوبراو لەلایەن خالید شێخ موحەمەدەوە تەجنیدکرا کە پێشنیاری بۆ کرد بچێتە ئەفغانستان، بەم

---

[i] "MI٥ double agent offers rare insight into al-Qaeda and jihad" (http://www.theweek.co.uk/٦٢٧٧١/mi٥-double-agent-off ers-rare-insight-into-al-qaeda-and-jihad). Theweek.

[ii] "The spy whocameinfromalQaeda"(http://www.bbc.com/news/magazine-٣١٧٠٠٨٩٤). BBC News. ٢٠١٥-٠٣-٠٣. Retrieved ٢٠١٧-١٢-٢٣.

[iii] "Aimen Dean's al-Qaeda story: dramatic but hard to swallow" (https://www.telegraph.co.uk/culture/tvandradio/١١٤٤٧ ٩٩٩/Aimen-Dean-al-Qaeda-review.html). telegraph.

هۆیەشەوە سەرەتا ناردی بۆ شاری پیشاوەری پاکستان و لەوێشەوە بەهۆی چەند کەسێکەوە بەرەو ئەفغانستان.[i]

دوابەدوای بۆسنیا، ئەیمەن بانگهێشتی قەندەهار کرا بۆ بەیعەتدان بە ئوسامە بن لادن و پەیوەندیکردن بە قاعیدەوە. لە ئەفغانستاندا، ناوبراو چەند خولێکی بنچینەکانی یەکتاپەرستی و مێژووەکەی بینی. دوای ئەوەی لەساڵی ١٩٩٨ ڕێکخراوەکە هەڵسا بە تەقاندنەوەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا، ناوبراو تووشی شپرزەیی و دڵەڕاوکێ بوو، هەربۆیە داوای لە عبدالله ئەلموحاجە کرد کە عوزری شەرعی بۆ ئەم کارە پێشکەش بکات. ناوبراو ڕووبەڕووی فەتوایەکی ئیبن تەیمیەی سەدەی سێزدە کرایەوە. دڵی ناوبراو تەنیا بە قسەی ئەوان ئاوی نەخواردەوە، بەڵکو هەڵسا بە لێکۆڵینەوە لەو فەتوایە کە تیایدا باسی داگیرکاری مەغۆلەکان و بەکارهێنانی قەڵغانی مرۆیی دەکات کاتێک شارەکەیان ئابلۆقەدا.[ii] دوای لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ، ئەیمەن هەستی بەوە کرد کە ئەمە عوزرێکی شەرعی نییە بۆ کوشتنی هاوڵاتیانی مەدەنی. ئەو بڕوای وابوو کە چەمکی "جیهاد" لەلایەن سەرانی قاعیدەوە گۆڕدراوە. ئامانجەکەی جیهاد لەلای قاعیدە بریتییە لە دەستپێکردنی جەنگی جیهانی لەدژی خۆرئاوا.[iii]

ئەیمەن بڕیاریدا قاعیدە جێبهێڵێت و بەبیانووی نالەباری تەندروستی وەک بەهانەیەک بەرەو قەتەر بەڕێکەوت. هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ فڕۆکەخانەی ئەو وڵاتە، لەلایەن دەزگای هەواڵگری قەتەرییەوە دەستگیرکرا، بەمەش دەزگای نهێنی بەریتانی خۆی لە مەسەلەکەوە هەڵقورتاند، دوای گفتوگۆیەکی زۆر ناوبراو قایل بوو کار بۆ دەزگاکە بکات. دوای نزیکەی حەوت مانگ لە لێکۆڵینەوە لەناوبراو، دەزگای نهێنی بەریتانی

---

[i] "Nine Lives: My time as the West's top spy inside al-Qaeda" (https://books.google.co.uk/books?id=opNNDwAAQBAJ&pg=PT٢&source=gbs_selected_pages&cad=٢#v=onepage&q&f=false). Oneworld Publications.

[ii] "Attacking the disbelievers if they use Muslims as human shields" (http://www.islamweb.net/emainpage/index.php?page=showfatwa&Option=FatwaId&Id=١٧٠٤٠٣). Islamweb.

[iii]"ThememoriesofAimenDean"(https://www.tasnimnews.com/fa/news/١٣٩٦/٠٢٢٣/١٤٠٥١١٥/%D٨%AE%D

ناوبراوی رازی کرد وەک سیخوڕ بگەڕێتەوە ئەفغانستان. دوای گەڕانەوەی، ئەیمەن بۆماوەی هەشت ساڵ سیخوڕی بەسەر قاعیدەوە کرد بەرلەوەی لەلایەن واشنتۆنەوە ئاشکرا بێت. لەوماوەیەدا، ئەو گەشتی ئەنجامەدا لەنێوان ئەفغانستان و لەندەن لەجیاتی قاعیدە، بەمەش دەرگا والا بوو بۆئەوەی هەموو چالاکییەکان بە دەزگای نهێنی ئەو بەریتانی رابگەیەنێت.[i] کارە نهێنیەکەی ئەیمەن لەلایەن نووسەرێکی ئەمریکییەوە ئاشکراکرا کە چەند سەرچاوەیەکی دەزگای هەواڵگری ناوەندی بەکارهێنا لە پەرتووکێکدا، بەمەش بەناچاری لە لەندەن مایەوە و کارەکەی کۆتایی پێهات. دوابەدوای ئاشکرابوونی، ناوبراو دوو پەرتووکی نووسی دەربارەی ئەو ئەزموونەی کە پیایدا تێپەڕی، ئامانج لەمەش تەنیا وشیارکردنەوەی گەنجانی موسڵمان بوو لە فریودانی دەزگا جیهادییەکانی وەک قاعیدە.[ii]

## گرتنی سیگیف، سیخوڕی ئێران لە ئیسرائیل

سیگیف وەزیری پێشووی حکومەتی ئیسرائیل، ئەندامی کنێسێت و پزیشک بووە. ناوبراو بەتۆمەتی هەوڵدان بۆ بەقاچاغبردنی دەرمان، ساختەکاری، وە تەزویری بازرگانی ئەلیکترۆنی تۆمەتبارکراو. لە مانگی ئایاری ٢٠١٨ بەگومانی سیخوڕیکردن بۆ ئێران لەلایەن حکومەتی ئیسرائیلەوە دەستگیرکرا.[iii]

ئەو لە ناوچەی کیریات مۆتزکین لەدایک بووە. ناوبراو خزمەتی سەربازی ناچاری خۆی لە هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیل بە بەژداربوون لە خولێکی سوپای ئاسمانی

---

[i] "MI٥ double agent offers rare insight into al-Qaeda and jihad" (http://www.theweek.co.uk/٦٢٧٧١/mi٥-double-agent-off ers-rare-insight-into-al-qaeda-and-jihad)
-"The spy who came infromalQaeda"(https://www.bbc.co.uk/news/magazine-٣١٧٠٠٨٩٤). BBC.

[ii] "IwasMI٦'SspyinalQa'ida"(https://www.theaustralian.com.au/news/world/thetimes/iwasmi٦sspyinalqaida/newsstory/٣٢٩١٠٢f٥d٠f٢feee٠a٧٧f٣٢b٩f٠d٩e٨٠.) .

[iii] Liebermann, Oren; Schwartz, Michael (١٨ June ٢٠١٨). "Ex-Israeli minister chargedwithspyingforIran"(https://edition.cnn.com/٢٠١٨/٠٦/١٨/middleeast/gonen-segev-israel-iran-intl/index.html). CNN.

ئیسرائیل دەستپێکردووە، بەڵام هەرزوو لەو شوێنە هاتەدەرەوە و چووە یەکەی شەرکەرەوە، کە تیایدا تا پلەی نەقیب رۆیشت. لەزانکۆی بنگوریۆن لە بەشی پزیشکیدا خوێندوویەتی. ئەو وەک پزیشکێکی تایبەت و جووتیارێک لە تەل ئەداشیم کاری کردووە. سەبارەت بەژیانی سیاسیی ناوبراو، ئەو لەسەرەتای ساڵانی نەوەدەکانەوە کەسێکی چالاک بوو لە پارتی تزۆمێت کە لەلایەن رافایل ئیتان دامەزرابوو. لەساڵی ١٩٩٧ ناوبراو وەک ئەندامی پەرلەمانی ئەو وڵاتە (کنێسێت) هەڵبژێردرا، ئەمەش دوای ئەوە هات کە پارتەکەی لەهەڵبژاردنی گشتیدا هەشت کورسی بەدەست هێنا. لەتەمەنی سی و پێنج ساڵیدا، یەکێک بووە لە لاوترین ئەو کەسانی بۆ ئەندامی کنێسێت هەڵبژێردراون. بەهۆی ئەوەی پارتی کرێکاران گەورەترین پارت بوو لە هەڵبژاردەکان، بۆیە حکومەتی تەشکیل کرد و پارتەکەی ناوبراویش هەر وەک ئۆپۆزسیۆن مایەوە. سیگیف وەک ئەندامێکی ئۆپۆزسیۆن و ئەندامی لیژنەی دارایی لە پەرلەمان کاری دەکرد.

سیگیف لە کانوونی دووەمی ١٩٩٥ بووە بە وەزیری وزە و ژێرخان دوای ئەوەی پارتەکەی (کە بەرەی یود بوو، وە لەساڵی ١٩٩٤ لە پارتی تزۆمێت جیابووەوە) بەژداری حکومەتەکی ئیسحاق رابینی کرد. سسیگیف هەمان لە ٢٢ نۆڤەمبەری ١٩٩٥ تا ١٨ای حەزیرانی ١٩٩٦ هەمان پۆستی پێدرا لە حکومەتەکەی شیمۆن پێرێز کە ماوەیەکی کەم دوای غافڵکوژی رابین پێکهێنرا. دەنگی ناوبراو لە پەرلەمانی ئەو وڵاتە دەنگی یەکلاییکراوە بوو لە تێپەڕاندنی دەنگدان لەسەر پەیمانی ئۆسلۆ.[i]

دوای ئەوەی پیشەی سیاسیی سیگیف کۆتایی هات، رووی کردە بازرگانیی. لە نیسانی ٢٠٠٤، ناوبراو بەتۆمەتی هەوڵدان بۆ بەقاچاغهێنانی هەزاران حەبی ئارامکەرەوەی قەدەغە لە شاری ئەمستردامی هۆڵەنداوە بۆناو ئیسرائیل، دەستگیرکرا کە خۆی بانگەشەی ئەوەی کرد بەهەڵە هێنراوە.[ii] ناوبراو بە قەڵەم رۆژی

---

[i] "Payoff at a Public Level" (https://www.haaretz.com/١،٤٨٤٧٨٩٥). Haaretz. ١١ April ٢٠٠٥.

[ii] Israeliexministerindrugsbust(http://news.bbc.co.uk/١/hi/world/middle_east/٣٦٥٢٤٧٥.stm) BBC News, ٢٣ April ٢٠٠٤

بەسەرچوونی پاسپۆرتە دبلۆماسییە هۆڵەندییەکەی درێژکردەوە بۆئەوەی لەلایەن سەرانی فڕۆکەخانەوە نەپشکنرێت. بەهۆی ئەم تۆمەتانەوە ناوبراو پێنج ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوە. جگە لەمەش، ئەو لە وڵاتی هۆنگ کۆنگ هەوڵیدا پارە لە ئامێری ئۆتۆماتیکی بانقی بهێنێتە دەرەوە لەوکاتەی بانگەشەی ئەوەی کرد کە کارتەکەی دزراوە.[i] ناوبراو بێ ئاگا بوو لەوەی وێنەکەی گیراوە لەوکاتەی دزیەکەی ئەنجامدەدا.
لە ئابی ٢٠٠٦دا، دادگایەکی ئیسرائیلی تانەی ناوبراوی ڕەتکردەوە بەمەبەستی کەمکردنەوەی ماوەی زیندانییەکەی. لە ئازاری ٢٠٠٧، مۆڵەتی تەندروستی ناوبراو بەفەرمی هەڵوەشێنرایەوە.[ii] دووبارە، تانەی لەو بڕیارەی دادگادا، بەڵام داواکەی ڕەتکرایەوە. لەساڵی ٢٠٠٧ ناوبراو بەمەرج لە زیندان ئازادکرا، ئەم بڕیارەش دوای ڕەفتاری چاکی ناوبراو هات لەناو زینداندا.[iii]
بەهۆی ئەوەی ناوبراو چیتر نەیدەتوانی مومارەسەی پیشەی پزیشکی خۆی بکات لە ئیسرائیل، ناچار بوو بەرەو وڵاتی نێجیریا بڕوات و لەوێ کارەکەی خۆی بکات.[iv] سیگیڤ لەوێدا پزیشکی ستافی دبلۆماسی ئیسرائیلی لە ئەبوجا و ئەندامی کۆمەڵگای خۆجێیی جوو بوو. بەهۆی ڕزگارکردنی ژیانی پاسەوانێکی ئاسایشی ئیسرائیل، وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل نامەیەکی سوپاس و پێزانینی پێبەخشی.[v] لەساڵی ٢٠٠٦، ناوبراو داوای کرد کە وەزارەتی تەندروستی ئیسرائیل دووبارە

---

[i] "Gonen Segev Charged With Credit Card Fraud" (https://www.haaretz.com/١,٤٧٤٢٦٣٠). Haaretz. ٢٩ June ٢٠٠٤.
[ii] "Former minister Dr. Gonen Segev's medical license revoked" (https://www.ynetnews.com/articles/١,٧٣٤٠,L-٣٣٧١٤٦٥,٠٠.html). Ynetnews. ٣ January ٢٠٠٧.
[iii] "Former minister Gonen Segev to be released" (https://www.jpost.com/Israel/Former-minister-Gonen-Segev-to-be-released). The Jerusalem Post. ٢١ May ٢٠٠٧.
[iv] "Convicted ex-minister seeks to return to Israel as doctor" (https://www.timesofisrael.com/convicted-ex-minister-seek s-to-return-to-israel-as-doctor/). The Times of Israel. ١ November ٢٠١٦.
[v] "Report: Ex-minister Segev was doctor for Israeli officials in Nigeria" (https://www.timesofisrael.com/liveblog_entry/re port-ex-minister-segev-was-doctor-for-israeli-officials-in-nigeria/). The Times of Israel. ١٨ June ٢٠١٨.

مۆڵەتەکەی پێبداتەوە بۆئەوەی لەسەر پیشەی پزیشکی لە ئیسرائیل بەردەوام بێت. داواکەی ڕەتکرایەوە. لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ میدیای ئیسرائیلی، ئەو وتی کە "من ئامادەنیم بگەڕێمەوە ئیسرائیل تا ئەوکاتەی وەک 'دکتۆر گۆنین سیگیف' بانگم نەکرێت و لە وڵاتەکەمدا وەک پزیشک کار نەکەم... نەوەک وەک تاوانباری پێشوو 'گۆنان سیگیف.'"[i]

لە حەزیرانی ٢٠١٨، ئاسایشی ناوخۆی ئیسرائیل (شین بێت) و پۆلیسی ئەو وڵاتە ڕایانگەیاند کە ناوبراو بەتۆمەتی گومانی سیخوڕیکردن بۆ دەزگای ئیتلاعاتی ئێران دەستگیرکراوە. ناوبراو لە وڵاتی نایجیریا لەلایەن سەرانی باڵیۆزخانەی ئێرانی لە نایجیریا لەساڵی ٢٠١٢ تەجنیدکرابوو، سەرەتا بەو بیانوویە هێنرایە باڵیۆزخانەی ئێرانی کە منداڵانی ستافی دبلۆماسیی چارەسەر دەکات.[ii] ئەو دووجار چووە ئێران بۆئەوەی چاوی بە ڕێنماییکەرەکانی بکەوێت، و لە هۆتێل و باڵەخانەکاندا چاوی بە چەند هەواڵدۆزی ئێرانی لەسەرتاسەری جیهان دەکەوت. ناوبراو چەند ئامێرێکی گەیاندنی نهێنی پێدرا بەمەبەستی شیفرەدارکردنی پەیامەکان لەنێوان خۆی و ڕێنماییکەرە ئێرانییەکانیدا. بەپێی ڕاگەیاندنەکان، ناوبراو بەردەوامی بە پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ ئەو ئیسرائیلیانەی لە بواری بەرگریی و پەیوەندی دەرەوەی ئیسرائیل کاریان دەکرد، وە بەجیددی کاری دەکرد بۆئەوەی بەرپرسە ئێرانییەکان ببەستێتەوە بە هەواڵدۆزە نهێنییەکانی ئیتلاعاتی ئێران. لە ئایاری ٢٠١٨، سیگیف ڕێگای پێنەدرا بۆئەوەی بچێتەناو وڵاتی گینیای ئیستیوائی بەهۆی ئەو تۆمارە تاوانبارییەی هەیبوو کە لەلایەن ئیسرائیلەوە درابووەپاڵی.[iii]

---

[i] "Disgraced 'M&Ms' minister Segev now a figure of infamy rather than derision" (https://www.timesofisrael.com/disgra ced-mms-minister-segev-now-a-figure-of-infamy-rather-than-derision/). The Times of Israel. ١٨ June ٢٠١٨.

[ii] "Former minister arrested on suspicion of spying for Iran" (http://www.israelnationalnews.com/News/News.aspx/٢٤٧٦ ٣٢). Israel National News. ١٨ June ٢٠١٨.

[iii] "Former Israeli Minister Who Smuggled Ecstasy Now Accused of Spying for Iran" (https://www.haaretz.com/israel-ne ws/former-israeli-minister-accused-of-spying-for-iran-١,٦١٨٢٥٤٨). Haaretz. ١٨ June ٢٠١٨.

هەر لەناو فڕۆکەخانەی ئەو وڵاتەدا ناوبراو بەتۆمەتی سیخوڕیکردن لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرا و دەستگیرکرا. ئەو تۆمەتانەی لەلایەن دادگای ئۆرشەلیم درابوونە پاڵشی بریتیی بوون لە هاوکاریکردنی دوژمن لەکاتی جەنگدا، و بەخشینی زانیاری بە دوژمن. بەگوێرەی وتەکانی سەرانی ئیسرائیلی، سیگیڤ نکوڵی لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەرپرسانی ئێرانی نەکرد، بەڵام وتی کە ئەو وەک سیخوڕی دووسەرە کاری کردووە، ئەمەش تەنیا بەو هیوایەی بتوانێت شکۆ شکێنراوەکەی بگەڕێنێتەوە و وەک پاڵەوانێک بگەڕێتەوە ئیسرائیل. دادگای ئۆرشەلیم رۆژی ٥ی تەمموزی ٢٠١٨ی دیاریکردووە بۆ دادگاییکردنی، بەڵام دادگاکەی بەداخراوی دەبێت.[i]

سیگیڤ لەبەردەم دادگادا

[i] "Former Israeli minister 'spied for Iran' " (https://www.bbc.com/news/world-middle-east-٤٤٥٢٠٨٥٠?ocid=socialflow_tw itter). BBC News. ١٨ June ٢٠١٨.

## پاڤلۆڤیچ بێریا (١٨٩٩-١٩٥٣)

بێریای سیاسەتڤان و بەرپرسی پۆلیسی نهێنیی، لە خێزانێکی جووتیاری وڵاتی جۆرجیا (ئەوکات سەربە رووسیا بوو) لە بەرواری ٢٩ی ئازاری ١٨٩٩ لەدایک بووە. ناوبراو لەوکاتەی لە شاری باکۆ قوتابی ئەندازیاری بوو، لە دەوروبەری ١٩١٧ پەیوەندی بە پارتی بەلشەڤیک کرد کە لە هەردوو وڵاتی جۆرجیا و ئازەربایجان چالاک بوو. لەساڵی ١٩٢١ چووە ناو ریزەکانی پۆلیسی نهێنی (Cheka) لە جۆرجیا، لە بەشی هەواڵگریی. ئەو هەرزوو چەندین پلەی بڕی.

بێریا پشتیوانی هاتنی جۆزێف ستالینی هاونیشتیمانیە جۆرجییەکەی کرد بۆسەر دەسەڵات لەسەرەتای ساڵانی بیستەکاندا. ستالین لە پاداشتدا، وەک جێگری بەرپرسی دەزگای هەواڵگری (People’s Commissariat for Internal Affairs) لەساڵی ١٩٣٨ دایمەزراند؛ هەرهەمان ساڵی بوو بە بەڕێوەبەری دەزگاکە. وەک بەرپرسی دەزگاکە، بەرپرسیارێتی بێریا بریتیی بوون لە کاری گشتی ئاسایش، دابینکردنی ئاسایش بۆ بەرپرسان، هێزە تایبەتەکان، بەڕێوەبردنی کەمپەکان، و هەواڵگریی و دژەهەواڵگریی بۆ یەکێتی سۆڤیەت. ناوبراو دەزگاکەی لە کەسانی نەشیاو و گوماناوی پاککردەوە، بەم بۆنەشەوە چەندین کەسی نزیک لە خۆی لەشوێنی ئەوان دانا. دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت رۆژئاوای پۆلەندای داگیرکرد لەساڵی ١٩٣٠ و وڵاتانی بەلتیک لەساڵی ١٩٤٠، ناوبراو هەڵسا بە کوشتن و نەفیکردنی چەندین لەو کەسانەی کە گومانی لێیان هەبوو.

کاتێک نازییەکان لەساڵی ١٩٤١ یەکێتی سۆڤیەتیان داگیرکرد، ناوبراو کۆمیسیاری ئاسایشی دەوڵەت و ئەندامی کۆمیتەی بەرگریی دەوڵەت بوو. لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا، بێریا ئامرازی هەمەجۆری بەکارهێنا بۆ ئەم مەبەستە، لەوانە بەکارهێنانی کرێکاری کۆیلە و کەسانی کەساسی وڵاتەکەی بۆ ئەوەی لەم جەنگەدا بەژداربن. بەهۆی سەرکەوتنەکانی، ناوبراو پلەی مارشالی لە سوپای یەکێتی سۆڤیەتدا وەرگرت. هەروەها، ستالین ئەوی وەک سەرۆکی بەرنامەی بۆمبی ئەتۆمی

دەستنیشانکرد، کە تیایدا سەرپەرشتی تۆڕە سیخوڕیەکەی کرد لە ئەمریکا کە بووە هۆی یارمەتیدانی سۆڤیەت لە پەرەپێدانی بۆمبی ئەتۆمی ئەو وڵاتە لەساڵی ١٩٤٩.

دوای جەنگ، بێریا وەک سەرۆکی دەزگای هەواڵگری دەستی لەکارکێشایەوە، بەڵام بەردەوام بوو لەسەر بەرپرسیاریەتی ئاسایشی نیشتیمانی وەک جێگری سەرۆک وەزیران. دوای مردنی ستالین لە ئازاری ١٩٥٣ و سەرهەڵدانی ململانێی هێز و دەسەڵات کە تیایدا بێریا لایەنگیری جۆرجی مالێنکۆڤی سەرکردەی نوێی سۆڤیەت کرد، ئەو هەر لەسەر پۆستەکەی جارانی وەک جێگری سەرۆک وەزیران مایەوە، وە دووبارە وەک سەرۆکی دەزگای هەواڵگریش دیاریکرایەوە. بێریا لەناکاو بڕیایدا کە ئەو زیندانیانەی بەتۆمەتی دژایەتی کردنی ستالین دەستگیرکرابوون، ئازادبکرێن.

لەساڵی ١٩٥٣، سەرکردە سۆڤێتییەکان بێریایان بە سیخوڕیکردن بۆ بەریتانیا تۆمەتبارکرد و دەستبەجێ دەستگیرییان کرد و هەموو پۆستە حکومییەکانیان لێ سەندەوە. هەندێ لە سەرکردە سۆڤێتییەکان بانگەشەی ئەوەشیان کرد کە هەر بێریا بووە ژەهری داوەتە ستالین وە ڕێگر بووە لە گەیشتنی دەرمانی پێویست بۆ ستالین لەکاتی جەڵتەی مێشکدا. ئەو بەتۆمەتی سیخوڕیکردنی بۆ دەزگا هەواڵگرییە بیانییەکان و هەوڵدان بۆ گەڕاندنەوەی سیستەمی سەرمایەداری لە دادگاییەکی نهێنیدا تۆمەتبارکرا و لە کانوونی یەکەمی ١٩٥٣ لە مۆسکۆ لە سێدارەدرا. هەندێک سەرچاوەی تریش ئاماژە بەوە دەکەن کە ناوبراو لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا لەماڵی خۆی لەگەڵ دەزگا هەواڵگرییەکانی سۆڤیەت کوژرا.[i]

---

[i] Beria, Sergo. Beria, My Father: Inside Stalin's Kremlin. Edited by Francosie Thom, translated by Brian Pearce. London: Duckworth, ٢٠٠١.
-Knight, Amy W. Beria: Stalin's First Lieutenant. Princeton, NJ: Princeton University Press, ١٩٩٣.
-Wittlin, Tadeusz. Commissar: The Life and Death of Lavrenty Pavlovich Beria.New York: Macmillian, ١٩٧٢.

## ئوسامە بن لادن (١٩٥٧-٢٠١١)

ئوسامە بن لادن وەک دامەزرێنەری قاعیدە و بەرپرسیار لە ڕێکخستنی هەردوو هێرشەکانی یازدەی ئەیلولی ٢٠٠١ بۆسەر ناوەندی بازرگانی جیهانی و پینتاگۆن (وەزارەتی بەرگریی) دەناسرێت. هەروەها ناوبراو پەیوەندی هەبووە لەگەڵ چەندین کاری تەقاندنەوە لەدژی ئامانجە ئەمریکییەکان لە دەرەوەی ئەو وڵاتەدا. ناوبراو بوو بە سیمبوڵی جەنگی جیهانیی دژەتیرۆری ئیدارەی سەرۆک جۆرج بوش. وەزارەتی دەرەوە بڕی ٢٥ ملیۆن دۆلاری تەرخانکرد بۆ هەر زانیارییەک کە بیانگەیەنێتە گرتن یان لەنێوبردنی ناوبراو. ئێف بی ئای ناوبراوی لە لیستی سەرەتای ویستراوترین تیرۆست لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠١ دانا، ئەمەش لەکۆی بیست و دوو لەو کەسانەی کارەکەیان ئەنجامدابوو. سەرۆک جۆرج بوش بەشێوەیەکی ئاشکرا بانگەشەی ئەوەی کرد کە بە "زیندوویی یان مردوویی" ئەویان دەوێت.

ئوسامە بن لادن لە خێزانێکی دەوڵەمەندی سعودی لەدایک بوو کە ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر بنەماڵەی پاشایی. موحەمەد عەواد بن لادنی باوکی بەرەو سعودییە کۆچی کرد و لەڕێی پیشەسازی بنیادنانەوە سەروەتێکی بێ شوماری کۆکردەوە. هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەدەن کە ئوسامە منداڵی حەڤدەم بووە لەکۆی پەنجا و چوار منداڵی ئەو خێزانە. بن لادن ژیانی منداڵی خۆی لەگەڵ دایک و زڕباوکی بەسەر بردووە. ئەو لە قوتابخانەیەکی زۆر پێشکەوتووی شاری جددە خراوەتە بەر خوێندن، لەوێدا یەکەم پەیوەندی دروست دەکات لەگەڵ چەند ئەندامێکی ئیخوان موسلیمین. ئیخوان موسلمین بزووتنەوەیەکی ئیسلامییە، لەساڵی ١٩٢٨ لە میسر دامەزراوە کە ئامانجی سەرەکی ئەوەیە هانی دروستکردنی حکومەتی ئیسلامی بدات، بۆچوونی پارێزکارانەی هەیە لەهەمبەر پرسە کۆمەڵایەتییەکان، و دژی پاشماوەکانی کۆلۆنیالیزمی غەربییە لە جیهانی ئیسلامیدا. بن لادن زیاتر تێکەڵی بەرنامەی ئیخوان موسلمین بوو لەوکاتەی لە زانکۆی شا عبدالعزیز بۆ خوێندنی ئەندازیاریی، کارگێڕی کار، ئابووریی، و کارگێڕی گشتی وەرگیرا کە تیایاندا لەساڵی ١٩٧٠ و ١٩٨١ بڕوانامەی بەدەستهێنا.

یەکێک لەو کەسانەی بن لادن لە زانکۆدا پەیوەندی لەگەڵدا بەست دکتۆر عبدالله یوسف عەزام بوو کە هاوکاری پێشکەش کرد لە ڕێکخستنی مقاومەیەکی دژە-سۆڤیەت لەهەمبەر داگیرکاری سۆڤیەت لە ئەفغانستان لە بنکەی پیشاوەری پاکستان. بن لادن دواتر لەوێ پەیوەندی پێوەدەکات و بەیەکەوە هەڵدەستن بە دامەزراندنی مەکتەب الخدمات لەساڵی ١٩٨٤. ئەم ڕێکخراوە کاری سەرەکی بریتیی بوو لەوەی کە پارە، چەک، و کارمەند بۆ مقاوەمەی ئەفغانی دابین بکات. چەندین سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە سەرەڕای سامانی تایبەتی بن لادن، ئۆپەراسیۆنەکانی دژە-سۆڤیەتی الخدمات پارەی پێویستی پێدرا لەلایەن ئەمریکا، سعودییە و پاکستانەوە. دوای تەنیا چوار ساڵ بن لادن لە عەزام جیابووەوە و هەڵسا بە دروستکردنی ڕێکخراوی قاعیدە. یەکێک لە ناکۆکییە هەرە سەرەکییەکان لە جیابوونەوەی هەردووکیان دەوترێت کە بریتیی بووە لە ویستی بن لادن لە تێوەگلاندنی عەرەبە ئەفغانییەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆتر لە جەنگەکەدا.

جەنگی کەنداوی فارس بە هەموو پێوەرەکان خاڵی وەرچەرخانی رامانی بن لادن بۆ لەهەمبەر جیهانی سیاسەتدا. دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن ئێراقەوە ناوبراو هاوکاری پێشکەش کرد بۆ ئەوەی بەرگریی لە سعودییە بکات لەدژی هەر هێرشێک بەڵام لەلایەن حکومەتی سعودیەوە ڕەتکرایەوە. کاتێک دواتر حکومەت ڕەزامەندی نیشاندا بۆئەوەی سوپای ئەمریکا لەو وڵاتەدا جێگری بێت، بن لادن سعودییە تۆمەتبارکرد و ڕایگەیاند کە مافی خۆیەتی حوکم بکات و ڕۆڵی خۆی بگێڕێت لە بەرگریکردن لە هەردوو شاری پیرۆزی مەککە و مەدینە. هێرشە بەردەوامەکانی بۆسەر سعودییە بووە هۆی دەرکردنی لەساڵی ١٩٩١. ناوبراو هەر بەردەوام بوو لە خەباتەکەی بەڵام ئەمجارە لە وڵاتی سودان کە ئەوکاتە لەلایەن بەرەی ئیسلامی نیشتیمانییەوە حوکم دەکرا. بن لادن تا ساڵی ١٩٩٧ لەوێ مایەوە و دواتر بەرەوشاری قەندەهار بەڕێکەوت کە ئەوکات شوێنگەی تاڵیبان بوو. لەکاتێکدا سودان سوودی زۆری بینی لە بوونی بن لادن لەو وڵاتەکەیدا، بەهۆی سامان و بەرژەوەندییە ئابوورییەکەی، بەڵام وڵاتەکە کەوتەبەر فشاری ئەمریکا و هەندێ وڵاتی ترەوە بۆئەوەی بن لادن لەوێ

دەربکەن. سودان سەرەتا ئامادەیی خۆی نیشاندا کە بینێرێتەوە بۆ سعودییە، بەڵام لەوە ترسا کە ئەم کارەی ئاژاوەی نێوخۆیی بەدوای خۆیدا بهێنێت، هەربۆیە سعودییە ئەمەی رەتکردەوە. دواتر لە ئایاری ١٩٩٦ ناردیە ئەفغانستان.

ئوسامە بن لادن لە بەرواری ٧ی تشرینی یەکەمی ٢٠١١ بەشێوەیەکی تۆمارکراوی تایبەت قسە بۆ کەناڵی جەزیرەی عەرەبی دەکات. ناوبراو سوپای خودای کرد بۆ هەردوو هێرشە تیرۆرستییەکانی یازدەی ئەیلول و سوێندی خوارد ئەمریکا "تا ماوە خەون بە ئاسایشەوە دەبینێت" تا ئەوکاتەی "سوپای کافرەکان خاکی محەمەد جێ دەهێڵن." (وێنە: ئەسۆشیەتید پرێس)

بوونی بن لادن بووەهۆی فشارێکی زۆری نێونەتەوەیی لەسەر سودان چونکە لەوکاتەی لەوێ بوو ناوبراو چەند زنجیرە هێرشێکی رێکخست بۆسەر ئەمریکییەکان لە کەنداوی فارسدا. هەوڵی یەکەم ئامانجی خۆی نەپێکا چونکە هیچ ئەمریکییەک نەکوژرا، لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٢، میوانخانەی گۆڵد میحەر لە شاری عەدەنی یەمەن تەقێنرایەوە. نزیکەی سەد سەربازی ئەمریکی لەو میوانخانەیە دەمانەوە بەڵام ماوەیەکی کەم بەر لە تەقینەکە شوێنەکەیان جێهێشتبوو. هەروەها، بن لادن پەیوەندیشی هەبوو بە رووداوەکانی ساڵی ١٩٩٣ی مەقادیشۆی سۆمال کە بووە هۆی کوشتنی هەژدە سەربازی ئەمریکی و تەقینەوەکانی ١٩٩٦ لە بنکەی سەربازی خۆبار

لە سعودییە کە بووە هۆی کوژرانی ٢١ سەربازی ئەمریکی. جگە لەمەش، قاعیدە لە تەقینەوەی شوباتی ١٩٩٣دا بۆسەر ناوەندی بازرگانی جیهانیی تێوەگلابوو کە بووە هۆی کوژرانی شەش کەس و بریندابوونی زیاتر لە هەزاری هاولاتی تر.
بن لادن لە ئەفغانستانەوە درێژەی بە هێرشەکانیدا بۆسەر ئامانجە ئەمریکییەکان. لە ئابی ١٩٩٨، چەندین تەقینەوەی یەک لەدوای یەک لە باڵیۆزخانەکانی ئەمریکا لە نایرۆبی کێنیا و دار سەلام تەنزانیادا، کە بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە ٢٠٠ کەس، ١٢یان ئەمریکی، و برینداربوونی زیاتر لە ٤٥٠٠ هاولاتی تر. لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٠، خۆکوژانی قاعیدە هێرشێکی تریان پێکهێنا بۆسەر کەشتیگەلییەکی ئەمریکا. لەم هێرشەدا حەڤدە کەشتیوان کوژران و ٣٩ی تریش برینداربوون.
دەزگای هەواڵگری ناوەندیی، بێگومان، ئاگاداری تێوەگلانی بن لادن بوو لە یاخیگەری ئەفغانەکان لە پاکستان بەڵام هیچ پەیوەندییەکی راستەوخۆی لەگەڵ ناوبراودا نەبوو. چالاکییەکانی بن لادن دەکەوتنەژێر دەسەڵاتداریەتی سنووری بەشی هەواڵگری ئەمریکا لە سعودییە. لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکانەوە، بەرە بەرە بووە ئامانجی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا. زانیاری زۆر و زەوەند کۆکرایەوە لەلایەن بنکەی سی ئای ئەی لە شاری خەرتوومی سودان، کە ئەرکی بەڕێوەبردنی لە ئەستۆی کۆفەر بلاک بوو. کۆفەر هەرزوو ناوبراوی وەک سەرکردەیەکی هەڵکەوتوو وەسف کرد بەڵام سی ئای ئەی هیچ بەڵگەیەکی راستەوخۆی نەبوو کە ناوبراو ببەستێتەوە بە هێرشە تیرۆرستییەکان. ناوبراو تەنیا کەسێک بوو لەو شەش کەسانەی کە ئەوان وەک ئامانجی هەواڵگریی چاودێرییان دەکرد. ئەوەی بەتایبەت جێگای سەرنج بوو بریتیی بوو لە رۆڵی ناوبراو وەک پارەپێدەرێک بۆ گروپە ئیسلامی و تیرۆرستییەکان، ئەمە جگە لە پەیوەندیەکەی لەگەڵ هەواڵگری سودانی. لەساڵی ١٩٩٤ چەند زانیارییەکی هەواڵگریی بەهاوکاری دەزگا هەواڵگرییە بیانییەکان لە ئەفریقیای باکوور کۆکرایەوە کە پەیوەندی بن لادنیان دەسەلماند بە چەند زنجیرەیەک لە کەمپی مەشقی تیرۆرستان لە سودان. سەرەڕای ئەمەش، هێشتا بن لادن ئامانجی سەرەکی واشنتۆن نەبوو. لە کانوونی دووەمی ١٩٩٥، کاتێک سەرۆک بێڵ کلینتۆن فەرمانی سەرۆکایەتی

بەژمارە ۱۲۹٤۷ دەرکرد کە ئامانج لێی ئابڵوقە خستنەسەر بوو بۆسەر گروپە تیرۆرستییەکان، نە بن لادن و نە قاعیدە لەنێو ئەو لیستەدا نەبوون کە پێکهاتبوو لە دوازدە گروپی تیرۆرستی.

ئەمە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە کانوونی دووەمی ۱۹٦٦ دەستی بە گۆڕان کرد، لەوکاتەی کە ناوەندی دژەتیرۆری سی ئای ئەی یەکەیەکی تایبەتی تەرخانکرد بۆ بن لادن. ئەمە یەکەمجار بوو لە مێژوودا ژوورێکی تایبەت بۆ تاقە کەسێک تەرخان بکرێت. پرسی بن لادن پێویستی بەم دەستپێشخەرییە بوو چونکە هەندێک پێیان وابوو بن لادن سیمبولی نەوەیەکی نوێی تیرۆرستانە کە چالاکییەکانیان لە فەزای نێونەتەوەییدا ئەنجامدەدا و ئەمەش کێشەیەکی مەزن بوو بۆ دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا بۆ کۆکردەوەی زانیاری پێویست لەسەر ناوبراو. یەکەمین گرفتی ئەم ژوورە تایبەتییەی بن لادن بریتیی بوو لەوەی کە دەبوایە سەرجەم سەرچاوە داراییەکانی ناوبراو لە هاوکاریکردنی بۆ گروپە تیرۆرستییەکان کە بووە هۆی بەرزکردنی پێگەیەکەی ئاشکرا بکرێن. هەردوو راپۆرتی هەواڵگری مرۆیی و برینی پێوەندییەکانی گەیاندن لەلایەن دەزگای ئاسایشی نیشتیمانییەوە تووشی گرفتی زۆر بوونەوە. چەندین گفتوگۆی چڕوپڕ ئەنجامدران دەربارەی ئۆپەراسیۆنی هەواڵگریی لەدژی بن لادن بەڵام ناوبراو بەرلە ئەنجامدانی هەر پلانێک خۆی گەیاندە ناو خاکی ئەفغانستان. بەڵام لەکۆتاییدا، چەندین کەسایەتی باڵا لەنێو سی ئای ئەی، وەک جۆرج تێنێت بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندیی، بن لادنیان وەک ئامانجێکی هەرە لەپێشینە لەکۆتاییەکانی ساڵی ۱۹۹۷ دانەدەنا. ناوبراو بۆ ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانە تا ئەوکاتیش تەنیا تاوانبارێکی مەترسیدار بوو.

لەساڵی ۱۹۹۷، سی ئای ئەی گروپێکی شەڕڤانە خێڵەکییە ئەفغانەکانی تەرخانکرد بۆئەوەی شوێن بن لادن بکەون و دەستگیری بکەن. ئەوان لەلایەن ئەمریکاوە پشتیوانی تەکنۆلۆژی سەتەلایەتییان پێدرابوو بۆ دەستنیشانکردنی ناوچەکانی دەوروبەری قەندەهار کە بڕوا وابوو بن لادن خۆی تیادا حەشار دابێت. پێشتر ئەم تەکنیکە لەساڵی ۱۹۹۳ لەدژی میر ئەمەل قاسی، کە دوای ئەوەی هێرشی کردە سەر

بارەگای سی ئای ئەی بەرەو سنوورەکانی ئەفغانستان و پاکستان رایکردبوو، بەکارهاتبوو. لەماوەی چەند مانگێکی دوای ئەوە، گفتوگۆیەکی ئاڵۆزی سیاسیی لە واشنتۆن ئەنجامدرا لەسەر ئەوەی دەبێت هەواڵگریی تا چ ئەندازەیەک باش بێت بۆئەوەی رێگا بە هێرشێکی زەمینی یان ئاسمانی بدرێت بۆسەر شوێنی گومانلێکراوی حەشارگەی بن لادن؛ ئایا دەکرێت بن لادن بکوژرێت یان دەبوایە دەستگیرکرابوایە؛ وە دەبێت تا چ ئەندازەیەک پشت بە دەزگا هەواڵگرییەکانی پاکستان و سعودیە بەسترێت کە پێشتر پشتیوانی ناوبراو بوون.

بۆ ساڵی ١٩٩٩، تێنێت ناچاربوو دان بەوەدا بنێت کە بن لادن دووەم مەزنترین هەڕەشەیە بۆسەر ئەمریکا لەدوای چەکی کۆمەڵکوژیی. تێنێت پێی وابوو کە تاکە چارەسەری گرفتی بن لادن دەبێت لەرێگای چالاکی نیمچە سەربازیی نهێنییدا ئەنجام بدرێت کە ببێتە هۆی گرتن یان کوشتنی ناوبراو. هەر بۆ ئەم مەبەستە ئەو هەڵسا بە دووبارە رێکخستنەوەی ناوەندی دژەتیرۆر. ئامانجەکەی بریتیی بوو لە زیادکردنی سەرنجی بۆسەر سەرچاوە هەواڵگرییە مرۆییەکان، بەتایبەتی لەنزیکەوە کارکردن لەگەڵ دامەزراوە هەواڵگرییە هەرێمیەکان و باشترکردنی پەیوەندی لە ئەفغانستان. پلانی زۆر پەرەی پێدرا، وەک مەشق و تەمویلکردنی هێزێکی دژەتیرۆری ئۆزبەکی کە دەکرا بن لادن دەستگیربکات. وە هەروەها، چەندین پێوەندی دروستکران لەگەڵ ئەحمەد شا مەسعود، فەرماندەی سەربازیی هەرێمیی باکوور کە لەلایەن تاڵیبانەوە شکستی پێهێنرابوو بەڵام هەر بەردەوام بوو لە خەبات و لەلایەن هەندێک بەرپرسی واشنتۆنەوە وەک دوا ئومێد بۆ هاوپەیمانێک لە ئەفغانستان دەبینرا. لەکۆتاییدا، ژمارەیەکی زیاتری سیخوڕ نێردرانە نێو ئەفغانستان. سەرەڕای ئەمەش، ئاسایشی بن لادن بەشێوەیەک پارێزراو بوو کە ئەم سیخوڕ و هەواڵدۆزە نوێیانە نەتوانن لێی نزیک ببنەوە و کاریگەرییەکی سنوورداریان هەبێت. چەندین هەوڵدرا بۆئەوەی بتوانرێت ئەو راپۆرت و وێنانەی ئەم کۆیانکردبووەوە یەکانگیربکرێت لەگەڵ وێنەی سەتەلایەتیی بۆئەوەی وێنەیەکی روون و دروستی کەمپ و شوێنی چالاکییەکانی بەدەست بخەن.

بۆ سەرەتای ٢٠٠٠ شارەزایانی دژەتیرۆر لە واشنتۆن دەستیان کرد بە گەڕان بەدوای سەرچاوەی بەدیلێکی نوێی زانیاری بۆ دۆزینەوەی بن لادن. ئەمە ستراتیژیەتە لەڕێی بەکارهێنانی فرۆکەی بێ فرۆکەوانی چاوەدێری بۆناو ئەفغانستان بەرجەستە دەبوو. بەپێچەوانەی سەتەلایت و فرۆکەی یو-٢، ئەم فرۆکە نوێیانە دەتوانن زانیاری ورد بدەن لەمەڕ وێنە و ئامانجی جووڵاو و ڕوخساری هەر کەسێکی بەئامانجگیراو. بارقورسی میکانیکی، گرفتی کەشوهەوا، و ململانێی ئیداری و یاسایی لە واشنتۆن هاوتا لەگەڵ ئەم بەرنامەیە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری هەواڵگریی کاریان دەکرد.

دوای هێرشەکانی یازدەی ئەیلول، ئەمریکا سوپاکەی نارده نێو ئەفغانستان بۆئەوەی حکومەتی تالیبان بڕوخێنێت کە پشتیوانی بن لادنیان دەکرد، و بیگرن یاخود بیکوژن. هەرچەندە ئامانجی سەرەتا پێکرا، بەڵام ئامانجی دووەم نەگەیشتە بەرهەم و بن لادن بەردەوام بوو لە پەکخستنی هەوڵەکانی ئەمریکا بۆ دۆزینەوەی.

لە تەممووزی ٢٠٠٦، سی ئای ئەی ڕایگەیاند کە هەڵساوە بە داخستنی یەکەی هەواڵگریی بن لادن. وتەبێژی سی ئای ئەی ئاماژەی بەوەدا کە بن لادن وەک ئامانجێکی گرنگ ماوەتەوە بەڵام سەرنج خستنەسەر ململانێ هەرێمییەکان نەوەک کەسایەتی یان گروپە تیرۆرستییەکان بەپێویست دەزانرێت. لەکۆتاییدا، لە ئۆپەراسیۆنێکی نهێنییدا لە پاکستان لە بەرواری ٢ی ئایاری ٢٠١١ ئوسامە بن لادن لەلایەن ئەمریکاوە کوژرا.[1]

[1] Bodansky, Yossef. Bin Laden: The Man Who Declared War on America New York: Forum, ١٩٩٩.
-Clarke, Richard A. Against All Enemies: Inside America's War on Terror. New York: Free Press, ٢٠٠٤.
-Reeve, Simon. The New Jackels: Ramzi, Yousef. Osama bin Laden and the Future of Terrorism. Boston: Northeastern University Press, ١٩٩٩.

## عبدالله عەزام

لەساڵی ١٩٤١ لە فەڵەستین لە گوندی سیلەی سەربە پارێزگای جەنین لە دایک بووە. کوڕی حاجی یوسف موستەفا عەزامە، دوای ساڵێک لە تیرۆرکردنی عەزام کۆچی دوایی کرد. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی هەر لەو گوندەدا تەواو کردووە، لە کۆلێژی حوزورییەی کشتوکاڵی درێژەی بە خوێندن داوە. دوای تەواوکردنی کۆلێژ بە مامۆستای سەرەتایی لە گوندی ئەدەر لە باشووری ئەردەن دامەزراوە.

دوای ئەوەی بەرەی رۆژئاوا لەلایەن سوپای ئیسرائیلەوە ساڵی ١٩٦٧ داگیر دەکرێت، عەزام گوێ بە پاڕانەوە و کروزانەوەی دایکی نادات و بەرەو رۆژهەڵاتی ئوردن دەچێت. لەوێ لە پاڵ هەندێ لاوی ئوردنی و فەڵەستینی، بەتایبەتی ئەوانەی سەر بە (بزووتنەوەی ئیسلامی ئوردنی) بوون، دەستیان بە چالاکی سەربازیی لەدژی ئیسرائیل کرد.

عەزام لەوکاتەی ئەم چالاکیانەی ئەنجام دەدا، لە باکووری ئوردن بنکەیەکی بەناوی بنکەی شیوخ دامەزراند و خۆی پلەی ئەمیری پێ بەخشرا.

ئەم بنکەیە لەماوەی ئەمیرایەتی عەزامدا چەند چالاکیەکی ئەنجامدا، کە عەزام خۆیشی تیایدا بەژداربوو. لەوانە: شەڕی پشتێنەی سەوز، کە عەزام لەگەڵ هاوەڵانی ئەنجامیاندا، تیایدا ئەبو موسعەب السوری بریندار بوو، هەروەها شەڕی پێنجی حەزیرانی ساڵی ١٩٧٠.

ساڵی ١٩٧٠ دوای ئەوەی سنووری نێوان ئوردن و فەڵەستین داخرا، عەزام بۆ سەر کاری پێشووی گەڕایەوە و بەردەوامی بە خوێندن لە کۆلێژی شەریعە لە زانکۆی ئوردن دا، بەمەش پلەی زۆر باشەی بەدەست هێنا. ئەمە وایکرد کە عەزام وەک راگر لە کۆلێژ وانەبێژی بکات. ئەمەش هەلێکی باش بوو بۆ عەزام کە سەدان لاوی زانکۆ بۆ رەوتی ئیسلامی سیاسی و هاندانی بۆ جیهادکردن، پەلکێش بکات. ئەم چالاکیانەی عەزام لەناو زانکۆ وایکرد دەسەڵاتداران سنوورێک بۆ جموجۆڵەکانی دابنێن و دواتر لەکارەکەی لایبەرن.

هەر لە هەمان ساڵدا، لە زانکۆی ئەزهەر نامەی دکتۆراکەی پێشکەش دەکات و ساڵی ١٩٧٣ بڕوانامەی دکتۆرا وەردەگرێت و لە زانکۆی ئوردن دەبێتەوە وانەبێژ. دووبارە دامودەزگای ئاسایش تەنگی پێ هەڵدەچنن و لەکارەکەی لادەبرێت و پەنا بۆ سعودیە دەبات.

ساڵی ١٩٨١ لە زانکۆی شا عبدالعزیز دەبێتە وانەبێژ، هەر لە هەمان ساڵدا داوایەک پێشکەش بە راگری کۆلێژەکە دەکات کە رەوانەی زانکۆی ئیسلامی نێوەدەوڵەتی لە ئیسلام ئاباد بکرێت، تا لە خەباتی ئەفغانیەکان نزیک بێت و سەرپەرشتی ئەو عەرەبە ئەفغانیانە بکات کە بۆ جیهادکردن روو لە ئەفغانستان دەکەن. ساڵی ١٩٨٣ بۆ سعودیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ماوەی مانەوەی لە زانکۆی ئیسلامی نێودەوڵەتی درێژبکاتەوە، بۆیە ئەویش دەستی لەکار کێشایەوە.

لەساڵی ١٩٨٤ دەگەڕێتەوە بۆ ئەفغانستان و نووسینگەی خزمەتگوزاری-مکتب الخدمات- دادەمەزرێنێت. ئەم نووسینگەیە زۆر چالاکی ئەنجامداوە، لەوانە:

- کۆکردنەوەی موجاهیدانی وڵاتانی عەرەب.
- بەسەربازیکردنی ئەو لاوە عەرەبانەی بە نیازی جیهاد روویان لە ئەفغانستان دەکرد.
- دروستکردنی سەربازگە بۆ عەرەبە ئەفغانییەکان.
- دروستکردنی بازنەیەک لە نێوان جیهانی ئیسلامی و جیهایی ئەفغانی.
- وتەبێژی جیهادی ئەفغانی بوو.
- هاندانی لاوانی عەرەبی و ئیسلامی بۆ جیهادکردن لە ئەفغانستان.
- پەراندنەوەی جیهادی ئەفغانی بۆ جیهادێکی جیهانیی.
- مەشقپێکردنی لاوەکان لە رووی (سەربازیی و دەروونیی و سەرهەنگەیی)یەوە.

بەم شێوەیە نووسینگەی خزمەتگوزاری دوو لایەنی سەرەکی لەخۆ کۆکردۆتەوە، یەکەمیان: لایەنی ئیعلامی کە هاندان و ریکلامکردن و وتاردان بوو لە دەرەوەی ئەفغانستان بۆ جیهاد. دووەمیان: لایەنی کرداریی کە خۆی لە مەشقی سەربازیی و کۆکردنەوەی موجاهیدان و دروستکردنی سەربازگەکان دەبینیەوە.

عبدالله عەزام

ساڵی ١٩٨٦، عەزام یەکەم سەربازگەی بەناوی سدا بۆ مەشقپێدانی لاوە هاتووەکانی ئوردن، سعودیە و میسر و ئامادەکردنیان بۆ بەرەکانی شەڕی سۆڤیەت، کردەوە. ئەم سەربازگەیە ئەوکات عەزام ناوی نەڕەی شێری لێنابوو کە چەند لاوێکی کەمی عەرەبی لەگەڵدا بوو. دوای ساڵێک زیاتر لە دە هەزار سەرباز ئامادەبوون بۆ جەنگ.

ساڵی ١٩٨٧ عەزام لە نووسینی میثاق الحرکة الأسلامیة بووەوە. ئەم میساقە وەک پرۆگرامی هەموو پارتە ئیسلامیەکانی دونیا کاری پێدەکرێت. لێرەوە ئەمەی خوارەوەش چەند بەشێکن لە میساقەکەی:

- ئەم میساقەی عەزام، بزاوتی ئیسلامی بە بزووتنەوەیەکی جیهانیی سەراپاگیر دادەنێت کاتێ لە ماددەی (٤)دا دەڵێت:

"بزووتنەوەی ئیسلامی پێشوازی لە هەموو موسڵمانێک دەکات کە باوەڕی پێی هەبێ و ئامادەیی تێدا بێت کە ئەرکی خۆی لەناو بزووتنەوەدا بهێنێتە دی."

هەروەها لە ماددەی (٧)دا دەڵێت: "لەبەر ئەوەی موسڵمانان لە سەرانسەری دونیادا بڵاون و حەزدەکەن بزووتنەوەی ئیسلامی سەربکەوێ، بۆیە ئەم بزووتنەوەیە، بزووتنەوەیەکی جیهانییە."

- ئامانجی ئەو بزووتنەوەی ئیسلامیەی عەزام بنیادی ناوە، بەرپەرچدانەوەی ناحەقی، پیادەکردنی ماف، گێڕانەوەی نیشتیمانی داگیرکراو، دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی و پاڵپشتیکردنی بێهێز و چەوساوانە.
- سەبارەت بە نیشتیمانپەروەریی، عەزام لە میساقەکەیدا، پێ لەسەر بەرگریکردن و رزگارکردنی نیشتیمان دادەگرێت و بە ئەرکی سەرجەم بزوتنەوەیەکی ئیسلامی دەزانێ کە ئەم فەریزەیە جێبەجێ بکەن.

میساقەکەی عەزام پڕ لە ماددەیە. ئەگەرچی تایبەتمەندیەکی جیهانی پێوەدیارە، بەڵام لەبەر ئەوەی عەزام فەڵەستینیە زۆر بە زەقی جەختی لەسەر کێشەی فەڵەستین و رزگارکردنی سەرجەم خاکی ئەو وڵاتە کردۆتەوە. وەک خۆی دەیڵێت "فەڵەستین وەقفێکی ئیسلامییە)" واتە خاکێکی پیرۆزە، نە دەکڕدرێت و نە دەفرۆشرێت، نە ئەم دەست و ئەو دەستی پێدەکرێت.

لەماوەی ساڵانی١٩٨٤-١٩٨٨ ئوسامە بن لادن و عبدالله عەزام زۆر لێک نزیک دەبنەوە، بەیەکەوە کاری جیهادی گەشە پێ دەدەن. بەیەکگەیشتنی بیروڕای هەردوو کەسایەتی، وایکرد (بیرۆکەی جیهادی جیهانیی) دابڕێژن.

ئەم دوانە لە چوارچێوەی جیهادی جیهانیی، دابەش بوون بۆ دوو شێوە کاری جیهادیی. عەزام لایەنی هاندان و ریکلامکردن و بڵاوکردنەوەی بیری جیهادیی لەئەستۆ گرت. بۆ ئەم مەبەستەش عەزام سەری لە وڵاتانی جیهان دەدا، بۆئەوەی سەرباز بۆ سەربازگەکان کۆبکاتەوە، لەنێو گروپ و جالیەی ئیسلامی لە وڵاتانی ئەورووپی وتاری پێشکەش دەکرد. عەزام لەم سەردانانەیدا پێشوازی گەرمی لێدەکرا بەهۆی ئەوەی وەک سەرکردەیەکی بەتوانای شەڕی دژ بە سۆڤیەت ناسرابوو. ساڵی ١٩٨٢ لە سەردانێکیدا بۆ ئەمریکا لەلایەن رابیتەی لاوانی موسڵمانی ئەمریکی کۆڕێکی بۆ رێکخرا. لەوێدا عسام ریدی، راهێنەری فڕۆکەوانی، زۆر پێی سەرسام دەبێت و سەردانی ئەفغانستان دەکات و دەبێتە ئەندامێکی قاعیدە، دواتر ئەم پیاوە رۆڵی بەرپرسی کڕینی چەک و فڕۆکەی تایبەتی ئوسامە بن لادن دەگێڕێ.

هەرچی ئوسامە بوو خۆی تەرخان کردبوو بۆ لایەنی جیهادیی، ئەمەش لەبەر ئەوەی کوڕە دەوڵەمەندێکی سعودی بوو، بەئاسانی دەیتوانی پارە بۆ دروستکردنی سەربازگە و دابینکردنی ئامێرە پێویستەکان و کڕینی چەک و جبەخانە و شوێنی حەوانەوەی جەنگاوەران، دەستەبەر بکات.

لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٨٩دا عەزام و دوو کوڕی بە ٢٠ کیلۆگرام TNT کە لە ئۆتۆمبیلەکەی چێنرابوو، تیرۆرکران. سەبارەت بە مەسەلەی تیرۆرکردنی عەزام بیروڕای جیاواز هەیە، کە جگە لە ئامێری کوشتنەکەی کە ماددەی تی ئێن تی بووە، سەراپای چیرۆکی تیرۆرکردنەکە لێک جودان.

سەرچاوەکانی دەزگای سیخوڕی ئەمریکی لەو باوەڕەدان کە جیاوازی بیروڕای نێوان عەزام و ئوسامە، وای لە ئوسامە کردووە کە پیلانی تیرۆرکردنەکە بگێڕێ. لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕی سۆڤیەت، جیاوازی نێوان ئەم دوانە رووی لە زیادی کرد. لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ و سەرەتای ١٩٨٩دا کێشەگەلێک ئەم دوانەی خستە بەرانبەر یەک. سەربازگەی (المساعدة) یەکێ لەو خاڵانە بوو کێشەی نێوان ئەم دوانەی دروست کرد، ئوسامە دەیویست سەربازگەکە ببێتە پاشکۆی قاعیدە، هەرچی عەزام بوو ئەو داواکاریەی ناوبراوی رەتکردەوە و دەیویست سەربازگەکەی سەر سنووری پاکستان و ئەفغانستان بنکەیەکی بێلایەن بێ و تەنها لاوانی وڵاتانی جیهادکەر، بۆ شەڕ ئامادە بکات.

خاڵێکی دیکەی جیاوازی نێوان ئەم دووانە، لەسەر ئەرکی نووسینگەی خزمەتگوزاریی بوو. ئوسامە دەیویست جەنگاوەرانی سەربازگەکانی قاعیدە لەسەر شێوەی چالاکی تیرۆریستی پەروەردە بکرێن، بۆ ئەوەی کاتێ دەگەڕێنەوە وڵاتەکانیان بەهێزەوە بگەڕێنەوە. ئەو راهێنانە تیرۆریستیەی بینیویانە یارمەتیان بدات لە وڵاتەکانیان جێ پێی خۆیان بکەنەوە، بەڵام عەزام وای دەبینی کە جەنگاوەران ئەو راهێنانە تەنها لەناو ئەفغانستاندا بەکار بهێنن.

لەبەر ئەوەی عەزام خۆی لە میسر بوو، چاک لە رەوشی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتانە گەیشتبوو، مەترسی تیرۆریستی لەو وڵاتانەی دەزانی، عەزام لەمەدا پشتی

بەوە بەستبوو کە فتواکانی ئیسلام رێگا نادەن پارە و مەشقی سەربازیی بۆ تیرۆرکردن بەکاربهێنرێت و ئەمە مەسەلەیەکی موخالیفی شەریعەتی ئیسلامە. ئەم ململانێیەی نێوان عەزام و ئوسامە، بەگوێرەی دەزگای سیخوڕی ئەمریکی دەبوایە، یەکێکیان لەناو بچێت، هەربۆیە لەساڵی ١٩٨٩دا عەزام لەگەڵ دوو کوڕەکەی بۆ نوێژی هەینی لە پیشاوەر دەچوون، چالاکیەک تیرۆریستیەکەی بەرانبەر ئەنجام درا.
هەرچی سەرچاوە ئیسلامیەکانن، چیرۆکی تەواو پێچەوانەی دەزگا سیخوڕیەکانی ئەمریکا پێشکەش دەکەن. ئەوان کارە جیهادییەکانی عەزام و بەرێکخستنی رەوتێکی جیهانیی بۆ دژایەتیکردنی ئەمریکا و زایۆنیزم بە فاکتەرێک دەزانن کە وای لە ئەمریکا و دەزگا سیخوڕیەکانی کردبێت پیلان بۆ کوشتنی عەزام بخەنەگەڕ، لەم کردەوەیەشدا ئەمریکا فشاری خستبێتە سەر پاکستان و پرۆسەی تیرۆرکردنەکەیان دژبە عەزام ئەنجام دابێت.

## عەلی محەمەد، سیخوڕی ئوسامە بن لادن

عەلی عبدالسعود محەمەد، سیخوڕێکی دووسەرەیە کە کاری بۆ هەردوو دەزگای هەواڵگری ناوەندی و جیهادی ئیسلامی میسری دەکرد.[i] ناوبراو وەک وەرگێڕ بۆ ئەیمەن زەواهیری هاتەنێو وڵاتی ئەمریکا، بەمەبەستی گەڕان بەناو مزگەوتەکاندا بۆ کۆکردنەوەی پارەی لەپێناو جەنگان لەدژی داگیرکاریی سۆڤیەت لە ئەفغانستان. زەواهیری لەوێدا هانیدا بۆئەوەی شتێک بکات بۆئەوەی لە ئەمریکادا بمێنێتەوە. هەربۆیە، ئەمیش خۆی وەک هەڵاتوویەک دایە ناسین. کاتێک لە قاهیرە چووە ناو نووسینگەی هەواڵگری ناوەندی وە داوای کرد قسە لەگەڵ بەرێوەبەری بنکەکە بکات بۆئەوەی هەرچی دەزانێت بۆیان باس بکات، ئەمریکییەکان وایاندانا کە ناوبراو سیخوڕێکی میسرییە بەڵام بەهەرجۆرێک بێت تەجنیدیان کرد بۆئەوەی وەک ئەفسەرێکی هەواڵگری پلەسەرەتایی کاربکات. کاتێک ئەرکی چوونەناو مزگەوتێکیان

[i] Hays, Tom; Theimer, Sharon (December ٢٦, ٢٠٠١). "In life of double-crosses, Egyptian worked with Green Berets and bin Laden" (http://www.bhpioneer.com/article_٢٦٤a٠١٣٢b٨e٩٥٩b٠b٢b٢١٧٤٠٩٨a٩٠٨fl).

پێسپارد کە پەیوەندی هەبوو لەگەڵ حزب الله، لەجیاتی ئەوەی کارەکەی خۆی بکات، هەڵسا بە ئاگادارکردنەوەی ئیمامی مزگەوتەکە بەوە کە ناوبراو سیخوڕی ئەمریکایەوە و بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری هاتۆتە ئەوێ. یەکێکی تر لە سیخوڕە دڵسۆزەکانی تری ئەمریکا لەناو ئەو مزگەوتەدا بوو وە سی ئای ئەی لەم بارەوە ئاگادارکردەوە، ئەمەش بووەهۆی دەرکردنی و ڕێگانەدان بۆ چوونەناو ئەمریکا.[i] بەهەرجۆرێک بێت، ناوبراو دواتر چووە ناو سوپای ئەمریکاوە، و لەبەشی کاروباری جەنگیی تایبەتی دەستی بە وەرگرتنی مەشق کرد، دوای کۆتایی هاتنی ئەم ئەرکەی، بڕوانامەی دکتۆرای لە شەریعەتی ئیسلامی وەرگرت بۆئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وانە بڵێتەوە.

لەساڵانی هەشتاکاندا، عەلی ڕاهێنانی بەو شەڕکەرە دژە سۆڤیەتیانە دەکرد کە دەچوونە ئەفغانستان. هەواڵدۆزی تایبەتی ئێف بی ئای، جاک کلونان، ناوینابوو "مەشقپێدەری یەکەمی بن لادن."[ii] ناوبراو تاوانبار بوو بە هێرشەکانی ساڵی ١٩٩٨ بۆسەر باڵیۆزخانەکانی ئەمریکا لە نایرۆبی، کێنیا. و دار سەلام، تەنزانیا. لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠، پێنج تۆمەتی درایەپاڵ بۆ کوشتنی هاوڵاتیانی ئەمریکا و وێرانکردنی سامانی نیشتیمانی ئەو وڵاتە.

عەلی لە زمانەکانی ئینگلیزی، فەرەنسی، عیبری و عەرەبییدا پاراو بوو. ئەو کەسێکی ڕێکپۆش، زیرەک بوو، جگەلەوەی توانایەکی لەڕادەبەدەری هەبوو لە دروستکردنی هاوڕێی نوێ.[iii] عەلی لە هەواڵگری سوپای میسریدا پلە ڕائیدی هەبوو، بەڵام دوای ئەوەی ئاشکرا بوو ناوبراو هەڵگری بیری توندڕەوییە، لەساڵی ١٩٨٤ لەکارەکەی دوورخرایەوە. دوای ئەوەی پەیوەندی بە سوپای ئەمریکاوە کرد، هەڵسا بە بەکارهێنانی زانیاری سەربازیی ئەو سوپایە بۆ مەشقپێدانی قاعیدە و چەکدارە

---

[i] Temple-Raston, Dina. "The Jihad Next Door", ٢٠٠٧. p. ٨٣

[ii] Interview with FBI special agent Jack Cloonan (https://www.pbs.org/wgbh/pages/frontline//////torture/interviews/cloonan.html)Archived(http://archive.wikiwix.com/cache/٢٠١١٠٢٢٤٠٦٠٣٢٢/https://www.pbs.org/wgbh/pages/frontline//////torture/interviews/cloonan.html) ٢٠١١-٠٢-٢٤ at Wikiwix, Frontline, PBS, October ١٨, ٢٠٠٥.

[iii] Wright, Lawrence (٢٠٠٦). Looming Tower. p. ١٨٠. ISBN ١-٤٠٠٠-٣٠٨٤-٦.

موسڵمانەکانی تر، جگەلەمەش نامیلکەیەکی بۆ گروپی تیرۆرستی قاعیدە لەم بارەیەوە نووسی. ئەوەی باسکرا پوختەی ژیانی ناوبراو بوو، ئێستا با بزانین بە چ شێوازێک چالاکییەکانی خۆی ئەنجامداوە و سوودی لە چ میتۆدێکی وەرگرتووە.

لەماوەی ساڵانی هەشتاکاندا، عەلی مەشقی بە موجاهیدینە ئەفغانەکانی دژە سۆڤیەت دەکرد. لەماوەی جەنگەکەدا، عەلی تەنیا لەسەرەتادا مەشقی بەژمارەیەکی کەمی چەکدار دەدا، لەناو ئەو چەکدارانەش ئوسامە بن لادن، ئەیمەن زەواهیری، ئەو تیرۆرستانەی تیادابوو کە بەرپرس بوون لە تەقینەوەکانی هەردوو باڵیۆزخانەکەی ئەمریکا لە کیشوەری ئەفریقیا. مەشقەکانی ناوبراو لە کەمپە سەربازییەکانی ئەفغانستان بوون. جگە مەشقپێدان، ناوبراو بۆماوەیەکی زۆری لە ئەفغانستان خۆی شەڕی هێزە سۆڤیەتییەکانی دەکرد.

دوای چوونی بۆ ئەمریکا و پەیوەندیکردن بە سوپای ئەو وڵاتەوە، عەلی زانیاری کۆدەکردەوە دەربارەی سوپا و ژێرخانی ئەمریکا لەماوەی کارکردنی وەک رێنماییکەری مەشقپێدان عەریفی پشتیوانی. لەساڵی ١٩٨٨، ناوبراو گەڕایەوە ئەفغانستان بۆئەوەی لەدژی سۆڤیەت بجەنگێت. لەو ماوەیەدا، بڕوا وایە کە ناوبراو بەهۆی ئەو زانیارییانەی لە ئەمریکا فێری ببوو، هەڵسا بە فێرکردنی چەند خانەیەکی تیرۆریستی بەهۆی ئەم زانیارییانەوە، وە دوای تەنیا یەک مانگ گەڕایەوە ئەمریکا.

لەساڵی ١٩٩٠، دووبارە گەڕایەوە ئەفغانستان، ئەمجارە هەر خەریکی مەشقپێدانی تیرۆرستەکان بوو بەشێوەی هونەری گەریلایی چەند ئەرکێکی تری وەک رفاندنی فڕۆکە، خۆتەقاندنەوە، رفاندنی مرۆڤ، و بۆمبی سەرشەقام.[i]

لەو ماوەیەدا، ناوبراو لەگەڵ ئوسامە بن لادن و ئەیمەن زەواهیری دەستی کردووە بە پلانی تەقاندنەوەی هەردوو باڵیۆزخانەکە. دواتر، عەلی کەسی هەرە سەرەکی بووە لە پارمەتیدانی بزووتنەوەکەی قاعیدە لە ئەفغانستانەوە بەرەو سودان.[ii] لەساڵی ١٩٩٢، وەک بەشێک لە خانەی مەشقی تیرۆریستی چەندین گەشتی کردۆتە

---

[i] Wright, Lawrence (٢٠٠٦). Looming Tower. p. ١٨١. ISBN ١-٤٠٠٠-٣٠٨٤-٦.

[ii] United States of America v. Ali Mohamed. Ali Mohamed pleads guilty on case, Life imprisonment

ئەفغانستان. تەنیا لەو ساڵەدا بەلایەنی کەمەوە ٨٥ گەشتی کردووە لەکاتێکدا لەژێر چاودێری سی ئای ئەیدا بووە. ناوبراو هەم دژی سۆڤیەت جەنگاوە و هەمیش کارگوزارێکی سوودمەند بووە لە مەشقپێدانی سەرانی قاعیدە. لەوکاتەدا، ناوبراو جەنەراڵەکانی قاعیدەی فێری چەندین هونەری هەواڵگری کردووە. لەوانە، چاودێری، دژەچاودێری، غافڵکوژی، رفاندن، شیفرە، و شکاندنی شیفرە.[i]

هەروەک باسکرا، لەساڵی ١٩٨٤ عەلی لە قاهیرە چووە بارەگای سی ئای ئەی بۆئەوەی ببێتە سیخوڕی ئەوان، دواتر لە شاری هامبۆرگی ئەڵمانیا دەست بەکاربوو. لەوێدا، ناوبراو چووە ناو مزگەوتێکەوە کە پەیوەندی هەبوو لەگەڵ حزب الله و یەکسەر بە ئیمامە ئێرانیەکەی وتی کە ئەو سیخوڕی ئەمریکاوە، ئامانجەکەشی دەرهێنانی زانیارییە لەو کەسانەی دێنە ناو مزگەوتەکە. بەرلەوەی ناوبراو بچێتە مزگەوتەکە، سی ئای ئەی کەسێکی تری ناردبوو، بەمەش کاری عەلی تەواو بوو، و بەتەواوی متمانەی خۆی لەدەستدا. دوای کۆتایی هاتنی کارەکەی وەک سیخوڕ، عەلی گەڕایەوە کالیفۆریا.

لە ئەمریکادا، پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی ئەمریکی خەڵکی سانتا کلارا ئەنجامدا دوای شەش هەفتە لە کێشمەکێشمی دادگا، بوو بە خاوەنی رەگەزنامەی ئەمریکی.[ii] بەمەش ناوبراو توانی بچێتەناو سوپای ئەمریکا و لە ناوەندی کاروباری جەنگی تایبەتی جۆن کەنەدی و فۆرت براگ تا ساڵی ١٩٨٩ دەست بەکاربێت. ناوبراو داوای لێکرا کە وانەی کولتوری عەرەبی لەو بنکەیەدا بڵێتەوە. لەساڵی ١٩٨٨، عەلی بە بەرپرسەکانی خۆی لە سوپای ئەمریکا راگەیاند کە ئەو پێویستی بە ئیجازەیەک هەیە بۆئەوەی بچێتەوە ئەفغانستان و لەوێ شەڕی سۆڤیەتییەکان بکات. دوای یەک مانگ، ناوبراو گەڕایەوە، گەزافی ئەوەی لێدا کە ئەو توانیویەتی دوو سەربازی سۆڤیەت

---

[i] Statement of Patrick J. Fitzgerald United States Attorney Northern District of Illinois Before the National Commission on Terrorist Attacks upon the United States

[ii] "Bin Laden's man in Silicon Valley / "Mohamed the American' orchestrated terrorist acts while living a quiet suburban life in Santa Clara" (http://www.sfgate.com/cgibin/article.cgi?f=/c/a/٢٠٠١/٠٩/٢١/MN٢٢٤١٠٣.DTL &hw=ali+mohamed& sn=٠٠٣&sc=٢٨٢). sfgate.com

بکوژێت، بەڵگەش بۆ قسەکانی پێشکەشکردنی قاییشی جلی سەربازیی هەردوو سەربازەکە بوو.

وێنەی لاپەڕەی یەکەمی پاسپۆرتە ئەمریکییەکەی عەلی محەمەد

رۆبێرت ئەندێرسن، چەندین جار وشیاری دابوو لەوەی موحەمەد سیخوڕە، بەڵام راپۆرتەکانی فەرامۆش دەکران. دوای گواستنەوەی چەندین زانیاری گرنگ و پێدانی مەشقی سەربازیی بە سەرانی قاعیدە دواجار ناوبراو دەستگیرکرا. لەساڵی ١٩٩٨، دوای تەنیا دوو رۆژ لە تەقینەوەکانی هەردوو باڵیۆزخانەکە، هەواڵدۆزەکانی ئێف بی ئای هەڵسان بە پشکنینی ماڵی عەلی. ئەوان چەندین بەڵگەیان دۆزیەوە سەبارەی بە چالاکییە تیرۆرستییەکانی کە پێکهاتبوو لە پلان و نامیلکەی مەشقپێدانی قاعیدە. ناوبراو پلانی دارشتبوو وڵاتەکە جێ بهێڵێت و چاوی بە ئوسامە بن لادن بکەوێت. هەر هەمان رۆژ، ناوبراو وەک گومانلێکراوی سەرەکی هەردوو تەقینەوەکە دەستگیرکرا. دوای دادگاییکردنی، ناوبراو پێنج تۆمەتی پیلانگێرانی درایەپاڵ و بەمەش سزای زیندانی تاهەتایی بۆ برایەوە.

## ڕاینهارد هایدریک (١٩٠٤-١٩٤٢)

ڕاینهارد باڵادەستی نازی و ڕێکخەری سەرەکی کۆمەڵکوژی نازییەکان بوو، هەروەها ناوبراو فەرماندەی هێزەکانی بروسکە و ڕەشەبای ناسراو بە (SS) بوو. بەشێک لە دیرۆکڤانان ناوبراو بە سەیرترین کەسایەتی نازی دادەنێن کە هیتلەر نازناوی "دڵی ئاسنین" لێنابوو. بەدرێژایی ماوەی خزمەتکردنی لە پارتی نازی، چەندین پۆستی ئەمنی و سیاسی وەرگرتووە کە گرنگترینیان سەرۆکی ڕێکخراوی (SD) بووە کە دەزگایەکی هەواڵگری بووە کاری دەکرد بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی پارتی نازی لەڕێگەی گرتن و کوشتن و ڕاگواستن، وە بەشداربووە لە دامەزراندنی ڕێکخراوی کریستال ناچ بۆ ئەنجامدانی پاککردنەوەی ئەڵمانیای نازی لە جووەکان کە لە ئەنجامدا ئەو کوشتارگەیەی لێکەوتەوە کە لەمێژوودا بە هۆلۆکۆست دەناسرێت، تێیدا شەش ملیۆن جوو کوژران.

ڕاینهارد هایدریک لەلای چەپەوە

مێژووی لەدایک بوونی ناوبراو دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٤ لە بنەماڵەیەکی مەسیحی کە دایکی پرۆتستانتی و باوکی کاسۆلیکی بووە، باوکی ناوبراو خاوەنی بیروباوەڕێکی نەتەوەیی توندڕەو بووە کە هەر ئەم بیروباوەڕە بۆ کوڕەکەی بە میرات مایەوە. لەساڵی ١٩١٨ و لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانیی یەکەم،

ناوبراو پەیوەندی بەچەند تیپێکی چەکدار لە خۆبەخشە راستڕەوەکان دەکات، پاشان دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەی نیشتیمانی دژە سامی.

لەساڵی ۱۹۳۱ هاینریش هیملەر، سەرۆکی ئەوکاتەی هەواڵگری نازییەکان، هەستا بە جیاکردنەوە بەشی قەڵاچۆکردنی سیخوڕی لە هێزەکانی (SS)، ناوبراو لەبواری هەواڵگریدا دەستی بەخزمەت کرد و کەوتە دامەزراندن و بڵاوکردنەوەی تۆڕە سیخوڕیەکانی بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی پارتی نازی. ئەو زانیارییەکانی لە هەزاران سیخوڕەوە کۆدەکردەوە و لە دۆسیەی تایبەتیدا هەڵیدەگرتن و تا لەکۆتاییدا بەهۆی لێهاتوویەوە پلەی بۆ رائید بەرزکرایەوە.

لەساڵی ۱۹۳۲، چەند پڕوپاگەندەیەک بڵاوکرایەوە لەلایەن رکابەرەکانی هایدریک کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە هایدریک بەڕەچەڵەک جووە و ئاری نییە کە ئەمەش لەکۆتاییدا سەرۆکایەتی لایەنە ئەمنی و سیاسیەکانی پارتی نازی ناچارکرد پەنا ببەنە بەر پسپۆڕێکی بواری رەچەڵەکناسی کە دوای پشکنین و لێکۆڵینەوە هایدرێک لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتوو بوو دەرکەوت کە بەڕەچەڵەک ئارییە و بەهیچ جۆرێک خوێنی جوو لە دەمارەکانیدا ناگەڕێت و ئەو پڕوپاگەندانەش سەرجەمیان ناڕاست بوون. لەناوەڕاستی ساڵی ۱۹۳۲ سەرۆکی گۆستاپۆ هایدریکی کرد بە سەرۆکی دەزگای (SD) کە تایبەت بوو بە قەڵاچۆکردنی سیخوڕی کە دواتر ئەم دەزگایە لەژێر سەرپەرشتی هایدریکدا بوو بە ئامێرێک بۆ چاندنی ترس و کوشتنی نەیارەکانی پارتی نازی. لەسەرەتای ساڵی ۱۹۳٤ لەسەر داوای هیتلەر هایدریک لیستێکی ئامادەکرد لەناوی ئەو کەس و لایەنانەی کە "پێویستە پاکتاو بکرێن،" دوای ئامادەکردنی ئەو لیستە هایدرێک لەڕیزی پێشەوەی ئەو بەرپرسانەی پارتی نازی بوو کە فەرمانی بە لەناوبردنیان دەرکرد بەبێ دادگاییکردن. دوای ئەوەی هیتلەر لەساڵی ۱۹۳٦ دا هیملەری کرد بە سەرۆکی پۆلیسی نهێنی، هایدریک بوو بە جێگری و دوای ئەوەی هیملەر دووبارە سیستەمی هەواڵگری (گۆستاپۆ)ی رێکخستەوە، هایدریک بوو بە سەرۆکی بەشی پۆلیس و هەواڵگری. مێژوونووسان پێیان وایە هایدریک تۆقێنەرترین بەرپرسی پارتی نازی بووە، ئەو یەکێک بووە لە ئەندازیارانی کۆمەڵکوژی و

کوشتارگەکانی نازییەکان کە راستەوخۆ فەرمانەکانی هیتلەری جێبەجێ دەکرد، ئەمەش بە چەند شێوەیەکی وەک راگواستن و بەندکردن و پاکتاوکردنی رەگەزی بەتایبەتی دژی جووەکان.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش، هایدریک یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی رێکخراوی کریستال ناچ کە بەرپرس بوو لە قەسابخانەکانی دژە جووەکان لە تەواوی ئەڵمانیادا. لە شەوی حەوتی ئۆکتۆبەری ١٩٣٨ هایدریک بروسکەیەکی بەپەلەی ئاراستەی هەریەک لە نووسینگەکانی گۆستاپۆ و دەزگای (SD) کردو داوای لێکردن هەماهەنگی بکەن لەگەڵ یەکەکانی (SS) و پۆلیسی ئەڵمانی بۆ پەلاماردانی جووەکانی ئەڵمانیا بە سووتاندن و رووخاندنی باڵەخانە و پەرستگاکانیان و دەستگرتن بەسەر سەرجەم بەڵگەنامە و سەروەت و سامانەکانیان و رەشبگیرکردنیان وە دوای ئەوەی ئەنجامدانی هەموو ئەوانە نزیکەی دە هەزار جوویان گواستەوە بۆ سەربازگەکانی مەرگ، ئەمەش سەرەتایەک بوو بۆ جینۆسایدی جووەکان کە بە هۆلۆکۆست ناسراوە. دوای داگیرکردنی چیکوسلۆڤاکیا لەلایەن ئەڵمانیای نازییەوە ناوبراو ئەرکی قەلاچۆکردنی شۆڕشگێرە چیکییەکانی گرتەئەستۆ و دوای دەستگیرکردنیان دووردەخرانەوە و پاشان گوللەباران دەکران. وە، دواتر کرا بەبەرپرسی راستەوخۆی کەرتی ئەینزاس گرۆپین کە بە هاریکاری سوپای ئەڵمانیای نازی دوو ملیۆن کەسیان لەناوبرد لە نێوانیاندا یەک ملیۆن جوو هەبوو، ئەم کارەش لەڕێگەی گولەبارانکردن و خنکاندن بەگازی ژەهراوی ئەنجام درا.

بەهۆی گرنگی و کاریگەری هایدریک لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی پارتی نازی، بەتایبەتی لەسەرەتای ساڵانی جەنگی جیهانی دووەمدا، دەزگای هەواڵگری بەریتانی ناسراو بە M١٦بڕیاریدا هایدریک لەناوبەرێت، بۆ ئەم مەبەستە تیمێکیان تەرخانکرد کە پێکهاتبوو لە دوو پارتیزانی چیکی کە جان کۆبیش و جۆزێف گابچێک بوون دوای ئەوەی لەرێگەی فڕۆکەوە و بەپەرەشووت دابەزینە ناو خاکی چیکوسلۆڤاکیا لە ترسی ئاشکرابوون لە حەشارگەیەکدا لە پراگی پایتەخت کەوتنە پلاندارشتن بۆ

جێبەجێکردنی کردەی لەناوبردنی هایدریک، سەرەتا ئەم تیمە ویستیان لەڕێگەی قەناسەوە هایدریک بکوژن بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. بۆیە پلانێکی تریان دارشت.
لەساڵی ١٩٤٢، ناوبراو لە بارەگاکەی خۆیەوە بەڕێکەوت تا لەگەڵ هیتلەردا چاوپێکەوتنێکی فەرمی ئەنجام بدات، وە بەڵگەنامەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە هیتلەر دەیویست هایدریک بگوازێتەوە بۆ فەرەنسا کە ئەو کاتە لەلایەن ئەڵمانیەکانەوە داگیرکرابوو بۆ دامرکاندنەوەی چالاکیەکانی شۆڕشگێڕە فەرەنسییەکان، کاتێک کەژاوەی ئۆتۆمبیلەکانی هایدریک بەڕێگاوە بوو بەرەو ئەو ئوتێلەی کە چاوپێکەوتنەکەی تێدا ئەنجامدەدرا، هایدریک فەرمانی بەشۆفێرەکەی کرد کە خێراییەکەی زیاد بکات و کەژاوەکە بەجێبهێڵێت بەهۆی درەنگکەوتنی لە چاوپێکەوتنەکە، دواتر لە پێچێکدا لە نزیک پردی ترۆجا یەکێک لە شۆڕشگێڕە چیکیەکان بەناوی جۆزیف گابچێک لەبەردەمی سەیارەکەی هایدریکدا وەستا و چەکەکەی ئاراستەکرد کە لە جۆری رەشاشی(sten) بوو کە بەوە ناسراوە پێکهاتەیەکی سادەی هەیەو لە چەند پارچەیەک پێک دێت بەڵام چەکەکە چروک بوو، لەو کاتەدا شۆڕشگێڕەکەی تر کە جان کۆبیش بوو بۆمبێکی دەستی دژە تانکی بە ئاراستەی سەیارەکەی هایدریک هاوێشت و راستەوخۆ تەقیەوە و بووە هۆی بەسەختی برینداربوونی.
دواتر هایدریک دەمانچەکەی دەرهێنا و ویستی تەقەبکات بەڵام لەتاو ئازار نەیتوانی، شۆڕشگێڕەکانیش هەڵهاتن و دوورکەوتنەوە. دواتر راستەوخۆ هایدریک گواسترایەوە بۆ نەخۆشخانە و دەرکەوت کە پارچەی بۆمبەکە زیانی بە گورچیلە و چەند بەشێکی تری هەناوی گەیاندووە و پەراسووی شکاندووە و هەر بەم هۆیەوە لە ٢ی حەزیران کۆچی دوایی کرد. تەرمەکەی گواسترایەوە بۆ بەرلین و لە رێورەسمێکدا بەخاک سپێردرا کە خودی هیتلەر تێیدا بەشدار بوو. کردەی تیرۆرکردنی هایدریک لەلایەن شۆڕشگێڕە چیکیەکانەوە گورزێکی کوشندە بوو کە لە هێزە تایبەتەکانی ئەڵمانیا درا، بەڵام لە تۆڵەی ئەم چالاکیەدا سەرۆکی گۆستابۆ، هیملەر، هەستا بە بەرپاکردنی قەسابخانەیەک کە هەزاران چیکی تێدا کۆمەڵکوژکران. بەڵام هەموو ئەمانە نەبوونە

هۆی ئەوەی چیکوسلۆڤاکیەکان لە بەرەنگاربوونەوەی ئەڵمانیەکان ساردبینەوە بەڵکو ئەوان بەردەوام بوون لە ئەنجامدانی چالاکی شۆڕشگێڕانە و دوای ئەوەی هێزەکانی روسیا یەکە یەکە وڵاتانی ئەورووپایان لە چنگی ئەڵمانیەکان رزگاردەکرد بەنزیکبوونەوەی سوپای روسیا لە چیکوسۆڤاکیا، چیکوسلۆڤاکیەکان ژمارەی چالاکیە شۆڕشگێڕەکانیان زیادی دەکرد تا ئەوکاتەی نازییەکان ناچار بوون سەرجەم هێزەکانیان لە ئەورووپای خۆرهەڵات و چیکوسۆڤاکیا بکشێننەوە و تەرخانی بکەن بۆ بەرگریکردن لە ئەڵمانیا دژی سوپای سووری رووسی[i].

## ئێدوارد سنۆدن (١٩٨٣-...)

ئێدوارد جۆزێف سنۆدن لەدایکبووی ٢١ی حەزیرانی ١٩٨٣ کەسایەتی ئەمریکی و راوێژکاری پێشووی دەزگای ئاسایشی نیشتمانی ئەمریکیە بەڵام بەهۆی ئەوەی ناوبراو هەڕەشەی لە حکوومەتی ئەمریکا کرد لەوەی چەندین بەڵگەنامەی نهێنی ئەمریکا ئاشکرا دەکات لەو وڵاتە رایکرد و لەدوایدا داوای لەوڵاتان کرد کە مافی پەنابەرێتی پێبدەن بەهۆی مەترسی بۆسەر ژیانی. هەر بۆ ئەمەش، بەپێی هەواڵەکان بێت ناوبراو سەرەتا چۆتە هۆنگ کۆنگ ئینجا چووەتە رووسیا و لەهەگبەی دایە کە بچێتە کوبا بۆئەوەی لەوێشەوە بچێتە یەکێ لەوڵاتەکانی ڤەنزوێلا یان ئیکوادۆر چونکە ئەو دوو وڵاتە ئامادەییان نیشان دابوو بۆ پێدانی مافی پەنابەرێتی بە ناوبراو. سنۆدن بەشداری لەشەری ئازادکردنی ئێراق لەلایەن ئەمریکاوە کردووە و کارمەندی هەریەکە لە Dell و CIA وNSA بووە.

تەنها بە دوو لێدوان توانی گرژیەکی زۆر گەورە بخاتە نێوان دوو وڵاتی زلهێزی وەک ئەڵمانیا و ئەمەریکا وە، ئەم دوو وڵاتەی کە لەزۆربەی زۆری سیاسەتەکانی دەرەوەیان هاوڕا و هاوئامانج بوون، نەک هەر لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتە بەڵکو گەورەترین کێشەی

---

[i] MacDonald, C. (١٩٨٩). The Killing of SS-Obergruppenführer Reinhard Heydrich. *Sea Power*, ٣٢(١٢), ٣٧.

بۆ ئەمەریکا دروست کردوە، لەگەڵ هەموو جیهان و حکومەتی ئەمەریکای وەک وڵاتێکی نادیموکرات و پێشێلکەری مافەکانی مرۆڤ و بەرژەوەندخواز پیشاندا.

ئێدوارد سنۆدن

سنۆدن لە ناوچەی ئیلیزابیس سیتی سەر بە هەرێمی کارۆلینا، لە دایک بووە. لە پرۆسەی خوێندندا زۆر سەرکەوتوو نەبووە و دواجار پەیوەندی کردوە بە کۆلێژی خوێندنی کۆمپیوتەرەوە تەنها بۆئەوەی ئاستی خۆی بەرزبکاتەوە بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی دواناوەندی و دوای ماوەیەکی دوورودرێژ ئەوسا کۆلێژی کۆمپیوتەر تەواو دەکات. لەساڵی ۲۰۰۳، هەوڵی داوە ببێتە سەرباز و بەشداری شەری ئێراق بکات، بەهۆی شکانی هەردوو قاچیەوە لەکاتی راهێنان، ئومێدی بەشداری شەڕی ئێراقی نەما کە وەک ئەرکێکی مرۆیی تێی ئەڕوانی تا بتوانێ هاوکاری ئەو کەسانە بکات کە ژێردەستەن. یەکەم کاری لە ئاژانسی پاراستنی نەتەوەیی دەبێ و دواجار لەبەر ئەوەی کە شارەزایەکی زۆر ئەبێ لە بواری بەرنامە و ئەنتەرنێتدا کارەکەی ئەگوازرێتەوە بۆ ئاژانسی ناوەندی هەواڵگری سی ئای ئەی، لە بەشی پاراستنی ئەلیکترۆنی، ئەوەی زیاتر بوە هۆکار بۆ بەرزبونەوەی لە کارەکەیدا ئەو پسپۆری و بەهرەیە بوو کە هەیبوو لەو بوارە، بەتایبەتی هاککەرێکی زۆر سەرکەوتوو بوو.

ئاژانسی پاراستنی نەتەوەیی ئاژانسێکی حکومی ئەمەریکییە، ساڵی ١٩٥٤ دامەزراوەو بەرپرسە لە کۆکردنەوەی هەموو زانیارییەکی نێردراو بە ڕێی پەیوەندییە جۆراوجۆرەکانی سیستمی پەیوەندیکردنەوە، لەسەرانسەری جیهاندا وەک تەلەفۆن و تۆڕی ئەنتەرنێت و کورتەنامە و... هتد وە دوای کۆکردنەوەی هەڵ ئەستێت بە شیکردنەوەی لەڕێی تەکنیکی زۆر پێشکەوتوەوە، واتا هەر کەسێ کە بەتەلەفۆن یان بە موبایلەکەی قسە لەگەڵ کەسێکی تردا ئەکات، جا هەر چیەک و هەرچەند گرنگیش نەبێ، لەم ئاژانسە سەیڤ ئەکرێ و شی ئەکرێتەوە و بۆ ماوەیەکیش هەڵئەگیرێ. جا ئەوەی بەکەڵکی خۆیانەوە بێ یان نا . بۆ نمونە، لە وڵاتی ئەڵمانیا کە یەکێکە لە وڵاتە پێشکەوتوەکان وڵاتە تەکنۆلۆژیەکان بەڵام هەر پەیوەندیەکی تەلەفۆنی بە تایبەتی مۆبایل بە فلتەری تایبەتی و ڕێرەوکانی سەر ئەمەریکا تێپەڕ دەبێت، ئەم کۆکردنەوە و شیکردنەوەیە لەڕێی بەرنامەیەکەوەیە بەناوی پریسما.

پریسما بەرنامەیەکی کۆمپیوتەری زۆر پێشکەوتوو،ە لە توانایدا هەیە تەواوی داتا و زانیاری لەسەر پەیوەندیەکان بەدەستەوە بدات. پڕۆژەی ئەم بەرنامەیە زۆر نهێنی و شاراوە بوو، هەرچەند کارکردنی ئەم پرۆژەیە لەساڵی ٢٠٠٦وە بووە بەڵام سنۆدن بۆ دوو ڕۆژنامەی گەورەی جیهان ئاشکرای کرد، واشنتن پۆست و گاردیان، و دوا بەدوای ئەوەش چەندین ڕۆژنامە و ماڵپەری ئەنتەرنێتی تر وەک پێ گەی ویکیلیکس و دەیان پێگەی تر. ئەوەشی ئاشکرا کرد کە کارکردنی بەرنامەی پریسما لە هەموو جۆرە پەیوەندیەکاندا بەکارهێنراوە، سەرەتا ئەو پەیوەندیانەی ناو ئەمەریکا و ئەو پەیوەندیانەی لە دەرەوە بۆ ناو ئەمەریکا ئەهاتن، بۆ ئەم کارەش سەرەتا لە دە وڵاتی ئەمەریکا جۆرە ئاسانکاریەک کرا لەڕێی دادگاوە بۆ گوێگرتن لە تەواوی پەیوەندیەتە لەفۆنییەکان و دواجاریش دوای ئەوەی بەرنامەی سکایپ و فەیسبوک بە بڵاوی جیهانیان داگیرکرد، زۆر کاری تیرۆریستی هەر نەبێ بە ڕوانگەی خودی ئەمەریکا خۆی، جۆرە چاوپۆشیەکی تەواو لەلایەن دادگاوە کرا بۆ مەسەلەی گوێگرتن و کردنەوەی ئیمایلەکان و زانیاری وەرگرتن لە کۆمپانیای گوگل.

لەساڵی ۲۰۰۹ وەک شارەزایەکی تەکنۆلۆژیا لە بواری هونەری و تەکنیکی لە کۆمپانیای بوز الن هاملتون دامەزرا کە کۆمپانیاییەکی کەرتی تایبەتە، کاری بۆ ناسا دەکرد، بە هۆی ئەوەی کە بەرپرسی پەیوەندیەکان و کاری هونەری بەشی چاودێری بوە هەزاران بەڵگەنامە و مەلەفی گرنگ کەوتۆتە بەردەستی و ئەمیش هەر لەو کاتەوە بۆ هەر یەک لەم مەلەفانە کۆپی تەواوی کردوە.
سنۆدن دوای سێ ساڵ لەدەست بەکاربوونیەوە بیرۆکەی ئەوەی بۆ پەیدابوو ئاخۆ ئەوەی دەیکەن راستە یان هەڵەیە، لەدوای ئەوەی بە هەزاران بەڵگەنامە دەکەوێتە بەردەستی، بیر لەوە دەکاتەوە ئەم کارانە ئاشکرابکات و روپۆشی بەناوو دیموکراتی سەر دەموچاوی ئەمەریکا لابەرێت، بەڵام ئەو گۆرانکاریانەی بەسەر ئەمەریکادا دەهات وای لێکرد ساردبێتەوە و نەشی ویستوە ئەو کەسانە ئاشکرابکات کە داواکارن یان ئەو کەسانە ئاشکرابکات کە سی ئای ئەی بەدوایانەوەیە و ژیانیان بخاتە مەترسیەوە.
بەڵام کاتێک ئەبینێ دوای هەڵبژاردنی سەرۆک ئۆباما هیچ گۆرانکاریەک و هیچ چاکسازییەک روونادات بۆیە ساڵی ۲۰۱۲ بریار دەدات زۆر لەو بەڵگانە ئاشکرا بکات کە ئەمەریکای هەژاند و رووە راستەقینەکەی کردە روو. سەرتا، لە بەرواری شەشی حەزیرانی ۲۰۱۳ رۆژنامەی گاردیانی بەریتانی دزەکردنی ئەو هەواڵانەی ئاشکراکرد دەربارەی بەرنامەی پریسما و ئاشکراشی کرد بەرنامەی پریسما کە لەسەر زۆربەی سیستەمەکانی مایکرۆسۆفت کار دەکات و تەواوی ئیمێلەکان هاک ئەکات و لەوانە هۆتمێل، یاهوو، بەئاسانی کار لە پاڵتاک و فەیسبووک و یۆتۆب دەکات و تەواوی پاسوۆرد و داتاکانی بەکارهێنەر و شوێن و کات و ماوەکەی کارکردن دەداتەدەستەوە.
ئەم هەواڵە رای جیهانی دژ بە ئەمەریکا هەژاند و سەرتاسەری دەوڵەتەکان کەوتنە مقۆمقۆی ئەوەی دەزگای هەواڵگری ئەمەریکا تا چەند سنوری ئەو یاساورێسا نێودەوڵەتیانەی بەزاندوە کە پارێزگاری لە سەروەری دەوڵەتان و شکۆمەندی وڵاتانی سەربەخۆ و سیستمی دیموکراتی و مافی دەست تێوەنەردان و مافەکانی نێودەوڵەتی بەزاندوە.

دوای ئەوەی ئاشکرابوو کە سنۆدن لە پشت دزەکردنی هەواڵەکانەوەیە، ئەو ماوەیەک بوو گەیشتبووە هۆنگ کۆنگ و لەوێشەوە کاتێ زانیاری ئەوەی بەدەست کەوتبوو کە گوایە ئەمەریکا بەفەرمی داوای کردوە تا وەک تاوانبارێک بیدەنەوە بە ئەمەریکا، هەڵبەت دواجار ئۆباما وەک گەورەترین خیانەتکار ناوزەندی کرد. سنۆدن دوای هۆنگ کۆنگ گەیشتە روسیا و هەر لە فرۆکەخانەکە داوای مانەوە و پەنابەری کرد و پارێزەرەکەی لەو بارەیەوە دەڵێت لەو کاتەی کە چاوەڕوانی دەکرد لە فرۆکەخانە، ئەلف وبێی روسی دەخوێند و خۆی خەریک کردبو بە زانیارییەکانی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت لە روسیا. دوای بواری مانەوەیاندا بۆماوەی ساڵێک. ئەمەریکا زۆر نیگەران بوو بەم هەواڵە و پۆتین پێی راگەیاندبوون کە هیچ یاسایەک یان پرۆتۆکۆلێک نییە لەنێوان هەردوو دەوڵەت تا تۆمەتباران رادەستی یەکتری بکەن.

دوابەدوای بەرنامەی پریسما بەرنامەیەکی تری ئاشکرا کرد کە زۆر لە پریسما مەترسیدارترە و بەهێزترە بەناوی ئێکس کی سکۆر، کە لەلایەن دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی بەکارهێنراوە، ئەم بەرنامەیە بە یەکێک لە بەهێزترین بەرنامەکان دەژمێردرێ لە بواری سیخوریکردندا، کە توانای زۆر سەرسوڕهێنەری هەیە. هەربۆیە، زۆر ئاسایی و زۆر ئاسانە ئەو کەسانەی ڤیدیۆی تیرۆرستی یان کاری نەشیاو یان هەر هەڕەشە و ئەو شتانە دەکات بدۆزرێنەوە بەتایبەتی لەم دواییە کە ڤیدیۆکانی داعش هەموو جیهانی تەنی بوو.

ئێستا، سنۆدن لە روسیایە و ماوەی مانەوەی کەمی ماوە هەر چەند داوای پەناهەندەیی لە بیست و یەک وڵات کردبوو بەڵام زۆربەی وڵاتەکان رەتیان کردبوەوە بێجگە لە ئیکوادۆر، داوایەکی پێشکەش وڵاتی ئەڵمانیا کردبوو بۆ بەخشینی مافی پەناهەندەیی بەڵام ئەڵمانیا رەتی کردەوە و هەرچەندە لە پەرلەمانی ئەڵمانیا تائێستا گفتوگۆی چڕ هەیە لەو بارەیەوە، دوای ئەوەی چەندین نهێنی سەرسوڕهێنەری ئاشکراکرد لەبارەی گوێهەڵخستنەکانی ناسا، ئاژانسی پاراستنی نەتەوەیی لە ئەنجێلا مێرکل راوێژکاری ئەڵمانیا و چەند نهێنیەکی تر دەربارەی بوونی دوو سیخوڕی سەر بە ئاژانسەکە لەناو دەزگا هەستیارەکانی ئەڵمانیادا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی

ئەوەی ئەمەریکا وەک تاوانبارێک سنۆردنی لە قەڵەمداوە و تۆمەتبارە بەدزیکردن لە داموەزگاکانی دەوڵەت، زۆربەی ئەو وڵاتانە ناتوانن مافی پەنابەری پێبدەن و بەپێچەوانەوە لەسەریانە بەپێی گرێبەستەکانی نێودەوڵەتی رادەستی پۆلیسی ئەنتەرپولی بکەن. ئەم پیاوەی زۆر کەس وەک پاڵەوان سەیری دەکات و زۆرێکی تریش وەک ناپاک.[i]

## سیلفیا رافاییل (١٩٣٧-٢٠٠٥)

وتەیەک لەناو ئەندامانی کۆمەڵگای هەواڵگریی هەیە کە دەڵێت: هەواڵگریی دووەم کۆنترین پیشەی جیهانە؛ تاکە جیاوازی لە نێوان ئەم و کۆنترین پیشە تەنیا ئەوەیە کە هەواڵگریی بەهای مرۆڤایەتی و ئەخلاقی کەمترە.

بەسەرهاتە ناوازەکەی سیلڤیا، کە کچە جوویەکی زایۆنیستی و جەنگاوەرێکی نهێنی بوو لە یەکەی تایبەتی ئۆپەراسیۆنەکانی دەزگای هەواڵگریی مۆساد، گومان دەخاتە سەر ئەم وتەیەی سەرەوە. لە لایەکی ترەوە، تیشک دەخاتە سەر بڕوای کارمەندانی هەواڵگریی کە هەر فرتوفێڵێک، جا گرنگ نیە تا چ ئەندازەیەک جێگای گومان بێت، رێگاپێدراو و شەرعیە بۆ ئەوەی ئامانجەکانیان بپێکن. لە لایەکی ترەوە، ئەوە دەردەخات کە چۆن ئەم کارمەندانە دەبێت لەسەر کۆنترۆلی خود و ئەمەکداریی تەواویان بۆ دەزگا دیاریکراوەکەیان بەردەوام بن، بۆ هەردوو خەباتی ئیسرائیل لەگەڵ دوژمنە عەرەبە فەلەستینیەکان (کە لە هیچ شتێک ناوەستن) وە پاراستنێکی وشیار بۆ بەها ئەخلاقیەکان، وە هەروەها دەبێت رەچاوی تێکۆشانی بەردەوام بکەن بۆ ئەوەی دوور بن لە ئازاردانی تەماشاگەرانی هەر چالاکیەک کە بەرێکەوت تووشیان دەبن، بە هەرچی توانی کە هەیانە.

---

[i] Gurnow, M. (٢٠١٤). *The Edward Snowden affair: Exposing the politics and media behind the NSA scandal*. Indianapolis: Blue River Press.

سیلڤیا رافایل، بکوژەکەی مۆساد

رووداوی لیلهامەر و لەناوبردنە بەرێکەوتەکەی ئەحمەد بوشیقی، گەنجێکی بێتاوانی ئەرویجی بەرەچەڵەک مەغریبی، بەچەندین رێگا پێچەوانەی سیاسەتێکی وردی حیساب بۆکراوە. ئەفسوس، هەندێ جار پێویستیەتی ئەنجامدانی هەندێک کار زاڵدەبێت بەسەر هەردوو کۆنترۆڵی خود و بژاردەی چاوەڕوانی کردنی دەرفەتێکی باشتر لەوەی کە هەیە- وە ئەو بڕیارەی دەدرێت بۆئەوەی بەردەوامی بە ئۆپەراسیۆنێک بدرێت کەمترە لە دۆخێکی نموونەیی. بە داخێکی زۆرەوە، ئەمە روویدا لە لیلهامەر؛ چەندین رووداوی نەخوازراوی لەم جۆرە تەنیا لەناو دەزگای هەواڵگریی ئیسرائیلیدا نابینرێن، بەڵکو لە هەموو دەزگا هەواڵگرییەکان ئەمانە رووداوی کردەیین.

سیلڤیا رافائیل خاوەن ورەیەکی بەرز بوو لەو کارەی ئەنجامی دەدا و متمانەیەکی تەواوی بە سەرووی خۆی هەبوو. هەڵە گەورەکەی لیلهامەر زۆر بەتەواوی بێ هیوای کرد. قوربانیەکی بە هەڵە دیاری کرابوو، وە پەرۆشی ئەنجامدانی کارەکە بووە هۆی

پلانێکی شکستخواردووی ئۆپەراسیۆنەکە کە ئەنجامەکەی دەستگیرکردن و زیندانی کردنی تەواوی تاقمەکەی لێکەوتەوە.

جێگای سەرسوڕمان نیە کە دوای شکستەکە سیلڤیا بەم شێوەیە نووسی: "دوای رووداوەکەی لیلهامەر، شتێک لە ناخی مندا شکا... ئەو پەرۆشیەی کە هەم بوو بۆ بەردەوامیدان بە کارکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی من زۆر رێزم دەگرتن، لەناوچوو. پیاوەکانم هەڵە بوون، بەڵام لەناکاو ئەوانم بەشێوەیەکی جیاواز بینی. جێی داخە..."

بێگومان، مۆساد، دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل، وە جەنگاوەرە نهێنیەکانی یەکەی تایبەتی ئۆپەراسیۆنەکان وانەیەکی گرنگ لە رووداوی لیلهامەر فێربوون. سەرەڕای ئەوەی کە لەسەرەوە باسکرا، ئەوانەی کە پلان دادەڕێژن و ئەم جۆرە کارانە ئەنجام دەدەن هەرگیز بەتەواوی نابەخشرێن لە بڕیاری هەڵە و بێبەختی.

لەڕاستیدا، شکستی لیلهامەر هیچ شتێکی نەکرد بۆ لاوازکردنی چارەسەرکردنی جەنگاوەرانی مۆساد، وە پابەندبوونیان بەو ئەرکەی هەیانە کە لەکۆتاییدا بەهەر نرخێک بێت بەئەنجام گەیەنرا. هەڵوێستە نەگۆڕەکەیان بۆ دۆزینەوە و لەناوبردنی عەلی سەلامە، تیرۆریستە گەورە و فەرماندەی ئەیلولی رەش، لەکۆتاییدا سەرکەوتوو بوو. سیلڤیا رافایل، جەنگاوەری بە جەرگ و ئازا، بەم هۆیەوە ئارام بووەوە.

لەکۆتاییدا، نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە بەشی هەرە گەورەی چالاکیەکانی مۆساد- وە ئەوانەی کۆمەڵگای هەواڵگریی بەگشتی- لە دۆزینەوە و لەناوبردنی دوژمنانی پێک ناهێت. سەرەڕای گرنگیە گەورەکەی ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنانە، ئەوان ئاوێزە و کەم دەرکەوتوون. ئەرکی سەرەکی دەزگا نهێنییەکان بریتییە لە ئەرکی جارسکەری زیاتری کۆکردنەوەی زانیاری بۆ ئەو کێشە گرنگانەی پەیوەندیان بە ئاسایشی نیشتیمانییەوە هەیە.

چیرۆکە درێژەکەی کووشتنی عەلی سەلامە بەو شێوەیە دەستی پێکرد کە نۆ پیاو بە چەکی قوورسەوە لە دەوری مێزێکی دانیشتبوون. ئەوان رەشتاڵ، پرچی تاریک و رووخسارێکی بێبەزەییان هەبوو. چەند نوسخەیەک لە وێنەیەکی رەنگاوڕەنگیان لە بەردەم بوو. هەریەکیان نوسخەیەکی هەڵگرت و بە وردی لێیان روانی. ئەو وێنەیە

ئافرەتێکی باڵابەرزی رێکپۆشی دەردەخست لە دوکانێکی فرۆشتنی پێداویستی مۆدێلی ئافرەتان لە ناوەڕاستی ئۆسلۆی پایتەختی نەرویج. لەژێر قۆلیدا جانتایەکی شتکڕینی تیادابوو کە لۆگۆی "ستیم و ستۆهرس" پێوەبوو.

ئەو وێنەیە بە کامێرایەکی کوالێتی بەرزی لێنس پێشکەوتوو لە مەودایەکی دوورەوە گیرابوو، بەڵام سەرەڕای دووریەکەی، رووخساری ئافرەتەکە بەڕوونی دەبینرا. ئەو ئافرەتە سەرنجڕاکێش و ئارام، بێ کێشە، بەدڵنیاییەوە گومانی لە هیچ کەسێک نەبوو کە بەدوای کەوتوون یان بە نهێنی وێنەی دەگرن.

کەشوهەوای ژوورەکە تەماوی و توند بوو. دوکەڵی جگەرە تەواوی شوێنەکەی داپۆشیبوو، وە سەرەڕای داخرانی پەنجەرەکان، دەنگەدەنگی خەڵکی سەرشەقام و بانگ لە مزگەوتێکی نزیک، بەئاشکرایی دەبیسترا. ئەو دەمە سەرەتای ئێوارەیەکی وەرزی زستانی ساڵی ١٩٩٧ بوو، لە خۆرئاوای بەیروتی پایتەختی لوبنان. خەڵک پەیتا پەیتا بە قەڵەباڵغیەکی زۆر بەهۆی هێواشی جووڵانی ترافیکەکانی هاتووچۆ لەسەر کار دەگەڕانەوە ماڵ، بەشێوەیەک تاریک بوو کە رووناکیەکانی سەر شەقام ئەوکات داگیرسابوون.

لە سەری مێزەکەدا عەلی حەسەن سەلامە دانیشتبوو، کە پیاوێکی سی و حەوت ساڵی قۆزی و پرچ لوول بوو. ئەوانیتر تێگەیشتن کە ئەو وێنانەی لەبەردەمیانن هۆکاری کۆبوونەوەیانە لەو شوێنەدا. ئەوان چاوەڕوانی فەرماندەکەیان کرد کە بۆیان روون بکاتەوە.

سەلامە بەم شێوەیە دەستی پێکرد، "ئەمە سیلڤیا رافایلە".

هەرچەندە هیچ کامیان هەرگیز چاوی پێ نەکەوتبوو، بەڵام لەگەڵ ناوەکەیدا ئاشنابووین. لەڕاستیدا، ئەوان زۆرجار بە ترس و رێزەوە باسی ئەویان دەکرد، ئاگاداری بوون کە ئەو لە پشت کوشتن و لەناوبردنی زۆرێک لە هاورێکانی ئەوانە.

بەرپرسەکەیان بەشێوەیەکی یەکلایکەرەوانە وتی، "ئەم ئافرەتە دەبێت بمرێت".

هیچ یەکێک لە ئامادەبووان نوقەی لەبەر نەهات. زۆربەیان بکوژی شارەزا بوون، کوشتنی سیلڤیا تەنیا چەند رۆژێک کارکردنی دەویست.

عەلی حەسەن سەلامە ئەفسەرێکی دیاری ئەیلولی ڕەش بوو، کە یەکێکە لە دڕندەترین و مەترسیدارترین ڕێکخراوە تیرۆرستیەکانی جیهان. ئەو سەرکردایەتی چەند هێرشێکی تیرۆرستی کردووە کە لەئەنجامدا چەندین هاوڵاتی ئیسرائیلی و جوو مردوون. هەروەها، ئەو ئەندازیاری هێرشە خوێناویەکەی وەرزشوانانی ئیسرائیلی بوو لە یاریەکانی ئۆلۆمپیادی میونخ وە خۆی فەرمانی ئەو ئۆپەراسیۆنەی دابوو، کە بوو بە سەردێڕی سەرجەم ڕۆژنامەکانی جیهان. لەماوەی ساڵانی حەفتاکاندا، کاتێک ڕێکخراوەکەی لە لوتکەی چالاکیەکانیدا بوو، عەلی بەهۆی ئەنجامدانی ئەم کارەیەوە بەشێوەیەکی لەڕادەبەدەر پێگەکەی بەرز بووە، سەرکردەکانی تر خەونیان پێیەوە دەبینی. ئەو بەسەرکردەیی لەدایک بوو: کەسێکی ئافرێندە، پڕ لە زانیاری، ئازا، و خاوەن بڕیار. پیاوەکانی سەرجەم فەرمانەکانی ئەویان بەبێ کەموکورتی بەجێ دەگەیاند. ئەو وەک سیمبولی خەباتی فەلەستین دادەنرا، وە یاسر عەرەفات، سەرکردەی فەتح، کە لەژێر ناوی ئەوەوە ئەیلولی ڕەش کاری دەکرد، لە هەر بۆنەیەکدا دەرفەتی هەبوایە رایدەگەیاند کە عەلی لە هەموو چاوەڕوانیەکانی ئەو تێپەڕیووە. عەرەفات پێی دەوت، "کوڕی من".

ئێستا، دوای نزیکەی حەوت ساڵ لەکردنەوەی، چالاکیەکانی ئەیلولی ڕەش بەڕێژەیەکی بەرچاو بەهۆی کێشەی بێ بایەخی ناوخۆیی و کەسایەتیەوە کەمبونەتەوە. عەلی سەلامە هەوڵیدەدا بەردەوام بێت لەسەر پلە باڵاکەی، وە پابەندبوو بە گەڕاندنەوەی یەکێتی بۆناو ڕیزەکانی و دووبارە ئەیلولی ڕەش بگەڕێنێتەوە ڕۆژانی پڕسەروەریی جارانی. ئەو بیری پێگەی پێشووی و ئەو ڕێزەی کە جارانی هەیبوە، دەکرد.

عەلی سەلامە تەنیا بە مافی خۆی سەرکردە نەبوو. ئەو سوودیشی لە پێگەی باوکی وەرگرت، کە ناوەکەی سەرچاوەی ئیلهامبەخش بوو لەناو فەلەستینیەکان لە ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەم. باوکی عەلی، حەسەن سەلامە، لەپێشدا بەدەوری پیاوەکانیدا دەسوڕایەوە بە فیشەکداغێکی گوللە کە لە دەوری سینگیدا ئاڵابوو وە دوو دەمانچەی چواردەخۆری پڕ لە فیشەک هەردوولا تەنیشتەکانی داپۆشیبوو، یەکێک

بووە لەنێو سەرکردە دیارەکانی عەرەب لە فەڵەستینی داگیرکراو. ئەو لەژێر پارێزگاری موفتی قودس، حاجی ئەمین الحسینی،دا بووە کە هاوکاری هیتلەر و قەڵاچۆکردنی جوەکانی کردبوو. بە هاندان و یارمەتی موفتیەکە، حەسەن سەلامە رابەرایەتی عەرەبەکانی فەڵەستینی کرد لەپێکدادانێکی کووشندەدا لەگەڵ جووەکان پێش جەنگی سەربەخۆیی و لەکاتی قۆناغەکانی سەرەتای ئەو جەنگە. ئەو سەرکردایەکی بە ئەزموون، وریا و کارزان بوو، کە لە ناوەراستی فەڵەستین رابەرایەتی چەندین هێرشی لەدژی جووەکان کرد. ناوبراو چەند بارەگایەکی لە باڵەخانە خۆڕاگرەکانی رام الله دامەزراند، کە لەوێوە فەرمانی بە بنکەکانی ئۆپەراسیۆنەکانی یافا، تایبە، و تولکەرەم دەکرد.

بۆ جووەکانی پێش-دەوڵەتی فەڵەستین، ناوی حەسەن سەلامە هاوواتا بوو لەگەڵ تێکدان و قەڵاچۆکردن. ئەوان درکیان بەوە کرد کە تا ئەوکاتەی ئەو هەیە، ئەوان کێشەکانیان لەگەڵ دراوسێ عەرەبەکانیان کۆتایی نایەت. لەناوبردنی بە گرنگ و بەپەلە دەبینرا، وە ئەولەویەتی یەکەمی پێدرا؛ ئەو بە بەردەوامی لە لایەن هێزەکانی جوەوە چاودێری دەکرا بەمەبەستی گەیشتن بە ئامانجی کۆتاییان کە خۆی لە کوشتنی ئەودا دەبینیەوە. کاتێک زانرا کە دەتوانرێت سەلامە لە بارەگاکان لە رام الله بدۆزرێتەوە، سەربازانی جوو هێرشیان کردە سەر باڵەخانەکە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لە برین و چوونە ناو دیوارەکانی و کوشتنی نێچیرەکەیان. لە هەوڵدانێکی تردا، هێزەکانی پاڵپشتی لە لیوای گیڤاتی هێرشیان کردە قەڵای فەڵەستین، سی و نۆ پیاوی سەلامەیان کوشت. ئەو خۆی لەکاتی هێرشەکەدا لەوێ نەبوو، بەڵام لەکۆتاییدا لە جەنگی راس العین لەساڵی ١٩٤٨دا کوژرا. کوڕ و تاکە میراتگرەکەی، عەلی سەلامە، لەوکاتەدا تەنیا تەمەنی نۆ ساڵان بوو. کاتێک کوڕەکە گەورە بوو، سوێندی خوارد تۆڵەی خوێنی باوکی بکاتەوە و جووەکان لە وڵات دەرکات. ئەو بەهۆی چالاکی تیرۆریستی ئامانجەکەی دەهێنایە جێ.

ئووری کۆنفرانسی بەیروت کە تیایدا پلەدارە پێشکەوتووەکانی ئەیلولی رەش لەگەڵ سەرکردەکەیان لە کۆبوونەوەدا بوون بە پاسەوانی تایبەتی پارێزرابوو. چاوی

پاسەوانەکان بە وریاییەوە لەسەر هەر جوڵانەوەیەکی گوماناویدا بوو. عەلی درکی بەوە کرد کە ئیسرائیلییەکان بەدوایدا دەگەڕێن وە لەوە دەترسا کە لە هەر ساتێکدا رەنگە هێرشی بکرێتەسەر.

عەلی توووند و بێ بەزەیی، زیرەک و بیرتیژ بوو. ئەو بەرپرسیار بوو لە چەندین کاری رفاندی فڕۆکە و تەڵەی مردن کە لەدژی هاوڵاتیانی بێتاوانی ئیسرائیلی دادەنرا. ناوبراو تیرۆرستی دەنارد بۆ ئەنجامدانی هێرشی ناوازە لەناو خاکی ئیسرائیل، وە بەبێ دوودڵی رکابەرە سیاسیەکانی لەناودەبرد. ئەو دڵنیابوو کە مۆساد، دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل، هەر کارێک کە لەتوانایدا بێت دەیکات بۆ وەستاندنی ئەو، بەڵام ئەو بەبەردەوامی توانی لەو سیخوڕە نهێنیانە رابکات کە بۆی دەنێردران، شوێن پێی هەڵدەگرن، وە ویستی کوشتنی ئەویان هەیە. بەم هۆیەوە، ناوبراو لە هیچ شوێنێکدا بۆماوەیەکی درێژ نەدەمایەوە، وە کە ئیسرائیلییەکان وایاندەزانی ئیتر شوێنەکەیان دۆزیەوەتەوە، ئەو لەناکاو بەرەو شوێنێکی تر دەچوو.

عەلی رقێکی قوڵی بەرامبەر مۆساد هەبوو، بەهۆی کوشتنی کارمەندە دیارەکانی ئەیلولی رەش لە ئەوروپا، کە زۆربەیان دۆستی نزیکی ئەو بوون. تەنیا لە دوو بۆنەدا ئەیلولی رەش توانی تۆڵەبکاتەوە بە کوشتنی ئەفسەرانی مۆساد. دەنگۆی ئەو ئۆپەراسیۆنانە زۆر کز بوو، تەنانەت بوونیشیان نەبوو، بەبەراورد لەگەڵ ئەو هێرشە کوشندانەی لەلایەن مۆسادەوە ئەنجام دەدران.

ئەیلولی رەش پێویست بوو دەستبەجێ وێنە لێلەکەی چارەسەر بکات، وە عەلی سەلامە درکی بەوە کرد کە باشترین رێگا بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە بریتی بوو لەوەی هێرشبکاتە سەر ئیسرائیلییەکان کە زۆرترین ئازار و زیانی هەبوایە. کووشتنی سیلڤیا رافائیل ئەم ئامانجە نموونەیەی ئەوانی دەپێکا.

سیلڤیا سیخوڕێکی بە ئەزموونی مۆساد بوو. ئەو ئەندامی تاقمێکی بەئەزموونی جەنگاوەریی نهێنی بوو کە ئەرکەکەی بریتی بوو لە دۆزینەوەی شوێنی عەلی سەلامە. لەبەرامبەردا، سەرکردەکانی ئەیلولی رەش بەبەردەوامی هەوڵیاندا شوێنەکەی بدۆزنەوە و پاشان بیکوژن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. ئەوان ئارەزوویەکی

لەرادەبەدەری کوشتنی ئەویان هەبوو، چونکە بۆماوەی چەندین ساڵ بوو ئەو ئافرەتە ببووە هەڕەشەیەکی بەردەوام لەسەر سەری سەرکردەکانی ئەو رێکخراوە. لەکۆتاییدا، ئەو ساتە هات کە بۆ ماوەیەکی درێژ بوو چاوەڕوانی بوون، وە ئەوان سووربوون لەسەر سەرکەوتن.

عەلی سەلامە زانی کە مردنی سیلڤیا رافائیل تەنیا نابێتە جێگای سەرسوڕمانی و ترسی مۆساد، بەڵکو دەبێتە سەرچاوەی ئارامی بۆ ئەندامە رزگاربووەکانی ئەیلولی رەش، کە فەرماندە و هاوکارەکانیان بەهۆی هێرشەکانی مۆسادەوە یەک بە یەک لەدەست داوە.

ئەو وتی، "نابێت ئەم کارە زۆر ئاڵۆز بێت، پیاوەکانمان بۆ چەند هەفتەیەک بەدوایدا بوو وە ئەویان دۆزیەوە کە لە دەوروبەری ئۆسلۆ بەبێ چەک و پاسەوان دەسوڕێتەوە. ئەو گومان نابات کە هیچ کەسێک هەڕەشە دەکاتە سەر ژیان".

ئەو رایگەیاند کە ئەو بەم زوانە هێزێک بەیەکەوە دەنێت بۆ کوشتنی سیلڤیا. ئەو بەڵێنیدا، "تەنیا باشترین پیاوەکان هەڵدەبژێردرێن بۆ ئەم ئەرکە، هیچ جۆرە هەڵەیەک نابێت بکرێت".

عەلی پلانەکانی بۆ یاسر عەرەفات روونکردەوە. سەرکردەی رێکخراوی ئازادی فەڵەستین بیرۆکەکەی بەدڵ بوو و یەکسەر رەزامەندی دەربڕی. لەبەرئەوەی پارەی ئەیلولی رەشی عەلی کەمیکردبوو، عەرەفات قایل بوو کە خۆی تێچووی ئۆپەراسیۆنەکە لەئەستۆ بگرێت، بە تەرخانکردنی بلیتی فڕۆکە، هۆتێل، خەرجیەکانی ژیان.

پلانی جێبەجێکردن زۆر زوو ئامادە بوو. دبلۆماتە لیبیەکان، کە خزمەتی عەلی و دامەزراوەکەیان بەدڵسۆزییە دەکرد و لە هەموو پایتەختەکانی ئەوروپا باڵیۆزخانەیان هەبوو، دەمانچەی و چەکی پێوستیان بە قاچاغ هێنایە ئۆسلۆ بە رێگای پەیوەندیە دبلۆماسیەکانیان، بە شاردنەوەییان تا ئەوکاتەی پێویست بوون.

عەلی سەلامە کاتی ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنەکەی بۆ سەرەتای هاوین دیارکرد. ئەو وایدانا کە کاتێک کەشوهەوا گەرم دەبێت، سیلڤیا کاتێکی زیاتر لە دەرەوە بەسەر دەبات، وە ئەمەش ئەرکی کوشتنی سیلڤیا ئاسانتر دەکات.
چوار بکوژ بە وریاییەوە دیاریکران. تەنیا ئەو کەسانەی کە پێشتر لەکاری ئاڵۆزدا بەژداریبون هەڵبژێردران. کاتێک ئەوان لە چەندین شاری جیاوازی ئەوروپیەوە گەیشتنە ئۆسلۆ، پاسپۆرتە ساختەکانیان لەلایەن پۆلیسی سنووری نەرویجیەوە مۆرکران بەبێ ئەوە هیچ گومانێک بکەن.
ئەندامانی تاقمەکە چوونە هۆتێلی جیاجیاوە وە بۆماوەی دوو رۆژ بەدەوری ئۆسلۆدا سووڕانەوە بۆئەوەی شارەزای شارەکە ببن و دەرچەی گونجاو بدۆزنەوە بۆ هەڵاتن. فەرمانەکانیان سادده و ورد بوون: دوای کوشتنی سیلڤیا ئەوان بڵاوەیان دەکرد وە بەرەو شوێنی جیاوازی ئەوروپا دەچوون، هەندێکیان بە ئۆتۆمبیل وە ئەوانی تریش بە فرۆکە.
دوای ئەوەی ئەوان پشکنینی شارەکەیان تەواو کرد، تاقمەکە دڵنیابوونەوە کە بە نائاشکرایی دەمێننەوە. ئەوان خۆیان بەدوور گرت لە بەکارهێنانی تەلەفۆن، خۆیان لە ژوورەکانیان شاردەوە، بە خواردنی لەفە چارەسەری برسیەتیەکەیان کرد.
لەوکاتەی بەرواری هێرشەکە نزیک دەبووەوە، ئەوان چەکەکانیان لە شوێنی شاردنەوە لە باڵیۆزخانەی لیبیا کۆکردەوە. بڕیاردرا کە ئەوان لە پارکێکی گشتی بەرامبەر ماڵەکەی هێرشی دەکەنەسەر. کاتێک لە دەرگاکەی هاتە دەرەوە، تەقەی لێدەکەن و لەسەر شۆستە بە مردوویی بەجێی دێهێڵن.[i] هەموو ئەو هەوڵانەی دران بۆ کووشتنی سیلڤیا مایەپوچ بوون و ناوبراو لەساڵی ٢٠٠٥ بەهۆی نەخۆشییەوە لە وڵاتی نەرویج کۆچی دوایی کرد. بەهۆی ئەو خزمەتەی پێشکەشی وڵاتی ئیسرائیلی کرد، لەبەرامبەردا ئەوانیش مەیدانێکیان بەناوی "مەیدانی سیلڤیا رافایل" لەو وڵاتەدا کرد.

---

[i] Oren, R., & Kfir, M. (٢٠١٤). *Sylvia Rafael: The Life and Death of a Mossad Spy.* University Press of Kentucky.

مەیدانی سیلڤیا رافایل لە شارۆچکەی میگدالی ئیسرائیل

## موستەفای چکۆڵە

دوای داگیرکردنی هیندستان لەلایەن حکومەتی بەریتانیای ئیمپریالیستەوە، بەریتانییەکان وەک هێزێکی ئیمپریالیستی لەهەوڵی ئەوەدا بوون سوود لە تەواوی سامانی سروشتی و مرۆیی ئەم نیشتیمانە وەربگرن کە داگیریان کردوە، هەروەها لەهەوڵی نانەوەی پشێوی و ئاژاوە بوون لەناو ئەو هێزانەی کە دژیان دەوەستانەوە بە هەرجۆرێک بێت، لە هەمان کاتیشدا دەیانویست زۆرترین خەڵک بەلای خۆیاندا راکێشن و بیانکەن بە هاوسۆزی بەریتانیای داگیرکەر و بەو شێوەیەی کە دەیانەوێت بەکاریان بهێنن و سوود لەتواناکانیان وەربگرن بۆ خزمەتی ئیمپراتۆری بەریتانیای ئیمپریالیست. وڵاتی هیندستان وەک خاکێک کە لەسەرەتای ساڵانی بیستەکاندا لەلایەن بەریتانیاوە داگیرکرابوو دانیشتوانەکەی لە هیندۆس و مسوڵمان پێک دێت، کە لەبەر زۆری ژمارەی دانیشتوانی هەژاری زۆر تیدا بڵاوە، هەر ئەم هۆکارەش وا دەکات کە لاوێکی بچووک کە ناوی مستەفایە بکەوێتە ناو داوی دەزگای هەواڵگری ئیمپریالیستی بەریتانی.

ئەم لاوە کە بە هۆی بچووکی جەستەیەوە بە مستەفای چکۆڵە ناوی دەرکردووە لە دایک و باوکیکی هەژاری مسوڵمان لە شاری بنیارس لەدایک بووە، ئەم لاوە خاوەنی زیرەکیەکی بێوێنەیە و لەناو هاوڕێکانیدا بەم هۆیەوە ناسراوە، کاتێ ناوبانگی زیرەکی ئەم لاوە گەیشتە یەکێک لە ئەفسەرە ئینگلیزەکانی حکومەتی بەریتانی (ئەو ئەفسەرە لە هەواڵگری بەریتانی کاریدەکرد) ئەفسەرەکە چووە ماڵی لاوەکە و بە کەس و کاری لاوەکەی راگەیاند کە کوڕەکەیان لەسەر ئەرکی بەریتانیا بخوێنێ، تا ئەو کاتە لەبەر هەژاری دایک و باوکی مستەفا نەیان توانیبوو کوڕەکەیان بخەنەبەر خوێندن بۆیە راستەوخۆ بەو پێشنیارەی ئەفسەرە ئینگلیزەکە رازیبوون، بۆیە مستەفا لەسەر ئەرکی حکومەتی بەریتانی دەستی کرد بە خوێندن لە خوێندگەیەکی باڵا لە هیندستان کە تایبەت بوو بە منداڵانی ئەفسەرەکان. کاتێک بڕوانامەی دواناوەندی بەدەست هێنا، رەوانەی زانکۆی ئۆکسفۆرد کرا لە لەندەن، لەوێ شان بەشانی کوڕە وەزیر و لۆردەکان دەیخوێند، پشووی کۆتایی هەفتەی لە ماڵ و باخچەی دەوڵەمەند و سیاسیە بەریتانییەکان بەسەر دەبرد، ئەمەش وەک پلانێکی هەواڵگری بەریتانی تا مستەفا رابهێنن لەسەر ژیانی مۆدێرنی ئەو سەردەمە، ئەمەش وەک راهێنانێک بوو بۆ ئەنجامدانی کارە سیخوڕیەکانی داهاتووی.

مستەفا سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەست هێنا لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا، کارە سیخوڕیەکانی لە زانکۆوە دەستی پێکرد، هەڵدەستا بە باسکردنی هاوڕێکانی و هەڵسەنگاندی بۆچوونەکانیان و لەشێوەی راپۆرتدا بەرزی دەکردەوە بۆ بەرپرسەکانی و ئەوانیش لێی رازیبوون، دوای ئەوەی گەیشتە دوا پلەی خوێندن و بڕوانامەی زانکۆی بە پلەی زۆرباشە بەدەست هێنا بەرپرسێکی هەواڵگری بەریتانی پێشی خۆی خست بۆ قوتابخانەی سیخوڕی بەریتانی لە دەوروبەری دو فونشیر، پاش ٢ ساڵ سیخوڕێکی کارامەی لێدەرچوو، فێری هەموو هونەرەکانی سیخوڕی بوو، یەکەم ئەرک کە پێی سپێردرا چوونە میسر بوو تا چاودێری بزووتنەوە نیشتیمانیەکان بکات و لەبەرئەوەی کە مسوڵمانە کەسێکی گونجاوە بۆ ئەو ئەرکە و کەس گومانی لێناکات، ماوەیەک لە قاهیرە مایەوە سیخوڕی لەسەر بزووتنەوە نیشتیمانیەکان دەکرد و راپۆرتی لەسەر

بەرز دەکردنەوە، دواتر فەرمانی پێدرا بچێتە ئەفغانستان لەو کاتانەدا کە سەردار محمد عزیز خان رازی نەبوو بچێتە ژێر فشاری بەریتانییەکان.
بۆیە، دەزگای هەواڵگری بەریتانی بڕیاریدا سەردار لەناوبەرێت، ئەو پلانەی کە هەواڵگری بەریتانی بۆ تیرۆرکردنی سەردار دایڕێژا لە دوو قۆناغ پێک هاتبوو، لە قۆناغی یەکەمدا دەبوو کارێک بکرێت کە ناوبراو لە ئەفغانستان و لەناو هۆزەکەی خۆیدا دووربخرێتەوە بۆ جێگایەکی دوور، و لە قۆناغی دووەمدا تیرۆر بکرێت بە هەر رێگایەک بێت. بۆیە، لەسەرەتادا سیخوڕێکیان نارد کە بە پارە و بە لێدوان هانی هۆز و تیرە ئەفغانیەکانی دەدا کە دژی سەردار بوەستنەوە و بەبێباوەڕ لە قەڵەمی دەدا، قۆناغی یەکەمی پلانەکەش سەریگرت و ئەوە بوو کارەکانی ئەم سیخوڕە وای کرد سەردار دوژمنێکی زۆری لە ناوخۆی ئەفغانستاندا بۆ دروست ببێت تا لەکۆتاییدا ناچار بوو رابکات بۆ سیبیریا، نابێت لە بیرمان بچێت کە ئەفغانستان لەو کاتانەدا گرنگی خۆی هەبوو بۆ بەریتانیا لەبەرئەوەی هاوسنوری هیندستان بوو کە لەلایەن بەریتانیاوە داگیر کرابوو. لە قۆناغی دووەمی پلانەکەدا هەواڵگری بەریتانی داوای لە مستەفا کرد کە سەردار لە سیبیریا تیرۆر بکات و بۆ ئەو مەبەستە مستەفا بەرەو سیبیریا کەوتەڕێ بەڵام دوای گەیشتنی بە سیبیریا دەرکەوت کە سەردار بەدەست سیخوڕێکی تر کوژراوە.
مستەفا بەتەواوەتی بووە جێگای متمانەی بەرپرسەکانی لە هەواڵگری بەریتانی، دوای ئەنجامدانی ئەرکێک ئەرکێکی تریان پێدەسپارد، لەم وڵاتی مسوڵمانەوە بۆ ئەو وڵات گەشتی دەکرد و ئەرکەکانی بە لێهاتووی ئەنجامدەدا، تا جارێکیان بەرپرسەکانی لە هەواڵگری بەریتانی بڕیاریاندا رەوانەی تورکیای بکەن بۆ ئەنجامدانی ئەرکێک، چونکە تورکیا وڵاتێکی مسوڵمانە، ئەو ئەرکەش سیخوڕی کردن بوو بەسەر رابەڕی شۆڕشی بزووتنەوەی تورکە لاوەکانی کەمال ئەتاتورک و تابزانن دوای سەرکەوتنە یەک لەدوای یەکەکانی بەنیازی چییە و دەیەوێت چ جۆرە سیاسەتێک لەگەڵ وڵاتانی خۆرئاوا پەیڕەو بکات.

هەروەها، بەریتانیا ترسی هەبوو لە فراوان بوونی دەسەڵاتی ئەتاتورک بەتایبەتی دوای ئەوەی توانیبووی زۆرێک لە ناوچەکانی ژێردەستی خەلافەتی عوسمانی یەک بخاتەوە، بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکەش مستەفا خۆی گەیاندە ئەنقەرە، لەو کاتاندە ئاهەنگیان دەگێڕا بە بۆنەی سەرکەوتن بەسەر یۆناندا، مستەفا خۆی وادەرخست کە دەیەوێت لیژنەیەکی (هیندی-تورکی) دابمەزرێنێت بۆ پتەوکردنی پەیوەندیەکانی نێوانیان و هەروەها لەو قسەو لێدوانانەی کە دەیکرد خۆی وادەردەخست کە دوژمنێکی سەرسەختی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیایە و لەبۆچوون و پێشنیارەکانیدا هێرشی دەکردە سەری (ئەمەش بەپێی ئەو پلانەی کە هەواڵگری بەریتانی بۆی دارشتبوو)، تا لەکۆتاییدا ناوبانگی گەیشتە سەرۆکی تورکیا، ئەتاتورک، بۆیە بانگهێشتی کرد تا چاوی پێی بکەوێت.

کاتێک چاوی پێکەوت و گفتوگۆی لەگەڵدا کرد و پێی وت کە دەتوانێت داوای هەر یارمەتیەک بکات، لە ماوەی گفتوگۆکەیان سەرکۆکی تورکیا بە لێهاتووی خۆی گومانی لەم گەنجە کرد کە ناوی مستەفایە، بۆیە هەردوای گفتوگۆکەیان و پاش رۆیشتنی مستەفا سەرۆکی تورکیا بەرێوەبەری پۆلیسی نهێنی ئەوکاتەی تورکیای بانگ کرد کە ناوی عەدنان بەگ بوو، داوای لێکرد کە چاودێری مستەفای بکرێت، لەو رۆژەوە هەموو نامەکانی مستەفا خرانە ژێر چاودێریەوە. هەواڵگری تورکی لەو کاتانەدە هەرچەند لەسەرەتای دامەزراندنیدا بوو بەڵام توانیبوویان چەند پسپۆرێک بەکرێ بگرن کە یارمەتیان بات لە ئاشکرا کردنی سیخورەکان و پلانەکانیان، ئەوە بوو پسپۆرێکی هەواڵگری کە ناوی عەونی بەگ بوو توانی سێ نامە ئاشکرا بکات کە بە مەرەکەبی نهێنی نووسرابوون و بۆ سیخورێکی تر رەوانە کرابوون لە ئەستەنبوڵ کە ناوی جەمال تۆغلۆ بوو، لەو کاتانەدا مستەفا خەریکی دامەزراندنی تۆرێکی سیخوری بوو بۆ زانینی هەموو شتێک دەربارەی سەرکردەی تورک و ئەفسەر و پاریدەدەرەکانی.

هەواڵگری بەریتانیش لە هەوڵی ئەوەدا بوو بەهەر هۆکارێک بێت ئەتاتورک بخاتەژێر رکێفی خۆیەوە و بە بەکارهێنانی پارە بێت یان هەر هۆکارێکی تر وە ئەگەر رازیش نەبوو ئەوا کاربکات بۆ تیرۆر کردنی بەڵام هەموو ئەم پلانانەی هەواڵگری بەریتانی

سەری نەگرت بەهۆی خۆشەویستی گەلی تورکیا بۆ سەرکردەکەیان. پاش ئەوەی هەواڵگری تورکی توانی نامە سیخوڕیەکانی مستەفا ئاشکرا بکات و هیچ گومانێک نەما لەوەی کە ئەو گەنجە سیخوڕە، بڕیاری دەسگیرکردنی بۆ دەرچوو تا بدرێتە دادگا، ئەوە بوو دادگایەکی تایبەت دامەزرا بۆ دادگایی کردنی کە سەرۆکی دادگا ئیحسان بەگ بوو کە ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکیا بوو، بەڵام لەبەرئەوەی مستەفا بەباشی ڕاهێنرابوو بەرگەی هەموو ئەشکەنجەیەکی گرت و حاشای کرد لەوەی کە ئەو سیخوڕ بێت، سەرەڕای ئەو بەڵگانەی کە سیخوڕبوونی ئەویان دەسەلماند بەردەوام بوو لە نکوڵیکردن تا لە ئەنجامدا دادگا بڕیاریدا دانیشتنەکە دوابخات لەپێناوی لێکۆڵینەوەی زیاتر لەگەڵیدا.

لەو کاتانەدا بەڕێوەبەری پۆلیسی نهێنی تورکیا، عەدنان بەگ، فێڵێکی داهێنا تا لەو ڕێگەیەوە مستەفا ناچار بکات دان بەتاوانەکایدا بنێت لەبەردەم دادگادا و حکومەکەی یەکلایی بکرێتەوە، بۆ ئەنجامدانی فێڵەکەش عەدنان بەگ مۆڵەتی لەو دادگا تایبەتە وەرگرت کە مستەفای دادگایی دەکرد تا وابکات ڕۆژنامەی یەنی گونی بەناوبانگ کە لەئەنقەرە دەردەچێت بۆ تەنها یەک ڕۆژ لە لاپەڕەی یەکەمیدا هەواڵێک بڵاوبکاتەوە کە تێیدا ئامارە بەوە بکات کە تورکیا لەگەڵ بەریتانیادا پەیوەندییە دیبلۆماسیەکانی دەپچڕێنێت، ئەوە بوو هەواڵەکە لەیەکەم لاپەڕەدا بڵاوکرایەوە و کۆپیەکیش لەو ڕۆژنامەیە و چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی تر نێردران بۆ ئەو زیندانەی کە مستەفای تێدا دەستگیرکرابوو، ناوبراو تا ئەو کاتانە ئومێدی وابوو بەریتانیا کارێک بکات بۆ ئازاد کردنی وە باوەڕی وابوو لەبەرئەوەی کە بەریتانیا و تورکیا خاوەنی پەیوەندی دیبلۆماسین ئەوا ئەنجامدانی ئەم کارە مەحاڵ نییە، بەڵام کاتێک هەواڵی پچڕانی پەیوەندیە دیبلۆماسیەکانی نێوان تورکیا و بەریتانیای لە لاپەڕەی یەکەمی ئەو ڕۆژنامە ساختەیەدا خوێندەوە، بۆی دەرکەوت کە ئیتر بەریتانیا هیچ نرخێک بۆ ئەو دانانێت و هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ ئازادکردنی.

بۆیە، لەبەردەم بەڕێوبەری پۆلیسدا دانی بەهەموو شتێکدانا و هەموو بەسەرهاتێکی خۆی لەگەڵ هەواڵگری بەریتانیدا بۆ گێڕایەوە تا کۆتایی، بەم شێوەیە فێڵەکەی

عەدنان بەگ سەری گرت و مستەفا درایە دادگا و بڕیاری لە سێدارەدرانی بۆ دەرکرا، لەبەرئەوەی لەو کاتانەدا کۆماری تورکیا بە قۆناغێکی هەستیاردا تێدەپەڕی و دەبوو ڕێکاری توند بگیرێتەبەر لە پێناو باشترکردنی بوارەکانی ژیان. بەریتانیا بەڕێگەیەکی دیبلۆماسی ناڕەزایی بەرامبەر بڕیاری لەسێدارەدانەکە دەربڕی و رایگەیاند کە مستەفا هاوڵاتییەکی بەریتانییە و هەواڵگری تورکی تووشی کردووە. پەیوەندی تورکیا و بەریتانیا ئاڵۆزی تێکەوت لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری لە سێدارەدانەکە جێبەجێکرا، پاشماوەی کەل و پەلەکانی مستەفا درا بە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە تورکیا، لەنێوان کەل و پەلەکانیدا نامەیەکی شاردراوەی تێدابوو کە بۆ سەرۆکایەتی هەواڵگری بەریتانی نووسرابوو تێیدا وتبووی کە من بە دڵسۆزی خزمەتی ئێوەم کردووە هەتا مردن و ئێوەش بژێوی خێزانەکەم بگرنەئەستۆ. بەم شێوەیە هەواڵگری بەریتانی یەکێک لە سیخوڕە بە توانا و ڕاهێنراوەکانی لەدەستدا بەهۆی وریایی و زیرەکی سەرکردەی تورکی پێشوو ئەتاتورک.

## بوگدان ستاشنکی

گەورە بەرپرسانی سەربازی و هەواڵگری جیهان، دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت بە تازەترین و بەهێزترین دەزگای هەواڵگری دادەنێن لە جیهاندا، کە بە بەکارهێنانی توندوتیژی ناسراوە لە پێگەیاندنی سیخوڕەکانی. بەڵام سەیرنیە کە سەرەڕای بەهێزی هەواڵگری ڕوسی و وردی لە دیاریکردن و مەشقپێکردنی سیخوڕەکانی، هەندێک لە سیخوڕەکانی کە لەژمارەی پەنجەکانی دەست تێپەڕناکەن ڕووخاون یان دەستەوەستان بوون بەهۆی خۆشەویستیەوە، کە پیشەی هەواڵگری لە بنچینەدا قەدەغەی کردووە.

بوگدان ستاشنکی، سیخوڕی ڕوسی، دەرچووی قوتابخانەی سیخوڕی ڕوسیە کە نێردرا بۆ ئەڵمانیا بۆ ئەنجامدانی ئەرکێک، ئەرکەکەش بریتی بوو لە تیرۆرکردنی دوو سەرکردەی ئۆکرانی (پەناهەندە بوون لە ئەڵمانیا) کە بەهۆی پایەی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیان بەناوبانگ بوون، ئەو دوو کەسەش بریتی بوون لە: پرۆفیسۆر لیف ریبیبت، ئەستفان باندێرا کە نووسەرێکی بەناوبانگ بوو. هۆکاری بڕیاری تیرۆرکردنیان

لەلایەن هەواڵگری روسیەوە ئەوە بوو کە هەستابوون بە بڵاوکردنەوەی هەندێک لایەنی تایبەتی ژیانی روسیا لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەڵمانیای رۆژئاوا. ستاشنکی بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەی ناسنامەیەکی ئەڵمانی ساختەی بۆ ئامادەکرا بەناوی یوشی لیمان، ناوبراو گەیشتە بەرلین و وەک بازرگانێک خۆی دەرخست و کەوتە گەڕان بەدوای نێچیرەکانیدا. کاتێک بۆی دەرکەوت کە لە میونخ نیشتەجێن، رووی کردە ئەوێ، ناونیشانی یەکەمیانی زانی ئەویش لیف ریبیت بوو، بە وردی چاودێری جمووجۆڵەکانی دەکرد و رۆژانە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو چاودێری دەکرد و پاشان بەجێی دەهێشت بۆ ئەوەی هەستی پێنەکات.

ناوبراو ژوورێکی بەرامبەر بارەگای ئەو رۆژنامەیەی کە کاری تێدا دەکرد بەکرێگرت بە جۆرێک کە دەیتوانی لەوێوە چاودێری بکات، کاتێک دڵنیابوو لەوەی دەتوانێت کارەکە جێبەجێ بکات بەرپرسەکانی لێئاگادارکردەوە، لە مۆسکۆوە پسپۆڕێک گەیشتە میونیخ ئەو چەکە تایبەتییەی کە تەرخانکرابوو بۆ ئەنجامدانی کردەی تیرۆرکردنەکە گەیاندە ستاشنکی، ئەو چەکەش بریتی بوو لە بۆرییەکی کانزایی کە بەقەد پەنجەیەک ئەستوور بوو درێژیەکەی ١٧سانتیمەتر بوو لە سێ پارچەی تێکهەڵکێش پێکهاتبوو کە لەبەشی دواوە پەلەپیتکەیەکی هەبوو بۆ تەقاندن کە لەکاتی تەقاندنیدا هەندێک باروت دەسووتا و دەبووە هۆی دەرپەڕینی دەرزییەکی ئاسنی ژەهراوی بە ژەهری ئەسیدی برۆسیک کە بێرەنگە و بەهێزترین جۆرەکانی ژەهرە، هەروەها دژە ژەهرێکیشی هەیە کە ئەویش تیوسلفاتی سۆدیۆمە لە شێوەی تۆزێکی سپیدایە.

بوگدان ستاشنکی و چەکە ژەهراوییەکەی بۆ کوشتنی هەردوو خەباتکارە ئۆکرانییەکە.

لەرێکەوتی ۱۲ تشرینی یەکەم ستاشنکی لیف ریبیتی کە بەیانیەکەی دەچوو بۆ نووسینگەکەی کەوتە شوێنی و لەسەر قادرمەی باڵەخانەکە ژەهرەکەی ئاراستەی دەمووچاوی کردوو یەکسەر کووشتی، بەجۆرێک قوربانیەکە نە هاوارێکی کرد و نە تووشی خوێن بەربوون بوو، دوای ئەم رووداوە ستانشکی چەکەکەی لەناوبرد و راستەوخۆ بە شەمەندەفەر بەرەو بەرلین بەرێکەوت. پاش کاتژمێرێک لاشەی قوربانیەکە دۆزرایەوە، پۆلیسی ئەڵمانی دوای پشکنینی پزیشکی لەلایەن پزیشکی دادوەریەوە هۆکاری مردنەکەی بەدڵ وەستان لەقەڵەمدا. پاش ئەوەی دوو ساڵ تێپەڕی بەسەر سەرکەوتنی ستاشنکی لە تیرۆرکردنی لیف ریبییتدا و بەبێ ئەوەی پۆلیسی ئەڵمانی بتوانێت هۆکاری راستەقینەی مردنەکەی دیاری بکات، هەواڵگری روسی بڕیاریدا دووبارە ستاشنکی رەوانە بکاتەوە بۆ جێبەجێکردنی بەشی دووەمی ئەرکەکەی کە بریتیە لە تیرۆرکردنی نێچیری دووەم، ئەستفان باندێرا. ستاشنکی بۆ ئەو مەبەستە گەشتەوە ئەڵمانیا و هەرزوو نێچیرەکەی دۆزیەوە لەبەرئەوەی کە پێشتر ناونیشانەکەی دەزانی.

لە رۆژی ۱۵ تشرینی یەکەمی ۱۹۵۹ چوو بۆ ماڵی باندێرا، لەوێ چاوەڕێی دەکرد تا باندێرا هاتەوە و لە ئۆتومبیلەکەی دابەزی کە کیسەیەک تەماتەی بەدەستەوە بوو،

ستاشنکی یەکسەر چەکە ژەهراویەکەی ئاراستەی دەموچاوی کرد، باندێرا کەوتەسەر زەوی تەماتەکەی دەستی بەو ناوەدا بڵاو بووەوە، پاشان ستاشنکی یەکسەر میونخی بەجێهێشت بەشەمەندەفەر چوو بۆ فرانکفۆرت و لەوێوە بە فڕۆکە چوو بۆ بەرلین و چەکەکەی لە شوێنێکی چۆڵ فڕێدا و خۆی گەیاندەوە مۆسکۆ لەوێ راپۆرتێکی لەبارەی چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەرکەکەی بۆ بەرپرسەکانی بەرزکردەوە لەلایەن سەرۆکی هەواڵگری روسیەوە مەدالیای ئاڵای سوری پێبەخشرا.
تیرۆرکردنی باندێرا پاش دوو کاتژمێر ئاشکرا بوو، ناوبراو گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانە بۆ ئەنجامدانی پشکنین و توێکاری. پزیشکی دادوەری شاری میونخ بۆی دەرکەوت کە بەژەهرێکی تایبەتی کوژراوە کە هیچ شوێنەوارێک جێناهێڵێت.
ستاشنکی لەسەرەتای خۆئامادەکرنیەوە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەی لە ئەڵمانیا، ئافرەتێکی ئەڵمانی ناسی کە ناوی ئەنجی پۆڵ بوو، تەمەنی ٢٣ ساڵ بوو یەکتریان خۆشویست و ئەڵقەی دەزگیرانداریان کردە پەنجەی یەکتر بەبێ ئەوەی کەس ئاگادار بکەنەوە، کاتێ بەرپرسەکانی لەهەواڵگری روسی بەم پەیوەندیەیان زانی بانگیان کرد و داوایان لێکرد لەو ئافرەتە دوور بکەوێتەوە و ئامادەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی نوێ لە جێگایەکی نوێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاریدا ئەنجی بگوازێتەوە و داوایلێکرد کە پێکەوە بگەڕێنەوە بۆ مۆسکۆ ئەویش رازی بوو. لەوێ ستاشنکی هەموو راستیەکانی بۆ خێزانەکەی باسکرد، کاتێک خێزانەکەی بۆی دەرکەوت کە هاوسەرەکەی پیشەی پیاوکوژیە دەستی کرد بە گریان بەڵام لێیخۆشبوو لەبەرئەوەی خۆشی دەویست، داوایلێکرد بگەڕێنەوە بۆ بەرلین. سەرەتا خێزانەکەی گەڕایەوە کە سکی ٤ مانگ بوو لەو ماوەیەدا ستاشنکی خولێکی راهێنانی لە دەزگای هەواڵگری دەبینی (کە قەدەغە بوو جێی بهێڵێت)، ئەنجی لە ئەڵمانیا منداڵێکی بوو ناوینا پیتەر. پاش ماوەیەک منداڵەکە بەنەخۆشی کۆچی دوایی کرد. ئەنجی ستاشنکی بەتەلەفون ئاگادار کردەوە، هەواڵگری روسی رێگەی بە ستاشنکی دا سەفەری ئەڵمانیا بکات بۆ ئەوەی لە مەراسیمی ناشتنی کوڕەکەیدا بەشدار بێت و لەهەمان کاتدا بەوردی چاودێریان دەکرد چونکە ترسی هەر کاردانەوەیەکی لێدەکرا.

لەکاتی سەردانکردنی بۆ نەخۆشخانە بۆ ئیمزاکردنی بەڵگەنامەی مردنی کورەکەی لەگەڵ ژنەکەیدا بڕیاری ڕاکردنیاندا بۆ بەرلینی ڕۆژئاوا، چاودێریکردنەکەی ئەوەندە ورد بوو بەشێوەیەک سێ سەیارە بەدوایەوە بوون، لەڕێکەوتی ١٢ ئابدا پاش ناشتنی کوڕەکەیان کاتێ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە دەرفەتەکەیان قۆستەوە و لەگەڵ چوونە ژوورەوەیان بۆ ماڵەوە یەکسەر لە دەرگای دواوە دەرچوون و دەستیان کرد بە ڕاکردن بەناو زەوییە کشتوکاڵیەکاندا تا گەیشتنە شەقامێکی سەرەکی و سواری تەکسییەک بوون بۆ ناوچەی فالکنزی لە دەوروبەری بەرلین، پاشان تەکسییەکی تر بۆ بەرلینی ڕۆژهەڵات ئینجا بەشەمەندەفەر بۆ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و لەوێ ڕوویان کردە مەڵبەندی هەواڵگری ئەڵمانی لە بۆلاخ نزیک شاری میونخ. ئەگەر ڕاکردنەکەیان یەک ڕۆژ دوابکەوتایە نەیان دەتوانی بگەنە بەرلینی ڕۆژئاوا، ئەوان لەڕێکەوتی ١٢ی ئابی ١٩٦١ ڕایان کرد ١٣ی ئاب دەستکرا بە دروستکردنی دیواری بەرلین، لەوێ خۆی تەسلیمی ئاسایشی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کرد، ستاشنکی درا بە دادگا پاش لێکۆڵینەوە لەلایەن هەواڵگری ئەڵمانیای خۆرئاوا و دادگا بڕیاری ٨ ساڵ بەندکردنی بۆ دەرکرد لەگەڵ کاری قورس، بەڵام لەساڵی ١٩٦٦ لە بەندیخانە ون بوو. هەروەها، خێزانەکەی کە ڕۆژانە سەردانی دەکرد ئەویش ون بوو، بۆ کوێ چوون؟ ئایا لە بەندیخانە ڕایانکرد؟ یان هەواڵگری ئەمریکی فڕاندنی؟ ئایا ئێستا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ژیان بەسەر دەبەن؟ ئایا تیرۆرکرا لەگەڵ خێزانەکەیدا لەلایەن هەواڵگری ڕوسیەوە؟ تا ئێستا کەس نازانێت.

## ریچارد سۆرج (١٨٩٥-١٩٤٤)

ریچارد سۆرج ناوێکە کە رەنگە نادیار و نەناسراو بێت لەلای زۆربەی شارەزایانی بواری هەواڵگری و هەرخوێنەرێکی ئاسایی لە هەرشوێنێکی جیهان، بەڵام لە مێژووی سیخوڕی جیهانیدا جێگایەکی گەورە داگیر دەکات. ئەو تاکە سیخوڕە کە لەمێژوودا رۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە یەکلاکردنەوەی ئەنجامەکانی شەڕی جیهانی دووەم، یان بەمانایەکی وردتر سۆرج سەرەڕای کۆتایی هاتنی چارەنووسی بەو شێوەیە بە سەرکەوتووترین سیخوڕ دادەنرێت کە مێژوو ناسیبێتی هەتا ئەم ساتە.

لە فایلە فەرمییەکاندا، سۆرج واباسکراوە کە خاوەنی کەسێتیەکی لێهاتووە و کەسێکی رۆشنبیر و زیرەکە و توانای تێگەیشتنی زۆرە و خێراگرە، هەرشتێک کە رووبەڕووی ببێتەوە دەتوانێ لێی تێبگات و سرووشتی کەشف بکات بەشێوەیەکی گونجاو مامەڵەی لەگەڵدا بکات ئەمە دەربارەی کەسایەتی سۆرج. بەڵام دەربارەی لێهاتووییەکانی لەبواری کردەیدا خاوەنی توانایەکی بەڕێوەبردنی نایابە بەوردبینی و بەهێزی کەسێتی خۆی. سۆرج سەرکەوتوترین و کاملترین تۆڕی سیخوڕی بەڕێوەبردووە لە ناوخۆی چین و ژاپۆن لەماوەی جەنگی جیهانی دووەم. بەڵام تەنانەت ئەم هۆکاری ناوبانگ و لێهاتوویی ئەو نیە لە جیهانی سیخوڕیدا کە ململانێکان تێیدا بۆ یەک چرکەش ناوەستن لە جەنگ یان لە ئاشتیدا، بەڵام ناوبانگ و لێهاتوویی ئەو کە بە وەسف کردنی بە دەیان کتێب تەواو نابێت دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو تاکە سیخوڕە لە مێژووی سیخوڕیدا کە توانیویەتی کاریگەری لەسەر گۆڕینی ڕێڕەوی گەورەترین جەنگی کاولکەر هەبێت. سۆرج لەشاری باکۆی روسی هاتۆتەدنیاوە لە باوکێکی ئەڵمانی و دایکێکی روسی، ئەو تەمەنی ٣ ساڵ بوو کە خێزانەکەی گەڕانەوە بۆ ئەڵمانیا.

سۆرج کوڕی دووەمی ئەندازیارێکی ئەڵمانیە کە لە کێڵگە نەوتیە شاهانەکاندا کاری کردووە، وە نەوەی ئەدۆڵف سۆرجە کە سکرتێری تایبەتی بیرمەند کارل مارکسە و یەکێکە لەوانەی کە لەسەرەتاوە باوەڕیان بە شیوعیەت هێناوە. سۆرج لەسەرەتادا پەیوەندیکرد بە یەکێک لە تیپە سەربازیەکانی ئەڵمانیا لە شەڕی جیهانی یەکەمدا وەک بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر لەسەر سۆزی ئەو بۆ ئەڵمانیا و ئیمپراتۆر، لە شەڕدا

سێ جار بریندار بوو، دواجار برینەکەی سەخت بوو، بۆیە مۆڵەتی پێدرا بۆ ماوەیەکی زۆر لە جێگادا بمێنێتەوە و لەو ماوەیەدا بیری لە هۆکارە سیاسی و ئابوورییەکانی هەڵگیرساندنی ئەو جۆرە جەنگانە دەکردەوە و لەو ماوەیەدا کاریگەر بوو بە بیری شوعی و بووە کەسێکی مارکسی. قۆناغەکانی خوێندنی بەسەرکەوتووی تەواوکرد و لەکۆتاییدا بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستە سیاسیەکاندا لە زانکۆی هامبۆرگ بەدەستهێنا.

پاشان بەفەرمی پەیوەندی بە پارتی شیوعیەوە کرد. ناوبراو وەک ئەندامێکی دڵسۆزی پارتەکە خزمەتی ڕێبازەکەی دەکرد، ماوەیەک برین پێچ بوو، پاشان بووە ڕۆژنامەنووس و شارەزاییەکی تەواوی لە کاروباری جیهانیدا پەیدا کرد لەڕووی سیاسی، ئابوری و سەربازییەوە و تا ئەو رادەیەی کە هەواڵگری روسی داوایان لێکرد هاوکاریان بکات لە دامەزراندنی نووسینگەی هەواڵگری لە بارەگای حیزبدا لە مۆسکۆ. سۆرج لێهاتووی خۆی دەرخست لەو کارەدا و پاش ئەوەی بوو بە هاوڵاتیەکی روسی بەنهێنی گوازرایەوە بۆ خزمەتکردن لە سەرکردایەتی گشتی سوپای سور. لەکۆتاییدا رەوانەکرا بۆ شەنگەهای تا سەرپەرشتی تۆڕی سیخوڕی بکات و پاشان لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٣٣ بانگهێشت کرایەوە بۆ مۆسکۆ و ئەرکی دامەزراندنی تۆڕێکی سیخوڕی لە تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆن پێسپێردرا کە ئەوەش لەو سەردەمەدا بە کارێکی ئەزموونی دەهاتە ئەژمار لەبەر ئەوەی سۆرج وەک کەسێکی بیانی دەبێتە جێگەی سەرنجی ژاپۆنییەکان.

بەرپرسانی هەواڵگری لە روسیا سۆرج بە شیاوترین کەس دەزانی بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە لەبەرئەوەی دیمەنی خۆی وەک ئەڵمانیەک دەکاتە پەردە و لەتوانایدایە خۆی وەکو ئەڵمانیەکی تەواو نیشان بدات. سەرەتا، پێویست بوو لەسەر سۆرج کە بچێتەوە بۆ ئەڵمانیا و پشتگیری ئەو وڵاتە بەدەست بهێنێت تاوەکو ببێت بە نوێنەریان لە تۆکیۆ، بۆ ئەم مەبەستە هەواڵگری روسی چەند بەڵگەنامەیەکی بۆ دەستەبەرکرد و کە بەهۆیەوە بەئاسانی گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا بێ هیچ گرفتێک. پاش ماوەیەک ژیان لە ئەڵمانیادا توانی پاسپۆرتی ئەڵمانی بەدەستبهێنێت، گرنگترین کار کە سۆرج

بەزیرەکی خۆی ئەنجامیدا بەدەستهێنانی متمانەی بەرپرسانی پارتی نازی بوو کە بۆ ئەو مەبەستە زۆربەی پروپاگەندەکانی ئەو پارتەی خوێندەوە و ووتە بەناوبانگەکانی هیتلەری لەبەرکرد لە کۆڕ و کۆبونەوەکان دەیوتەوە و تەنانەت چەند جارێک کتێبی (خەباتی من)ی هیتلەری خوێندەوە.

هەموو ئەمانەش هۆکار بوو بۆ ئەوەی کە بەرپرسانی پارتی نازی وەک ئەندامێکی دڵسۆزی ئەو پارتە قبووڵی بکەن، دوای ئەوەی کە بەتەواوەتی متمانەی نازییەکانی بەدەستهێنا، بەرلینی بەرەو تۆکیۆ جێهێشت بۆ دەستکردن بە کارە نوێکەی. لە تۆکیۆ، خۆی وەک ئەڵمانیەکی دڵسۆزی وڵاتەکەی دەردەخست و بەو بەڵگەنامانەی کە لەئەڵمانیا بەدەستی هێنابوو توانی خۆی وەک پەیامنێری رۆژنامەی فرانکفۆرت زیتۆج بناسێنێت، کە بەناوبانگترین رۆژنامەی ئەڵمانیا بوو.

لەو کاتەدا، سۆرج تەمەن ٣٧ ساڵ بوو کە باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە تۆکیۆی پایتەختی ژاپۆن پێشوازیان لێکرد. هەر لەسەرەتای ئەم ئەرکەوە، سۆرج توانی لێهاتووی خۆی بسەلمێنێت، هاورێیەکی ژاپۆنی پەیداکرد بە ناوی ئەریتۆی-میتسۆکادۆ کە ئەویش پەیامنێری رۆژنامە بوو. سۆرج داوای لێکرد ژوورێکی لە یەکێک لە هۆتێلەکاندا بۆ بدۆزێتەوە، لەو کاتانەدا هەواڵگری ژاپۆنی بە ووردی چاودێریان دەکرد و سۆرجیش زۆر لێهاتوانە مامەڵەی دەکرد تا ئەو ئاستەی ژاپۆنییەکان بێهیوا بوون لە چاودێریکردنی. ئەو ماوەیەی کە هەواڵگری رووسی بۆ سۆرج-یان دانا بوو تا تۆڕەکەی دابمەزرێنێ تەنها ٢ ساڵ بوو. لەو ماوەیەدا سۆرج تۆڕەکەی دامەزراند بە سێ ئەندام ئەوانیش:

-برنار: ئەڵمانی بوو دەرچووی قوتابخانەی مۆسکۆ بوو بۆ ئامێری بێتەل، ئەرکەکەی دامەزراندن و بەڕێوەبردنی ئامێری بێتەل بوو.

-برانکۆدی فۆکلیچ: یوگسلافی بوو بە رووکەش وەک وێنەگری گۆڤارێکی فەرەنسی کاریدەکرد.

-میاجی جۆکۆتۆ: ژاپۆنی بوو، تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو هونەرمەند بوو، لەتەمەنی ١٦ ساڵیدا چوو بوو بۆ کالیفۆرنیا و لەوێ پەیوەندی کردبوو بە پارتی شیوعیەوە.

لەساڵی ١٩٣٤ دوای ساڵێک لە دامەزراندنی تۆڕەکە، سۆرج هەستا بە دوو کردار کە کاری تۆڕەکەی بەرەو پێشەوە برد ئەوانیش:

-بەکرێگرتنی خانوویەکی دوو نهۆم لەگەڕەکی ئازابۆکۆ ژمارە ٣٠ لە ناگازاکی کە نزیکی بنکەی پۆلیس بوو ئەمەش ببوە پەردەیەک بۆ چالاکیەکانی

-دامەزراندنی ژاپۆنیەکی تر لە تۆڕەکەدا کە ناوی ئۆزاکی هۆکۆسی بوو، شیوعیەکی دڵسۆز بوو بە فەرمی ئەندامی حیزب بوو، کە دواتر ببووە بەسوودترین ئەندامی تۆڕە سیخوڕیەکەی سۆرج.

پاش دامەزراندنی تۆڕە سیخوڕیەکە، سۆرج لەڕێگەی نیۆرکەوە سەفەری مۆسکۆی کرد و لەوێ پاسپۆرتێکی ساختەی پەیداکرد بۆ تا سەفەرکردنی بۆ روسیا لەسەر پاسپۆرتەکەی دیار نەبێت لەگەڵ خۆیدا زۆرترین زانیاری هەڵگرتبوو، بەرپرسانی هەواڵگری روسی پێشوازیەکی گەرمیان لێکرد و دوو بابەتی سەرەکیان لەگەڵدا تاوتوێکرد ئەوانیش:

ئایا ژاپۆن هێرش دەکاتە سەر روسیا؟ ئەگەر هێرش دەکات ئامادەیی ژاپۆن تا چ رادەیەکە بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ دژی روسیا.

پاشان، سۆرج گەڕایەوە بۆ تۆکیۆ و دەستیکردەوە بەچالاکی ناردنی زانیاری، دەرکەوت کە برنار کە بەرپرسی ئامێری بێتەل بوو لە تۆڕەکەی سۆرج کەسێکی شیاونیە بۆ ئەو کارە، لەبەر ئەوەی زۆر دواکەوت لە دامەزراندنی ئامێرەکە و ترسێکی زۆری هەبوو ئەمەش وای لە سۆرج کرد کە بیگۆڕێت بە کەسێکی تر ئەویش ماکس کلاوزۆنی بوو کە فیتەرێکی ئەڵمانی بوو.

تۆڕەکە لەو ماوەیەدا چالاکیەکانی خۆی بەباشی بەڕێوە دەبرد، یەکەم تاقیکردنەوەی تۆڕەکە لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٦ دا بوو کاتێک ئاژاوەیەکی سەیر روویدا لە تۆکیۆ کە تێیدا ٢٤٠٠ سەرباز بەسەرکردایەتی هەندێ لەئەفسەرانی سوپا دەستیان گرت بەسەر چەند بینایەکی حکومەتدا، و کەوتنە تیرۆرکردنی گەورەبەرپرسان لە ماڵەکانی خۆیاندا. ئەم ئاژاوەیە گرنگی خۆی هەبوو، خێرا سۆرج داوای لە تۆڕە سیخوڕییەکانی خۆی کرد کە یارمەتی بدەن لەزانینی هۆکاری روودانی ئەم ئاژاوەیە. سۆرج لەو کاتەدا

بە زیرەکی خۆی سەردانی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیای کرد (وەک پێشتر ووتمان توانیبوی متمانەی ئەوان بە دەستبهێنێت)، و چاوی کەوت بە باڵیۆز هربرت ڤۆن) لەگەڵ پاشکۆی سەربازی و پاشکۆی دەریایی باڵیۆزخانە، پێشنیاری کرد کە هەرسێکیان لەلایەن خۆیەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەن لەسەر هۆکاری ڕوودانی ئەو ئاژاوەیە و لەکۆتاییدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان بکەن بەیەک. سۆرج هێندە ڕێزی پەیدا کردبوو کە باڵیۆزی ئەڵمانیا هەرزوو پێشنیارەکەی پەسەند کرد، ئەمەش وایکرد کە سۆرج لێکۆڵینەوەکانی ئەوان ببینێت و زانیاری گرنگی چنگ بکەوێت کە پاشکۆی سەربازی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە تۆکیۆ دەستی کەوتبوو دەربارەی هێزی سەربازی ژاپۆنی ئەو زانیاریانە بریتیبوو لە چەندین کتێب و ڕاپۆرت و بڵاوکراوە کە ئەوەندە بەنرخ بوو سۆرج دەرگای نوسینگەکەی لەسەر خۆی داخست و بەکامێرایەکی بچووک وێنەی گرت تا بینێرێ بۆ مۆسکۆ.

سۆرج لە یەکەم تاقیکردنەوەیدا سەرکەوتووبوو وەک سیخوڕێکی ڕوسی لە تۆکیۆ، لێهاتوویەکی کەم وێنەی پیشاندا لە کۆکردنەوەی زانیاری و قۆستنەوەی دەرفەت و ئاراستەکردنی بۆ بەرژەوەندی خۆی.

کاتێک جەنەڕاڵ لیۆشکۆفی ڕوسی سووپای ڕوسی بەجێهێشت و ڕایکرد بۆ ژاپۆن بەهۆی ئەو زانیاریە زۆرەی کە لەلای بوو ڕەوانە تۆکیۆ کرا بۆ لێکۆڵینەوە لەو کاتەدا کە ئەڵمانیا کە هاوپەیمانی ژاپۆن بوو پێشنیاری کرد کە شاندێکی ئەڵمانی بنێرن بۆ تۆکیۆ بۆ لێکۆڵینەوە لەو زانیاریانەی کە ئەو جەنەراڵە بە ژاپۆنییەکانی داوە دەربارەی توانا و هێزی سوپای ڕوسیا، ئەوە بوو شاندەکە زانیارییەکانی لە لەو جەنەراڵە هەڵهاتووەی سوپای ڕوسیا وەرگرتبوو لەڕاپۆرتێکدا کۆکردەوە و کۆپیەکی پێشکەشی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە تۆکیۆ کرد، سۆرجیش بەهۆی ئەو متمانەیەی لەلای بەرپرسانی ئەو باڵیۆزخانەیە هەیبوو توانی وێنەیەک لەو ڕاپۆرتەی دەستکەوێت و هەرزوو بە بێتەل ڕەوانەی مۆسکۆی کرد، لەو ڕاپۆرتەدا هاتبوو کە لیۆشکۆف جفرەی سوپای ڕوسیای بۆ ژاپۆنییەکان ئاشکرا کردووە، ئەمەش وای کرد هەرزوو ڕوسیەکان جفرەکەیان بگۆڕن.

لەسەرەتای ئۆکتۆبەری ۱۹۳۹ دەزگای ئاسایشی ژاپۆنی کەوتە چاودێریکردنی سۆرج ئەمەش لەبەر ئەم هۆکارانە :

- کەسێکی بیانیە (لە ژاپۆن چاودێری بیانیەکان دەکرێت)
-رۆژنامەنووسە.
-هاموشۆی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا دەکات.

ئاسایشی ژاپۆنی کارمەندێکی ۲۸ساڵی کرد بە چاودێر بەسەریەوە کە بەبێدەنگی چاودێری سۆرجی دەکرد هەڵسوکەوتەکانی دەنووسی بە شێوەیەک کە سۆرج هەستی پێنەکات، رۆژانە تەنها یەک کاتژمێر چاودێری دەکرد. لەو کاتانەدا ئەڵمانیا پۆڵەندای داگیرکردبوو، بەپێی رێککەوتنێک لەگەڵ روسیادا دابەشیان کردبوو. هەروەها، ئەڵمانیا پاش داگیرکردنی پۆڵەندا پلانی هێرش کردنە سەر روسیای هەبوو لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

-داگیرکردنی کێڵگە گەنمەکانی روسیا
-دەستکەوتنی یەک ملیۆن دیل بۆ کارکردن لە بواری پیشەسازی و کشتوکاڵ لە ئەڵمانیا
-نەهێشتنی مەترسی سنوری رۆژهەڵاتی ئەڵمانیا. ئەوەی لەسەر هەواڵگری روسیا پێویست بوو کە بزانێت ئایا ئەڵمانیا بەراستی پلانی هێرشکرنە سەر روسیای هەی؟ ئەگەر ئەڵمانیا هێرش دەکات ئەوا چ بەروارێک بۆ ئەو هێرشە دیاریکراوە؟

سۆرجی بەتوانا بەهۆی زیرەکی خۆیەوە لەگفتوگۆیەکی ئاسایدا لەگەڵ پاشکۆی سەربازی باڵیۆزخانەی ئەڵمانی لە تۆکیۆ توانی بەرواری هێرشی ئەڵمانی بۆسەر روسیا بزانێت، بۆی دەرکەوت کە ئەو هێرشە لەلایەن ئەڵمانەکانەوە ئامادەکاری تەواوی بۆ کراوە و نزیکە ۱۸۰ تیپی ئەڵمانی لەسەر سنوری روسیا کۆکراونەتەوە بەپاڵپشتی تانک و زرێپۆش. بەرواری هێرشەکەش ۲ی حەزیران بوو.

ئەم زانیاریانەش گرنگی خۆی هەبوو لەبەر ئەوەی وەک ووتمان پێشتر ڕێکەوتنێکی سەربازی لەنێوان روسیا و ئەڵمانیادا هەبوو، سۆرج هەرزوو ئەو زانیاریانەی لەڕێگەی ماکس کلاوزین کە بەرپرسی بێتەلی تۆڕە سیخوڕیەکە بوو رەوانەی مۆسکۆ کرد بەلاَم بەرپرسانی مۆسکۆ گومانیان لەڕاستی زانیارییەکان هەبوو، ئەمەش سۆرجی زۆر تووڕە کرد، کە ئەڵمانیا لەبەرواری دیاریکراودا هێرشی بۆسەر روسیا دەستپێکرد ئەوکاتە رووسەکان راستی زانیارییەکانی سۆرجیان بۆ دەرکەوت. پاش هێرشی ئەڵمانیا روسەکان دەیانویست نیازی ژاپۆنییەکان بزانن کە ئایا نیازی هێرشکردنە سەر روسیایان هەیە لە باکورەوە؟ لەبەرئەوەی ژاپۆن و ئەڵمانیا هاوپەیمان بوون، سۆرج ئەو پرسیارەی لە باڵیۆزخانەی ژاپۆنی کرد و بۆی دەرکەوت کە ژاپۆن قورسایی هێزەکانی خستوەتەسەر بەرەی خۆرئاوا و ئامانجی یەکەمی بەرەنگار بوونەوەی ئەمریکایە و ئامادە نییە هێرش بکاتە سەر باکوری روسیا، بێگومان ئەم زانیاریانەش گرنگی سەربازی خۆیان هەبوو لەبەرئەوەی سەرکردایەتی سوپای سوور هێزەکانی وڵاتەکەی لەباکوری روسیا کشاندەوە و تەرخانیکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا لە خۆرهەڵات تا لەکۆتاییدا توانی ئەو دوژمنە لە خاکی وڵاتەکەی وەدەرنێ. ئەو کەسەی کە پۆلیسی ژاپۆنی ئاراستەی تۆڕەکە کرد بێ ئەوەی بزانێ کەسێک بوو بە ناوی ئیتۆ رتیسۆ کە لەژاپۆن بەتۆمەتی شیوعیەت گیرابوو، کاتێ لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرا، پرسیاری لێکرا کە ئایا کەس دەناسێ لە شیوعیە ژاپۆنییەکان بەتایبەتی ئەوانەی کە بەم دواییانە لە ئەمریکا گەڕاونەتەوە؟ ئیتۆ لە وەلاَمی ئەو پرسیارەدا وتی کە پووری خزمەتی ماڵێک دەکات کە خاوەنەکەی ئافرەتێکە چەند ساڵێکە لە ئەمریکا گەڕاوەتەوە و شانازی بەوەوە دەکەن کە شیوعیە، پۆلیسی ژاپۆنی سەرەتا کەوتنە چاودێری کردنی ئەو ماڵە، ئەو ماڵەش ماڵی خاتو کیتابایاش بوو کە هاوڕێی میاجی ئەندامی سێیەمی تۆڕەکەی سۆرج بوو. لەکاتی لێکۆڵینەوەدا دانی بەوەدانا کە ئەندامی پارتی شیوعی بوون لە ئەمریکا، بەم شێوەیە میاجی دەستگیرکراو چەند بەڵگەنامەیەکیان لەماڵەکەیدا دۆزیەوە دەربارەی یەدەگی نەوتی ژاپۆن کە ئەو زانیاریانەش زۆر نهێنی بوون. دوای لێکۆڵینەوە میاجی دانی بە هەموو شتێکدانا و

سەرجەم ئەندامانی تۆڕەکە دەستگیرکران و لەساڵی ١٩٤٢ دادگایکران و سۆرجیش بە لەسێدارەدان سزادرا و لەماوەی دەستگیرکردنیشی بەرپرسانی روسیا نکوڵیان لێکرد و ئامادەنەبوون هاوکاریبکەن. پاش تێپەڕینی بیست ساڵ بەسەر لەسێدارەدانی سۆرج روسیا دانییپێدانا و شەقامێکی سەرەکی لە باکۆ زێدی لەدایک بوونی بەناوەوەنا، هەروەها ناوی کەشتیەکی بارهەڵگری بەناوی ئەوەوە نا و دراوێکی دەرکرد کە وێنەی ئەوی لەسەر بوو وەک پاڵەوانێکی روسی.

## کیم فیلبی

ئەگەر بگەڕێین بەدوای ناوبانگی دیارترین سیخوڕ لە جیهاندا، دەبینین سیخوڕی بەریتانی کیم فیلبی بە ناوبانگترین سیخوڕە پەردەی لەسەر لادرابێ لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە. ئەو سیخوڕە ماوەی ٣٠ ساڵ بەریتانیای هەڵخەڵەتاند و کاری بۆ یەکێتی سۆڤیەت دەکرد تا لەکۆتاییدا هەواڵگری روسی بڕیاری خانەنشینکردنیدا. لەبەر ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی یەکێتی سۆڤیەتی کردبوو، بانگێشتکرا بۆ روسیا لەرێگەی بەیرووتەوە و ئێستا لە روسیا بە کامەرانی ژیان بەسەر دەبا.

ناوبراو لەساڵی ١٩١٢ لە شاری ئەمبالای هیندستان لەدایک بووە، کوڕە تاقانەی هاری سانت جۆن برد فیلبی بوو کە فەرمانبەر بوو لە حکومەتی هیندی، پاشان فیلبی گوازرایەوە بۆ ئێراق کە ئەو کاتە لەلایەن بەریتانیاوە داگیرکرابوو، کرا بە راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ. پاشان بوو بە نوێنەری حکومەتی بەریتانی لە رۆژهەڵاتی ئەردەن و لەکۆتاییدا بوو بە راوێژکاری پاشای سعودیە. باوکی کیم ناڕازی بوو لە سیاسەتی بەریتانیا لە خۆرهەڵات و هەر ئەو ناڕازییە بە میرات بۆ کوڕەکەی مایەوە.

فیلبی چووە کۆلێژی ترینیتی لە زانکۆی کامبریدج، لەو رۆژانەدا بیری سۆسیالستی لەناو رۆشنبیراندا باو بوو، چوونە ریزی پارتی شیوعی بەڵگەی ئازایەتی و بەجەرگی بوو. هەر لەم رێگایەوە فیلبی پەیوەندی کرد بەڕیزەکانی پارتی شیوعیەوە و بەنهێنی کاری بۆ دەکردن، بە تەواوی تێکەڵی بیروباوەڕی مارکسیەت و شیوعیەت بوو. لە هاوینی ١٩٣٤دا لە ڤییەنا بڕیاریدا ببێتە سەربازێک لە ململانێی جیهانی دژبە فاشیەت

و کەوتەناو گێژاوی سیاسەتەوە. لە سەرەتادا ناوی خۆی لە لیستی شۆڕشگێڕانی نیشتیراکی تۆمار کرد کە شیوعیە نەمساویەکان یارمەتی و پشتگیریان دەکرد، وەکو پەیامنێرێک لە نێوان چەند یەکەیەکی دژ بە حکومەت دەستی بەکارکردن کرد، لەو کاتانەدا کچێکی نەمساوی شیوعی ناسی و یەکیان خۆشویست ئەویش ئەلیس فریدمان بوو کە بە لیتر فریدمان ناسرا، کە ئەویش بە تەواوی تێکەڵی سیاسەت ببوو. کاتێک حکومەت دژی شیوعیەکان وەستایەوە و خانوەکانی کرێکارانی بۆردومان کرد و سەدانیان لێکوژرا، فیلبی ئەم کوشتارەی بەچاوی خۆی بینی و بوو بە رادیکاڵێکی توندڕەو. وارێککەوت کە دەزگای هەواڵگری روسی لەو کاتانەدا دوو بەکرێگیراوی هەبوو کە سیخوڕی بۆ دەکردن، یەکێکیان تیودور مالی هەنگاری بوو کە لە پێشتر قەشە بوو دواتر ببوە کۆمۆنیست، لەگەڵ جابور بینتز ئەمیش هەر کۆمەنیست بوو، هەردووکیان باوەڕیان وابوو کە فیلبی کەسێکی گونجاوە بۆ سیخوڕی و ئامادەیە لەپێناو بیروباوەڕی شیوعیەتدا خۆی بەخت بکات.

لەکۆتاییدا توانیان بیهێننە ناو ریزەکانی خۆیانەوە بەڵام داوایان لێکرد کە هاوسۆزی خۆی بۆ بیروباوەڕی شیوعیەت بشارێتەوە و وەک نهێنییەک بیپارێزێت تا بتوانێت دزە بکاتە ریزەکانی حکومەتی بەریتانیا هەوڵ بدات لەناو حکومەتی بەریتانیادا جێگایەک بۆ خۆی دابین بکات وە باشتریش دەبوو کە ئەگەر هەوڵ بدات لە نێو هەواڵگری بەریتانیدا پلەیەک بەدەست بهێنێت. بۆ ئەم مەبەستە، فیلبی گەڕایەوە بۆ بەریتانیا و واخۆی دەردەخست کە هیچ پەیوەندیەکی بە کۆمۆنیست و بیری مارکسیەتەوە نییە، ئەم خۆ دەرخستنەش گرنگی خۆی هەبوو تا وای لێبکات جێگای خۆی لەنێو حکومەتی بەریتانیادا بکاتەوە، تا لەکۆتایدا بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی ئەنگلۆ-ئەڵمانی کە کۆمەڵەیەکی راستڕەو بوو. ئەم کۆمەڵەیە بۆ ئەوە کاریان دەکرد کە هاوپەیمانییەک لەنێوان بەریتانیا و ئەڵمانیای نازیدا دروست بکەن، لەوکاتاندا بەتەواوەتی پەیوەندی خۆی بە هاوڕێ کۆمۆنیستەکانیەوە بڕیبوو تا سەرئەنجام بووە کەسێکی جێگەی متمانەی بەریتانیا و لەساڵی ١٩٣٦ وەک پەیامنێری رۆژنامەی لەندەن تایمز دەستبەکاربوو، ناردیان بۆ ئیسپانیا تا دەنگوباسی شەڕی ناوخۆی ئەوێ

بۆ رۆژنامەکە بنێرێ. لەوێ چەند راپۆرتێکی بۆ رۆژنامەکە نووسی کە تیایدا پشتگیری جەنراڵ فرانکۆی دەکرد، ئەمەش وایکرد کە ناوبانگی وەک کەسێکی راستڕەو و لە هەمان کاتدا توندڕەو ناوبانگ دەربکات، بەڵام ئەو بەنهێنی پەیوەندی کردبوو بە هەواڵگری روسیەوە و هەر زانیاریەکی لەسەر شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا بەدەست بهێنایە رەوانەی هەواڵگری روسی دەکرد.

کیم فیلبی

رۆژێکیان تووشی پێشهاتێک هات کە هێندەی نەمابوو ژیانی سیخوڕی کۆتایی پێبێت، کاتێک سەربازە ئیسپانیەکان گومانیان لێکرد و بە ماوەیەک بەندیان کرد تا هەندێک پرسیاری لێبکەن. لەو کاتەدا هەندێک بەڵگەی پێبوو کە جێگای تۆمەتبارکردنی بوو، بەڵام بە دزیەوە ئەو بەڵگەنامانەی قووتدا و رزگاری بوو. لەساڵی ١٩٣٩ کە هێشتا پەیامنێری رۆژنامەی لەندەن تایمز بوو، ئەو دەرفەتەی بۆ رەخسا کە تێکەڵی یاری موخابەراتی ببێت ئەویش لەڕێگەی هاوڕێیەکیەوە کە هەروەکو ئەو بەکرێگیراوی هەواڵگری روسی بوو بەڵام بەنهێنی دزەی کردبووە ناو ریزەکانی هەواڵگری بەریتانی، ناوی ئەو هاوڕێیە گای بیرجیس بوو، پاش ئەوەی گای توانی فیلبی بهێنێتە ریزەکانی موخابەراتی بەریتانیەوە، لەسەرەتادا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرد و هەروەها

لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیدا کرد تا دڵنیابن لەوەی هیچ سۆزێکی بۆ بیری شیوعیەت نییە، تا لەکۆتاییدا وەک کارمەندێکی هەواڵگری بەریتانی قبوڵکرا و سەرئەنجام ئاواتەکەی هاتەدی و لە بەشی دژەهەواڵگری وڵاتە بیانیەکان دامەزرا.

ئەمە ئەو جێگایە بوو کە خەونی پێوە دەبینی تا لەرێگەیەوە زۆرترین زانیاری هەواڵگری بەدەست بێنێت و بەنهێنی پێشکەشی موخابەراتی روسی بکات. فیلبی هەرزوو لەنێو هەواڵگری بەریتانیدا جێی خۆی کردەوە و بووە کەسێکی خۆشەویست، توانی بلیمەتی خۆی لە بواری کۆکردنەوەی زانیاریدا بسەلمێنێت و زۆرکەس پێشبینی ئەوەی دەکرد کە لەداهاتوو ببێت بە سەرۆکی هەواڵگری بەریتانی و کەسیش بە خەیاڵیدا نەهات کە ئەو بە نهێنی کار بۆ هەواڵگری روسی دەکات. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤ دەرفەتێکی گرنگی بۆ رەخسا، ئەویش ئەوە بوو کە سەرۆکایەتی بەشی نۆهەمی وەکالەتی موخابەراتی بەریتانیایان پێ سپارد، کە ئەم بەشەش کاری ئەوە بوو دژی چالاکییە سیخوڕیەکانی روسیا بوەستێتەوە کە بۆ ماوەیەک ئەم بەشە چالاکیەکانی راگیرا بوو بەڵام دوای جەنگی جیهانی دووەم دووبارە زیندو کرایەوە. فیلبی کرا بەسەرۆکی ئەو بەشە و نزیکەی ١٠٠ سیخوڕیان خستە بەردەستی، هەواڵگری رووسەکان لەمەدا قازانجێکی زۆریان کرد، تەنها بەڵگەنامە نهێنیەکانی رووسەکان دەتوانن قەبارەی ئەو خیانەتە دیاری بکەن کە فیلبی کردوویەتی لە وڵاتەکەی خۆی و چ خزمەتێکی پێشکەشی رووسە شیوعیەکان کردووە.

بەدڵنیاییەوە ئەو خزمەتەی کە فیلبی پێشکەشی رووسەکانی کردووە بە پەنجەی دەست ناژمێردرێن. یەکێک لەو خزمەتانە ئاشکرا کردنی ناوی هەموو سیخوڕەکانی بەریتانیا بوو کە لە ئەورووپای رۆژهەڵات دژی روسیا چالاکیان ئەنجام دەدا. لەساڵی ١٩٤٥ فیلبی رووبەڕووی کێشەیەک بووەوە کە زۆری نەمابوو ببێتە هۆی ئەوەی لە کاری هەواڵگری دوور بخرێتەوە، دوو پیاوی هەواڵگری روسی پەنایان هێنایە رۆژئاوا، یەکێکیان ناوی ئیگور جوزینکۆ بوو کە نووسەری شفرە بوو لە باڵیۆزخانەی روسیا لە کەنەدا و لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک بروسکەی زۆر نهێنی هێنابوو، ئەوی تریان ناوی کونستاتین فولوف بوو کە ئەفسەرێکی گەورەی هەواڵگری روسی بوو لە ئەستەمبول،

کە پەنای بردبووە بەر باڵیۆزخانەی بەریتانیا و داوای پەناهەندەیی سیاسی کردبوو. هەروەها ئەوەی پێراگەیاندبوون کە هەواڵگری روسی توانیویەتی دزە بکاتەنێو هەواڵگری بەریتانییەوە و بەڵام بەتەواوەتی نەیدەزانی کە ئەو بەکرێگیراوەی هەواڵگری روسی کێیە کە دزەی کردووەتە ناو هەواڵگری بەریتانییەوە.

هەڵهاتنی ئەو دوو کارمەندەی هەواڵگری روسی و پەنا بردنیان بۆ بەریتانیا وای لە فیلبی کرد لەئاشکرا بوون بترسێت و داوای یارمەتی و ئامۆژگاری لە یوری مردین کرد، کە بریکاری هەواڵگری روسی بوو لە لەندەن و سەرپەرشتی تۆڕێکی سیخوڕی دەکرد کە فیلبی یەکێک بوو لە ئەندامانی ئەو تۆڕە. مردین فیلبی ئاگادار کردەوە کە ئەو ناتوانێت هیچ کارێک بکات دژیان بۆیە پێویست لەسەر هەواڵگری روسی کە هەریەکێک لەو دوو هەڵهاتووە لەناوبەرێت، بۆیە کونستاتین فولوفیان دەستنیشان کرد کە دەبێ لەناو ببرێت، فیلبی چوونکە سەرۆکی بەشی دژە سیخوڕی بوو دەبوو خۆی چاوپێکەوتن لەگەڵ فولوفدا بکات، لێی بپرسێت کێن ئەوانەی دزەیان کردووەتە ناو هەواڵگری بەریتانییە و بە نهێنی زانیاری دەدەن بە رووسەکان؟

بۆ ئەم مەبەستە، فیلبی گەشتی کرد بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ لەهەمان کاتدا هەواڵگری روسی پلانی لە ناوبردنی فولوفیان داڕشتبوو، تا ئێستا نەزانراوە کە فولوف چی لێکراوە بەڵام دەنگۆیەک هەیە دەڵێت لە رۆژی دیارنەمانی لاشەی کەسێک لە نزیک فڕۆکەخانەی ئەستەمبوڵ دۆزراوەتەوە کە هەموو گیانی بە لەفاف پێچراوە. سەبارەت بە هەڵهاتووی دووەمی، ئیگور جوزینکۆ، دەرکەوت کە زانیاریەکی ئەوتۆی لانییە دەربارەی دزەکردنی هەواڵگری روسی بۆناو هەواڵگری بەریتانی. لە کۆتاییدا فیلبی گەڕایەوە لەندەن و دەنگوباس لە نێو دەزگای هەواڵگری بەریتانی بڵاو بووەوە کە فیلبی پلەی بەرز دەکرێتەوە. لەکۆتاییدا کردیان بە سەرۆکی وێستگەی هەواڵگری بەریتانی لە واشنتۆن، لەژێر پەردەی سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە واشنتۆن دەست بەکاربوو. یەکێ لەو کارەی کە کەوتبووە سەرشانی ئەوە بوو کە وەک ئەڵقەی پەیوەندی نێوان هەواڵگری بەریتانی و ئەمریکی کاربکات، ئەمەش دەرفەتێکی زێڕینی تربوو بۆ فیلبی تا رووسەکان لە پەیوەندی و

ئاڵوگۆڕی زانیاری نێوان هەواڵگری بەریتانی و ئەمریکی ئاگادار بکاتەوە. فیلبی لە واشنتۆن دەستی بەکار کرد، هەر زوو توانی شفرەی ئەمریکییەکان بەدەست بهێنێت و کە بۆ پەیوەندی بێتەلی نێوان لەندەن و نیویۆرک بەکاردەهێنرا، فیلبی هەر زوو رووسەکانی لەم نهێنییە ئاگادار کردەوە و ئەوانیش توانیان گوێ لە پەیوەندییە بێتەلەکانی هەردوولا بگرن. واشنتۆن و لەندەن هەستیان بەوە کرد کە گۆڕانێک لە خەستی پەیوەندی بێتەلەکانیان روویداوە گومانەکەشیان لەجێگەی خۆیدا بوو.

سەرەتای ئاشکرا بوونی فیلبی بەوە دەستی پێکرد کە هەواڵگری ئەمریکی توانی کتێبێکی شیفرەی رووسەکان بەدەست بهێنێت و بەم رێگایە توانیان نامە شفرەدارەکانی رووسەکان بخوێننەوە لەم رێگەیەوە بۆیان دەرکەوت کە ژمارەی سیخوڕەکانی هەواڵگری روسی لە ئەمریکا و بەریتانیا بە سەدان سیخوڕ بوو، بەڵام ئەم سیخوڕانەش ناوی خوازراویان هەبوو کە ئاشکرا کردنیان ئاسان نەبوو، بەڵام لەئەنجامی بەراوردکردنی چەند نامەیەکدا توانیان ناسنامەی چەند سیخوڕێکی دیار ئاشکرا بکەن بە تایبەتی ئەوانەی خەریکی پێدانی زانیاری ئەتۆمی بوو بە رووسەکان کە لەنێویانداکلوز فوشزی تێدابوو کە دەستگیریان کرد، ئەمەش مەترسی خستەدڵی فیلبییەوە. کاتێ ئەمریکی و بەریتانییەکان بۆیان دەرکەوت کە سیخوڕێکی روسیا هەیە کە پایەیەکی بەرزی هەیە و ناوە نهێنییەکەی هومرە، کە زانیاری گرنگ و نهێنی دەگەیەنێتە رووسەکان، گومانەکان لەسەر فیلبی زیادی کرد بەڵام زانیاریە بەدەست هاتووەکان بەس نەبوون بۆ تۆمەتباکردنی. تا لەکۆتاییدا بەریتانیا بڕیاریدا بیگەڕێنێتەوە و ئەو پۆستەی لێوەربگرێتەوە هەرچەندە گومانەکان لەسەری بەردەوام بوون. ساڵی ١٩٦١ بەتەواوی فیلبی ئاشکرا بوو کاتێک کە سیخوڕێک بە ناوی جۆرج بلێک کە سیخوڕی رووسەکان بوو گیرا و هەموو شتێکی درکاند و بۆ بەریتانییەکانی ئاشکرا کرد کە فیلبی سیخوڕی بۆ رووسەکان دەکات لەو کاتانەدا فیلبی بە ئەرکێک لە لوبنان بوو لەلایەن بەکرێگیراوێکی هەواڵگری روسیەوە ئاگادار کرایەوە کە هەڵبێت بۆ روسیا، لە ٢٣ی مایسی ١٩٦٣ فیلبی خۆی کرد بەناو قەرەباڵغی ئاهەنگێکدا و

لەوێ خۆی شاردەوە بە یەکجاری دیار نەما. دوای شەش هەفتە مۆسکۆ رایگەیاند کە کیم فیلبی مافی پەنابەرێتی سیاسی پێدراوە
پەیوەندی هەواڵگری روسی لەگەڵ فیلبی تاساڵی ١٩٨٠ بەردەوام بوو، بەڵام لەکۆتاییدا هەواڵی هەڵهاتنی بۆ روسیا بوو بە مانشێتی زۆربەری رۆژنامە جیهانیەکان و رۆژنامەکان چیرۆکی خەیاڵی و سەیر و سەمەرەیان لە بارەیەوە دەگێڕایەوە. لە ساتەوەختی هەڵهاتنیەوە تەنانەت تا کۆتایی تەمەنی بەردەوام بوو لە خزمەتکردنی هەواڵگری روسی، هەموو بەیانییەک نوێنەری هەواڵگری رۆژنامە بەریتانی و ئەمریکییەکانی بۆ دەبات و ئەویش پاش خوێندنەوەی راپۆرتێکیان لەسەر دەنوسێت و دەیان نێرێت بۆ هەواڵگری. بەم دواییە ئافرەتێکی روسی هێنا کە ٢٠ ساڵ لەخۆی بچووکتر بوو هەرچەندە پێشتر سێ ژنی تەلاقداوە ئەمەش وەک خەلاتێکی هەواڵگری روسی بەرامبەر ئەو خزمەتانەی پێشکەشی کردووە، لە کۆتایشدا تووشی حەساسیەتی پێست هات تا لەساڵی ١٩٨٨ دا کۆچی دوایی کرد. حکومەتی شیوعی روسیاش رێزێکی تایبەتی لێنا وەک سیخوڕێکی گەورە سیاسەتمەدارانی روسیا لە ناشتنەکەیدا بەشدار بوون و پلەی جەنەراڵیان پێبەخشی لەسەر وەسێتی خۆی لە گۆڕستانێکی روسی ناشتیان[i]

### حەسەن عەبدولجیهاد (١٩٧٦- ...)

حەسەن لەئەسڵدا هاوڵاتیەکی ئەمریکییە، لەژێر ناوی پۆل هۆل لەدایک بووە. ناوبراو لە حەوتی ئازاری ٢٠٠٧ بەتۆمەتی پێدانی ئامێری تایبەت و زانیاری بە چەند کەسێک بۆ کووشتنی هاوڵاتیان ئەمریکی دەستگیرکرا. ئەوکات ناوبراو تەمەنی سی و دوو ساڵ بوو، وە لە دادگا هیچی لەسەر ساغ نەبووەوە. لە شەشی ئازاری ٢٠٠٨، ناوبراو دووبارە دادگایی کرا و ئەمجارە، دوای بەدەستهێنانی بەڵگە، بیست و پێنج ساڵ زیندانی بۆ برایەوە، کە زۆرترین ماوەی زیندانیکردن بوو. ناوبراو لە تەمەنی نۆزدە

---

[i] Knightley, P., ١٩٩٠. *The master spy: the story of Kim Philby*. Vintage.
-Page, B., Leitch, D. and Knightley, P., ١٩٧٧. *Philby: The Spy Who Betrayed a Generation*. Sphere.

ساڵی بوو بە موسڵمان. لەساڵی ۱۹۹۸ بۆ ۲۰۰۲، ناوبراو لە کەشتیگەلی ئەمریکی خزمەتی سەربازیی دەکرد. حەسەن بەهۆی لێهاتوویی لەکاردا ماوەیەک بەرلە کۆتایی هاتنی خزمەتی سەربازیی مۆڵەتی پێدرا، واتە بەرلەوەی بە تۆمەتی سیخوڕی تۆمەتبار بکرێت.

حەسەن دەستی کرد بە پێدانی زانیاری زانیاری گرنگ بە رێکخراوی قاعیدەی تیرۆرستی و جیهادیی ئیسلامییەکانی تر لەساڵی ۲۰۰۰. ئەو پەیوەندی بە بابەر ئەحمەدەوە دەکرد لە لەندەن وە دەستی هەبوو لە بەڕێوەبردنی وێبسایتێک بۆ پروپاگەندەی ئەو گروپانە وەک دەزگای عەزام. حەسەن پەیوەندی بە دەزگاکە کرد و داوای چەند ڤیدیۆیەکی کرد هانی جیهادی توندئاژوویان دەدا. هەروەها بەردەوام بەدوای ئەو کەسانەدا دەگەڕا کە هەمان ئیمان و پاڵنەری ناوبراویان هەیە بۆ ئەنجامدانی کردەی تیرۆرستی. لە ئاڵوگۆڕی ئیمەیلەکانیدا، حەسەن پەسنی ئەو کەسانەی کردبوو کە هێرشیان کردبووە سەر (کۆڵ) وە چەند زانیارییەکی گرنگی کەشتیگەلی بە دەزگاکە بەخشیبوو. لە کانوونی یەکەمی ۲۰۰۲دا هێرشێکی چڕوپڕ کرایەسەر ماڵەکەی لە لەندەن وە تیایدا چەندین دیسکی کۆمپیوتەریان دۆزییەوە کە چەندین زانیاری نهێنیی لەخۆگرتبوو سەبارەت بە جووڵەکانی گروپی جەنگی کەشتیگەلیی کە ئامانج لێی دۆزینەوەی سەرانی قاعیدە و بەدەستهێنانی زانیاری بوو دەربارەی هێرشە تیرۆرستییەکان. دوای ئەوەی لەساڵی ۲۰۰٤ ئەحمەد دەستگیرکرا، حەسەن چەند چاپکراوێکی تایبەتی ئەو بابەتانەی تێکشکاند کە لە دەزگاکە وەریگرتبوو وە هەڵسا بە سڕینەوە چەندان فایلی لەسەر کۆمپیوتەری کەسیی خۆی. تۆمەتی دووەم لەدژی ناوبراو پەیوەندی بە تۆمارێکی دەنگییەوە هەبوو کە تیایدا ناوبراو داوای کردبوو دوو چەکی جۆری (AR-۱۵) بکرێت.

دێریک شەریف یەکێک بوو لە هاوڕێوانی ناوبراو کە دوای دەستگیرکردنی ئەحمەد لەساڵی ۲۰۰٤ هەڵسا بەپێدانی زانیاری گرنگ بە دەزگای ئێف بی ئای، ئەمەش دوای ئەوە هات کە شەریف بە چەند رومانەیەکەوە دەستگیرکرا کە دەیویست یەکێک لە

مۆڵەکانی شیکاگۆ بتەقێنێتەوە لەکاتی جەژنی سەری ساڵ کە تیایدا نرخی شتمەک دادەبەزێت و کڕیاری زۆری ڕووی تێدەکات.[i]

## ئیسخاک ئاخمیرۆڤ (١٩٠١-١٩٧٥)

ئیسخاک ئاخمیرۆڤ سیخوڕێکی یەکێتی سۆڤیەت بوو کە لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا چالاکییەکانی لە ئەمریکادا بەئەنجام دەگەیاند. ناوبراو بۆ شاردنەوەی ناسنامەی خۆی، وەک کوتاڵ فرۆش لەو وڵاتەدا خۆی دابووە ناسین. ئەو لەساڵی ١٩١٩ پەیوەندی بە پارتی بەلشەفیک کردبوو وە دوای دەرچوونی لە کۆلێژ لەساڵی ١٩٣٢ پەیوەندی بە دەزگای هەواڵگرییەوە ئەو وڵاتەوە کرد. ئاخمیرۆڤ یەکەمجار لە تورکیا دەستی بە چالاکییەکانی کرد، وە دواتر لەساڵی ١٩٣٤ لە وڵاتی چین ئەرکێکی پێسپێردرا و پاشان دوای یەک ساڵ بە ناسنامەیەکی ساختەوە چووە نێو خاکی ئەمریکا. ئەو تا ساڵی ١٩٣٩ لە ئەمریکا مایەوە، دواتر گەڕایەوە یەکێتی سۆڤیەت. پاشان لەساڵی ١٩٤٢ دووبارە گەڕایەوە ئەمریکا. دوای جەنگ، ١٩٤٥ یان ١٩٤٦، ناوبراو دووبارە گەڕایەوە یەکێتی سۆڤیەت کە تیایدا بوو بە جێگری بەرپرسی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB) لە یەکەی هەواڵگریی پەنهاندا.

کردە سیخوڕییەکانی ئاخمیرۆڤ لەئەنجامی بڕینی شەپۆلەکانی ڤینۆنای سۆڤیەت ئاشکرا کران. ناوبراو لەژێر ناوە نهێنییەکانی ئالبێرت و مەیەر کارەکانی ڕادەپەڕاند. ئەو تا ئێستا بەباشترین ئەو خاڵە پەیوەندییانە دادەنرێت لە مێژوودا کە لەلایەن هاری هۆپکینس، یاریدەدەری شەخسی سەرۆک *فرانکلین رۆزڤێلت*، بەکارهێنراوە بۆ پەیوەندیگرتن لەگەڵ جۆزێف ستالین. هیچ بەڵگەیەکی ئاشکرا لەبەردەستدا نییە کە بیسەلمێنێت بە دەستەنقەست یان بەپێچەوانەوە هۆپکینس زانیاری نهێنیی لەڕێگای ناوبراوەوە دابێتە ستالین. سەرەڕای ئەمەش، ناوبراو ئەو کەناڵە زانیارییەی

---

i Centre for CounterIntelligence and Security Studies. "Spy Cases,"http://www.cicentre.com/ (accessed July ١٧, ٢٠٠٨).
Herbig, Katherine. Changes in Espionage by Americans. Monterey, CA: Defense Personnel Research Center, ٢٠٠٨.

بەکارهێنان بۆئەوەی ستالین ئاگاداربکاتەوە لە نیاز و بیرکردنەوەی ڕۆزڤێڵت وە بۆ ناردنی زانیاری لە کۆبوونەوەکانی نێوان ڕۆزڤێڵت و سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا، وینستن چێرچل.[i]

## ئالدریچ هەیزن ئەیمس (١٩٤١-...)

ئەیمس، هەواڵدۆزی دەزگای هەواڵگری ناوەندی دژەهەواڵگریی و یەکێک لە بەدناوترین و مەترسیدارترین خیانەتکارە ئەمریکییەکان لە مێژوودا، لەساڵی ١٩٤١ لە ویسکۆنسن لەدایک بووە. لەماوەی تەمەنی سەرەتای منداڵیدا، باوکی ناوبراو، کارلیتۆن ئەیمس، هەواڵدۆزی دەزگای سی ئای ئەی بووە لە وڵاتی بۆرما، لەژێر ناونیشانی پیشەی مامۆستای زانکۆدا. تا دوای گەڕانەوەیان خێزانەکەی لەو وڵاتەوە و چوونی بۆ دەزگای سەرەکی سی ئای ئەی لە لانگلی، ڤێرجینیا، ریکی گەنج (نازناوی ئەیمس) نەیدەزانی کە پیشەی سەرەکی و دروستی باوکی چی بووە. دواتر، بەهۆی ئەوەی سیخوڕیکردن لە خوێن و دەماری ئەودا بوو، باوکی ئەیمس هەڵسا بە دۆزینەوەی کارێکی هاوینە بۆ کوڕەکەی لەگەڵ سی ئای ئەی کە ئەرکی سەرەکیان دروستکردنی پارەی ساختە بوو بۆ بەکارهێنان لە مەشق. ناوبراو لەم کارە نوێیەی لە لانگلی باش بوو، بەڵام پێدەچوو ئارەزووی هەرەسەرەکی ناوبراو شانۆ بووبێت نەوەک خوێندنەکەی کە بووە هۆی شکستێکی مەزن لە زانکۆی شیکاگۆ. ئەیمس بەبەخت بوو، چونکە هێشتا باوکی دەسەڵاتێکی بەهێزی لەناو سی ئای ئەیدا هەبوو، بەسەرکەوتووی لەشوباتی ١٩٦٢ لەنێو دەزگاکەدا دەستبەکار بوو.

ئەیمس یەکەم ئەرکی فەرمی خۆی لەساڵی ١٩٦٣ وەک ئەفسەری مەیدان بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئۆپەراسیۆنەکان لە ئەنقەرەی تورکیا وەرگرت، کە تیایدا فەرمانی

---

[i]-Andrew, Christopher and Oleg Gordievsky. KGB. The Inside Story of Its Foreign Operations from Lenin to Gorbachev. Vol. ١: From the Russian Revolution to the Cold War. Kent: Hodder & Stoughton, ١٩٩٠.
-Haynes, John Earl, and Harvey Klehr. VENONA: Decoding Soviet Espionage in America. New Haven, CT: Yale University Press, ١٩٩٩.

پێکرا بۆئەوەی هەواڵدۆزی تورک و سۆڤیەتی تەجنید بکات. دوای تەنیا دە ساڵ لەکارکردن لە تورکیا، ئەو تەنیا توانی یەک هەواڵدۆز قاییل بکات وە لەساڵی ١٩٧٣ بەشکستخواردوویی گەڕایەوە بۆ واشنتۆن.

ئەیمس لە تافی لاوێتیدا

بەبیرکردنەوەی لە جێهێشتنی سی ئای ئەی، ئەیمس هەرزوو دوای ئەمە بۆ کۆلێژی زمانی بیانی سی ئای ئەی نێردرا کە تیایدا بەخێرایی فێری زمانی رووسی بوو. ئەم سەرکەوتنەی بووەهۆی وەرگرتنی ئەرکێکی نوێ لە یەکێک لە بارەگاکانی سی ئای ئەی بۆ چاودێریکردنی دبلۆماتکاری رووسی ئەلیکساندەر ئۆگۆرۆدنیک. ئەو مامەڵەی ئەیمس لەو کەیسەدا لەگەڵ ئەلیکساندەر دەیکرد و ئەو زانیارییە هەواڵگرییە گرنگانەی ناوبراو بەدەستی هێنان، بووە جێی خۆشحاڵی سەرانی خۆی و هەربەم هۆیەشەوە ئەرکێکی تری پێدرا لەساڵی ١٩٧٧ بۆ چاودێریکردنی سێرجی فێدۆرینک و دواتر نیکولایڤیچ شیڤچێنک لەساڵی ١٩٧٨، کە هەردووکیان نوێنەری باڵای سۆڤیەت بوون بۆ نەتەوەیەکگرتووەکان. دوابەدوای هەڵهاتنی شیڤچێنکۆ بۆ ئەمریکا، ئەیمس بوو بە یەکێک لە بەناوبانگترین هەواڵدۆزەکانی سی ئای ئەی.

لەگەڵ ئەم سەرکەوتنانەشدا، ژیانی کەسی ئەیمس زۆر ئاڵۆز بوو و هەرزوو دەستی کرد بە خواردنەوەی رێژەیەکی زۆری کحول. هەروەها، پیشەکەی لەوکاتەشدا کەوتە مەترسییەوە کە سەرانی سی ئای ئەی لەکۆتاییدا زانیان کە ئەیمس تەجنیدکەرێکی باش نەبووە. ناوبراو دووبارە ئەرکێکی تری تەجنیدکردنی پێسپێردرا لە شاری مەکسیکۆ سیتی لەساڵی ١٩٨١.

لەوێدا، دووبارە شکستی هێنا لە کارەکەی خۆی بەڵام خۆشبەختانە توانی دڵدارێکی نوێ بۆخۆی بدۆزێتەوە بەناوی ماریا دیل رۆزاریۆ کاساس دیپوێ. دواجار لە ئەرکی ئۆپەراسیۆنەکانی بەشی دژەهەواڵگریی یەکێتی سۆڤیەت لە سی ئای ئەی لەساڵی ١٩٨٣ ناوبراو پلەی بەرزکرایەوە، وە بەمەش گەڕایەوە واشنتۆن و دەستی بە چەندین فایلی زۆر نهێنیی گەیشت سەبارەت بە هەموو هەواڵدۆزەکانی سی ئای ئەی لەناو یەکێتی سۆڤیەت و هەڵاتوانی سۆڤیەت لە یەکێتی سۆڤیەت و دەرەوە.[1]

بەهۆی جیابوونەوەی لە خێزانی یەکەمی و ژیانی پڕخەرجی رۆزاریۆوە ئەیمس قەرزی دونیای کەوتەسەر. ئەو هەموو بیری لە هەموو رێگایەک دەکردەوە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم چەندە و دانەوە قەرزەکانی. لە بەرواری ١٦ی نیسانی ١٩٨٥، ئەیمس بەنهێنی چووە نێو باڵیۆزخانەی سۆڤیەت لە واشنتۆن و پێشنیاری پێدانی زانیاری نهێنی لەهەمبەر پارەدا بۆ کردن. ئەو سەرەتا پەنجا هەزار دۆلاری پێدرا و بەردەوام بوو لەسەر ئەم کارەی تا برەکەی گەیاندە نزیکەی دوو ملیۆن و پێنج سەد هەزار دۆلار. دوای نزیکەی یەک دەیە لەساڵی ١٩٩٤ دەستگیرکرا.

هەرزوو دوای ئەم رووداوە، سی ئای ئەی زانی هەواڵدۆزەکانی لە هەموو شوێنێک و پرۆژە نهێنیەکانیان لە مەترسیدان. سی ئای ئەی داوای لە ئێف بی ئای کردبوو کە ناوبراو بخاتەژێر چاوەدێری و بیکاتە ئامانجی خۆی. ئەیمس دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرا، سێ جار لە تاقیکردنەوەی ئامێری پۆلیگراف بە سەرکەوتوویی دەرچوو.

---

[1] *An Assessment of the Aldrich H. Ames Espionage Case and Its Implications for U.S. Intelligence: Report Prepared by the Staff of the Select Committee on Intelligence, United States Senate* [٨٤-٠٤٦] (Washington: U. S. Government Printing Office, ١٩٩٤), ٤.

دوای چاودێرییەکی چڕوپڕ و بەردەوام، ئەیمس ویستی لە شوباتی ١٩٩٤ بەرەو مۆسکۆ بفڕێت، بەڵام ئێف بی ئای دەسگیری کرد. لە ٢٢ی شوباتی ١٩٩٤، ئەیمس بەتۆمەتی سیخوڕیکردن بۆ یەکێتی سۆڤیەت لەلایەن وەزارەتی دادەوە تۆمەتبارکرا و هەرماوەیەکی کەم دوای ئەمە تۆمەتەکەی بەسەردا ساغکرایەوە.[i] ناوبراو ئێستا لە بەندیخانەیە، تاهەتایی هەر بە بەندکراوەی دەمێنێتەوە.

## رایان ئەندێرسن (١٩٧٨- ...)

رایان ئەندێرسنی تەمەن بیست و شەش ساڵ چوار تاوانی هەوڵدان بۆ بەخشینی زانیاری بە دوژمن لە دوازدەی شوباتی ٢٠٠٤ تۆمەتبارکرا. پیشەی ئەندێرسن لە سیخوڕیدا کورت و ناکاریگەر بوو.

ناوبراو لەساڵی ١٩٩٥ یان ١٩٩٦ بووە موسڵمان؛ بەر لەوکاتە ئەو خۆی وەک "مەسیحیەکی بیروباوەڕ دامەزراو" دەناساند. هەروەها، ئەندێرسن خۆی وەک نیشتیمانپەروەر و پشتیوانێکی سەرسەختی ئەمریکا دەناساند. دوای ئەوە ئایینی خۆی گۆڕی، ئەندێرسن بەبەردەوامی ئینتەرنێت و کورتەنامەی تەلەفۆنی بەکاردەهێنا بۆ پەیوەندیکردن بە گروپە موسڵمانەکان و خزمەتگوزارییەکانی وەک سیخوڕێک پێشکەش دەکردن. یەکێک لە پەیوەندییەکان لەرێگای ئیمەیلەوە لەلایەن شانۆن رۆزمیلەر، شارەزا لە بوار دیاریکردنی تیرۆریست، خوێنرایەوە. ناوبراو دەستبەجێ زانیارییەکانی بۆ ئێف بی ئای نارد. دەزگاکەش لەبەرامبەردا هەرزوو ئۆپەراسیۆنێکی لەم پێناوەدا ئەنجامدا. لەنێو ئەو خزمەتانەی ناوبراو پێشکەشی کردبوو، نەخشەی دروستکردنی تانکی (M١A١) و (M١A٢) وە دیسکێکی کۆمپیوتەری هەبوون کە پاسپۆرتە سەربازییەکەی تیادا بوو.

ئەندێرسن بەرلە یەک مانگ لەوەی یەکە سەربازییەکەی بچێتە ئێراق دەستگیرکرا. بەپێی یاسا، تۆمەتەکان لەدژی ناوبراو شایانی سزای مردن بوو. لە دادگاییکردنەکەدا،

---

[i] Early, Pete. Court TV's Crime Library. "CIA Traitor Aldrich Ames," http://www.crimelibrary.com/terrorists_spies/spies/ames/١.html(accessed December ١٢, ٢٠٠٥).

پارێزەرەکەی ئەوەی خستەڕوو کە ئەندێرسن تووشی چەندین جۆری نەخۆشی دەروونی بوو، هەربۆیە ئەم کارەی ئەنجامداوە. دادگا ئەم پۆزشەی لەبەرچاو نەگرت و تاهەتایی زیندانی بۆ بڕیەوە لەگەڵ ئازادی بەمەرج. سەرەڕای ئەم سزایە، ناوبراو هەموو پلە سەربازییەکانی لێسەنرایەوە و وەک سەربازێکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵدا کرا. ئەندێرسن دووەم سەربازی موسڵمانە کە مامەڵەی نەشیاو لەگەڵ زانیاری نهێنی وڵاتەکەیدا بکات لە یەکەی ئێف تی لویس. ئەوەی تر بریتیی بووە لە نەقیب جەیمس لی، کە بە نایاسایی زانیاری دەربارەی زیندانیانی گرتوخانەی گوانتانامۆ بۆ رای گشتی رادەگەیاند.[1]

## دەیڤید بارنێت (١٩٤٠-١٩٧٨)

کارمەندی باڵای دەزگای هەواڵگری ناوەندی دەیڤید هێنری بارنێت لەساڵی ١٩٨٠ بەتۆمەتی فرۆشتنی زانیاری وردی گرنگی ئۆپەراسیۆنە نهێنییەکانی سی ئای ئەی تۆمەتبارکرا، لەژێر ناوی نهێنی هابرینک، بە یەکێتی سۆڤیەت. کەیسی بارنێت یەکەمین کەیسی ئاشکرای کارمەندێکی سی ئای ئەی بوو کە نهێنی بفرۆشێتە کۆمیتەی سۆڤیەت بۆ ئاسایشی دەوڵەت (KGB).

وەک دەرچوونی زانکۆی میشیگان لەساڵی ١٩٥٥، بارنێت لەساڵی ١٩٥٨ پەیوەندی بە دەزگای هەواڵگری ناوەندییەوە (CIA) کرد. ناوبراو لەگەڵ یەکەی هەواڵگری سوپای ئەمریکا وەک شیکەرەوە لە کۆریای باشوور و واشنتۆن کاری دەکرد. لەساڵی ١٩٦٥ بۆ ١٩٦٧، بارنێت لە بارەگای سەرەکی سی ئای ئەی لە لانگلی، ڤێرجینیا، وەک ئەفسەری ستاف لە بەڕێوەبەرایەتی ئۆپەراسیۆنەکان کاری دەکرد، ئەو بەشە تایبەت بوو بە بەڕێوەبردنی سەرجەم چالاکییە نهێنییە جیهانییەکانی تایبەت بە دەزگاکە. لەساڵی ١٩٦٧ بارنێت لە ئەندەنوسیا پۆستێکی دبلۆماسیی پێدرا کە تیایدا

---

[1] Herbig, Katherine. Changes in Espionage by Americans. Monterey, CA: Defense Personnel Research Center, ٢٠٠٨.
-Centre for Counterintelligence and Security Studies. "Spy Cases," http://www.cicentre.com/ (accessed July ١٧, ٢٠٠٨).

توانی چەندین بەرپرسی خۆجێی تەجنید بکات بۆ سیخوڕیکردن بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

بارنێت لەساڵی ۱۹۷۰ دەستی لەکارکێشایەوە بۆئەوەی کۆمپانیایەکی ناردنی کەلوپەلی شوێنەوارناسیی لە ئەندەنوسیا بکاتەوە، بەڵام هەر بەردەوام بوو لە کارکردنی لابەلا بۆ سی ئای ئەی. لەکۆتایی ۱۹۷٦، بارنێت کەوتە ژێرباری قەرزێکی سەد هەزار دۆلارییەوە و خەریک بوو لە کارەکەی ئیفلاس بکات، هەر لەوێوە ناوبراو دەستی کرد بە فرۆشتنی زانیاری نهێنی بە دەزگای هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەت. بارنێت سەروبنی ئۆپەراسیۆنەکانی هابرنیکی بە دەزگاکە بەخشی، وەک زانیاری سی ئای ئەی لەمەڕ موشەکی سۆڤیەتی (SA-۲) و کەشتی ژێرئاوی (Whiskey). هەروەها، ناوبراو ناوی سی ئەفسەری هەواڵگری سی ئای ئەی ئاشکرا کرد و ناوی چەندین هەواڵدەری ئاشکرا کرد کە لەلایەن سی ئای ئەیەوە تەجنید کرابوون. دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت بڕی نەوەد و دوو هەزار دۆلاری بۆ ئەو زانیارییە بەنرخانە بەخشییە بارنێت وە لەساڵی ۱۹۷۷ قاییلی کرد بۆئەوەی کاربکات لە پێگەی گرنگی وەک بۆردی چاودێری هەواڵگری ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی پیران. خۆشبەختانە، بارنێت لە هیچ یەکێک لە بۆردەکان وەرنەگیرا، بەڵام لە کانوونی دووەمی ۱۹۷۰ ئەو لەلایەن سی ئای ئەیەوە دووبارە وەرگیرایەوە، ئەمجارە وەک هەواڵدۆزێکی بەڵێننامە. ئەو بەشێوەیەکی کتوپڕ تەنیا دوای سێزدە مانگ دەستی لەکارکێشایەوە.

لەنیسانی ۱۹۸۰، هەواڵدۆزەکانی ئەمریکا توانییان بارنێت لەوکاتەدا ببینن کە لەگەڵ هەواڵدۆزێکی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (Komitet Gosudarstvennoi Bezopasnosti) لە ڤیەننا چاویان بەیەکتر دەکەوت. هەرکە هاتەوە نێو ئەمریکا، لەلایەن ئێف بی ئای دەستگیرکرا و لێپرسینەوە چڕی لەگەڵدا کرا. هەموو ئەو

تۆمەتانە لەلایەن دادگای باڵاوە بەسەریدا ساغکرانەوە و بە حوکمی هەژدە ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوە، بەڵام لەساڵی ١٩٩٠ بەمەرج ئازادکرا.[i]

## کریستۆفەر جۆن بۆیس (١٩٥٣-...)

کریستۆفەر جۆن بۆیس، لەنێو خەڵک بە فالکۆن، لەگەڵ ئەندرو دۆلتنی هاوڕێی پیلانێکیان دارشت بۆ فرۆشتنی زانیاری نهێنی لەمەڕ تۆڕی سەتەلایەتی رایۆلێت (Ryholite) بۆ بەرژەوەندی سۆڤیەت. بۆیس، گەورەترین منداڵی چارلس بۆیس، لە باشووری کالیفۆرنیا لە گەڕەکی پالۆس ڤاردێس تەمەنی منداڵی و لاوی خۆی گوزەراندووە. باوکی ناوبراو کارمەندی ئێف بێ ئای بوو، پاشان لە کالیفۆرنیا رووی کردە کارکردن لە کارگەیەکی دروستکردنی فڕۆکە، وە دایکیشی بەرلەوەی پرۆسەی هاوسەرگیری پێک بهێنێت پێی باش بوو ببێتە راهیبەی کلێسا بەڵام دوای ئەوەی شووی کرد، ئیتر هەموو منداڵەکانی لەسەر رێبازی ئایینی کاتۆلیکی پەروەردەکرد. هەر لەسەرەتای تەمەنییەوە دیاربوو کە بۆیس منداڵێکی چەلەنگە و نمرەی ١٢٤ی تۆمارکرد لە تاقیکردنەوەی ئاستی ژیریی (IQ)، لەنێو خەڵکدا بەوە ناسرابوو کە کەسێکی چاونەترسە و باکی نییە بە ئەنجامدانی کاری جەربەزەیی. بۆیس تووشی گرفتێکی قووڵی باوەڕی ئایینی بوو لەماوەی جحێڵێیدا، دواتر بوو بە کەسێک کە حەزی بەمانەوە لەماڵ نەدەکرد و هەردەم لە دەرەوە بوو. دوای ئەوەی بۆ سێ کەڕەت وازی لە کۆلێژ هێنا، بەهۆی ئەو پەیوەندییانەی باوکی هەیبوو لەگەڵ سی ئای ئەی، بۆیس لە دەزگاکەدا دەستبەکار بوو. بۆیس لەوێدا بەهۆی مەیلەکەی بۆ یەکێتی سۆڤیەت، بەلێزانانە توانی ئەندرو قایل بکات، کە دواتر بوو بە مامەڵەکارێکی سەرکەوتووی ماددەی هۆشبەر، بۆئەوەی هاوکاری بکات لە بەقاچاغبردنی چەندین بەڵگەنامەی نهێنی و فرۆشتنیان بە دەزگای هەواڵگری

---

[i] Shulsky, Abram and Gary Schmitt. Silent Warfare: Understanding the World of Intelligence. Washington, DC: Brassey's. ١٩٩٣.
-Volkman, Ernest. Spies: The Secret Agents Who Changed the Course of History.NewYork: Wiley, ١٩٩٧.

سۆڤیەت، لەرێگای باڵیۆزخانەکەی لە مەکسیکۆ سیتی، بۆیس و ئەندرو بەردەوامییان بە دۆستایەتیەکەیاندا بۆماوەی نزیکەی دووساڵ بەرلەوەی لەساڵی ١٩٧٧ هەردووکیان دەستگیر بکرێن. لەساڵی ١٩٨٠، بۆیس لە زیندان رایکرد و پەنای بردە بەر باکووری شاری ئیداهۆ کە تیایدا بۆ بەردەوامیدان بەژیانی خۆی کاری دزینی بانقی دەکرد. دوای ساڵ و نیوێک گەڕان هێزەکانی فیدراڵی ئەویان لەساڵی ١٩٨١ دەستگیرکرد لەو دەمەی هەوڵیدەدا بچێتە دەرەوەی وڵات. لەکۆتاییدا، ناوبراو لە دادگا بڕیاریدا کە بۆماوەی شەست و پێنج ساڵ حوکمی زیندانی بۆ ببڕدرێتەوە.[i]

## رۆدۆڵف ئیڤانۆڤیچ ئابیل (١٩٠٣-١٩٧١)

سیخوڕە رووسەکان لە زۆر جێگای جیهاندا چێندراون، ئەوان بۆ هەر جێگایەک کە بیانەوێت لەسەر نووکی پەنجەکانیان دەڕۆن بۆ ئەوەی هیچ کەسێک هەست بە بوونیان نەکات، بەپێچەوانەی ئەمریکییەکانەوە کە بایەخ بە شاردنەوەی خۆیان نادەن، لەبەرئەوەی بڕوایان وایە کە سیاسەتی راستەقینە تەنها بە هێز و توندوتیژی تیرۆرکردن ئەنجام دەدرێت، بەڵام هەردوولا ئامانجی تایبەتی خۆیان هەیە لەو شێوازەی پەیڕەوی دەکەن. چالاکیەکانی دەزگای هەواڵگری روسی بەتەنها لەسەر وڵاتانی خۆرئاوای ئەورووپا کورت نابێتەوە، بەڵکو ئەمریکا لەسەرەوەی ئەو وڵاتانەیە کە بە دوژمنی ژمارە یەکی خۆی دەزانێت، سیخوڕە رووسەکان کە بە لێهاتوویی و زیرەکی ناسراون هەمیشە هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی روسیا بوون لە بەرەنگار بوونەوەی ئەو دوژمنە سەرسەختەیدا، یەکێک لەو سیخوڕانە بەناوی سەرهەنگ رۆدۆڵف ئیڤانۆڤیچ ئابێلە کە بەڵگەی سەرکەوتوویی دەزگای هەواڵگری روسیە لەو جەنگە هەواڵگرییەی کە دوای جەنگی جیهانی دووەم لەگەڵ ئەمریکادا ئەنجامیدا.

---

[i] Lindsey, Robert. The Falcon and the Snowman: A True Story of Friendship and Espionage. New York: Pocket Books, ١٩٧٩.
-Lindsey, Robert. The Flight of the Falcon: The True Story of the Manhunt for America's Most Wanted Spy. New York: Pocket Books, ١٩٨٣.

ئابێل لەساڵی ١٩٥٧ لەگەڵ جەیمس دۆناڤان –بەڕێوەبەری سی ئای ئەی- گفتوگۆدەکات

ئەم سیخوڕە کە بۆ ماوەی ٩ ساڵ لە نیویۆرک کاری بۆ روسیا دەکرد بەبێ ئەوەی ئاشکرا ببێت، ژیانی لەو ماوەیەدا تژی بوو لە سەرکێشی و مەترسی، ئەو بەجۆرێک لێهاتوو بوو کە هیچ کام لە دەزگا ئەمنی و ئاسایشیەکانی ئەمریکا نەیانتوانی ئاشکرای بکەن. ئەو لەساڵی ١٩٠٢ لە مۆسکۆ لەدایک ببوو، پاش ئەوەی لەلایەن هەواڵگری روسیەوە راهێنانی چڕوپڕی پێدەکرێت، لەساڵی ١٩٤٨ لەرێگەی کەنەداوە داخیلی ئەمریکا دەبێت بە بەکارهێنانی ناسنامەیەکی ساختە بەناوی ئاندرۆ کایۆتیس کە لەلایەن هەواڵگری روسیەوە بۆ ئەو مەبەستە بۆی ئامادەکرابوو، دوای ئەوەی گەیشتە نیۆرک لە ئوتێلیماننهاتن بە ناوێکی ساختەوە ناوی خۆی تۆمارکرد. هەرچەندە سەرهەنگ ئابێل لەلایەن هەواڵگری روسیەوە ناسنامەیەکی ساختەی بۆ ئامادەکرابوو، بەڵام ئەو بڕیاریدا ناسنامەیەکی راستەقینەی ئەمریکی بۆخۆی پەیدا بکات تا گومانەکان لەسەر ئاشکرا بوونی کەم بینەوە، ئەو ناسنامەیە هی منداڵێک بوو بەناوی ئەمیل گۆڵدفۆس کە پاش دوو مانگ لە لەدایکبوونی لە نیویۆرک کۆچی دوایی کردبوو.

بەپێی ئەو رێنماییانەی کە پەیمانگای هەواڵگری روسی فێریان کردبوو، نەدەبوو ئابێڵ ژووری ئوتێلەکەی وەک جێگای پلاندانان بۆ چالاکیە سیخوڕیەکانی بەکاربهێنێت، لەبەرئەوەی دەترسا لەوەی هەواڵگری ئەمریکی ئامێری تۆمارکردن و گواستنەوەی دەنگ و هەروەها کامێرای نهێنیان تێدا شاردبێتەوە، لەبەرئەوە هەستا بە بەکرێگرتنی ستۆدیۆیەکی وێنەگرتن کە لەیەک ژوور پێکهاتبوو، بەناوی ستۆدیۆی ئەمیل گۆڵفۆسەوە ناوینا، وەک فۆتۆگرافەرێک دەستی بەکارکرد، بەدرێژایی نۆ ساڵی ماوەی سیخوڕی کردنی لەڕێگەی ئامێری رادیۆوە زانیاری گرنگی بۆ بەرپرسانی هەواڵگری روس دەنارد، وەک زانیاری دەربارەی هێزی سەربازی ئەمریکا و توانای بەرەنگاربوونەوەی لەکاتی هێرشی لەناکاو بۆ سەریان، هەروەها زانیاری دەرباری چەکەکانی سوپای ئەمریکا و ژمارە و پێکهاتەکانیان، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەو زانیاریانە بوون کە دەربارەی چەکە ئەتۆمیەکانی ئەمریکا دەینارد. لەبەرئەوەی لەو ساڵانەدا کە جەنگی سارد لە نێوان ئەمریکا و روسیادا بەرپابیوو، هەردوولا هەوڵیان بۆ بەهێزکردنی توانای سەربازی خۆیان دەدا و چەکی ئەتۆمیش کە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا وەک یەکەم وڵات بووە خاوەنی مەترسیەکی گەورە بوو لەسەر روسیا، وە روسیاش لەڕێگەی سیخوڕەکانیەوە بەردەوام هەوڵیدەدا زۆرترین زانیاری لەسەر ئەم چەکە دەست بکەوێت و سوپای وڵاتەکەی پێ پڕچەک بکات.

وە لەماوەی چالاکیە سیخوڕییەکانی لە ئەمریکا، سەرهەنگ ئابێڵ چەندین زانیاری گرنگی بۆ مۆسکۆ نارد کە هەموویان زانیاری نهێنی و تایبەت بوون وەک بەڵگەنامە و هێڵکاری چەکە قورسەکان و وێنەی بنکە سەربازیەکان. کاتێک لەساڵی ١٩٥٧ دا دەستگیرکرا، لەبەردەم دادگای فیدراڵی ئەمریکاوە دانینا بەوەی کە سەرجەم ئەو کەل و پەلانەی لە ستۆدیۆی وێنەگرتنەکەیدا دەستیان بەسەردا گیراوە وەک: پارەی ئاسن و قۆپچە و قەڵەم و برغوی ناوبۆش، بەکاری هێناون بۆ شاردنەوەی فیلمی مایکرۆیی کە زانیاریە گرنگەکانی تێدا تۆمارکردبوون بۆ ئەوەی رەوانەی مۆسکۆیان بکات. بەڵام سیخوڕێک کە بۆ ماوەی ٩ ساڵ گەورەترین زیان لە حکومەتی ئەمریکا بدات و لەو ماوەیەدا ئاشکرا نەبووبێت، رەنگە بپرسن کە چۆن وا بە ئاسانی ئاشکرا دەبێت،

بەدڵنیاییەوە ڕێکەوت لە ئاشکرابوونی ئەم جۆرە سیخوڕانەدا ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت، ئاشکرابوون و دەستگیرکردنی ئەو بەسەرهاتێکی سەرسوڕهێنەرە.
بەیانیەک کاتێک گەنجێکی تەمەن ١٤ ساڵ بەناوی جیمی بۆزارت کە پیشەی دابەشکردنی ڕۆژنامە بووە، لە یەکێک لە کڕیارەکانی ڕۆژنامەی پارەی ڕۆژنامەکەی وەردەگرێت، یەکێک لەو پارە ئاسنانەی کە وەریدەگرێت لە دەستی دەکەوێتە خوارەوە، بەڵام کاتێک دەیەوێت ئەو هەڵیبگرێتەوە تووشی سەرسووڕمان دەبێت بەوەی کە دەبینێت یەکێک لەو پارە ئاسنانە لە ناوەڕاستدا بووە بە دوو لەتەوە و لە ناویدا شتێکی بچکۆلە دەبینرێت وەک فیلمێکی بچووک وایە، جیمی بە بینی تووشی سەرسوڕمان دەبێت و ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای باوکی و ئەوەی بینیویەتی بۆی دەگێڕێتەوە، باوکیشی پێی دەڵێت کە شتی لەو شێوەیەی تەنها لە فیلم و چیرۆکە سیخوڕیەکاندا بینیوە، بۆیە باوکی هەست دەکات بەوەی کە پێویستە ڕاستەوخۆ پۆلیس ئاگاداربکاتەوە، دواتر پەیوەندی بەلێکۆلەرێکی پۆلیس دەکەن بەناوی فرانک میللی کە هاوڕێیەکی نزیکی باوکی بووە.
بەهۆی ئەم بەڵگەیەوە پۆلیس سەرەداوێکی دەستکەوت و دڵنیابوو لەوەی کە تۆڕێکی فراوانی سیخوڕی لە ئەمریکا هەیە، بۆیە دەستیان کرد بە پرۆسەی گەڕان و شوێنپێهەڵگرتنی هەموو ئەو کەسانەی کە لەناوچەکەدا گومانیان لەسەر بوو. لەئەنجامی ئەو گەڕانەدا چەند سیخوڕێکی ڕوسیان دەستگیرکرد بەناوەکانی: فیتالی پافلۆف، ئەلێکساندەر میکالۆڤیچ، میکاییل سیفرن. بەڵام تا ساڵی ١٩٥٧ سەرهەنگ ئابێل ئاشکرا نەبوو هەرچەندە بەدوایدا دەگەڕان بەڵام نەیانتوانی بەئاسانی بیدۆزنەوە، تا ئەو کاتەی کە ڕێکخراوی کۆچ و ڕەگەزنامەی ئەمریکی ناوی ئەویان لە لیستی ئەو کۆچبەرانەی هاتوونەتە ئەمریکاوە نەدۆزییەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە گومانی لێبکەن لەوەی کە بەشێوەیەکی نایاسایی داخیلی ناو خاکی ئەمریکا بوو.
بۆ ئەم مەبەستە بۆ ماوەی ٢ هەفتە لە کەمپێکی سەربازیدا زیندانیان کرد تا لە دواتردا بیگەڕێننەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، بەڵام دوای دەستگیرکردنی کاتێک لەلایەن پۆلیسی فیدراڵی ئەمریکیەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرا، چەند لێکۆڵەرێکی فیدراڵی

بەنهێنی هەستان بەگەڕان و پشکنینی ستۆدیۆی وێنەگرتنەکەی کە دەکەوتە گەڕەکی فیلتۆن. ئەو لەنێو دانیشتوانی گەڕەکی فیلتۆندا کەسێکی ناسراوبوو، دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ئەویان بەناوی ئەمیل گۆڵدفۆکس واتە ناوی سەر ناسنامە ساختەکەی دەناسی وەک پیاوێکی کورتەبالاّ و کەم قسە کە هیوایەتی وێنەکێشان بوو، وە کاتێک کە پۆلیس ستۆدیۆی وێنەگرتنەکەیان پشکنی بۆیان دەرکەوت کە چەندین کەل و پەلی تایبەت بە پیشەکەیان دۆزیەوە وەک: ئامێری وێنەگرتن و شۆردنەوە، بەلاّم ئەمانە بەس نەبوون بۆ ئەوەی تۆمەتباری بکەن تا ئەو کاتەی توانیان ئامێرێکی ناردنی شەپۆلی رادیۆیی کورتمەودا بدۆزنەوە کە کوالێتیەکی بەرزی هەبوو، هەروەها چەند کەل و پەلێکی تریان دۆزیەوە کە هیچ پەیوەندیەکان بەکاری فۆتۆگرافەرییەوە نەبوو وەک: ئامێری بڕینی شوشە، چەند بەڵگەنامەیەکی نهێنی، دووربینی گەورەی دووچاو، چەند فیلمێکی بچووکی تۆمارکراو، بزمار و قەڵەم و برغو و قوپچە و پارەی ئاسنی ناوبۆش، هەروەها ئامێری چاپکردن و بچووک کردنەوەی زانیارییەکان بۆ قەبارەی سەرەدەرزییەک.

دواتر پۆلیس بۆی دەرکەوت کە ئابێل بەردەوام لە پەیوەندیدا بووە لەگەڵ مۆسکۆدا لەڕێگەی ئامێری رادیۆکەوە کە بەهۆیەوە زانیاری ناردووە و فەرمانی وەرگرتووە، هەروەها دەرکەوت کە پەیوەندی بەتۆڕێکی هەواڵگری روسیەوە هەبووە کە چەندین سیخوڕی تری گرتووەتەخۆ کە لەناوچە جیاجیاکانی ئەمریکادا بلاّو بوونەتەوە. بۆیە هەواڵگری ئەمریکی بەردەوام بوو لە چاودێریکردنیان تا ئەو کاتەی کە توانیان سەرجەم ئەندامانی تۆڕەکە دەستگیربکەن و لەنێویاندا سەرهەنگ ئابیل کە مەترسیدارترینیان بوو بەجۆرێک ناتوانرێت کە قەبارەی ئەو زانیاریە زۆر و هەستیارانە بزانرێت کە ناردوویەتی بۆ هەواڵگری روسی، ئەو سەرباری ئەوەی کاری فۆتۆگرافەری دەکرد شارەزای تۆمارکردنی دەنگ بوو، هەروەها ئەندازیاری کارەبا و وێنەکێش و هونەرمەندێکی لێهاتوو بوو لەگەڵ ئەوەشدا زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی و ئەڵمانی بەباشی زانیوە. هەرچەندە ئەو بەڵگانەی کە لە ستۆدیۆکەیدا دەستی بەسەردا گیرابوون بەس بوون بۆئەوەی تۆمەتی سیخوڕی بدەنەپاڵ و رەوانەی دادگای

بکەن، بەڵام خیانەتی یەکێک لە ئەندامانی تۆڕەکەی دەستگیرکردن و بەسزاگەیاندنی ئەویان ئاسانتر کرد ئەو سیخوڕە کە یەکێک بوو لە ئەندامانی تۆڕەکەی سەرهەنگ ئابێل ناوی هایهانێن بوو کە ناوە نهێنیەکەی ماکی بوو، دوای ئەوەی خۆی رادەستی هەواڵگری ئەمریکی کرد هەموو زانیاریەکی دەربارەی تۆڕە سیخوڕیەکە خستەڕوو هەروەها پێی وتن کە ئارەزووناکات بگەڕێتەوە بۆ روسیا و لەو وڵاتەدا ژیان بەسەر ببات.

پاش دادگایی کردن بەهۆی ئەو تۆمەتەی ئاراستەی کرا، سزای زیندانی کردنی بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ بەسەردا سەپێنرا، هەرچەندە دەتوانرا سزای لە سێدارەدانی بەسەردا بسەپێنرێت بەپێی یاسای قەلاچۆکردنی سیخوڕی و کاری تێکدەرانە، بەڵام ئەو تەنها ٥ ساڵی لە زینداندا بەسەر برد لەبەرئەوەی هەواڵگری روسی لەگەڵ سیخوڕێکی ئەمریکیدا بەناوی فرەنسیس گاری باورز گۆڕینەوەی پێکرد کە بەخۆی و فرۆکە سیخوڕیەکەیەوە لەخاکی روسیادا کەوتبووە خوارەوە. ناتوانرێت قەبارەی ئەو زیانانە دیاری بکرێت کە ئابێل لە ئەمریکای داوە بەهۆی دزەپێکردنی ئەو زانیاریە گرنگانە، بەڵام سەرئەنجام ئەو ئازادکرا و گەڕایەوە بۆ روسیا بەهۆی دڵسۆزی هەواڵگری روسی بۆ ئەو سیخوڕانەی خۆی کە ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە لەپێناو نیشتیمانەکەیان.

## مانوێل نۆریگا (١٩٣٤-٢٠١٧)

مانوێل نۆریگا سەرۆکی پێشووی وڵاتی پەنەما و بەکرێگیراوی دەزگای (CIA) سەرەتای پەیوەندی کردنی بە دەزگای هەواڵگری ئەمریکی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی پەنجاکان کاتێک قوتابی زانکۆ بوو لە ئەمریکا لە کۆلێژی سەربازی (دێنست). ئەو لەلایەن دەزگای هەواڵگری ئەمریکاوە بانگهێشت کرا بۆ ئەوەی کاریان لەگەڵدا بکات ئەویش ڕەزامەندی دەربڕی. سەرەتا زانیاری دەربارەی هاوڕێکانی کۆلێژ کۆدەکردەوە، وە دوای ئەوەی خوێندنی کۆلێژی تەواوکرد، بەشێوەیەکی فەرمی پەیوەندی کرد بە هەواڵگری ئەمریکیەوە، سەرەتا وەک هەواڵگر و سەرچاوەیەکی بەدەسهێنانی زانیاری کاری بۆ ئەم دەزگایە دەکرد لە سەردەمی سەرۆکی ئەمریکا ریچارد نیکسۆن. لەو کاتانەدا نۆریگا لە چەند چالاکیەکی تاوانکاریەوە تێوەگلا وەک بازرگانی کردن بە ماددەی هۆشبەر و حکومەتی ئەمریکیش ئەم راستیەی دەزانی بەڵام چاوپۆشی لە سزادانی کرد لەبەرئەوەی دڵنیابوون لەوەی کە لەداهاتوودا دەبێت بە یەکێک لە سیخوڕە گرنگەکانیان لە وڵاتی پەنەما. (پەنەما وڵاتێکی بچووکە کە دەکەوێتە نێوان هەردوو کیشوەری ئەمریکای باکور و باشوور).

مانوێل نۆریگا، دیکتاتۆر و داردەستی سی ئای ئەی

دەزگای هەواڵگری ئەمریکی داوای لە نۆریگا کرد کە بگەڕێتەوە وڵاتەکەی، واتەپەنەما، و پەیوەندی بکات بە دەزگای هەواڵگری ئەو وڵاتەوە. دوای ئەوەی نۆریگا گەڕایەوە بۆ پەنەما و پەیوەندی کرد بە هەواڵگری ئەو وڵاتەوە بەهۆی ئەوەی دەرچووی کۆلێژێکی سەربازی ئەمریکی بوو هەرزوو بەهۆی لێهاتووییەوە ناوبانگی دەرکرد و چەندین جار پلەی بەرزکرایەوە تا لەکۆتاییدا کرا بە سەرۆکی پەنەما. وە پێش ئەوەی پۆستی سەرۆک کۆمار وەربگرێت چەند جارێک چاوی کەوتووە بە ولیام کەیسی سەرۆکی هەواڵگری ئەمریکی و جێگری سەرۆکی ئەمریکا.

هەر لەسەرەتای دەست بەکاربوونی مانوێل نۆریگا وەک کارمەندێکی دەزگای هەواڵگری پەنەما بەنهێنی زانیاری پێشکەشی هەواڵگری ئەمریکی دەکرد و تەنانەت دوای ئەوەی بوو بە سەرۆک کۆمار هەواڵگری ئەمریکی مووچەی مانگانەکەی بەردەوام لە حسابی بانقی تایبەتی ئەودا لە سویسرا هەڵدەگرت کە چارەکە ملیۆنێک دۆلار بوو. بەڵام پاش ماوەیەک لە دەست بەکار بوونی ئەو سیخوڕەی دەزگای سی ئای ئەی وەک سەرۆک کۆماری پەنەما، تێوەگلا لە چەندین کاری نایاسایی کە بەهۆیەوە زیانێکی زۆریان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، وەک بازرگانی کردن بە ماددەی هۆشبەر بەشێوەیەکی فراوان کە بەم هۆکارە بڕێکی خەیاڵی لە ماددەی هۆشبەر لە پەنەماوە رەوانەی ئەمریکا کرا، ئەمەش حکومەتی ئەمریکی ناچارکرد کە هەڵمەتێکی سەربازی فراوان دەست پێبکات بۆ سەر پەنەما و سەرجەم خزمەتگوزاریە گشتیەکانیان لەکارخست، کاتێک هێزێکی تایبەتی ئەمریکی دزەیان کردە ناو کۆشکی کۆماری بۆیان دەرکەوت کە نۆریگا لەوێ نییە بەڵام چەندین ملیۆن دۆلاریان دۆزیەوە کە نۆریگا بەهۆی بازرگانی بە ماددەی هۆشبەر دەستی کەوتبوون.

دواتر دەرکەوت کە ناوبراو بە نیوەشەو هەڵهاتووە و پەنای بردووەتەبەر باڵیۆزخانەی وڵاتی بابۆی لە پایتەختی پەنەما، ئەو باڵیۆزخانەیەش بەهۆی ئەوەی خاوەنی حەسانەی دیبلۆماسی بوو رێزیان لێگرت و داڵدەیاندا بەلەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخەی کە تێیدا بوو، بەم هۆکارە ئەمریکییەکان بێچارە مانەوە لە دەستگیرکردنی نۆریگا، لەبەرئەوەی نەریتی دیبلۆماسی نێودەوڵەتی رێگەنادات بە هیچ هێزێکی بیانی و

نێودەوڵەتی بەهەر هۆکارێک بێت هێرش بکاتەسەر باڵیۆزخانە. بۆیە، دەزگای هەواڵگری ئەمریکی بیریان لە فێڵێک کردەوە بۆئەوەی کە نۆریگا ناچار بکەن خۆی رادەستی هێزەکانی ئەمریکا بکات. وەک دەڵێن(لە پشت هەموو پیاوێکی مەزنەوە ئافرەتێک هەیە)، لەماوەی سەرۆکایەتیدا نۆریگا کاریگەر بوو بەچەندین ئافرەتی جوان، لە کۆتاییدا ئەو ژنەی کە لەژیانی تایبەتی نۆریگادا رۆڵێکی گەورەی دەگێرا هەر ئەو ژنە بوو کە نۆریگای ناچارکرد خۆی رادەستی ئەمریکییەکان بکات. فیکی ئامادۆ مەعشوقەکەی نۆریگا کە ئافرەتێکی گەنج و جوان بوو لەلایەن هەواڵگری ئەمریکیەوە داوای لێکرا کە بەتەلەفون پەیوەندی بە نۆریگاوە بکات و پێی بڵێت کە خۆی رادەستی ئەمریکییەکان بکات لە بنکەیەکی سەربازی ئەمریکا لە سنوری پەنەما، هەروەها پێی بڵێت کە ئەمریکییەکان بەڵێنیان پێداوە کە کارئاسانیان بۆ بکەن بۆ سەفەرکردن بۆ وڵاتی کوبا تا لەوێدا پێکەوە ژیان بەسەر بەرن. دوای ئەوەی فیکی ئامادۆ پەیوەندی بە نۆریگاوە کرد، سەرەتا نۆریگا رازی نەبوو وە گومانی لەڕاستی وتەکانی هەبوو بەهەموو شێوەیەک رەتی کردەوە کە خۆی رادەست بکات.

ئەمەش ئەمریکییەکانی ناچارکرد پەنا ببەنە بەر فێڵێکی تر، زۆری نەبرد سەدان خۆپیشاندەر کە لەلایەن هەواڵگری ئەمریکییەوە بەکرێگیرابوون چواردەوری باڵیۆزخانەی بابۆییان داو هاواریان دەکرد: "نۆریگای ناپاکمان رادەست بکەن تا بەسزای خۆی بگەیەنین،" لەگەڵ ئەم فێڵەشدا ئەمریکییەکان چەکێکی دەروونی کاریگەریان بەکارهێنا دژی نۆریگا تا ناچاری بکەن خۆی رادەستی هێزەکانی ئەمریکا بکات و چەند فرۆکەیەکی سیخوڕی جۆری تارماییان بەسەر پایتەختی پەنەما خستە فڕین و بەجۆرێک کە زۆرترین دەنگیان لێوە بێت، ئەمەش نۆریگای بەتەواوەتی لەڕووی دەروونیەوە داڕووخاند و هەستی دەکرد کە بەرەنگاری و دژایەتی کردنی هێزەکانی ئەمریکا کارێکی گێلانەیە لەبەرئەوەی تەواوی زەمین و ئاسمانی وڵاتەکەی بە سوپای ئەمریکا تەنراوە. ئەو ژوورەی کە نۆریگای تێدابوو لە باڵیۆزخانە ژوورێکی بچووک بوو کە تەنها تەلەفزیۆنێکی شکاوی تێدابوو، وە هیچ ئامێرێکی فێنک کەرەوەی تێدا نەبوو، کاتێک گەرمای هاوین و هات و هاواری سەدان خۆپیشاندەری دەوری باڵیۆزخانە و

دەنگی فڕۆکەکان نۆریگایان بێزار دەکرد و هەستی دەکرد بازنەکەی دەوری تادێت بچووکتر دەبێتەوە، لەوکاتەدا باڵیۆزی بابۆی هات بۆ ژوورەکەی نۆریگا و پێی ووت: گەر ئامادە نەبێت خۆی رادەست بکات ئەوا ناچار دەبێت لە باڵیۆزخانە بیکاتە دەرەوە لەپێناو سەلامەتی باڵیۆزخانەکە و کارمەندەکانی. نۆریگاش داوای لە باڵیۆز کرد کە پێنج خولەک کاتی بداتێ بۆ بیرکردنەوە، دواتر نۆریگا تەلەفونی بۆ مەعشوقەکەی کرد و پێی ووت کە تا چەندێک دڵنیایە لەو بەڵێنەی کە ئەمریکییەکان داویانە پێیان، ئەویش پێی ووت کە زۆر دڵنیایە. دواتر نۆریگا لەژێر فشاری دەروونیدا خۆی رادەست کرد و گواسترایەوە بۆ ئەمریکا بەڵام خێزانەکەی ئازاد کران و بۆ کوبا سەفەریان کرد . بەم شێوەیە ئەو سەرۆک کۆمارەی کە لە گرانبەهاترین ئۆتێلەکان شەوی بەسەر دەبرد و لە وڵاتان پێشوازی لێدەکرا و لەگەڵ کەژاوەی ماتۆر و ئۆتۆمبێلی پڕلە پاسەوان هاتووچۆی دەکرد و لە بەناوبانگترین چێشتخانەکان نانی دەخوارد، ئێستا لەلایەن هەواڵگری ئەمریکیەوە زیندانی کراوە لەژێر زەویدا لە ژوورێکدا کە درێژیەکەی ٥ مەتر و پانیەکەی ٣ مەترە و بووە بە زیندانی ژمارە (٤١٥٨٦).

دوای دادگایی کردن دەیان تۆمەتی ترسناکی ئاراستەکرا، وەک بازرگانی کردن بەماددەی هۆشبەر و سپیکردنەوەی پارە و سزای ٢٠ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپێنرا، وە دوای تەواوکردنی ماوەی سزاکەی رادەستی حکومەتی فەرەنسی کرا لەبەرئەوەی هەندێک لە تاوانەکانی وەک سپیکردنەوەی پارە لەڕێگەی بانکەکانی فەرەنساوە ئەنجامی دابوون دوای دادگایی کردن بۆ ماوەی ٧ ساڵی تر زیندانی کرا. بەڵام ئەو هەموو ئاواتێکی ئەوە بوو بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی تا لەوێدا کۆچی دوایی بکات. لەکۆتاییدا و لەتەمەنی ٨٣ ساڵیدا لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی شاری پەنەمای پایتەخت کۆچی دوایی کرد.

## گای بێرجیس (١٩١١-١٩٦٣)

گای، ئەندامێکی گروپی زانکۆی کەیمبریجی سیخوڕەکانی کۆمۆنیستی، لەشاری دێڤۆنپۆرتی بەریتانیا، لەبنەماڵیەکی زەنگین و کوڕی ئەفسەرێکی کەشتیگەلی

پاشایی، لەدایبک بووە. ناوبراو چووە کۆلێژی کەشتیوانی لە دارتماوس، بەمەبەستی کارکردن لەم بوارەدا بەڵام بەهۆی ئەوەی گوایە کێشەیەکی بینینی هەیە کۆلێژەکەی جێهێشت کە رەنگبوویێت ئەمە تەنیا بیانوویەک بوویێت بۆئەوەی ناوبراو کاری هاوڕەگەزبازیی لەگەڵ قوتابیان کردبوو، و ئەم کارەشی ئاشکرابوو.

گای لەساڵی ١٩٣٠ لە ئامادەیی ئیتن دەرچوو و دواتر رووی کردە زانکۆی کەیمبریج. ناوبراو لەگەڵ ئەنتۆنی بلەنت، جۆن کارینکرۆس، دۆناڵد مککلین و کیم فیلبی لە سەرەتای ساڵانی سییەکاندا لەلایەن دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەت لەو زانکۆیەدا تەجنیدکران. ئەو هاوکاری ئەنتۆنی بلەنتی کرد بۆ ئەنجامدانی کردەی هاوڕەگەزبازیی لەگەڵ دۆناڵد مککلین. لەساڵی ١٩٣٤ لەگەڵ مککلین، فیلبی، و ئەواتی تردا، گای بەسەردانێکی کۆمەڵایەتی گەشتێکی کرد بۆ مۆسکۆ و یەکێتی سۆڤیەت. ناوبراو لەوێدا زۆربەی کاتەکانی بە مەستی بردەسەر. ئەوان شیوعیەتییان وەک چارەسەری کێشەکانی ئەو سەردەمە دەبینی، بەمەش هەواڵدۆزەکانی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB) ئەم دەرفەتەیان قۆستەوە. دوو لە سەرەکیترین ئەو کەسانەی رۆڵی باڵایان هەبوو لەم کارەدا بریتیی بوون لە ئارنۆڵد دیوتچ و تیۆدۆر مالی.

لەساڵی ١٩٣٦، گای دەستی کرد بە پیشەی رۆژنامەڤانی لە هەردوو دەزگای بی بی سی و رۆژنامەی تایمز. لەماوەی جەنگی ناوەخۆی ئیسپانیا، گای وەک پەیامنێر بۆ کارینکرۆس کە ئەوکات لە نووسینگەی بیانی و فیلبی کە لە فەرەنسا و ئیسپانیاوە راپۆرتی دەکرد، کار دەکرد. دوای هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی دووەم، ناوبراو دەستی کرد بە کارکردن بۆ دەزگای هەواڵگریی نهێنی بەریتانی (MI-٦). ئەو تەنانەت لەو کاتەشدا هەر بەردەوام بوو لە پەیوەندییە سۆزدارییە هاوڕەگەزبازییەکەی لەگەڵ بلەنت و خواردنەوەی لەڕادەبەدەری مەی.

لەساڵی ١٩٤٤، وەک ئەفسەری راگەیاندن پەیوەندی بە نووسینگەی بیانییەوە کرد. بۆماوەی شەش ساڵی داهاتوو ناوبراو بەبەردەوامی زانیاری نهێنی بە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB) دەبەخشی. کاتی زێڕینی ئەم بابەتەش بەتایبەتی لەوکاتەوە دەستی پێکرد کە ئەو بوو بە سکرتێری هێکتۆر مکنێل. لەساڵی ١٩٤٧،

ئەو وەک دووەم سکرتێری باڵیۆزخانەی بەریتانی لە واشنتۆن دامەزرا. خواردنەوەی لەرادەبەدەری ناوبراو بووەهۆی ئەوەی گروپی کەیمبریج گومانی لێبکەن لەوکاتەی لە واشنتۆن کاری دەکرد. لەساڵی ١٩٥١، بەهۆی گرفتی زۆری خواردنەوەی مەدی نێردرایەوە ماڵ.

لەساڵی ١٩٥١ بەهۆی سەرکەوتن لە شکاندنی کۆدێک، لێکۆڵەران گومانیان لە بێرجیس و مککلین کرد. هەردووکیان لەلایەن کیم فیلبیەوە ئاگاداکرانەوە کە پەیوەندی بە ئەفسەری سۆڤیەتی کەیسی ناوبراو بکەن. لە بەرواری ٢٥ ئایار لە رۆژی هەینی گای چووە ماڵی مککلین. هەردووکیان بەلەمێکیان گرت بۆ فەرەنسا کە لەوێدا دوو ناسنامەی ساختەیان پێدرا. ئەوان بەناو ڤیێنادا گەشتیانکرد، لە سنووری چیکسلۆڤاکیا پەرینەوە، لەکۆتاییدا خۆیان گەیاندە مۆسکۆ.

هەڵاتنی گای بە نیسبەت مۆسکۆوە جێی سەرسوڕمان بوو. ئەو هەموو بەڵگەنامەکانی لە باڵەخانەکەیدا جێهێشت کە ئاماژەیان بەوەدەدا کینکرۆس کە لەسەرەتادا نکۆڵی لەوە کرد سیخوڕ بووە. هەڵاتنەکەی کیم فیلبیشی تێوەگلاند. لە یەکێتی سۆڤیەت، ئەو ناوی خۆی گۆڕی بە جیم ئەندریڤیچ ئیلیۆت. ناوبراو بەهۆی خواردنەوەی زۆری مەی و سەرخۆشییەوە، لە ٣٠ی ئابی ١٩٦٣ و لەکارکەوتنی گورچیلەکانی سەری نایەوە.[i]

## ئەڤریل هاریمان

ئەڤرێل نوێنەری تایبەتی سەرۆک فرانکلین رۆزڤێلت بوو بۆ کاروباری بەریتانیا لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەم و دواتر بوو بە باڵیۆزی وڵاتەکەی لە مۆسکۆ. ئەو متمانەیەکی تەواوی پێدرابوو لەلایەن سەرۆک جۆن کەنەدی و لەماوەی چەندین ئیدارەی ئەمریکادا وەک راوێژکاری کۆشکی سپی کاری کردووە. بەگوێرەی وتەکانی

---

[i] Costello, John. Mask of Treachery: Spies, Lies, Buggery and Betrayal: The First Documented Dossier on Anthony Blunt's Cambridge Spy Ring. Lanham, MD: Rowman & Littlefield Publishers, ١٩٩١.

-Sutherland, Douglas. Great Betrayal: The Definitive Story of Blunt, Philby, Burgess, and Maclean. New York: Penguin Group, ١٩٨٢.

هەڵاتووی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (KGB)، ئاناتۆلی گۆلیتسین، ناوبراو لە هەمانکاتدا سیخوڕی سۆڤیەتیش بووە کە لەوکاتەی بوو بە باوکی منداڵێک لەکاتی سەردانێکیدا بۆ جۆرجیا لەساڵی ١٩٢٧ تەجنید کراوە.
دوای هەڵاتنی ئاناتۆلی لە هێلسنکی پایتەختی فینلەندا لە کانوونی یەکەمی ١٩٦١، ناوبراو ئاشکرای کرد کە ئەو لەلایەن هاوەڵێکی لە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەتی لەسەردەمی ستالین (NKVD)، کەسێک لەژێر ناوی نهێنی (موگناتیس) کە لەکاری بازرگانیدا زۆر سەرکەوتوو، و لەهامانکاتدا یەکێک بووە لە سەرانی باڵای ئەمریکا لە مۆسکۆ، تەجنید کراوە. دواتر ئاشکرا بوو کە هەڵاتووەکە راستی دەکرد و ئەڤریل سیخوڕی دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت بوو. ناوبراو لەساڵی ١٩٨٦ کۆچی دوایی کرد.

## کاترینا لیونگ

لەژێر ناوی نهێنی پارلۆر مەید لەلایەن ئێف بی ئای، کاترینا لەساڵی ١٩٩٧ چەندین بەڵگەنامەی نهێنی لە جانتای ئەفسەرێکی ئێف بی ئای بەناوی سمیس دەرهێناوە و دواتر هەموویانی کۆپی کردووە وە کاتێک لەساڵی ٢٠٠٢ماڵەکەی پشکنرا، پەڕاوێکی تۆماری پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ کەسێکی چینی دۆزرایەوە. هەرچەندە نە کاترینا و نە سمیس بەتۆمەتی سیخوڕی تۆمەتبار نەکران، بەڵام کەیسەکە ئەوەی دەرخست کە ئێف بێ ئەی ماوەیەکی درێژ بووە چالاکییەکەی ئەنجامداوە.
ناوی راستەقینەی کاترینا چی وین لینگ بوو کە لەشاری گوانژۆ لەدایک بووە و لە هۆنگ کۆنگ لەلایەن سوسان چین پەروەردە کراوە. یەکەم هەوڵی پەیوەندیکردن بە کۆماری چینی میللی لەشاری نیۆیۆرک لەساڵی ١٩٧٢ روویداوە کاتێک لەگەڵ ئەو وڵاتە وەک خۆبەخشێک لە نەتەوەیەکگرتووەکان کاری دەکرد.
کاترینا خاوەنی کاری خۆی بوو کە کۆمپانیایەکی راوێژکاریی بوو لە کالیفۆرنیا و بەڕێوەبەری ئەنجومەنی کاروباری جیهانی لۆس ئەنجلس بوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەندامێکی پارەدەری کەمپینی پارتی کۆمارییەکان بوو. ناوبراو زیاتر لە حەفتا و یەک گەشتی دەرەوەی ئەمریکای ئەنجامدا لەماوەی بیست ساڵدا کە وەک هەواڵدۆزێک

بۆ ئێف بی ئای کاری دەکرد بەڵام پانزە گەشتیان هەر بە نهێنی مانەوە. لەم گەشتانەدا، دەوترێت کە ناوبراو لە پەیوەندیدا بوو لەگەڵ ئەفسەرانی وەزارەتی ئاسایشی دەوڵەت لە ۲۱۰۰ بۆنەدا و دیارییەکی بەبڕی سەد هەزار دۆلار لەلایەن یانگ چانکونگ، سەرۆکی چینی میللی، پێبەخشراوە.

سمیس، کە بۆ چەند ژوانێکی دڵداریی لە لەندەن، هاوای، و هۆنگ کۆنگ چاوی بە کاترینا کەوتبوو، درکی بەوە کردبوو کە کاترینا خەریکی کۆپیکردنی بەڵگەنامەی نهێنییە لە جانتاکەیدا، وە زانیشی کە کاترینا سیخوڕی دووسەرە بوو بۆ وەزارەتی ئاسایشی دەوڵەتی وڵاتی چین، سەرەڕای هەموو ئەمانەش هێشتا هەر بەردەوام بوو لە پێدانی زانیاری نهێنی بە ناوبراو هەرچەندە دەشیزانی کە تاکە ئامانجی کاترینا تەنیا بەکارهێنانی ئەوە. کاتێک لەگەڵ ئێف بی ئای رووبەڕوو بووەوە، سمیس نکوڵی کرد کە هیچ پەیوەندییەکی سێکسی هەبووبێت لەگەڵ کاترینای شۆخ و شەنگدا. کاترینا لەگەڵ هەواڵدۆزێکی تری ئێف بی ئای بەناوی ویلیام کلیڤلاند تێوەگلابوو، کە بەرپرسی ئاسایشی بوو لە بنکەی توێژینەوەی نیشتیمانی چەکی ناووکی لە کالیفۆرنیا. ئەو دانی بەوەدانا کە لەساڵی ۱۹۸۸ەوە تا کاتی خانەنشینبوونی لەساڵی ۱۹۹۳ پەیوەندی سێکسی هەبوو لەگەڵ کاترینا، وە ئەوەشی وت کە پەیوەندییەکە سێکسییەکە هەر بەردەوام بوو تا ساڵانی ۱۹۹۷ و ۱۹۹۹. تەنانەت پەیوەندییە سۆزدارییەکە تا ئەو رادەیەش بوو کە دوای ئەوەی ناوبراو درکیشی بەوەکرد کە کاترینا پەیوەندی رێگاپێنەدراوی هەبوو لەساڵی ۱۹۹۱ لەگەڵ دەزگای هەواڵگری وەزارەتی ئاسایشی دەوڵەت (MSS).

وەک دیاربوو کاترینا لەبەرژەوەندی وەزارەتی ئاسایشی دەوڵەت و جەنەراڵی چینی جی شینگدی کاری دەکرد بۆئەوەی بتوانێت دەستی بە چەند بەڵگەنامەیەکی سیاسیی بگات کە چ پلانێک دادەڕێژرێت لەدژی وڵاتی چین. دوای گومانێکی زۆر لە کاترینا، ئێف بی ئای بڕیاریدا کە تاقیکردنەوەیەکی درۆگریی (polygraph) لەسەر ناوبراو ئەنجام بدەن. بەڵام ئەوە جێگای سەرسوڕمان بوو لە تاقیکردنەوەکەیدا بەسەرکەوتوویی هاتەدەر. لەڕاستیدا، سمیس خۆی نزیکەی نۆزدە فایلی راپۆرتی

خەملاندنی لەسەر کاترینا هەبوو کە بە کەسێکی "متمانەپێکراو" وەسفی دەکرد. وە دواتر لەساڵی ١٩٩١ هەر خودی سمیس بۆی دەرکەوت کە کاترینا بە لێشاو راپۆرتی بۆ دەزگای هەواڵگری چینی ناردووە لە پەکین و هیچ دوورنەبوو کە سیخوری دووسەرە بوبێت، ئەگەر سێ سەرە نەبووبێت.

## ئۆلگا چیخۆڤا

ئۆلگا چیخۆڤا لەدایک بووی شاری کنێبیری روسیە، کە بە جوانی و زیرەکی رێکپۆشی ناسرابوو، لەدوای ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ کورەزای نووسەری روسی بەناوبانگ ئەنتۆن چیخۆف ئەو نازناوەی بەسەردابرا، کە هەر بەم هۆکارە توانی لە پەیمانگای مۆسکۆ بۆ هونەری شانۆ وەربگیردرێت، یەکەمین مامۆستای کە دەرهێنەری بەناوبانگ کۆنستانتین ستانیسلافسکی بوو کە هەستی بەوە کرد کە ئۆلگا لەبوارەکەی خۆیدا سەرکەوتوو دەبێت چونکە لێهاتوویەکی زۆری تێدا بەدی دەکرد و پێشبینی دەکرد لەداهاتوودا ببێتە ئەستێرەیەکی بواری شانۆ و بچێتە رێزی شانۆکارە گەورەکانی جیهانەوە. بەڵام ئۆلگا لەژیانی خێزانیدا کەسێکی شکست خواردوو بوو، دوای لەدایک بوونی کورەکەی لە مێردەکەی جیابووەوە، دوای بەرپابوونی شۆرشی بەلشەفی لە روسیا بارودۆخەکە نائارام بوو، سەرئەنجام شەری ناوخۆی لێکەوتەوە و بەم هۆکارە ئۆلگا لەساڵی ١٩٢٠ روسیای بەرەو ئەڵمانیا جێهێشت. لە ئەڵمانیا ئۆلگا ژیانێکی نوێی دەستپێکرد، سەرەتا وەک شانۆکار لە چەند شانۆییەکی بچووکدا بەشداری کرد، بەڵام بەهۆی لێهاتوویی لەبوارەکەی خۆیدا هەرزوو ناوبانگی دەرکرد. سەرنجی زۆرێک لە دەرهێنەرە سینەماییەکانی راکێشا و لە زۆر فیلمی سینەماییدا بەشداری کرد و سەرکەوتنێکی گەورەی بۆ خۆی تۆمارکرد، کە ئەمەش وای کرد رۆژ لە دوای رۆژ ناوبانگی لە زیادبووندا بێت، وە لەساڵانی سییەکان لە نزیکەی ١٠٠ فیلمی سینەماییدا بەشداریکرد تا ئەوکاتەی کە بوو بە ئەستێرەیەکی درەوشاوە لە بواری سینەمادا. وە دوای ئەوەی لەساڵی ١٩٣٣دا هیتلەر دەسەڵاتی گرتەدەست ئۆلگای بانگهێشت کرد بۆ ئاهەنگێکی پێشوازی کردنی فەرمی، بەدڵنیاییەوە ئەم کچە

روسیە بە جوانیەکەی سەرنجی زۆرێک لە گەورە بەرپرسانی پارتی نازی راکێشا، وە لەو کاتەوە هیتلەر بۆ زۆرێک لە ئاهەنگە فەرمییەکان بانگهێشتی دەکرد و تەنانەت هیتلەر و دارودەستەکەی بینەری زۆرێک لەو فیلمانە بوون کە ئۆلگا رۆڵی سەرەکی تێدا دەبینی. ئەو کاتەی کە ئۆلگا گەیشتبووە لوتکەی ناوبانگ و سەرجەم دەرگاکان لە بەردەمیدا کراوە بوون و دەیتوانی راستەوخۆ پەیوەندی دروست بکات لەگەڵ هیتلەر و گەورەبەرپرسانی پارتی نازی لەلایەن دەزگای هەواڵگری روسیەوە وەک کەسێکی بەسوود سەیر دەکرا، کەسێک کە لە توانایدا هەیە زانیاری گرنگ لە دەمی بەرپرسانی سوپا و پارتی نازی دزەپێبکات بەهۆی نزیکی و بوونی متمانە لە نێوانیاندا.

یەکێک لە ئەفسەرانی هەواڵگری روسی کە ناوی جەنەراڵ باڤێل سۆدۆپلاتوف بوو، ئۆلگای بە یەکێک لە کارمەندەکانی هەواڵگری روسی داناوە و ئاماژەی بەوە کردووە کە لەساڵی ١٩٤٢ دا هەواڵگری روسی پلانی دارشتووە بۆ غافڵکوژی کردنی هیتلەر و ئۆلگاش رۆڵێکی سەرەکی لەو پلانەدا بۆ دیاریکراوە، بەهۆی پەیوەندیە بەهێزەکەی بە هیتلەر و بەرپرسانی حیزبی نازی، بەڵام لە چرکەساتی کۆتایی بریاردان بۆ ئەنجامدانی ئەم پلانە جۆزێف ستالین ئەنجامدانی ئەم پلانەی رەتکردووەتەوە، بەهۆی ئەوەی هیچ بەڵگەیەک نەبووە کە بیسەلمێنێت کە ئۆلگا یەکێک بووە لە سیخورەکانی هەواڵگری روسی و هەروەها ترساوە لەوەی کە ئۆلگا کار بۆ هەواڵگری ئەڵمانی، گۆستاپۆ، بکات. بەڵام لە بەهاری ساڵی ١٩٤٥ رووداوێک روویدا کە جێگەی گرنگیپێدانە، لەو ساڵەدا کە کۆتا ساڵی جەنگی جیهانی دووەم بوو بەرلین لەلایەن رووسەکانەوە گەمارۆدرابوو، وە هیتلەر چەند رۆژێکی لە ژیاندا مابوو، ئەفسەرێکی هەواڵگری روسی لە مانگی نیساندا ئۆلگا بە فرۆکەیەکی تایبەتی دەگوازێتەوە بۆ مۆسکۆ و لە جێگەیەکی نادیاردا دەیشارێتەوە، وە دوای دوو مانگ ئەو ئەفسەرە ئۆلگا دەگەرێنێتەوە بۆ بەرلین و فەرامۆشی دەکات.

ئۆلگا لە ئاهەنگێکدا لە تەنیشت هیتلەر دادەنیشێت

بەڵام ئەم رووداوە چۆن شرۆڤە دەکرێت؟ ئەوەی زانراوە لە فایلەکانی دەزگای هەواڵگری روسی کە ئۆلگا وەک دوژمن لەلایەن رووسەکانەوە سەیرکراوە لەبەر پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ هیتلەر و نازییەکان، بەڵام ستالین بە دوژمن داینەناوە، خودی ئۆلگا چیخۆڤا لە بیرەوەریەکانیدا دەربارەی ئەو رووداوە نووسیویەتی کە ئەفسەرە روسیەکە دەربارەی مۆسیقا و هونەر و پەیوەندیەکانی بە نازییەکانەوە پرسیاری لێکردووە، بەڵام چاودێران ئاماژە بە ناڕاستی ئەم زانیاریانە دەکەن و دەڵێن کە ئەفسەرەکەی هەواڵگری روسی دەیتوانی لە بەرلینیش ئەو پرسیارانە لە ئۆلگا بکات، وەک چۆن جەنراڵ سۆدۆبلاتۆف دەڵێت کە ئۆلگا زانیاری گرنگی دەربارەی نازییەکان پێشکەشی رووسەکان کردووە. هەروەها، لەساڵی ١٩٤٥ چەند پروپاگەندەیەک بڵاوکرایەوە کە ئاماژەیان بەوە دەکرد کە ستالین ئۆلگای خەڵات کردووە بەهۆی خزمەتی زۆری بە هەواڵگری روسی، کە ئەم هەواڵەش لە رۆژنامە ئەوروپیەکاندا هەرایەکی زۆری نایەوە بەڵام ئۆلگا هەموو ئەو هەواڵانەی رەتکردەوە. رۆژنامەیەکی ئەمریکی لە پاییزی ساڵی ١٩٤٥ بابەتێکی لەژێر ناونیشانی (ئەو ژنە سیخوڕەی دڵی هیتلەری فڕاندبوو) بڵاوکردەوە، کە ئاماژەی بەوە دەکرد کە "ئۆلگا چیخۆڤای ئەستێرەی سینەمایی و باشترین ئەکتەر بەلای هیتلەرەوە کاری بۆ هەواڵگری روسی کردووە." ژیانی ئەم ئافرەتە پڕیەتی لە نهێنی کە زۆربەیان تا

ئەمڕۆش ئاشکرانەکراون. دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم، ئۆلگا لە ئەڵمانیای رۆژئاوا کۆمپانیایەکی بواری جوانکاری خانمانی دامەزراند و لەکۆتاییدا لەساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کرد، وە تا ئەمڕۆش ئۆلگا بە یەکێک لە شاراوەترین و نهێنی ئامێزترین ئافرەتی سەدەی بیستەم دادەنرێت.

## ئەلبێخ سانچێز

ئەلبێخ رامێرز سانچێز ناسراو بە کارلۆس چەقەڵ، لە ١٢ ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٥٠ لە خێزانێکی فەنزوێللی لە کاراکاسی پایتەختی ڤەنزوێلا لەدایک بووە، لەبنەماڵەیەکی شیوعی، باوکی کارلۆس هەرسێ ناوەکەی رابەری شۆڕشی بەلشەفیکی روسی لە منداڵەکانی نابوو، واتە ئەلبێخ، فلادیمێر، لینین. ئەو خوێندنی زانکۆی لە مۆسکۆ تەواو کردووە، لە مۆسکۆ لە زانکۆی باتریس لومومبا لەساڵی ١٩٦٩ تا ساڵی ١٩٧١ ماوەتەوە، لەو ماوەیەدا لەسەر کاری تێکدەرانە و نیشانە شکاندن و تەقینەوە راهێنراوە. لەڕاستیدا ئەو زانکۆیەی کە کارلۆس لێی دەخوێند لەلایەن دەزگای هەواڵگری رووسیەوە بەردەوام چاودێری دەکرا بۆ بەکرێگرتنی سیخوڕە غەیرە روسیەکان و ناوبراو لەو ماوەیەدا فێری چەند زمانێکی جیاواز بوو وەک: عەرەبی و ئەڵمانی و فەرەنسی. لەساڵی ١٩٧٥ بڕوا بە ئایینی ئیسلام دەهێنێت و پەیوەندی دەکات بە رێکخراوە تیرۆرستیە فەڵەستینیەکانەوە، لە وانە رێکخراوی (الجبهة الشعبية) بەڵام لەلایەکی ترەوە لە پەیوەندیدا بووە لەگەڵ KGB دا. لەو کاتانەدا هاریکاریەکی زۆر هەبوو لەنێوان رێکخراوە تیرۆرستیە فەڵەستینیەکان و رێکخراوە تیرۆرستیەکانی تری ئەوروپا و ژاپۆن، کارلۆسیش پەیوەندی بەسەرجەم ئەو رێکخراوانەوە هەبوو لەگەڵ ئەندامەکانیدا پێکەوە چالاکیان لە سەرجەم ناوچەکانی ئەوروپا دژی بەرژەوەندیەکانی ئیسرائیل و ئەمریکا ئەنجام دەدا.

لەساڵانی حەفتاکاندا جەنگێکی هەواڵگری لەنێوان مۆساد و رێکخراوە فەڵەستینیەکاندا هەڵگیرسا هەردوولا کاریان بۆ ئەنجامدانی چالاکی دەکرد دژی یەکتری، زۆربەی ئەو چالاکیانەی کە تیرۆرستە فەڵەستینیەکان ئەنجامیان دەدا

تەقینەوە و تەقەکردن بوو لە ئەندامانی حکومەتی ئیسرائیلی و مۆساد لە جیهان و ئەورووپا بەتایبەتی. بۆیە، هەرزوو مۆساد کەوتەخۆی و چەندین تیپی تۆڵەسەندنەوەی لە جیهاندا چالاک کرد کە بەزۆری بەناردنی نامەی بۆمبڕێژکراو ئامانجەکانیان لەناودەبرد و دواتر چاندنی بۆمب و تەقاندنەوەی لەڕێگەی ئامێری بێتەڵەوە جێگای ئەم تەکنیکەی گرتەوە. بێگومان مۆساد هەستی بەوە کرد کە ئەوەی لە پشت زۆربەی چالاکیەکانی تیرۆرستە فەڵەستینیەکانەوەیە سیخوڕێکی جیهانییە کە لای زۆربەی دەزگای هەواڵگری وڵاتان فایلی هەیە و ئەو سیخوڕەش کارلۆس بوو.
کارلۆس لەسەرەتادا زۆر ناسراو نەبوو، هەندێک کەس ئەویان بە "چەقەڵ" دەناساند بەهۆی لێکچوونی لەگەڵ کەسایەتی پاڵەوانی ڕۆمانێک بەناوی "ڕۆژی چەقەڵ)" کە نووسەرەکەی فریدریک فوریس بوو، هەر ئەوەندەی کە دەستەکەی کەشف بوو مۆساد کاری کرد بۆ تیرۆرکردنی بەڵام هەرزوو ئەفسەرانی مۆساد بۆیان دەرکەوت کە کارلۆس سیخوڕێکی ئاسایی نییە و بەڵکو ئەو زۆر فێڵباز و وریایە لە خۆ وونکردن و خۆحەشاردان. هەرئەوەندەی هەستی بکردایە شوێنی کەوتوون لەدەرفەتێکدا جلوبەرگەکانی دەگۆڕی و هەروەها پاسپۆرتەکانیشی زوو زوو دەگۆڕی. یەکێک لە سیخوڕەکانی مۆساد دەربارەی کارلۆس وتوویەتی: "ئێمە دەتوانین لەگەڵ هەر سیخوڕ و تیرۆرستێکدا هەڵسوکەوت بکەین تەنها لەگەڵ ئەم کابرا سەیرو سەمەرەیەدا نەبێت کە هەر ڕۆژەی لەگەڵ ئافرەتێکدایە و هەرئەوەندەی ئافرەتێکی ناسی ئیتر گومانی لێدەکات و لێی دووردەکەوێتەوە". لەساڵی ١٩٧٧ لە گەرمەی جەنگی هەواڵگری نێوان مۆساد و ڕێکخراوە تیرۆرستیە فەڵەستینیەکان، کارلۆس یەکێک بوو لەو کەسانەی کە ناوی لە لیستی ڕەشی مۆساددا بوو بەڵام چالاکیەکانی مۆساد لەو ساڵانەدا ئەنجامێکی وایان بەدەستەوە نەدا جگە لە کوشتنی محمد ساڵح، سەرۆکی مەکتەبی ڕێکخراوی ئازادی فەڵەستین، لە پاریس. کارلۆس دوای ماوەیەک لە دیارنەمانی دووبارە دەرکەوتەوە و جگە لەسەرپەرشتی کردنی ئەندامانی تۆڕەکەی خۆشی چالاکی تیرۆرستی ئەنجام دەدا. .

کارلۆس لەتافی لاویەتیدا

زۆربەی هەوڵەکانی مۆساد و CIA بۆ لەناوبردنی کارلۆس بێ ئەنجام بوون تا ئەوکاتەی مۆساد پەیوەندی کرد بە دەزگای نهێنی بەریتانی و هەواڵگری فەرەنسی و کەوتە زانیاری گۆڕینەوە لەگەڵیاندا دەربارەی کارلۆس، ئەوەیان بۆ ئاشکرا بوو کە کارلۆس هاوشێوەیەکی هەیە کە زۆر لە خۆی دەچێت کە ڕێنمایی لە KGB وەردەگرێت و وەک فیڵێک بۆ چاوبەستکردن سوودی لێوەردەگرن. بۆیە مۆساد هیچ چارێکی نەما جگەلەوەی کە چاودێری پەیوەندی ڕێکخراوە فەڵەستینیەکان بکات بە ڕێکخراوە تیرۆرستیەکانی تری جیهانەوە وەک ڕێکخراوی سوپای سوری ژاپۆنی کە لەوکاتانەدا لەلایەن ئەندامەکانیەوە چالاکی تیرۆرستیان لە فەرەنسا ئەنجام دەدا و پەیوەندیان بە فەڵەستینیەکانەوە هەبوو. لەژێر ڕۆشنایی ئەم ڕێنماییانەی مۆساد، پۆلیسی فەرەنسا ژاپۆنییەکیان دەستگیرکرد کە بڕێک پارەی ساختە و سێ پاسپۆرتی پێبوو بەو گومانەی کە پەیوەندی بە کارلۆسەوە هەیە بەڵام نەیانتوانی هیچ زانیاریەکی لێدەربێنن دەربارەی کارلۆس و هاوڕێ ژاپۆنییەکانیشی لەکۆتاییدا توانیان ئازادی بکەن بە هێرشکردنەسەر باڵیۆزخانەی فەرەنسا و کارلۆسیش بەردەوام بوو لە چالاکیە

تێکدەرانەکانی دژی بەرژەوەندیەکانی ئیسرائیل و لەو ماوەیەدا چەند هێرشێکی تیرۆرستی ئەنجامدا گرنگترینیان هێرشکردنە سەر فرۆکەیەک بوو لە فرۆکەخانەی عال لە ئورلی بە بەکارهێنانی چەکی R.B.G کە لەو بڕوایەدابوو کە وەزیری دەرەوەی ئیسرائیلی تێدایە بەڵام گوللەکان بەر فرۆکەکە نەکەوتن و کارلۆسیش دووبارە خۆی ون کرد و مۆسادیش بەردوام بوو لەگەڕان بەدوایدا.

پاش ماوەیەک دووبارە دەنگۆی پەیدا بوونەوەی هاوشێوەکەی کارلۆس بڵاو بووەوە. لەو ماوەیەدا کارلۆس توانی چارەکە ملیۆنێک دۆلاری ساختە بگەیەنێتە ئیسرائیل و لە بازاڕی رەشدا ئاڵوگۆڕی پێبکات لەڕێگەی چەند کەسێکەوە کە دواتر هەواڵگری فەرەنسی توانی یەکێک لەو کەسانە دەستگیر بکات، پاشان رازی بکات تا پەیوەندی بە کارلۆسەوە بکات و لەم رێگەیەوە شوێنەکەی بزانن بەڵام کارلۆس زۆر زیرەکانە رەفتاری کرد و توانی ئەو کەسە بکوژێت و لە پەنجەرەی شوقەکەیەوە رابکات و جارێکی تریش خۆی لەبەرچاوان ون بکات. دوای ئەم رووداوانە کارلۆس بۆ ماوەیەک دیارنەما، پاشان لە چیکۆسلۆڤاکیا سەری دەرهێنا دواتر لە سویسرا و پاشان لە نەمسا و لە ڤیەننای پایتەختی نەمسا بەهاوکاری تیرۆستە فەڵەستینیەکانی سەربە رێکخراوی (الجبهة الشعبية) توانیان لە کاتی کۆبوونەوەی وەزیری نەوتی ١١ وڵاتی ئەندام لە رێکخراوی نێودەوڵەتی بەرهەمهێنانی نەوتی ئۆپیک هێرش بکەنەسەر کۆبوونەوەکە و هەر یانزە وەزیرەکە و ٦٩ کەسی تر بە بارمتە بگرن کە دواتر لەژێر هەڕەشەی چەکدا بەرەو جەزائیر گواستیانەوە.

دوا هەواڵ دەربارەی کارلۆس ئەوەی ئاشکرا کرد کە ناوبراو لە ناوچەی کەنداوی فارسدا بینراوە، هەندێک دەیانووت کە لە دوبەی بینویانە و چەند جارێکیش سەردانی بەغدای کردووە، ژمارەی چالاکیەکانی کارلۆس کە دژی ئیسرائیل و ئەمریکا و هاوپەیمانەکانیان ئەنجامیدا بە پەنجەی دەست ناژمێردرێت، ئەو یەکێکە لە گەورە سیخوڕانی سەدەی بیستەم کە بە لێهاتوویی و فێڵبازی ناسراوە و توانیویەتی شکست بەزۆربەی ئەو هەوڵانە بهێنێت کە بۆ دەستگیرکردن و کوشتنی درابوو، بەڵام لە کۆتاییدا و لەساڵی ١٩٩٤دا بەپێی پلانێکی هاوبەشی نێوان حکومەتی سودان و

هەواڵگری فەرەنسی، کارلۆس بە فڕۆکەیەک لە سودانەوە بەرەو فەرەنسا فڕێنرا. پاش دادگایی کردنی، دادگا تۆمەتی ئاراستە کرد بە کوشتنی دوو پۆلیسی فەرەنسی و سزای زیندانی هەتا هەتایی بەسەردا سەپێنرا و تا ئەمڕۆش لە زینداندا لەژێر چاودێری و پاسەوانی توندوتۆڵ دایە، بەڵام ڕێگەی پێدەدرێت چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی بکات و ئەو هەمیشە پاساوی ئەوە ئەهێنێتەوە کە سەرجەم چالاکیەکانی لەپێناو دۆزی فەڵەستیندا بووە.

## بن عامی

لەنیسانی ٢٠٠٨، بن عامی تەمەن ٨٤ ساڵ بەتۆمەتی سیخوڕیکردن بۆ ئیسرائیل لەساڵی ١٩٧٩ تا ١٩٨٥ دەستگیرکرا. ناوبراو چوار تۆمەتی پیلانگێڕی درایەپاڵ، لەوانە پێدانی زانیاری بەرگری نیشتیمانی بە ئیسرائیل و هەواڵدۆزی تۆمارنەکراوی ئیسرائیل. عامی لەبەردەم کارمەندانی ئێف بی ئایدا دانی بەوەدانا کە ناوبراو لەنێوان پەنجا تا دووسەد بەڵگەنامەی نهێنی بە ئیسرائیل داوە. هەروەها راشیگەیاند کە ئەو هیچ قەرەبوویەکی دارایی نەکراوە لەهەمبەر پێدانی ئەم بەڵگەنامانەدا، تەنیا ئەوە نەبێت جاربەجار دیاری بچوکی پێدەدرا یان بانگهێشتی نانی ئێوارە دەکرا.

عامی لە شاری کنێکتیکەت لەدایک بووە و لەماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا لە هەردوو سوپای ئەمریکا و بەریتانیادا خزمەتی کردوو. ناوبراو لە ئینتیدابی بەریتانی فەڵەستیندا گەورە بووە. لەساڵی ١٩٦٣ تا ١٩٩٠، عامی فەرمانبەر بووە لە ناوەندی ئەندازیاری و پێشخستن بۆ لێکۆڵینەوە. لەو ماوەیەدا، بەرپرسی کەیسی عامی، کە کەسێکی ئیسرائیلی بوو، لیستێک زانیاری پێبەخشی کە هەوڵبدات و بەدەستیان بهێنێت. ئەو زانیاریانەی عامی بە ئیسرائیلی بەخشی بریتیی بوون لە زانیاری دەربارەی فڕۆکەی ئێف-١٥ شەڕکەر، موشەکی پاتریۆت، و چەکی ناووکی.

یوسی یاگور، کە بەرپرسی کەیسی ناوبراو بوو لە مۆساد، پێدەچێت هەر هەمان کەس بووبێت کە بەرپرسی کەسی جۆناسان پۆلارد بووبێت کە بەتۆمەتی سیخوڕیکردن بۆ ئیسرائیل تۆمەتبارکرا و زیندانیی تا هەتایی بۆ بڕایەوە. یوگور، لەگەڵ بەرپرسێکی

باڵیۆزخانەی ئیسرائیل بەناوی ئیلان راڤید لەساڵی ١٩٨٥ لەلایەن حکومەتی ئیسرائیلەوە بانهێشتکرانەوە. عامی لەمانگی ئازاری ٢٠٠٨ لەلایەن راڤید ئاگادارکرابووەوە کە بەرپرسانی ئەمریکا خەریکی لێکۆڵینەوەن لەناوبراو تا بەڵگەی پێویست بدۆزنەوە کە ئەو سیخوڕی دەکات وە رێنماییشیان دایە کە یەک وشە لە دەمی دەرنەچێت.
بن عامی لەلایەن هاوڕێکانیەوە وەک هاوڵاتییەکی نیشتیمانپەروەری ئەمریکا بەرگریی لێکرا کە بەتووندی بڕوای وابوو دەبێت دەوڵەتێکی جوو دروست ببێت کە تیایدا جووەکان بتوانن مەراسیمە ئاینیەکانیان بەبێ گرفت ئەنجام بدەن.[1]

## ئینگا ئارڤاد

ئارڤاد کچێکی شۆخ و شەنگی لیوناڵی پرچ زەردی دانیمارکی بوو. ناوبراو بۆ خوێندن رووی لە ئەمریکا کرد بۆئەوەی لە بەشی رۆژنامەڤانی لە زانکۆی کۆلۆمبیا دەست بە خوێندن بکات وە لەهەمانکاتیشدا وەک ستوون نووسێک لە رۆژنامەی واشنتۆن تایمز هێراڵد کاری دەکرد. هەرلەوێ چاوی کەوت بە کاتلین کەنەدی، کە لە کانوونی یەکەمی ١٩٤١ ئارڤاد، پۆل فیژۆسی تەمەن بیست و هەشت ساڵی دووجار جیابووەوە لە خێزانی و جۆن ئێف کەنەدی، ناساند بەمەبەستی چاوپێکەوتنێک کە دواتر لە گۆڤارەکەدا بڵاوبووەوە. هەرچەندە ئارڤاد چوارساڵ لەو گەورەتر بوو، کە لە نووسینگەی هەواڵگری دەریایی کاری دەکرد، هەردووکیان بەرەزامەندی هەردوولا کردەی سێکسیان ئەنجامدا کە دواتر بووە هۆی ئەوەی دەزگای ئێف بی ئای لێکۆڵینەوەیەکی کردەی سیخوڕی ئەنجامبدات کە گومان هەبوو ئارڤاد سیخوڕێکی ئەڵمانی بێت.

[1] Black, Ian, and Benny Morris. Israel's Secret Wars: The Untold Story ofIsraeli Intelligence.London: Hamish Hamilton, ١٩٩١.
-Raviv, Dan, and Yossi Melman. Every Spy a Prince: The Complete History of Israel's Intelligence Community. Boston: Houghton Mifflin, ١٩٩٠.

بەپێی فایلی ئێف بی ئای، ئارڤاد چاوپێکەوتنی لەگەڵ چەندین ئەندامی باڵای نازییدا ئەنجامداوە لەساڵی ١٩٣٦ لەوکاتەی روماڵی يارييەکانی ئۆلۆمپی دەکرد، وەک ئەدۆلف هیتلەر، وە ئەو کارئاسانییەی بۆی دەکرا لە دەستگەیشتن بەو کەسایيەتيانە وایکرد گومانی ئەوە بکەن کە لە کردەی سیخوڕی تێوەگلاوە. لە يارييەکانی ئۆلۆمپيدا، ئەو لە شوێنە تايبەتييەکانی هیتلەر وەک میوان پێشوازی لێدەکرا لەوکاتەی کە وێنەگرەکان بە بەردەوامی وێنەکەیان دەگرت. ناوبراو لە زەماوەندی هێرمان گۆرینگ ئامادەبوو، وە لە يەکێک لە وتەکانیدا ئەو دەڵێت کە هیتلەر "شەڕانگێز نەبووە هەروەک وێنەکەی لەلایەن دوژمنەکانی ئەڵمانیاوە کێشراوە." وە "بەبێ گومان هیتلەر ئایدیالیست بووە." هەروەها ئارڤاد دۆستێکی نزیکی ئەکسیک ڤینەر گرین بووە کە زڕبرای گۆریگ بوو و خاوەنی یەختی کرۆسی باشوور بوو. جگە لەمەش، چەندین کەس گوێيان لە ئارڤاد بووە گەزافی لێداوە کە جاک کەنەدی "هێشتا زۆری ماوە فێر بێت و من خۆشحاڵ ئەبم فێری بکەم."

کاتێک ئابڕووچوونەکە دەربارەی پەيوەندی سۆزدارييان هەڕەشەی کردەسەر ژيانی لە واشنتۆن، کەنەدی گواسترایەوە بۆ بارەگای شەشی دەريايی لە چارلستۆن، کارۆلاینای باشوور؛ ئارڤاد بەدوايداچوو و هەموو پشووەکانی هەفتەدا لە مۆتێل سەمتەر و فرانسیس ماریۆندا گیرسایەوە. ئێف بی ئەی هەڵسا بەدانانی مایکرۆفۆنێکی بچووک لە ژوورەکەیدا و بەمەش، بەبەڵگەی پێویستەوە، رایگەیاند کە هەردووکیان چەندین ژوانی دڵدارييان بەستووە، وە "کەنەدی و ئارڤاد لە چەندین بۆنەدا سێکسیان کردووە لەژووری ژمارە ١٣٢ی هۆتێلی سەمتەر فۆرت. هەموو ئەو جمووجۆڵانە لەلایەن ئێف بی ئایەوە بە وردی چاوەدێرییان دەکرا، ئەمەش بەهۆی گوێهەڵخستن لە سەرجەم پەيوەندييەکانی ناوبراو کە بەهۆی دانانی ئامێری سیخوڕی لە ماڵەکەیدا. راپۆرتەکانی ئێف بی ئای ئاماژەیان بەوەکرد کە هەردووکیان چەند جارێک باسیان لە ئەگەری هاوسەرگیریکردن کردۆتەوە، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی ئارڤاد بۆ رەواندنەوەی چەند گومانێکی کەنەدی، رێگایدا بەوەی کە دووگیان بێت بۆئەوەی بەتەواوی گومانەکەی برەوێنێتەوە.

ئارڤاد لەگەڵ هیتلەردا دەردەکەوێت

دەزگا چاودێرییەکانی ئێف بی ئای ئاشکرایان کرد کە ئارڤاد چەند پەیوەندییەکی سێکسی لەگەڵ خۆشەویستە دانیمارکیە کۆنەکەی بەناوی نیکس بۆلک هەبووە بەڵام دوای جیابوونەوەیان لەساڵی ١٩٤٢ ئارڤاد چووە کالیفۆرنیا و شووی بە تیم مککۆی کرد، کە ئەوکات ئەستێرەیەکی گەشتی بواری سینەما بوو. لەکۆتاییدا، ئێف بی ئای نەیتوانی بەبەڵگەوە بیسەلمێنێت کە ناوبراو هەرگیز سیخوڕی بووە.

## واڵتەر دورانتی

واڵتەر پەیامنێری خانەنشینی رۆژنامەی نیویۆرک تایمز بوو لە مۆسکۆ بۆماوەی دوازدە ساڵ تا ١٩٣٤، کە دەرفەتێکی ئاوازەی پێدرا بۆئەوەی لەساڵی ١٩٢٩ چاوپێکەوتنێک لەگەڵ جۆزێف ستالیندا بکات. دواتر، ناوبراو کەوتەنێو داوی دەزگای هەواڵگری ئەو وڵاتە کاتێک دەزگاکە لە بارێکی زۆر هەستیاردا گرتی کە خەریکی ئەنجامدانی کاری سێکس بوو لەگەڵ دڵدارە هاوڕەگەزبازەکەی. لەو رۆژە بەدولوە،

دورانتی هەرەشەی لێکرا بەوە کە ئەگەر راپۆرتەکانی لە مۆسکۆوە پاڵپشتی هێڵی پارتی کۆمۆنیستی نەبن، ئەوا بەبێ دوودڵی کارەکەی ئاشکرا دەکرێت و پیشەکەی کۆتایی دێت و ئابرووشی دەچێت. بەم بۆنەیەوە، دورانتی یەکێک بوو لە چەندین پەیامنێری بیانی کە چەندین راپۆرتیان ناردەوە بۆ وڵاتەکانیان دەربارەی رژێمی ستالین و هەموو دۆخەکانی تری ژیانیان، وەک برسیەتی بەهۆی سیاسەتی ستالینی کشتوکاڵی کە بووە هۆی برسیەتی لەسەرتاسەری ئۆکرانیا، لە راپۆرتەکانیاندا باسیان نەدەکرد. تاکە رۆژنامەڤانێک کە لەبارەی ئەم بابەتەوە دەینووسی لە رۆژنامەی مانچستەر گاردیان، مالکۆلم موگێریج بوو، کە دورانتی زانیارییەکانی بەنهێنی بۆ دەگواستەوە.

دورانتی، کە لەشاری لیڤەرپول لەساڵی ١٨٨٤ لەدایک ببوو و لاقێکی لە رووداوێکی رێگای شەمەندەفەر لە فەرەنسا لەساڵی ١٩٢٤ لەدەست دابوو، لەساڵی ١٩٣٢ خەڵاتی پولتیزەری پێبەخشرا بەهۆی راپۆرتەکانیەوە لە رووسیا، و بەڵام دواتر کە زانرا ناوبراو کەوتۆتە نێو چ تەڵەیەکەوە، هەوڵی زۆر درا بۆنەوەی خەڵاتەکەی لێ وەرگیرێتەوە و ناوبراو وەک کەسێکی شکستخواردوو لەم بوارەدا لەقەڵەم درا. دورانتی لەساڵی ١٩٥٧ لەشاری فلۆریدا کۆچی دوایی کرد.

## رۆبەرت هانسن

بەرپرسی باڵای ئێف بی ئای کە سیخوڕی بۆ دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت دەکرد و نزیکەی ٤٤ ملیار دۆلاری زیانی بە حکومەتی ئەمریکا گەیاندووە. ناوبراو بەخۆبەش بوو بە سیخوڕی دەزگای هەواڵگری رووسیا لە شاری نیۆیۆرک لەساڵی ١٩٧٩. ناوبراو کۆمەڵێک زانیاری نهێنی فرۆشت، وەک ناسنامەی ئۆپەراسیۆنی کڵاوەی سەرەکی، بەبڕی بیست هەزار دۆلار، بەڵام هەرساڵی دواتر وازی لەکارەکە هێنا دوای ئەوەی ناوبراو دانی بە کارەکەی نا لەلای هاوسەرەکەی و بەڵێنی بە قەشەیەکی کڵێسادا کە چیتر زانیاری نەداتە سۆڤێتییەکان. ناوبراو تاساڵی ١٩٨٤ هیچ چالاکییەکی

ئەنجامنەدا، دواتر دووبارە هەڵسا بە دروستکردنەوەی چەند پەیوەندییەک لەگەڵ سۆڤێتییەکان لە واشنتۆن.

لەساڵی ١٩٩٠، هانسن چاوی بە پرسیلا گالی، لەشفرۆشێک لە یانەی شەوانەی جۆانا، کەوت، وە دە دۆلار بەخشیشی پێدا و دواتر تێبینییەکی لەسەر پارچە کاغەزێک نووسی کە تیایدا مەدحی کردبوو بە "جوانی و شوخ و شەنگیی." دوای ماوەیەکی کەم، کارتی کاری فەرمی بە ئافرەتەکەدا. هەردووکیان بە بەردەوام چاویان بەیەکتر دەکەوت و لەدەرەوە خواردنیان بەیەکەوە دەخوارد. لە چاوپێکەوتنەکانی داهاتوودا، ناوبراو بڕی دووهەزار دۆلاری بە ئافرەتەکەدا تەنیا بەمەبەستی ئەوە سەر لە پزیشکی ددان بدات. پەیوەندییەکە لەمەش دەربازی بوو، ئەوجارە هەڵسا بەپێدانی خەناوکەیەکی یاقوتی شین.

هانسن بەمەش نەوەستا، ئافرەتەکەی لەگەڵ خۆی بردە گەشتێکی هۆنگ کۆنگ، کە هەردووکیان لە یەک هۆتێل، بەڵام لە دوو ژووری جیا، نیشتنەوە بۆماوەی نزیکەی دوو هەفتە و نیو. ئێف بی ئای دواتر رایگەیاند کە هەرچەندە هەردووکیان نکۆڵیان لەوە کردووە هیچ پەیوەندییەکی سێکسیان ئەنجام دابێت، رەنگە لەبەر خاتری خێزانەکەی بووبێت، بەڵام ئافرەتەکە دانی بەوەدانا کە هەردووکیان دەستبازییان کردووە. رەنگە تاکە پاڵنەرێک بۆ پەرەپێدانی پەیوەندییەکەی لەگەڵ ناوبراو بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ویستوویەتی ئافرەتەکە تەجنید بکات بۆئەوەی چەند ئەرکێکی بچووکی پێ راسپێرێت لەجیاتی ئەوە ئەنجامی بدات بۆ یارمەتیدانی لە کاری سیخوڕی ئەودا.

هانسن تەنیا بەمە نەوەستا، لەساڵی ١٩٩١ برنسن کارتێک، ئۆتۆمبیلێکی مارسیدیسی دەستی دووم وە لاپتۆپێکیشی پێدا، بەڵام کاتێک لەساڵی ١٩٩٢ کارتەکەی بەکارهێنا بۆ کڕینی چەند دیارییەکی سەری ساڵ بۆ خوارزاکانی، کارتەکەی لێوەرگرتەوە. بۆیە، گالی کەوتەنێو گێژاوی بەکارهێنانی کۆکاین، وە بوو بە لەشفرۆشێکی مەزنی سەرشەقام، و هەموو پەیوەندییەکانی لەگەڵدا پچڕاند. هانسن، بەم بۆنیەوە، پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ چەند ئافرەتێکی هاوشێوە دروستکرد، لەوانە دیپ مولینا، کچە ڤێتنامی کە سەماکارێکی بەناوبانگ بوو. ئەویش لەلایەن ئێف بی ئایەوە

لێکۆڵینەوە لەگەڵدا کرا، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی روون نەبوو لەسەر دەستێکەڵی لەگەڵ چالاکییەکانی هانسن.

هانسن لەساڵی شوباتی ۲۰۰۱ دەستگیرکرا. بۆ تەمموزی ۲۰۰۱، ناوبراو سێزدە تاوانی سیخوڕی بەسەردا ساغکرایەوە و بڕیاری زیندانی تا هەتایی بەبێ مەرجی بۆ بڕدرایەوە. لەماوەی چەندین لێکۆڵینەوەیدا، دۆخێک بۆ دوورکەوتنەوە لە سزای مەرگ، هانسن چەندین چیرۆکی زۆر ئابڕووبەری ژیانی سێکسی خۆی گێڕایەوە، بە کردەی هاوڕەگەزبازیشەوە. زۆربەی هەرەزۆری هاوپیشەکانی لە ئێف بی ئای تووشی سەرسوڕمانی بوون کاتێک هانسن دانی بە تاوانەکانیدا دەنا، بەڵام هیچ یەکێکیشیان نکۆڵی لەوە نەدەکرد کە ناوبراو کەسێکی زۆر لێهاتوو بووە لە کارەکەیدا.

سەرەڕای تاوانبارکردنی، بۆنی هانسنی هاوسەری هەر بە دڵسۆز بۆ هاوسەرەکەی مایەوە، و دوای چەند سەردانێک بۆ داواکارنی پارەی خانەنشینی هاوسەرەکەی، لەکۆتاییدا توانی بڕی ساڵانەی پەنجا هەزار دۆلار وەربگرێت، لەحاڵەتی مردنی هاوسەرەکەیدا. ناوبراو هەموو ژیانی خۆی لە زیندای تاکەکەی لە شاری فلۆرێنس، کۆلۆرادۆ، بەسەر برد.

## ئانا چاپمان، کچە جوانەکەی سۆڤیەت

سیخوڕی رووسی ئانا کوشیچینکۆ، ناسراو بە ئانا چاپمان، لە ۲۷ی حەزیرانی ۲۰۱۰ لە شاری نیۆیۆرک بەتۆمەتی بوون بە بەشێک لە بەرنامەی هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەتی نایاسایی دەستگیرکرا. دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت لەسەردەمی ستالین (NKVD)، کە دواتر بوو بە (KGB)، بەشێکی سیخوڕییان دروست کرد و ناویاننا "نایاساییەکان" کە زیانێکی زۆری بە رۆژئاوا گەیاند و هاوکارییەکی زۆری کرد لە هێنانی بەریتانیا لە جەنگی جیهانیی دووەم بۆ بەرەی رووسیا، ئەم هەنگاوە بووە هۆی ناڕەزاییەکی زۆر لەنێو هەواڵگری بەریتانیای ئەوکاتدا.

ژنی جوان لەمێژە بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە بەکاردەهێنرێن بۆ فریودانی ئەو پیاوە تەنیایانەی لەماڵەکانیان دوورکەوتوونەتەوە. هەر بەم بۆنەیەوە، دەزگای هەواڵگری

سۆڤیەت هەڵسا بە دروستکردنی یەکەیەکی تایبەت بەم بوارە کە تیایدا جوانترین ئافرەتیان تەجنید دەکرد بۆ هەڵخەڵەتاندنی پیاوانی سیاسیی و دەزگا هەواڵگرییەکانی دوژمن، ئەم یەکەیە ناونرا قوتدەران (Swallows).

شەکسپێر، شانۆنووسی بەناوبانگی بەریتانی، دەڵێت، "جوانی بڵندگۆیەکە بەبێ هیچ دواندەرێک قاییلت دەکات." وە ئانا رێک ئەو وەسفەی شەکسپێری لەسەر جێبەجێ دەبوو، بەڕاستی کچێکی جوان و سەرنجڕاکێش بوو. ئانا هەرزوو نازناوێکی پێبەخشرا "سوورەی ناو پێخەف."

لە جەنگی جیهانیی دووەم "سۆنیای سوور" ئورسولا روس کوجێنسکی چەندین پیاوی بەهۆی سەرجێیەوە فریودا و دواتر هەڕەشەی لێکردن بە بەخشینی زانیاری نهێنی لەبەرامبەر شاردنەوەی پرسەکە. فلۆرا سۆلۆمۆن و سیخوڕی بەنێوبانگی بەریتانی، کیم فیلبی، هەمان شتیان ئەنجامدا کە ئەمەی دواییان هاوسەرگری لەگەڵ سیخوڕێکی کۆمۆنیست بەناوی لتزی فریدمان کرد (ناوی راستەقینەی ئالیس کۆلمان بوو) کە چەندین بەرپرسی باڵای لەندەنی لەرێگای سێکسەوە فریودا و دواتر لە بەرامبەردا داوای زانیاری نهێنی دەکرد، هەموو ئەو کەسانەی ئەم کارەی لەگەڵدا دەکردن کاریان کرد بۆ سەرگرتنی پلانی درێژخایەنی مۆسکۆ بۆ دەستبەسەرداگرتنی تەواوی ئەورووپا. سیخوڕانی ئافرەتی "نائاسایی" بەوە لە سیخوڕەکانی تر جیادەکرێنەوە کە ئەوان بە پاسپۆرتێکی ساختە دێنەناو وڵاتێک و لەژێر ناسنامەیەکی تەواو نهێنیدا دەژین، لەکاتێکدا ئەوانی تر لەژێر ناوی فەرمی و لەگەڵ باڵیۆزخانەیەک یان قونسوڵخانەیەک دێنەناو وڵاتێکەوە و ئەو ناسنامەیە بۆ پەردەپۆشکردنی سیخوڕییەکەیان بەکاردەهێنن، بەڵام لەم سەردەمەدا ئەم کارە بەزۆری بەهۆی سەرچاوەی هەواڵگری مرۆیی یان دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤ ئەنجام نادرێت بەڵکو زیاتر پەیوەستە بە سیستەمی هاککردنی کۆمپیوتەرەوە.

ئانا چاپمان، سیخوڕی ڕووسیا

کاری دۆزینەوەی "نائاساییەکان" کارێکی قورس بوو بۆ دەزگا هەواڵگرییەکان، ئەم کارە تەنیا ئەو کاتە ئاسان دەبێت کە کەسێکی ڕاکردوو لە دەسەڵاتەکەی زانیاری لەسەر ئەمان بدات. لە هەموو ئەو دە ئەندامەی ئۆپەراسیۆنەکەی ئانادا دوای دەساڵ لێکۆڵینەوە ئینجا ناسنامەکەیان ئاشکرا بوو، ئەو هەواڵدۆزانەی تیمی هەڵاتووەکەیان بەڕێوە دەبرد کەسایەتی سێبەرن کە پێیان دەوترێت "شوان."

ئانا لەساڵی ۲۰۰۳ ڕووی کردە لەندەن و لە بانقی بارکلەی و کۆمپانیای نێت جێت کاری کرد، ئەم دوو شوێنە ئامانجی سەرەکین بۆ سیخوڕان چونکە لەو شوێنانەدا دەتوانن لیستی تەواوی گەشتیاران بەدەست بهێنن و بزانن کە کێ دێتە ناو ڕووسیا و کێ دەردەچێت، ئەوانەی لەم جۆرە کارانە کاردەکەن بەزۆری تووشی وەرگرتنی بەرتیل دەبن و دواتر هەڕەشەیان لێدەکرێت کە وەک "کۆتری نامەبەر" کاربکەن. هەروەها، بانقەکانیش ئامانجی سەرەکین چونکە پارە لە دەرەوە و ناوەوەی وڵاتە

بەوێدا تێپەڕدەبێت بەتایبەتی سەرچاوەی بیانی کە گرنگییەکی تایبەتی هەیە بۆ کاری سیخوڕی.
کاتێک ئانا لە ئەمریکا دەستگیرکرا خەریک بوو ئەندامێکی کابینەی باراک ئۆباما بەهۆی سێکسەوە فریوبدات، وە دەوترێت کە هەوڵیشی داوە بۆئەوەی نزیک بێتەوە لە هەردوو شازادەی بنەماڵەی پادشایی بەریتانیا.
ناوبراو بەهۆی ناسنامە نوێکەیەوە لە بەریتانیا هیچ گومانێکی سیخوڕی لەسەر خۆی نەهێشتبوو و بەم هۆیەشەوە شووی بە پیاوێکی بەریتانی کرد بەناوی ئەلێکس چاپمان، هەروەها باوکی ئاناش کەسێکی پلەباڵای ناو دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت بوو بەناوی ڤاسیلی کوشێنکۆ. ئانا لە مۆسکۆ چاوی بە ئەلێکس چاپمان کەوتبوو وە هەرلەوێشدا پرۆسەی هاوسەرگیرییان ئەنجامدا. بەم هۆیەشەوە توانی ببێتە خاوەنی پاسپۆرتی رووسی و بەریتانی. بەگوێرەی راپۆرتەکانی هەواڵی بلومبێرگ، کاتێک ئانا لە نیۆیۆرک دەستگیرکرا هاوسەری پێشووی لەگەڵ ماکس کلیفۆرد مارەیی بڕیبوو بۆئەوەی پەیوەندییە رۆژنامەوەنییەکانی بەکاربهێنێت بۆ بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکە بەشێوەیەکی هاوسۆزانەتر بۆ ئانا، وە دواتر چیرۆکەکەی فرۆشتە رۆژنامەی دەیلی تەلەگراف کە زمانحاڵی زایۆنیستەکان بوو لە میدیای بەریتانیادا. لە حەزیرانی ٢٠١١، ئانا بوو بە سەرنووسەری گۆڤاری (Venture Business News). ناوبراو لە دادگاییەکی داخراودا لە غیابی سەرهەنگ ئەلێساندەر پۆتێڤ دانی بەوەدانا کە لە مانگەکانی ئایار و حەزیرانی ٢٠١١ چی روویدا. چاپمان گەواهی ئەوەیدا کە ئەوە تەنیا پۆتێڤ بووە کە توانیویەتی زانیاری نهێنی بە سەرانی ئەمریکا بدات کە بووە هۆی دەستگیرکردنی ناوبراو لە ٢٠١٠.

یەکەمین نموونەی تەڵەی هەنگوینی لە مێژوودا لە ئینجیل باسکراوە کە تیایدا دوو ئافرەتی جوانی جوو بەناوەکانی دیلایلا و جودیس ئەم کارەیان ئەنجامداوە، جودیس سێکسی لەگەڵ فەرماندەی دوژمن بەناوی هۆلۆفێرنیس ئەنجامدا و هەرلەنێو جێگەکەشیدا غافڵکوژی کرد. وە دیلایلاش سەرجێی لەگەڵ سامسۆن کرد و ناچاریکرد نهێنیە بەهێزەکەی کە لەناو پرچیدا بوو ئاشکرا بکات.

## ئێرڤین چەیمبەرس سکارێک

ئێرڤین بەرپرسێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو کە بەتۆمەتی پێدانی زانیاری بە پۆلیسی نهێنی پۆڵەندا لەماوەی جەنگی سارددا تۆمەتبارکرا، ئەمەش دوای ئەوە دێت کە ناوبراو تووشی کچێکی جوانی پۆڵەندی هات و بەمەش کەوتە داوی خۆشەویستیی ئەو کچەوە، لەدواجاریش سێکسی لەگەڵدا ئەنجامدا. دواتر، لەلایەن هەواڵدۆزەکانی دەزگای هەواڵگری پۆڵەنداوە هەڕەشەی ئەوەی لێکرا کە ئەگەر زانیاری نهێنی بە دەزگاکە نەدات، ئەوە کارەکەی ئاشکرا دەکرێت.

ئێرڤین لەساڵی ١٩٤٢ تا ١٩٤٢ لە سوپای ئەمریکادا خزمەتی دەکرد. دوای ئەم کارە، رووی کردە وەزارەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە و لەوێدا خەڵات شایستەیی خزمەتی وەرگرت. لەساڵی ١٩٥٨ چووە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە وارشۆی پایتەختی پۆڵەندا، وەک بەڕێوەبەری نووسینگەیەک دەستبەکار بوو. خێزان، کچ و دوو کوڕەکەشی بۆ ئەم مەبەستە چوونە ئەوێ. ناوبراو زۆری حەزی لەوەبوو خێزانەکەی بباتە گەشت و گەڕان لەو وڵاتە و زۆری حەزی بە گوێگرتن لە مۆسیقا دەکرد. ئەو لەلایەن هاوپیشەکانیەوە زۆر خۆشەویست بوو.

لەساڵی ١٩٥٩ دڵی بۆ کچێکی بیست و دووساڵی لێیدا بەناوی ئورزولا ماریا دێشلەر، بەم هۆیەشەوە پەیوەندییەکە درێژەی کێشا تا گەیشتە سەرجێیکردن لەگەڵی. پەیوەندییەکە تەنیا لێرەدا کۆتایی نەهات، بەڵکو ئێرڤین هەڵسا بە کڕینی شوقەیەک بۆ دێشلەر و زوو زوو سەردانی دەکرد. لەساڵی ١٩٦٠، هەواڵدۆزەکانی دەزگای ئاسایشی پۆڵەندی لەناکاو رایانکوتایە سەر ژوورەکە و هەردووکیانی لە قافدا گرت و وێنەی زۆریان لێکێشان. دواتر، دەزگا هەواڵگرییەکەی پۆڵەندا ئەو وێنانەی بەکارهێنا بۆ هەڕەشەکردن لە ئێرڤین بەوەی پێویستە زانیاری نهێنیان لە حکومەتی ئەمریکاوە پێبدات. دواتر ئەو وتی کە پۆلیسی نهێنیی هەڕەشەی لە خاتوو دێشلەریش کردوو کە بیگرێت و دواتر بیداتە دادگا. بە هاوکاریکردن لەگەڵ دەزگای هەواڵگری ئەو وڵاتە، ئەو وتی کە دەیتوانی ژیانی ئەو کچە لە چارەنووسێکی تاریک و ناخۆش رزگاربکات. ئەو توانی وابکات کچەکە بەرەو ئەڵمانیای رۆژهەڵات رابکات، کە لەوێش

شوقەیەکی بۆ دۆزیەوە، و هەندێک پارەی پێدا بۆئەوەی بتوانێت لەوێ کاروبارەکانی ڕۆژانەی پێ هەڵبسوڕێنێت.
ئێف بی ئای لە حەزیرانی ۱۹٦۱، ناوبراوی دەستگیرکرد. لە تەمموزی هەمانساڵدا دادگای باڵای شاری کۆلۆمبیا ناوبراوی بەتۆمەتی بردنەدەرەوەی بەڵگەنامەی حکومەت بۆ بەرژەوەندی دەزگایەکی هەواڵگری بیانیی تۆمەتبارکرا. دوای پێنج ساڵ زیندانیکردن، ناوبراو لەساڵی ۱۹٦٦ بە مەرج ئازادکرا.

## شەهرام ئەمیری، زانا کوردەکە

لە دوازدەی تەمموزی ۲۰۱۰، شەهرام ئەمیری تەمەن سی و دووساڵ، بەرەگەز کورد، لە تەکسییەک هاتەخوارەوە لە بەشی ئێرانییەکان لە واشنتۆن و ڕایگەیاند کە ئەو دەیویست بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی ئێرانی دایک. شادبوونەوە بە خێزان و منداڵەکەی وەک هۆکاری سەرەکی دادەنرێت بۆ بڕیارەکەی. بەرلە ساڵێک زیاتر، لە حەزیرانی ۲۰۰۹، ئەمیری بەرەو سعودیەی بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج گەشتی کرد. لە نزیکەی هەمانکاتدا ئەمریکا ڕایگەیاند کە "کودەتایەکی هەواڵگریی" گرنگی ئەنجامداوە لەدژی ئێران کە ئەمیری و یەکێک لە هەواڵدەرە ئێرانییەکانی تر هێنراونەتە ئەمریکا ئەوکاتەی کردەوەکانیان بۆ دەسەڵاتدارانی ئێران بۆتە جێگەی گومان و لەکۆتاییدا زانراوە هەردووکیان خەریکی چ چالاکییەکن لەدژی وڵاتەکەیان.

لەکاتی دیارنەمانی، ئەمیری وەک زانایەکی چەکی ناووکی دامەزرابوو لە زانکۆی پیشەسازیی مالیکی عەشتار لە تەهران کە سەربە کاردی نیشتیمانی شۆڕشی ئێرانی بوو. پێنەدەچوو ئەمیری دەستی بە بڕێکی زۆر زانیاری نهێنی دەربارەی بەرنامەی ناووکی ئێران هەبووبێت، یان هیچ نەبێت نیازێکی لەم چەشنەشی هەبووبێت، بەڵام ناوبراو توانای هەبوو هەندێ زانیاری پشتڕاستبکاتەوە یان ڕەتیان بکاتەوە لە سەرچاوەکانی ترەوە. بەرپرسانی هەواڵگری ئەمریکا دیارنەمانی ئەمیرییان وەک هەڵاتن لەقەڵەمدا. ماوەیەکی کەم بەرلە دووبارە هەڵاتنەوە، ئەمیری لەچەندین ڤیدیۆی ئینتەرنێتدا دەرکەوت کە لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا رفێنراوە و ئەشکەنجەدراوە. بەگەڕانەوەی بۆ ئێران، ئاژانسی فارس بۆ دەنگوباس رایگەیاند کە ئەمیری زانیاری گرنگی بە ئێرانداوە دەربارەی سی ئای ئەی و گەڕانەوەی ناوبراویشی وەک سەرکەوتنێکی هەواڵگری مەزن راگەیاند.

ئەمیری وەک هەواڵدۆزی نهێنی لە شاری توکسن دەژیا. بەپێی مەرجەکانی یاسای ساڵی ١٩٤٩ی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی، سی ئای ئەی بۆی هەیە تا نزیکەی سەد کەس ساڵانە کە بتوانن زانیاری گرنگی هەواڵگری گرنگ ببەخشنە ئەمریکا دووبارە ڕێگای پێ بدات لەو وڵاتە نیشتەجێ ببێتەوە. بەپێی ڕاپۆرتەکان ئەمیری یەکێک بوو لەو شەش ئێرانیەی کە سی ئای ئەی لەساڵی ٢٠٠٩ هێنابوویە ئەمریکا. پێنج ملیۆن دۆلار لەلایەن ئەمریکاوە خرایە هەژماری یەکێک لە بانقەکانی ئەمریکاوە بەڵام بەهۆی ئەو ئابلۆقەی ئابوورییەی لەلایەن ئەمریکاوە خراوەتە سەر ئێران، ناوبراو ناتوانێت لەوێوە دەستی پێ بگات.

ئەم جۆرە دووبارە هەڵاتنەوانە دەگمەنن بەڵام ئەوە نییە بڵێین هیچ کاتێک روویان نەداوە. لەساڵی ١٩٨٥، ڤیتالی یۆرچینکۆ لە یەکێتی سۆڤیەتەوە پەنای هێنا بۆ ئەمریکا وە زانیاری گرنگی دەربارەی سیخوڕەکانی سۆڤیەت، وەک ڕۆناڵد پێلتن، بەو

وڵاتە بەخشی. وادیاربوو ئەو لە بڕیارەکەی پەشیمان ببوەوە و هەرزوو بڕیارەکەی گۆڕی و دووبارە بەرەو یەکێتی سۆڤیەت هەڵاتەوە.[i]

شەهرام ئەمیری لەکاتی گەڕانەوەی بۆ ئێران

دوای گەڕانەوەی بۆ ئێران، شەهرام ئەمیری لەلایەن دەسەڵاتدارانی رژێمی ئێرانەوە بەتۆمەتی خیانەتی نیشتیمان و پێدانی زانیاری گرنگی بەرنامەی ناووکی ئەو وڵاتە بە ئەمریکا، لە ٣ی ئابی ٢٠١٦دا لەسێدارەدرا.[ii]

---

[i] Dareini, Ali Akbar. "Iran Says Scientist Provided Information on CIA," Washington Post (July ٢١, ٢٠١٠).
-Miller, Craig. "CIA Says It Moved Iranian Scientist, ٢nd Informant to U.S. Over Safety Concerns," Washington Post (July ١٧, ٢٠١٠).
-Miller, Craig and Thomas Erdbank. "U.S. Paid Iranian Nuclear Scientist $٥ Million for Aid to CIA, Officials Say," Washington Post (July ١٥, ٢٠١٠).
[ii] Iran scientist executed for treason. (٢٠١٨). Retrieved from https://www.bbc.com/news/٣٦٩٩٨٧٤٧

## برادلی مانینگ

برادلی لەساڵی ١٩٨٧ لەشاری ئۆکلاهۆما لەدایک بووە. ناوبراو لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٧ پەیوەندی بە ریزەکانی سوپای ئەمریکاوە کردوو و تەنیا دووساڵ دوای ئەمە وەک شیکەرەوەیەکی هەواڵگریی رەوانەی ئێراق کراوە. لەوێدا، ناوبراو دەستی بە دوو تۆڕی کۆمپیوتەری نهێنی وەزارەتی بەرگریی دەگەیشت. لەکاتێکدا واینیشاندەدا کە خەریکی گوێگرتنە لە گۆرانی لەسەر لاپتۆپەکەی کە دوگمەی کۆپیکردنەکی نەکوژاندبووەوە، برادلی بڕێکی زۆر لە بەڵگەنامەی لە تۆڕی وەزارەتی بەرگریی و وەزارەتی دەرەوەی داونلۆد کردە سەر لاپتۆپەکە و هەرزوو هەموو ئەو زانیارییانەی بۆ دامەزرێنەی ویکیلیکس، ژولیان ئاسانژ، ناردن کە دواتر هەموو ئەو زانیارییانەی لە نیسانی ٢٠١٠ لە ئینتەرنێت بڵاوی کردنەوە.

لەبەڵگەکەیدا، برادلی، کە بەئاشکرا دانی بەوەدەنا هاوڕەگەزبازە و دواتر تەنانەت جێندەری خۆشی گۆڕی و ناوی خۆینا "چێڵسی مانینگ"، ناوبراو زیاتر وتی کە ئەو هەر لە لاپتۆپەکەیەوە ئەو هەموو زانیارییانەی لە داتابەیسی ئەفغانستانی وەزارەتی بەرگریی ناردووە لەوکاتەی زیاتر لە چوارسەد هەزار راپۆرتی کۆپی کرد. هەرماوەیەکی کەم دوای ئەمە، ئەو نەوەد و یەک هەزار بەڵگەنامەی تریشی داونلۆد کرد.

دوای تەنیا یەک مانگ، برادلی لەمەشی تێپەڕی کێبلی زانیارییەکانی وەزارەتی بەرگریی بۆ پێگەی ویکیلیس نارد کە بە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئایسلەنداوە لکێنرابوو. دواتر ناوبراو لە داتابێسی داواکاری گشتی گەڕا و ڤیدیۆیەکی هێرشێکی هەلیکۆپتەری داونلۆد کرد لە بەغدا و ئەویشی نارد بۆ ویکیلیکس. کۆتا کاری بەرلەوەی لە ئایاری ٢٠١٢ دەستگیربکرێت، بریتیی بوو لەهێنانە دەرەوەی دووسەد و پەنجا هەزار فایل لە کێبلی وەزارەتی دەرەوە و لکاندنیان بە درۆبۆکسی پێگەی ویکیلیکس. برادلی لەکۆتاییدا دەستگیرکرا و لە ئابی ٢٠١٣ بیست و سێ تۆمەتی درایەپاڵ، و سی و پێنج ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوە.

## دەزگای هەواڵگری ناوەندی

سی ئای ئەی دەزگایەکی هەواڵگری سڤیلی بیانی حکومەتی فیدراڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، کە ئەرکی سەرەکی بریتیە لە کۆکردنەوە، پرۆسەکردن، وە شیکردنەوەی زانیاری تایبەتمەند بە ئاسایشی نیشتیمانی لەسەرتاسەری جیهانەوە، بەشێوەیەکی سەرەکی لەڕێگای بەکارهێنانی هەواڵگری مرۆییەوە. وەک یەکێک لە ئەندامە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا، سی ئای ئەی بەشێوەیەکی راستەوخۆ راپۆرتەکانی بۆ بەڕێوەبەری هەواڵگری نیشتیمانی دەنێرێت وە سەرنجی سەرەکی لەسەر پێدانی زانیاری هەواڵگرییە بە سەرۆک و کابینەی حکومەت.

بەپێچەوانەی ئێف بی ئای، کە دەزگایەکی ئاسایشی ناوەخۆییە، سی ئای ئەی هیچ وەزیفەیەکی جێبەجێکردنی یاسای نییە وە بەشێوەیەکی سەرەکی سەرنجی لەسەر کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی دەرەکییە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرپرسە لە کۆکردنەوەی چەند زانیارییەکی سنووورداری ناوەخۆ.i هەرچەندە تاکە دەزگای حکومەتی ئەمریکی نییە کە تایبەتمەند بێت لە کۆکردنەوەی زانیاری لەڕێگای مرۆییەوە، سی ئای ئەی وەک دەزگای سەرەکی بۆ هاوئاهەنگی چالاکییەکانی هەواڵگریی مرۆیی لەسەرتاسەری کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا کاردەکات.(٨) هەروەها، سی ئای ئەی تاکە دەزگایە کە بەهۆی یاساوە بۆی هەیە چالاکی پەنهان ئەنجام بدات و چاوەدێریان بکات لەسەر فەرمانی سەرۆکی وڵات.ii دەزگاکە کاریگەرییە سیاسییەکانی بەهۆی بەشە تەکنیکەیەکانی دەخاتەگەڕ، وەک بەشی چالاکییە تایبەتییەکان.

دوای هێرشەکانی یازدەی ئەیلول و دەرچوونی یاسای پێشگیری لە تیرۆریزم لەساڵی ٢٠٠٤، رۆڵی سی ئای ئەی فراوانتر بوو. یەکێک لە گەورەترین بەشەکانی، ناوەندی

---

i Aftergood, Steven (October ٦, ٢٠١١). "Secrecy News: Reducing Overclassification Through Accountability". Federation of American Scientists. Retrieved February ٣, ٢٠١٢.

ii Woodward, Bob (November ١٨, ٢٠٠١). "Secret CIA Units Playing Central Combat Role". The Washington Post. Retrieved February ٢٦, ٢٠١٢.

ئۆپەراسیۆنی زانیاری (IOC)، سەرنجی خۆی لە کردەی دژەتیرۆرەوە گۆڕیوە بۆ ئۆپەراسیۆنی هێرشەکانی سایبیری.[i]

کاتێک سی ئای ئەی دروستکرا، ئامانجەکەی بریتیی بوو لە چێکردنی ئاڵوگۆڕێکی زانیاری بۆ هەواڵگری شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەکی. ئیمڕۆ، ئامانجە سەرەکیەکەی بریتییە لە کۆکردنەوە، شیکردنەوە، هەڵسەنگاندن، وە دابەشکردنی هەواڵگری بیانی، و ئەنجامدانی چالاکی پەنهان. بەگوێرەی ئەو بودجەیەی لەساڵی ٢٠١٣دا بۆی تەرخانکرا، سی ئای ئەی هەڵدەستێت بەڕاپەڕاندنی پێنج ئەرکی هەرەلەپێشینە:

- دژەتیرۆریزم، وەک ئەرکی سەرەکی
- ڕێگاگرتن لە چەکی ناووکی و جۆرەکانی تری چەکی کۆمەڵکوژیی
- وشیارکردنەوە یان ئاگادارکردنەوەی سەرکردە ئەمریکییەکانی لە ڕووداوی گرنگی دەرەکی
- دژەهەواڵگریی
- هەواڵگری سایبیری

جینا هاسپێل لەئێستادا بەڕێوەبەری گشتی دەزگای هەواڵگری ناوەندییە. وە بەشەکانی ئەو دەزگایەش پێکدێن لە نووسینگەی جێبەجێکردن و پێنج بەڕێوەبەرایەتی سەرەکی تر:

بەڕێوەبەرایەتی داهێنانی دیجیتاڵی
بەڕێوەبەرایەتی شیکردنەوەی زانیاری
بەڕێوەبەرایەتی ئۆپەراسیۆنەکان
بەڕێوەبەرایەتی پشتیوانی
بەڕێوەبەرایەتی زانست و تەکنەلۆژیا.

---

[i] Gellman, Barton; Nakashima, Ellen (September ٣, ٢٠١٣). "U.S. spy agencies mounted ٢٣١ offensive cyber-operations in ٢٠١١, documents show". The Washington Post.

ئێستا با یەک بە یەک باس لە ئەرک و کارەکانی هەر بەشێکی ئەم دەزگایە بکەین.
بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری ناوەندی، بەڕەزامەندیی ئەنجوومەنی پیران، لەلایەن سەرۆکی ئەو وڵاتەوە دیاری دەکرێت و راستەوخۆ راپۆرتەکانی دەداتە بەڕێوەبەری هەواڵگری نیشتیمانی؛ لەکرداردا، بەڕێوەبەری سی ئای ئەی بەشێوەیەکی فەرمی لەگەڵ بەڕێوەبەری هەواڵگری نیشتیمانی، کۆنگرێس، وە کۆشکی سپیدا هەماهەنگی دەکات، لەوکاتەی جێگری بەڕێوەبەر لایەنی ناوەخۆی جێبەجێکاری سی ئای ئەیە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری رۆژانەی دەزگاکە وەک سێیەمین باڵاترین پۆستی دەزگاکە.[i]
جێگری بەڕێوەبەر بەفەرمی لەلایەن بەڕێوەبەرەوە دیاری دەکرێت بەبێ رەزامەندی ئەنجوومەنی پیران، بەڵام بۆچوونی سەرۆک لەم نێوەندەدا رۆڵێکی باڵا دەگێڕێت لە بڕیارەکەدا.[ii] پۆستی جێگری بەڕێوەبری دەزگاکە بەزۆری پۆستێکی سیاسییەوە وەک لەوەی هەواڵگریی بێت.

هەروەها، نووسینگەی جێبەجێکردن پشتیوانی سوپای ئەمریکاش دەکات، ئەمەش لەرێگای پێدانی ئەو زانیاریانەی وەچنگی کەوتووە، وەرگرتنی زانیاری لە دەزگا هەواڵگرییە سەربازییەکان، وە هاوئاهەنگیکردنی لە ئۆپەراسیۆنی زەمینیدا. ئەم بەشە بەرپرسە لە ئۆپەراسیۆنی رۆژانەی سی ئای ئەی. هەر لقێک لە خزمەتگوزاری سەربازیی خاوەنی بەڕێوەبەری خۆیەتی.[iii]

بەڕێوەبەرایەتی شیکردنەوە، کە لە زۆربەی مێژووەکەی بە بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگریی ناسراوە، ئەرکی سەرەکی بریتییە لە هاوکاریکردنی "سەرۆک و داڕێژەرانی تری سیاسەت بۆ بڕیاردانی لەجێ دەربارەی ئاسایشی نیشتیمانی وڵاتەکەمان" بەهۆی گەڕان بەدوای "هەموو زانیارییە بەردەستەکان دەربارەی پرسێک و ڕێکخستنی بۆ

[i] "Leadership". Central Intelligence Agency. ٥ June ٢٠١٧. Retrieved ٦ January ٢٠١٨؛ "Sisterhood of Spies: Women crack the code at the CIA (also see Video"CIA director: 'Women make us better'")". NBC News. ١٤ November ٢٠١٣. Retrieved ٧ January ٢٠١٨.
[ii] "CIA deputy director linked to torture at Thailand black site". The Guardian. ٣ February ٢٠١٧. Retrieved ٧ January ٢٠١٨.
[iii] "Leadership". Central Intelligence Agency.

بەردەم دارێژەرانی سیاسەت."[i] بەڕێوەبەرایەتیەکە خاوەنی چوار تیپی شیکردنەوەی خۆجێیی، شەش تیپ بۆ پرسە نێونەتەوەییەکان، وە سێیان کە سەرنجی سەرەکیان دەخەنەسەر سیاسەت، کۆکردنەوەی، وە پشتیوانی ستافەکە. نووسینگەیەکی تایبەتی تەرخانکراو بۆ ئێراق؛ نووسینگەکانی شیکردنەوەی هەرێمیی تایبەتی بە خۆرهەڵاتی نزیک و ئاسیای باشوور، رووسیا و ئەوروپا؛ وە ئەمریکای لاتینی ئاسیا، وە ئەفریقیا، هەیە.

بەڵام بەڕێوەبەرایەتی ئۆپەراسیۆنەکان بەرپرسە لە کۆکردنەوەی هەواڵگری بیانی (بەزۆری بەهۆی کردەی نهێنی لەسەرچاوەی مرۆییەوە) و چالاکی پەنهان. خودی ناوەکەی دەلالەت لە رۆڵی ئەو بەشە دەکات وەک هاوئاهەنگکاری چالاکییەکانی هەواڵگری مرۆیی لەنێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا و ئۆپەراسیۆنی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی لەڕێگای مرۆییەوە. ئەم بەڕێوەبەرایەتییە بۆئەوە دروستکرا کە هەوڵبدات کۆتایی بە ساڵانی رکابەری لەسەر کاریگەریی، فەلسەفە و بودجە بهێنێت لەنێوان وەزارەتی بەرگریی ئەمریکا و سی ئای ئەی. سەرەڕای ئەمەش، وەزارەتی بەرگریی بەم دواییانە هەڵسا بە رێکخستنی دەزگای هەواڵگری نهێنی جیهانی تایبەت بەخۆی لەژێر سەرپەرشتی ئاژانسی هەواڵگری بەرگریی (DIA).[ii] بەڕێوەبەرایەتیەکە بەوە ناسراوە کە بەهۆی ناوچەی جوگرافی و پرسەکانەوە رێکخرابێت، بەڵام رێکخستنە وردەکە تائێستاش بەنهێنی ماوەتەوە.

بەڕێوەبەاریەتی زانست و تەکنەلۆژیا بەمەبەستی ئەوە دامەزراوە کە لێکۆڵینەوە و ئیدارەکردنی ئامراز و دیسپلینەکانی کۆکردنەوەی زانیاری تەکنیکی لەئەستۆ بگرێت. بەشێکی زۆری داهێنانەکانی گواستراونەتەوە بۆ دەزگاکانی تری هەواڵگری، یان، هەرکە ئاشکرا دەبوون، دەدرانە دەزگا سەربازییەکان.

---

[i] "Offices of CIA – Intelligence & Analysis – History". CIA. Archived from the original on April ٣٠, ٢٠١٣.

[ii] Miller, Greg (December ١, ٢٠١٢). "DIA to send hundreds more spies overseas". The Washington Post.

بەڕێوەبەرایەتی پشتیوانی چەند وەزیفەیەکی ڕێکخستن و ئیداریی هەیە بۆ یەکە گرنگەکانی وەک:

نووسینگەی ئاساییش
نووسینگەی گەیاندن
نووسینگەی تەکنەلۆژیای زانیاریی.

سەبارەت بە مەشق و ڕاهێنانی دەزگاکە، سی ئای ئەی لەساڵی ١٩٥٠ یەکەم نووسینگەی پەروەردە و مەشقی خۆی کردەوە. دوابەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد، بودجەی ڕاهێنانی دەزگاکە کەمبووەوە، ئەمەش کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر کارمەندەکانی دانا.[i] لەوەڵامی ئەم پاشەکشەیەدا، بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری ناوەندی، جۆرج تێنێت، هەڵسا بە دامەزراندنی زانکۆی سی ئەی ئەی لەساڵی ٢٠٠٢دا. زانکۆکە ساڵانە لەنێوان ٢٠٠ تا سێ سەد کۆرس دەکاتەوە، کە ئەرکی سەرەکیان ڕاهێنانکردنە بە فەرمانبەری نوێ و ئەفسەرە هەواڵگرییە ئەزموونداره‌کان، و ستافی پشتیوانی دەزگاکە.[ii] ئەم زانکۆیە بەهاوبەشی لەگەڵ زانکۆی هەواڵگری نیشتیمانی کاردەکات، وە پێک دێت لە کۆلێژی شێرمان کێنت بۆ شیکردنەوەی هەواڵگری، بەڕێوەبەرایەتی پێکهاتەکانی شیکردنەوەی زانکۆکە. بۆ قۆناغەکانی دواتری ڕاهێنانی قوتابییەکان، بەلایەنی کەمەوە یەک شوێنی ڕاهێنانی نهێنی هەیە کە دەکەوێتە کەمپی پێری، نزیک ویلیامسبێرگ، ڤێرجینیا. قوتابییەکان هەڵدەبژێردرێن، وە بەرەپێشچوونەکانیان هەڵدەسەنگێنرێت بەرلەوەی ببن بە ئەفسەری ئامادە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی هەواڵگریی. شوێنی سەرەکی ڕاهێنان بۆ نووسینگەی ڕاگەیاندن ناوەندی ڕاهێنانی وارێنتۆنە، کە دەکەوێتە نزیک وارێنتۆن، ڤێرجینیا. ئەم شوێنە

---

[i] Wendt, Jeff. "A feature interview with Frans Bax, President, CIA University". Today's Campus.
[ii] Host: Mary Louise Kelly (May ٢٨, ٢٠٠٤). "Inside CIA University: Higher Ed for Operatives". Morning Edition. NPR.

لەساڵی ١٩٥١ دامەزراوە و لەساڵی ١٩٥٥ەوە لەلایەن سی ئای ئەیەوە بەکاردەهێنرێت.[i]

سەبارەت بە بودجەی ئەو دەزگایەش، تائێستا ئەو زانیارییە هەر بە نهێنی ماوەتەوە. لەژێر ماددەی یاسایی ساڵی ١٩٤٩ی دەزگای هەواڵگری ناوەندی، بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندی تاکە دەزگای حکومەتی فیدراڵیە کە دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی بودجە خەرج بکات.[ii] حکومەتی ئەمریکا رایگەیاند کە بودجەی ساڵانەکەی بۆ ئەو دەزگایە بۆساڵی ١٩٩٧ بریتیی بووە لە ٢٦, ٦ ملیار دۆلار.[iii] حکومەت بڕی گشتی خەرجی هەواڵگری ناسەربازیی لەساڵی ٢٠٠٧ەوە ئاشکرا کرد؛ ساڵی ٢٠١٣ بڕی ساڵانەی ٥٢, ٦ ملیاری دۆلاری بوو. بەگوێرەی راگەیەنراوەکانی حکومەت لەساڵی ٢٠١٣، بودجەی سی ئای ئەی بۆ چاودێری بریتیی بووە لە ١٤, ٦ ملیار دۆلار، کە دەکاتە لەسەدا ٢٨ی کۆی بودجە و لەسەدا ٥٠ زیاتر بودجەی ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانیی. بودجەی کۆکردەوەی زانیاری هەواڵگری لەڕێگای مرۆییەوە لەدەزگای سی ئای ئەی بریتییە لە ٢, ٣ ملیار دۆلار، بودجەی کۆکردنەوەی هەواڵگری هێما بریتییە لە ١, ٧ ملیار، وە خەرجییەکان بۆ کردەی پاراستن و لۆجیستیکی سی ئای ئەی بریتییە لە ٢, ٥ ملیار. رۆبەرت بایەر، شیکرەوەی کەناڵی سی ئێن ئێن و کارمەندی پێشووی سی ئای ئەی رایگەیاند کە کارمەندێکی ئاسایی دەزگاکە سێ بۆ چوار ساڵ جارێکی دەبێت تاقیکردنەوەی درۆگریی (polygraph) لەسەر ئەنجام بدرێت. پەیوەندی دەزگاکە بە دەزگا هەواڵگرییەکانی تری ئەو وڵاتەوە فراوانە. سی ئای ئەی وەک دەزگای سەرەکی کۆکردنەوەی زانیاری مرۆیی ئەمریکا شیکردنەوەی

---

[i] Pike, John (٢٠٠١). "Warrenton Station B". Federation of American Scientists. Archived from the original on June ٥, ٢٠٠٩. Retrieved March ١٨, ٢٠١٣.

[ii] Pedlow, Gregory W.; Welzenbach, Donald E. (١٩٩٢). The Central Intelligence Agency and Overhead Reconnaissance: The U-٢ and OXCART Programs, ١٩٥٤–١٩٧٤. Washington, D.C.: History Staff, Central Intelligence Agency. pp. ٤٣–٤٤.

[iii] "Statement of the Director of Central Intelligence Regarding the Disclosure of the Aggregate Intelligence Budget for Fiscal Year ١٩٩٧". Central Intelligence Agency. October ١٥, ١٩٩٧.

هەواڵگری گشتی لەقەڵەم دەدرێت، لەژێر سەرپەرشتی بەڕێوەبەری هەواڵگری نیشتیمانی، کە بەڕێوەبەر و هاوئاهەنگاری دەکات بۆ شازدە دەزگای ئەندام لە کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا. جگە لەمەش، ئەو دەزگای زانیاری لە دەزگا هەواڵگرییەکانی حکومەتی ئەمریکا، سەرچاوەی زانیاری بازرگانی، وە دەزگا هەواڵگرییە بیانییەکان بەدەست دەهێنێت.[i]

## دەزگای هەواڵگری نهێنی (SIS)

نووسینگەی دەزگای نهێنی لەساڵی ١٩٠٩ وەک ئاژانسی هەواڵگری سەرەکی بەریتانی لەژێر سەرپەرشتی فەرماندە مانفیلد کەمینگ دامەزراوە. بەشی بیانی نووسینگەکە، کە بەرپرس بوو لە کۆکردەوەی زانیاری هەواڵگری لەدەرەوەی بەریتانیا، بەخێرایی فراوانبوو وە لەساڵی ١٩٢٠ ناوەکەی بوو بە دەزگای هەواڵگری نهێنی، یان (MI-٦). ئیمڕۆ، دەزگاکە پێکهاتەکەی سەرەکییە لە هەواڵگری نیشتیمانی بەریتانی.

سەرهەڵدانی کەشتیگەلی ئەڵمانی و هێزی سەربازیی لەساڵانی بەرلە جەنگی جیهانیی یەکەم وایان دەخواست سەرکردە بەریتانییەکان، کە پێویستیان بە هەواڵگرییەکی ورد هەبوو لەسەر هێز و لاوازی ئەڵمانەکان، هەڵسنەوە سەرخۆیان و کارێک بکەن بۆ دروستکردنی دەزگایەکی بەهێزی هەواڵگریی. بەشی بیانی نووسینگەی خزمەتگوزاری نهێنی لەساڵی ١٩٠٩دا دروست کرا کە ئامانج لێی پێدانی زانیاری وردی هەواڵگری بوو لە سەرچاوەی بیانییەوە بۆ حکومەتی بەریتانی. لەماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا بەشی بیانی، کە بە دەزگای هەواڵگری نهێنی ناسرابوو، پەرەی بە تۆڕەکانی سیخوڕیدا لەناوچە داگیرکراوەکانی فەرەنسا و بەلجیکا لەلایەن ئەڵمانیاوە، بەمەش سوودێکی زۆری بە هەوڵەکانی جەنگ لەگەڵ ئەو هێزەدا گەیاند.[ii]

---

[i] Rosva, Edward (February ٢١, ٢٠١٧). "National Security Council spokesman quits CIA, writes scathing editorial in Washington Post". Salon. Archived from the original on February ٢٣, ٢٠١٧. Retrieved February ٢٤, ٢٠١٧.

[ii] Andrew, Christopher. Her Majesty's Secret Service: The Making of the British Intelligence Community. New York: Viking, ١٩٨٥.

تەنانەت دوای کۆتاییهاتنی جەنگەکەش، کەمینگ دڵنیایی ئەوەیدا کە دەزگاکە هەڵناوەشێتەوە. لەماوەی ساڵانی بیستەکاندا، دەزگاکە سەرنجی خستەسەر چالاکییەکانی یەکێتی سۆڤیەت و شوعیەتی نێودەوڵەتی، کە پێیان وابوو هەڕەشەیەکی مەزنە بۆ بەریتانیا و ئیمپراتۆریاکەی. جگەلەمەش، سەرهەڵدانی ئەڵمانیای نازی لەساڵانی سییەکاندا دەزگاکە ناچارکرد دووبارە سەرنجی خۆی بخاتەوە سەر ئەڵمانیا. داگیرکاری نازییەکان بۆ ئەورووپای خۆرئاوا لەساڵی ١٩٤٠دا بەو واتایە دەهات کە دەزگاکە بەشی هەرەزۆری سەرچاوە هەواڵگرییە مرۆییەکانی لەدەستداوە. تۆڕەکانی ئەو دەزگایە دەبوایە دووبارە لەسەرەتاوە بەخۆی بکەوێت لەماوەی داگیرکاری نازییەکانی لە ئەورووپا. هەروەها، دەزگاکە سەرپەرشتی کارەکانی کۆد و تەشفیری حکومەتی دەکرد لە بلێچلی پارک لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەم. لە بلێچلی پارکدا، شکێنەرانی کۆدی توانیان بەزیرەکانە بەهۆی زانستە فراوانەکەی ئالان تیورینگ کۆدی ئامێری ئێنیگما بشکێنن. بەم هۆیەشەوە، جەنگە لە بەرژەوەندی هاوپەیمانان کۆتایی هات.[i]

لەماوەی ساڵانی جەنگی ساردیشدا، دەزگاکە سەرنجی سەرەکی لەسەر هەڕەشەکانی یەکێتی سۆڤیەت بوو. دەزگاکە تووشی چەندین گرفتاریی بوو لەماوەی ململانێکەدا. هەرلەو ماوەیەدا، دەزگاکە بەناچاری دەبوایە لە چەندین کردەی نهێنی تردا تێوەبگلێت، لەوانە رووخاندنی بەلشەڤیک لە رووسیا و روخاندنی حکومەتی ئێران لەساڵی ١٩٥٣. لەوەتەی جەنگی سارد کۆتایی هاتووە، دەزگاکە بەچەندین کردەوە خەریکە، بەتایبەتی هەڕەشەکانی تیرۆریزم، تاوانکاری نێونەتەوەیی، و ناسەقامگیریی ناوچەیی. هەرلەم دواییانە، دەزگاکە تووشی رەخنەیەکی زۆر بوو لەلایەن هاوڵاتیانی وڵاتەکەیەوە بەهۆی رۆڵەکەی لە داگیرکردنی ئێراق لەساڵی ٢٠٠٣. رۆڵی دەزگاکە بەشێوەیەکی فەرمی لەرێگای یاسای دەزگا هەواڵگرییەکانی ١٩٩٤ پێناسە کراوە. وە،

---

[i] Hinsley, F. H., et al. British Intelligence in the Second World War, ٥ vols. London: Cambridge University Press, ١٩٩٣.

بارەگا سەرەکیەکەشی دەکەوێتە ڤۆکسهۆل کرۆس، ناوەڕاستی شاری لەندەنی پایتەخت.[1]

## چاوەدێری ئاسمانیی (Aerial Surveillance)

لە کرداردا، ئەوە سەلمێنراوە کە فڕۆکە یەکێکە لە باشترین ئەو ئامرازانەی بەکارهاتووە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە سەددەی بیستەمدا. فڕۆکە دەتوانێت چەندین جۆر کامێرا هەڵبگرێت کە دەتوانن شوێنی دوژمن دەستنیشان بکەن و هەموو ئەو ئامێرانە ئاشکرا بکەن کە بۆ کاری پەیوەندیکردن بەکاردێن تەنانەت هەندێ فڕۆکەی پێشکەوتوو ئەو توانایەشیان هەیە کە شوێنی پیتاندنی یۆرانیۆم و تاقیکردنەوەی چەکی ناووکی بەشێوەیەکی لێهاتوو دیار بکەن. لەماوەی جەنگی سارددا، فڕۆکە ئامێرێکی زۆر بەسوودی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی بوو، ئەمەش بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە. یەکەم، توانای فڕۆکەکان بۆ گەیشتن بە بەرزی کە وای لە کامێراکانیان دەکرد بەئاسانی بتوانن بەسەر سنووری دوژمندا زاڵ بن بەبێ ئەوەی پێشێلی بەزاندنی سنوورە نێودەوڵەتییەکان بکەن. دووەم، فڕۆکەی چاوەدێری نەوەی نوێی دوای جەنگی جیهانیی دووەم ئاسانکاری کرد بۆئەوەی بەسەر سنووری هەندێ وڵاتی تردا بفڕن بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانیان بە بەرزی و خێراییەکی وا کە دوژمن بەئاسانی نەتوانێت هەستیان پێ بکات. سێیەم، فڕۆکە دەتوانێت لەکاتی گونجاودا زانیاری کۆبکاتەوە. فڕۆکەوان لەچەند کاتژمێرێکی کەمدا ڕێنمایی پێدەدرێت، فڕۆکەکەی هەڵسێنێت، بەرەو ئامانجەکەی بفڕێت، و بە داتای گرنگی هەواڵگریی بگەڕێتەوە. سەرەڕای ئەمەش، فڕۆکەش زیانی خۆی هەیە. جاربەجار ئەم فڕۆکانە دەکەونەبەر هێرشی موشەکی دژە فڕۆکە و تۆڕی ئاسمانییە هەواڵگرییەکانەوە، بەمەش کێشەی دبلۆماسی لەنێوان دوو وڵاتەکە ڕوودەدات ئەگەر هاتوو ئەو فڕۆکەیە هێنرایە خوارەوە. لەم ساڵانەی دواییدا، سەتەلایت و فڕۆکەی بێ فڕۆکەوان

[1] Wark, Wesley. The Ultimate Enemy: British Intelligence and Nazi Germany, ۱۹۳۳–۱۹۳۹. Ithaca, NY: Cornell University Press, ۱۹۸۵.

کەمکراونەتەوە جێگای فڕۆکەی بە فڕۆکەوانی گرتۆتەوە، بەڵام بەتەواویش جێگای نەگرتۆتەوە، وەک ئامرازێک بۆ کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی.
هەرچەندە فڕۆکە هەردەم بەکارهێنراوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری تەکتیکی لە بەرەکانی جەنگدا، تەواوبوونی جەنگی جیهانیی دووەم وای کرد بەکارهێنانیان زیاتر بۆ مەبەستی هەواڵگری ستراتیژیی بێت. جیاوازییە ئایدۆلۆژییەکانی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و هێزەکانی هاوپەیمانان دوای جەنگ وای کرد جیابوونەوەیەکی فیزیکی سنوور ئەوە سنوورە بێتە ئاراوە کە ئەوان دوای کەوتنی ئەڵمانیا داگیریان کردبوو.

فڕۆکەی چاوەدێری هێزەی ئاسمانی ئەمریکا (لۆکهید یو-٢) یەکەمین ئەرکی خۆی لە ئابی ١٩٥٥ بەئەنجام گەیاند.

ئەمریکا و بەریتانیا دەستیان کرد بەناردنی فڕۆکە بەسەر سنووری داگیرکراو لەلایەن سۆڤیەتەوە بەر لەساڵی ١٩٤٦. ئەم فڕۆکانە، کە بەزۆری وا رادەگەیێنرا بەهەڵە ئەو سنوورانەیان بڕیوە، یەکەمین بەکارهێنانی فڕۆکەی هەواڵگری جەنگی سارد بوون. ئەمریکا، سۆڤیەت، وە هاوپەیمانەکانیان فڕۆکەی هەواڵگرییان بەدرێژایی جەنگی سارد، سەدەی بیست و یەکەمیشی لەگەڵدا بێت، بەکارهێناوە.

چەندین ئامێری هەواڵگریی لەسەر فڕۆکەدا زیادکراوە لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمەوە. دەکرێت بەشێکی زۆری ئەم جۆرە ئامێرانە بۆ سێ بەش پۆلێن بکەین. یەکەم، فڕۆکەی هەواڵگریی دەتوانێت چەندین جۆری کامێرا و فیلم هەڵبگرێت، وەک کامێرای پێشکەوتووی ستاندارد کە دەتوانێت لە شەودا وێنە بگرێت. ئەم جۆرە کامێرانە دەتوانێت لەپێشەوە فڕۆکە جێگیر بکرێت بۆ وێنەگرتنی ئامانجەکەی بەو ئاراستەیەی کە فڕۆکەکە دەفڕێت. جۆرەکانی تری کامێرا دەتوانێت یەک گۆشە لە ڕاست یان چەپی فڕۆکەکەوە وێنە بگرێت. ئەم جۆرە کامێرانە ڕێگا بە فڕۆکەیەک دەدەن بۆئەوەی بەدرێژایی سنوورێک یاخود لەنێو سنووری ئاسمانی نێونەتەوەییدا بفڕێت کاتێک وێنە لەناو سنوورێکی تردا دەگرێت کە فڕۆکەوانەکە نەیەوێت ئەم هەوڵە بدات.

بۆنموونە، لەساڵی ١٩٦٢، فڕۆکەی چاودێری یو-٢ی ئەمریکی ئەم کامێرایە تێدا بەکارهێنرا لەسەر وڵاتی کوبا دوای ئەوەی فڕۆکەیەکی لەم جۆرە لەلایەن موشەکی ئاسمانی سۆڤیەتەوە کرایە ئامانج. کامێراکە وادەکات ئەم جۆرە موشکانە نەتوانن بیکەنە ئامانج کاتێک وێنەی ئامانجەکانی لە ڕوویەکی لێژدا دەگرێت کە چەند گۆشەیەک لە فڕۆکەکەوە دوورە. دووەم، فڕۆکە دەتوانێت چەندین جۆری کامێرای سانسۆری ئەلیکترۆنی هەڵبگرێت لەکاتی بەئەنجامێک کە پێی دەوترێت هەواڵگریی ئەلیکترۆنی، هەواڵگری هێمایی یان هەواڵگری گەیاندن. کاتێک فڕۆکەکە لە نزیک یان بەسەر سنووری دوژمندا دەفڕێت، ئەو سانسۆرانە دەتوانن شوێنەکە دیار بکەن و چەندین جۆری هێمای ئەلیکترۆنی تۆمار بکەن، وەک ڕادار و چەندین جۆری تری پەیوەندی کە بۆ کاری شیکردنەوەی هەواڵگریی بەکاردێن. بۆنموونە، لەساڵی ١٩٨٣، هێڵی ئاسمانی کۆریای باشوور بەسەر سنووری یەکێتی سۆڤیەتدا فڕی لە ڕووداوێکدا کە تا ئێستاش هەر باسی لێوە دەکرێت. دوای ئەوە فڕۆکە شەڕکەرەکانی سۆڤیەت فڕۆکەکەیان لەسەر ئاوە نێوەدەوڵەتییەکان هێنایە خوارەوە، ئەمریکا لەوکاتەدا تۆمارەکانی دەنگی و تەکنیکی فڕۆکەوانەکەی یەکێتی سۆڤیەتی تۆمارکرد کە داوای

دەکرد رێگای پێبدرێت بۆنەوەی ئەو فرۆکەیەی هێڵی کۆریای باشوور بهێنێتە خوارەوە.[1]

## نووسینگەی هەواڵگریی و توێژینەوە (INR)

نووسینگەی هەواڵگری و توێژینەوە لەساڵی ١٩٥٧ دامەزراوە، ئەرکی سەرەکی بریتییە لە کارکردن وەک یەکەیەکی هەواڵگری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە زانیاری ورد و درشتی هەواڵگریی بە وەزیری دەرەوە بۆ بڕیاردان لەسەر سیاسەتی دەرەوە، دبلۆماتکارە ئەمریکییەکان، و چەند کەسایەتییەکی دیاریکراو لە وەزارەتی دەرەوە، دەبەخشێت. هەروەک وەزارەتی دەرەوە دەڵێت، "ئەرکی سەرەکی ئەم یەکەیە بریتییە بەیەکتربەستنەوەی سەرچاوە هەواڵگرییەکان بۆ خزمەتی دبلۆماسیەتی ئەمریکا." هەروەها، ئەم یەکەیە خاڵی پەیوەندی و هەماهەنگی وەزارەتی دەرەوەیە لەگەڵ نووسینگەی بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری نیشتیمانی و وەک نوێنەری وەزارەتی دەرەوە لەزۆربەی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەندامای تری کۆمەڵگای هەواڵگریی رۆڵ دەگێرێت. بنچینەی سەرەکی دروستبوونی ئەو یەکەیە دەگەڕێتەوە بۆ دروستبوونی نووسینگەی دەزگا ستراتیژییەکان (OSS) کە لەلایەن سەرۆک فرانکلین رۆزڤێلت لەساڵی ١٩٤٢ دروستکرا و لەلایەن هاری ترومان لەساڵی ١٩٤٥ لێکهەڵوەشایەوە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانیی دووەم. بە کۆتاییهێنان بە نووسینگەی دەزگا ستراتیژییەکان، ترومان ئەرکەکانی بەسەر وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی جەنگدا دابەشکرد، کە وەزارەتی دەرەوە لقی شیکردنەوە و توێژینەوەی بەرکەوت. ئەم لقە تژی بوو لە ستافی ئەکادیمی لەچەندین کەسایەتی دیار لەکاتی جەنگدا، توانی راپۆرتی زۆر گرنگ بەرهەم بهێنێت لەمەڕ دۆخی سوپا، دارایی، و کاروباری ئابووری ئەڵمان.

---

[1] Gunston, Bill. An Illustrated Guide to Spy Planes and Electronic Warfare.New York:Arco Publishers, ١٩٨٣.
-Jackson, Robert. High Cold War: Strategic Air Reconnaissance and the Electronic Intelligence War. Newbury Park, CA: Haynes North America, ١٩٩٨.

لەڕووی دامەزراوەییەوە، دەزگاکە دابەشکراوە بۆسەر نۆزدە نووسینگە کە سەرچەمی وەزارەتی دەرەوە بەشێوەیەکی گشتی پێک دەهێنن. زیاتر لە سێ سەد کارمەندی هەیە، سێ چارەگ لەو ڕێژەیە خزمەتگوزاری مەدەنین. دەزگاکە بەم شێوەیە کارمەندەکانی دابەشکردبوو: ئەفریقیا، سێزدە کارمەند؛ کاروباری ئەمریکا و دەوروبەری، سێزدە کەس؛ ئاسیای ڕۆژهەڵات و هێمن، بیست کەس؛ شیکردنەوەی ئابووریی، نۆزدە کەس؛ ئاسیای نزیک و ئاسیای باشوور، هەژدە کەس؛ ئەوروپا، حەڤدە کەس؛ رووسیا و ئۆراسیا، بیست و سێ کەس؛ بڵاوبوونەوەی چەک و پرسە سەربازییەکان؛ هەژدە کەس؛ تیرۆریزم، ماددەی هۆشبەر و تاوان، نۆزدە کەس؛ و پرسە جیهانییەکان، هەژدە کەس. یەکێک لە ئەرکە هەرەسەرەکییەکانی ئەم یەکەیە بریتییە لەوەی کە دەبێت هەموو بەیانییەک ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل لەمەڕ ئەم بابەتانەی سەرەوە ئامادە بکات و بەشێوەیەکی شیکراوەیی بخرێتە بەردەم وەزیری دەرەوە. یەکێک لە خاڵە هەرە بەهێزەکانی ئەم یەکەیە بریتیی بوو لە نموونەی چەکی کۆمەڵکوژی ئێراق، ئەم دەزگایە پێی وابوو کە ئێراق خاوەنی هیچ چەکێکی کۆمەڵکوژ نییە. بەپێچەوانەوە، دەزگا هەواڵگرییەکانی تری لە کۆمەڵگای هەواڵگریی بەپشت بەستن بەو بەڵگانەی هەیانبوو پێیان وابوو کە ئێراق خاوەنی ئەم چەکانەیە، بەم پێیەش لەسەر ئەم بنەمایە ئەمریکا جەنگێکی وێرانکەری بەرپاکرد.[i]

---

[i] Harr, John. The Professional Diplomat. Princeton, NJ: Princeton University Press, ١٩٦٩.

-Pringle, Robert. "Creeping Irrelevance at Foggy Bottom," Foreign Policy ٢٩ (١٩٧٧/٧٨), ١٢٨–١٣٩.

-Richelson, Jeffrey. The U.S. Intelligence Community, ٥th ed. Boulder, CO: Westview, ٢٠٠٨.

## کۆمپانیای هێڵی ئاسمانیی ئەمریکا

هێڵی ئاسمانی ئەمریکا کۆمپانیایەکی گواستنەوەی تایبەتی بوو کە بەنهێنی لەلایەن سی ئای ئەیەوە خاوەنداریەتی دەکرا. ئەم هێڵە بەتایبەتی چالاک بوو لە پشتیوانیکردنی چالاکییە نهێنییەکانی سی ئای ئەی لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا. هەروەها، ئەم هێڵە تۆمەتبارکرا لە تێوەگلان لە چالاکی بەقاچاغبردنی ماددەی هۆشبەر کاتێک ئەو ئەرکانەی ئەنجام دەدا. هەلیکۆپتەرەکانی ئەو هێڵە بەژداربوون لە دوایین کشانەوەی ڤێتنامییەکانی باشوور و ئەمریکییەکان لە سایگۆن لەساڵی ١٩٧٥. ئەم هێڵە بەشێوەیەکی فەرمی لەساڵی ١٩٧٦ کۆتایی بە کارەکانی هێنرا. دروشمەکەی بریتیی بوو لە "هەرشتێک، هەرشوێنێک، هەرکاتێک، بەشێوەیەکی پیشەییانە."

ئەو کۆمپانیایە لەژێر ناوی کۆمپانیای گواستنەوەی ئاسمانی مەدەنی دەرکەوت. لەساڵی ١٩٥١، سی ئای ئەی لە خاوەنەکەی، کە ناوی کلێر لی چینۆلت، نزیک بووەوە کە لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا ناوبانگێکی باشی پەیداکردبوو بەهۆی ئەوەی ئەندامی پلەنگە ئاسمانییەکان بوو، کە هێزێکی ئاسمانی خۆبەخش بوو لەساڵی ١٩٤١ بۆ ١٩٤٢ لە مامەڵەی کڕینی ئەو فڕۆکانەدا. کاتێک کە فڕۆکەکانیان کڕی، ناوی کۆمپانیاکە گۆڕدرا بۆ گواستنەوەی ئاسمانی مەدەنی. لەساڵی ١٩٥٩دا دووبارە ناوەکەی گۆڕدرا بۆ هێڵی ئاسمانیی ئەمریکا. ئەم کۆمپانیایە خاوەنی چەندین جۆر فڕۆکە بوو، وەک هەلیکۆپتەر و فڕۆکەی سەربازیی یەکێتی سۆڤیەتی جاران.

ئەم کۆمپانیایە پاڵپشتی چەندان ئۆپەراسیۆنی سی ئای ئەی کرد لە وڵاتی لاوس لەساڵانی ١٩٥٩ بۆ ١٩٦٢. لەساڵی ١٩٦٢ بۆ ١٩٧٥ بەشێوەیەکی تایبەتی چالاک بوو لە پێدانی شتمەکی لۆجیستی (خواردن و تەقەمەنی) و پشتیوانی چاوەدێری ئاسمانی بۆ سوپای لاوی پاشایی و سوپای همۆنگ. سەرەڕای چالاکی پەنهانی و پشتیوانی ئۆپەراسیۆنی سەربازیی، هێڵی ئاسمانی ئەمریکا بەکاریش دەهات بۆ گواستنەوەی دبلۆماتکار، پزیشک، سیخوڕ، بەرپرسانی ماددەی هۆشبەر، وە چەندان هاوڵاتی تری مەدەنی.

مشومڕێکی زۆر هەیە لەمەڕ ئەوەی کۆمپانیاکە بەقوڵی تێوەگلاوە لە کاری قاچاغچیەتی حەشیش و هێرۆین کە سەربە لیوا ڤان پاوی لاوسی بوو. لەکاتێکدا هەندێ رەخنەگر وای دەبینن کە ئەو کۆمپانیایە تێوەگلابوو لە کاتی بەقاچاغبردنی ماددەی هۆشبەر، هەندێکی تر ئاماژە بەوە دەکەن کە خودی هێڵی ئاسمانی ئەمریکا تێوەنەگلابوو وە فەرمانبەرانی زانیاری راستەوخۆیان نەبوو لەبارەی ئەوەی کە ئەم کارە لەنێو فڕۆکەی ئەواندا ئەنجام دەدرێت.

هەرچەندە هێڵی ئاسمانی ئەمریکا لەساڵی ١٩٧٦ هەڵوەشایەوە، هەرزوو جێگرەوەی دەرکەوت. لەساڵی ١٩٧٩دا یەکێک لە فڕۆکەوانەکانی و ئەفسەری پێشووی سی ئای ئەی بەناوی جیم رایان هەڵسا بە دامەزراندنی کۆمپانیایەکی تر کە خۆی وەک کۆمپانیایەکی تایبەت دایە ناسین. هەندێ گێڕانەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم کۆمپانیا نوێیە هەڵساوە بەپێدانی چەک و خۆراک بە جۆناس ساڤێمبی لە ئەنگۆلا. دوای ئەوە جەنگی دژە تیرۆر دەستی پێکرد کارمەندانی ئەو هێڵە لە ٤٨ کەسەوە بۆ ٧٩ کەس لەساڵی ٢٠٠٤ بەرز بووەوە. تۆماری فڕۆکەوانی پێمان دەڵێن کە دوای دەسگیرکردنی سەرانی رێکخراوی قاعیدە لەساڵانی ٢٠٠٢ و ٢٠٠٣، فڕۆکەکانی کۆمپانیاکە بەرەو ئەو فڕۆکانە فڕین کە نزیک بوو لەو شوێنەی ئەو سەرکردانەی رێکخراوەکەی تیادا دەستگیر کرابوو.[i]

## هەواڵگری ئەمریکا لە جەنگی جیهانیی یەکەم

بەرلە سەدەی بیستەم، کۆمەڵگای هەواڵگری بەشێکی هەمیشەیی نەبووە لە یەکەی کارگێڕی حکومەت، ئەرکی سەرەکی تەنیا ئەوەبوو لەکاتی هێرشی لەناکاودا ئاسانکاری بۆ دەزگا پەیوەندیدارەکان بکات. لەگەڵ دامەزراندنی کۆماردا، جۆرج واشنتۆن زۆر دوودڵ بوو دەربارەی دامەزراندنی دامەزراوەیەکی هەمیشەیی هەواڵگری بەهۆی ئەو تایبەتمەندییە نهێنیی و فریودانەی کە لەخودی کارەکەدا هەیە. هەرچۆنێک

---

[i] Air America Archives, University of Texas at Dallas.
-Robbins, Christopher. Air America. New York: Putnam, ١٩٧٩.

بێت، لەساڵی ١٧٩٠، ئەو وایکرد یاسایەک لە کۆنگرێس تێبپەڕێنرێت لەمەڕ دامەزراندنی "تەمویلێکی نهێنیی" بەبڕی چل هەزار دۆلار کە تەرخانکراو بوو بۆ "مامەڵەی بیانیی،" هۆکاری هەرە سەرەکی ئەم بڕیارەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەمریکا وڵاتێکی تازە بوو و دەبوایە لەڕێی هاوکارێکی بەهێزەوە ئەو ئەزموونەی بپارێزرێت. هەروەک ئامارەی پێدرا کە جۆرج واشنتۆن پێشەنگی ئەو رابەرانە بوو لە دابینکردنی بڕە پارەیەکی بۆ کاری هەواڵگریی، بەڵام ئەو بڕە پارەیە بۆ خودی بابەتی هەواڵگریی دابین نەکرابوو.

لەماوەی جەنگی ناوخۆدا، بەشێکی زۆری کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی یەکێتی(Union) ئەو وڵاتە لەلایەن دەزگای پۆلیسی نهێنیی(سیخوڕی) ئالان پینکێرتۆنەوە ئەنجام دەدرا. لەساڵانی دوای جەنگی ناوەخۆدا، دەزگای پینکێرتۆن لە چەندین چوارچێوەدا هەڵدەستا بە کۆکردنەوەی داتای هەواڵگریی وەک چالاکڤانانی کرێکار و فران و خێسی جەیمس، هەردوو دزی ناو هێڵی شەمەندەفەر. سەرەڕای ئەمەش، بۆ کاتی جەنگی ئەمریکا و ئیسپانیا لەساڵی ١٨٩٨ دەزگای نهێنیی رۆڵێکی دیارتری گێڕا لە کۆکردنەوەی زانیاری بەهۆی هاوێشتنی پەلەقاژەی کاری خۆیان بۆ پشت تەنیا بەرەنگاربوونەوەی کاری ساختە، گرتنی سیخوڕانی ئیسپانی و ئانارشیستە شاراوەکان. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ئیدارەی هەواڵگری هەمیشەیی خەریک بوو دەکەوتە سەرپێی خۆی و ئیتر بە سەربەخۆی چالاکی ئەنجام دەدا.

حکومەتی ئەمریکا وانەیەکی باشی لە جەنگ لەگەڵ ئیسپانەکان وەرگرتبوو لە بواری پێکهاتەی سەربازیی و هەواڵگرییدا. سوپای ئەمریکا پەرەی بە پەیمانگای ئەورووپی "ستافی گشتی"دا بۆ دروستکردنی بەشی زانیاری سەربازیی(هەرچەندە هێزە دەریاییەکان نووسینگەی هەواڵگریی دەریاییان لەساڵی ١٨٨٢ دروست کردبوو). ئەم بەشە بوو بە سەرچاوەی سەرەکی هەواڵگریی سوپا، بەڵام تواناکانی وەک دەزگایەکی هەواڵگری سەربازیی لەکاتی ئاشتی لەو ساڵانەی بەرلە جەنگی جیهانیی یەکەم هێشتا بە فەرمی نەناسرابوو.

دوای هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەم، دەزگایەکی نوێی هەواڵگری سەریهەڵدا کە بە یو-١ ناسرابوو. لەساڵی ١٩١٥، سەرۆک وڵسن بڕیاریدا کە بۆ وەزارەتی دەرەوە گرنگە دەست بخاتە ناو کاروباری هەواڵگرییەوە. هەرکە جەنگ ڕووداوی نوێی بەخۆیەوە دەبینی، ئەمریکا لە پێگەیەکی نەرمدابوو لە بەردەوامیدا بە پێگە بێ لایەنەکەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەکاتێکدا پشتیوانی لە حکومەتی بەریتانیای مەزن دەکرد، کە هێزێکی ئیمپریالی بوو. وەزیری دەرەوە ولیام جێنینگ برایان تووشی چەرمەسەرییەکی زۆر بووە بەهۆی ئەم پشتیوانیەی حکومەتەکەی بۆ هێزێکی ئیمپریالی بەهۆی ئەوەی ئەمریکا خۆی دژە ئەم جۆرە هزرە بوو، وە ناوبراویش باڵپشتێکی سەرەکی بوو هزری پۆپۆلیستی. هەرچۆنێک بێت، لەکۆتاییدا ناوبراو بۆ نارەزایەتی دەربڕین لە پێگەی ئیدارەی وڵسن لەهەمبەر ئەڵمانیا دوای نغرۆبوونی کەشتی لوسیتانیا دەستی لەکار کێشایەوە.

ڕۆبەرت لانسینگ، جێگرەوەی برایان، چەند دامەزراوەیەکی دامەزراند بۆ یو-١. بۆ دڵنیابوون لەوەی سەرۆک بەهیچ جۆرێک لە نزیکەوە پەیوەندی نابێت لەگەڵ دەزگا هەواڵگریی نوێکە، لانسینگ، هەڵسا بە دامەزراندنی فرانک پۆلک، کە ئەندامێکی دووری بنەماڵەی سەرۆک جەیمس پۆلک بوو، وەک ڕاوێژکاری وەزارەتی دەرەوە. ڕۆڵی ناوبراو بریتیی بوو لە پێدانی ئامۆژگاریی بە حکومەت لەمەڕ بێلایەنی ئەمریکا لە ململانێ ئەورووپییەکان. بە بەرزبوونەوەی پێگەی ئەمریکا لە تەنگژەکە، پۆلک زیاتر بایەخی بە کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی لەڕێی هەماهەنگیکردن لەگەڵ باڵیۆزخانەکانی بەریتانیا و فەرەنسا کرد لەمەڕ پرسەکانی دژەهەواڵگریی. پۆلک لەم سەروبەندەدا هەڵسا بە دروستکردنی "ژووری ڕەشی ئەمریکی،" کە تیایدا شیفرەی بیانی دەبڕی، و هەروەها بەشێکی تریشی دروست کرد بەناوی "بەشی هەواڵگری بیانیی"ی وەزارەتی دەرەوە کە کاری سەرەکی بەردەوامیدان بوو بە ئەنجامدانی چالاکی کۆکردنەوەی هەواڵگریی لەکاتی ئاشتییدا. بۆ ساڵی ١٩١٩، دەزگاکە ڕووکار و شێوەی فەرمی دەزگای "یو-١"ی وەرگرت دوای ئەوەی کۆنگرێس نووسینگەیەکی نوێی بریکاری وەزارەتی دەرەوەی بۆ پۆلک دروست کرد. سەرەڕای ئەمەش،

دروستکردنی ئەم دەزگایە بە فەرمی نەیتوانی کێشەکانی ناو کۆمەڵگای هەواڵگری ئەمریکا چارەسەر بکات. رکابەرییەکی تووند لەنێو دەزگاکانی وەک نووسینگەی لێکۆڵینەوە، ئێف بی ئای، وە دەزگای نهێنیی دروست کرد.
تەنانەت بەرلە چوونی ئەمریکا بۆناو جەنگ لە نیسانی ١٩١٧، کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی، ئەو کارە بۆ دەزگای یو-١ دروستکرا، دەستی بە کارەکانی کرد. گۆردن ئۆشینکلۆس وەک راوێژکاری پۆلک لە رێکخستنی کارە نهێنییەکان هاوکاری ناوبراوی کرد. پێکهاتەی کۆمکاری ئایڤی (Ivy League) یو-١ ئەو نوێنەرەی کۆمەڵگای ئەمریکی نەبوو کە بەهۆی شەپۆلی کۆچکردنەوە دەبووە کۆمکارێکی هەمەچەشن. دەکرێت بڵێین ئەوەی لەو کۆمکارە تێبینی دەکرا بریتیی بوو لە لایەنگیرییەکی بەهێز لەهەمبەر دۆزی بەریتانیادا. یەکێک لەم جۆرە نموونانە بریتیی بوو لە سێر ویلیام وایزمان. لەساڵی ١٩١٥، وایزمان لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە وەک بەرپرسی هەواڵگری بەریتانیا لە ئەمریکا دامەزرا. وایزمان بەئاسانی توانی کاریگەریی بەهێز بەدەستبهێنێت لەنێو بەرپرسانی حکومەت، ئەمەش لەرێگای برەودان بەو کەسانەی کە لەنێو بازنەی نوخبەی ئەمریکادا بوون کە زیاتر و زیاتر بیانهێنێتە ژێر رکێفی بەریتانیاوە. ئەمە دەرفەتێکی باشی بە حکومەتی بەریتانیدا بۆئەوەی بەئاسانی بتوانێت پشتیوانی نوخبەی دەسەڵاتداری ئەو وڵاتە بەدەست بهێنێت.
کاریگەری ئەم رەوتە لەنێو دامەزراوەی یو-١ بەئاسانی لەنێو سیاسەتی ئەمریکادا دەبینرا. کاتێک سەرۆک وڵسن داوای لە کۆنگرێس کرد بۆئەوەی جەنگ لەدژی ئەڵمانیا رابگەیەنێت، ئەو وتی کە ئەو ویستی جیهان سەلامەت بێت بۆ دەستپێکردنی رەورەوەی دیموکراسیی. یەکێک لە بنەماکانی ئامانجەکانی جەنگی وڵسن بریتیی بوو لە بڕیاری چارەی خۆنووسینی نیشتیمانی بۆ وڵاتەکەی، کە ئامانج لێی لەیەکتر هەڵوەشاندنەوەی ئیمراتۆریەتی هەمەنەتەوەی هابسبێرگ و تورکە عوسمانییەکان بوو، بێگومان سەرەڕای ئامانجێکی تر کە سەرکەوتن بوو بەسەر ئەڵمانیادا. لەگەڵ ئەمەشدا، رامانی ئەمریکی بۆ سیستەمی دژە ئیمپریالیستی لەگەڵ یو-١ بۆ پشتیوانی نەدەگونجا. بە هاوسۆزبوون بۆ چینی دەسەڵاتداری بەریتانی، ئەندامانی کۆمکاری

ئایفی ناچاربوون ئیمپراتۆریای بەریتانی پشتگوێ بخەن، و بەرگرییان لە بەردەوامیی ئیمپراتۆریای کۆلۆنیالی هێزە هاوپەیمانەکاندا، بەتایبەتی بەریتانیا و فەڕەنسا. ئەم تێکهەڵچوونە لە سیاسەتدا وای کرد وڵاتانی تر ئەمریکا وەک وڵاتێکی دووڕوو ببینن. بۆنموونە، لەسەرەتای ۱۹۱٦، ئەمریکا ڕێگای بە سیخوڕەکانی بەریتانیادا بۆئەوەی سیخوڕی لەسەر شۆڕشگێڕەکانی پشتیوانی کۆتاییهێنان بە حوکمی بەریتانیا لە هیندستان بکەن، کە بە پارتی گادر ناسراوبوو، و کۆبوونەوەکانیان لەسەر خاکی ئەمریکا ئەنجام دەدا. بێجگە لەمەش، ئەمریکا هیچ بەربەستی دادەنا لەبەردەم ئەو سیخوڕانەدا کە هەوڵی بەردەوامیاندەدا بۆ سەرکوتکردنی نەتەوەپەرستانی ئێرلەندی لەدژی حکومەتی بەریتانیا لەکاتێکدا هیچ کێشەی نەبوو لەگەڵ شۆڕشگێڕەکانی پۆلەندی و چیکی کە دەیانویست حوکمی نەمسا لە وڵاتەکانیان بە هەوڵی جدی لە ئەمریکاوە کۆتایی پێبهێنن.

دەزگای تری نهێنی حکومەتی ئەمریکا بەژداربوون لە سیخوڕی ناوخۆیی لەماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا. دەزگای نهێنیی چەندین هێرشی ئەنجامدا بۆسەر تۆڕەکانی سیخوڕی ئەڵمانی کە ئامانجیان وێرانکردنی ئەو ماددە جەنگیانە بوو ئەمریکا مەبەستی بوو بیداتە بەریتانییەکان، بەتایبەتی لەژێر ڕۆشنایی تەقینەوەیەک بۆسەر دوورگەی بلاک تۆم لە بەرواری ۳۰ تەمووزی ۱۹۱٦ لە شاری نیۆیۆرک، کە بووە هۆی زیانێکی زۆر لەسەرتاسەری ئەو شارە و تەنانەت زیانەکانی گەیشتە شاری نیۆجێرسیش. نووسینگەی لێکۆڵینەوە، ئێف بی ئای، هەڵسا بە لێکۆڵینەوە لە چالاکیەکانی حکومەتی ئەڵمانیا کە سەرپێچی بێلایەنی ئەمریکای کردبوو لە جەنگەکەدا. بۆ نموونە، لەسەرەتای ساڵی ۱۹۱٤، باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا چەندین پاسپۆرتیان ساختەکردبوو بۆ هاوڵاتیانی ئەڵمانی لە ئەمریکا بۆئەوەی بگەڕێنەوە وڵاتەکەیان. کاتێک بەڵگەی پێویستی ئەم کارە خرایە بەردەمیان، باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا بەڵێندا لەمەودوا هەموو هەوڵێکی بەگەڕبخات بۆئەوەی ڕێ لەم کارەی ساختەکردنی پاسپۆرت بگرێت. دەزگای نهێنی بەرپرسانی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیایان بەئامانج گرت، وەک فرانز ڤۆن پاپن، کە دواتر لە بازنەی ناوخۆیی هیتلەر کاری کرد،

کە بەبەردەوامی چالاکی نهێنی ئەنجامدەدا لەناو ئەمریکا. لەکۆتاییدا، ئەڵمانەکان سەرکەوتن لە گۆڕینی ئاراستەی هزری گشتی ئەمریکییەکان لەدژی دۆزی ئەڵمانەکان. کاتێک ئەمریکا چووە نێو جەنگەکەوە، هەواڵگری ناوخۆیی فراوان بوو.
بەچوونی ئەمریکا بۆناو جەنگەکە، کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی بوو بە کارە هەرە لەپێشینەکانی ئەو وڵاتە. بەر لەساڵی ١٩١٧، جی-٢ بوو بە لقێکی شاراوەی بەشی کۆلیژی جەنگ، کە تەنیا دوو ئەفسەر و دوو نووسەری هەبوون. بۆ تشرینی دووەمی ١٩١٨، ژمارەی فەرمانبەرانی هەڵکشا بۆ ٢٨٢ ئەفسەر، ٢٩ ئەفسەر سیخوڕ، وە ٩٤٨ فەرمانبەری مەدەنی. رائید رالف ڤان دێمان و عەمید مارلبۆرۆ چێرچل بەرپرس بوون لە گۆڕین و گواستنەوەی جی-٢، کە بەلێبڕاوانە توانیان چارەسەری سیخوڕی و چالاکی نهێنی بکات. بۆ کەمکردنەوەی پشت بەستن بە دەزگا هەواڵگرییەکانی بەریتانی و فەرەنسی، ئەم دەزگایە بەرفراوانیەکی مەزنی بەخۆیەوە بینی و ئیتر بۆ هەر زانیارییەکی هەواڵگریی بەزۆری پشتی بە دەزگاکەی دەبەست.
لەبەرەبەری کۆتایی هاتن بە دەزگایەکی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی کە رکابەر بوو لەگەڵ هاوتا بیانییەکانی، سەرۆک ئەرکانی سوپاس پەیتن مارچ دەزگایەکی نوێی دروست کرد بەناوی ئێم ئای-٨ لە حەزیرانی ١٠١٧. ئەم دەزگایە یەکەیەک بوو لە بەشی کۆد و شیفرە کە لەلایەن ڤان دیمانەوە دروستکرابوو. کەسایەتی هەرە سەرەکی بۆ راپەڕاندنی ئەم بەشە بریتیی بوو لە هێربێرت هاردلی، نووسەر لە وەزارەتی دەرەوە، کە لەلایەن ڤان دێمانەوە تەجنید کرابوو. هاردلی توانای هەبوو زۆر بە لێهاتووانە و ئاسانی هەموو کۆدە دبلۆماسییەکان بشکێنێت، وە لەساڵی ١٩١٦دا کارێکی وا ناوازەی ئەنجامدا کە بووە هۆی سەرسوڕمانی سەرپەرشتیارەکانی بە شکاندنی پەیامێکی شیفرەکراو لەنێوان سەرهەنگ هاوس و ویڵسن بۆماوەی دوو کاتژمێر. بۆ دوو ساڵی داهاتوو، هاردلی بەتەواوی توانی هەموو ئەو رێچارانە رێک بخات کە دڵنیایی دەزگایەکی هەواڵگریی گونجاویان دەستەبەر دەکرد.
پاشان هاردلی هەرلەناو دەزگای ئێم ئای-٨ هەڵسا بە دروستکردنی چەندین بەشی تایبەتمەند بە سیستەمی شکاندنی کۆد، کە لەڕاستیدا بووە وەرچەرخانێک لەمێژووی

دژەهەواڵگریی ئەمریکادا. ئێم ئای-٨ بەرپرس بوو لە پێدانی مەشقی سەربازی شکاندنی کۆد بەر لەوەی هەر سەربازێکی بۆ ئەرکێکی دەرەوە رابسپێردرێت. هاردلی لەماوەی کارکردنیدا توانی دەیان هەزار پەیامی پەیوەندی دبلۆماسی بشکێنێت لە چەندین وڵاتی وەک ئەرژەنتین، بەرازیل، چیلی، کۆستاریکا، کوبا، ئەڵمانیا، مەکسیک، پاناما، و ئیسپانیا. تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی هاردلی و چەند تایبەتمەندێکی کۆدشکاندن بوون بە هاوسەفەری سەرۆک وڵسن بۆ مۆرکردنی پەیمانی ڤێرسای. ئەرکی سەرەکی ئەمان بریتیی بوو لە شکاندنی ئەو پەیامە دبلۆماسییانەی لەماوەی بەستنی پەیمانەکەدا لەلایەن سەرانی وڵاتانی بەژدار پێشکەش دەکران. هەرچۆنێک بێت، یەکسەر دوای جەنگەکە، دەزگای جی-٢ و کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی دووبارە بەهای خۆیان لەدەستدا، ئەمەش دوای ئەوەی ئەمریکا بەهۆی پەیمانی ڤێرسای لە رابەرایەتیکردنی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانی کشایەوە، ئەمش پێویستی بە جەنگێکی تری جیهانیی دەکرد بۆئەوەی دووبارە بەهاکەی بەدەست بهێنێتەوە.[i]

## هەواڵگری ئەمریکا لەجەنگی جیهانیی دووەم

لەماوەی ساڵانی دوای جەنگی جیهانیی یەکەمدا بەهای کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگریی لەلایەن حکومەتی ئەمریکادا داکشانێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی. تەسریحکردنی خێرای سوپا و دوودڵی ئەمریکا بۆ گێڕانی رۆڵێکی پێشڕەوانە لە کاروبار و کێشمەکێشمەکانی جیهاندا وایکرد کۆمەڵگای هەواڵگریی بەرەو دابەزین هەنگاو بنێت. سەرەڕای هەموو ئەمانە، هێربت هاردلی، کە تۆڕی هەواڵگری ئەمریکای

---

[i] Ameringer, Charles D. U.S. Foreign Intelligence: The Secret Side of American History. Lexington, MA: Lexington Books, ١٩٩٠.
-Andrew, Christopher. For the President's Eyes Only: Secret Intelligence and the American Presidency from Washington to Bush. New York: HarperCollins, ١٩٩٥.
-Andrew, Christopher, and Jeremy Noakes. Intelligence and International Relations, ١٩٠٠–١٩٤٥. Exeter, UK: University of Exeter Press, ١٩٨٧.
-Jeffrey-Jones, Rhodri. Cloak and Dollar: A History of American Secret Intelligence. New Haven, CT: Yale University Press, ٢٠٠٢.

دروست کردبوو لەماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، داوای کرد تواناکانی شکاندنی کۆدە دووبارە بەگەڕ بخرێتەوە. لەکاتێکدا حکومەت چەندین بەشی بەرنامە هەواڵگرییەکانی هەڵوەشاندەوە، یاردلی پێشنیاری کرد کە نووسینگەیەکی شیفرەسازیی کاتی ئاشتی هەبێت کە لەلایەن وەزارەتی دەرەوە و جەنگەوە سەرپەرشتی بکرێت. لە ئایاری ١٩١٩دا، فرانک پۆلک، وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتە بە وەکالەت، کە چالاکییە هەواڵگرییەکانی لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەم ڕێکدەخست، هەوڵەکانی هاردلی نرخاند و بڕیاریدا دەزگایەکی نوێ دروست بکرێت لەژێر ناوی "ژووری ڕەش."

ژووری ڕەش بەشێک بوو لە یەکەی هەواڵگری سەربازیی، کە پێک هاتبوو لە ٢٥ کەسی شارەزا لە کاروباری کردنەوەی شیفرە و شکاندنی کۆد. وەزارەتی جەنگ لەم سەروبەندەدا هەڵسا بە دابینکردنی لەسەدا شەستی پارەکەی، لەکاتێکدا وەزارەتی دەرەوە ئەو لەسەدا چلەی دابین کرد کە لە بودجەی ساڵانەی سەد هەزار دۆلار مایەوە. لەژێر سەرپەرشتی هاردلی، ژووری ڕەش کاری ناوازەی ئەنجامدا لە شیفرەدارکردن و شکاندنی شیفرەی دوژمن، بەڵام بەئەنجامدانی ئەم کارە، هەندێک یاسای پێشێل کرد سەبارەت بە نهێنیگەرایی، ئەمەش بەهۆی ڕێککەوتنی نهێنی لەگەڵ هەندێ کۆمپانیای وەک وێستر یونیەن و پۆستال تەلەگراف بۆ بڕینی پەیامی دبلۆماسی بیانیی. ژووری ڕەش نزیکەی چل و پێنج هەزار کۆدی لەنزیکەی دوازدە وڵات شکاند، وەک ئەرژەنتین، بەریتانیا، فەڕانسا، ئەڵمانیا، و ژاپۆن. کردنەوەی کۆدە دبلۆماسییەکانی وڵاتی ژاپۆن یەکێک بوو لە مەزنترین دەسکەوتەکانی ژووری ڕەش، کە بەتایبەتی سوودی هەبوو لەماوەی کۆنفڕانسی دەریایی واشنتۆن لەساڵی ١٩٢٢. دەستگەیشتن بە زانیارییەکانی وەفدی ژاپۆنییەکان لەم کۆنفرانسەدا وای کرد بەریەککەوتن لەگەڵ بەریتانییەکان یان ئەمریکییەکان ڕێیان خۆشکرد بۆئەوەی وەفدەکەیان پێ لەسەر بڕیارەکان خۆی دابگرێت بۆئەوەی ڕێ لە خواستەکانی ژاپۆن بگرێت بۆ زیادکردنی بڕی کەشتیگەلی وڵاتەکەی. سەرەڕای ئەم سەرکەوتنە، چالاکییەکانی ژووری ڕەش سنووردارکران و لەکۆتاییدا لەلایەن وەزیری دەرەوە هێنری

ستیمسن لەساڵی ١٩٢٩ داخران، ئەمەش بەهۆی گۆڕینی ستراتیژیەت و ئەولەویەتی ئیدارەی داهاتووی هوڤەر و "شلەژانی مەزن" کە دوای ماوەیەکی کورت ڕوویدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ھاردلی دوای شازدە ساڵ خزمەتی مەزن، بە شەرمەزاری لەکارەکە دەرچێت. هەرەسێکی مەرە کوشندە بۆ هەواڵگری ئەمریکا بریتیی بوو لە ڕەتکردنەوەی ئیدارەی هوڤەر بۆ بەکارهێنانی ئەو زانیاریانەی کۆیانکردبووە لە سیخوڕی، بەتایبەتی ئەو زانیاریانە لە پەیوەندییەکانی هەواڵگری سەربازی ئەڵمانەکان دەستیان کەوتبوو کە هەوڵیدابوو بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر بەرە بەرگرییەکانی پێرل هاربەر. دوای داخستنی ژووری ڕەش لەساڵی ١٩٢٩، ستیمسن دەزگای هەواڵگری هێمایی (SIS) پێکهێنا بۆ بەهێزکردنی کۆکردنەوەی کۆد و شکاندنی شیفرەی دوژمن. ولیام فریدمان، کە لە ژووری ڕەشدا کاری دەکرد، بەرپرسی ئەم بەشە نوێیە (SIS) بوو. لەساڵی ١٩٢٧دا، ناوبراو سۆلۆمۆن کولباک، فرانک رۆلێت، و ئەبراهام سینکۆڤی هێنایە ریزەکانی ئەو دەزگایە، کە هەرچواریان سەرمایە بوون بۆ شیکردنەوەی کۆدی ئەمریکا بۆماوەی سی ساڵی داهاتوو. سەرەڕای بەرزبوونەوەی تەنگژە لە ئەورووپا، دەزگاکە هەر بەردەوام بوو لە سەرنج خستنەسەر کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری لەسەر چالاکییەکانی ژاپۆن. هەروەک وڵاتانی تر لەماوەی ساڵانی سییەکاندا، حکومەتی ژاپۆن بەکارهێنانی شیفرەی خولاو (rotor ciphers) بەکارهێنا بۆ پەیامە نهێنییەکانی. لەساڵی ١٩٣٥، دەزگاکە یەکێک لەم ئامێرانەی شکاند، کە فریدمان ناوی نابوو ئامێری سووری ژاپۆنییەکان. دوای دووساڵ، ژاپۆنییەکان ئەمەشیان گۆڕی و ئامێرێکی ئاڵۆزتریان بەکارهێنا، کە فریدمان ئەویشی شکاند و لەساڵی ١٩٤٠ ئامێرێکی دروست کرد بەناوی "پێرپڵ". بەم شێوەیە، هەموو شکاندن و وەرگێڕانی پەیامەکانی ژاپۆن ناونرابوون "جادوو". ئەم سەرکەوتنە، بەداخەوە، بەهۆی ململانێی نێوان دەزگای هەواڵگری هێمایی (SIS) و (OP-٢٠-G) بایەخی خۆی لەدەستدا. هەردوو دەزگاکە ڕکابەرییان لەسەر ئەوە دەکرد کە کێ سەرەتا دەگاتە لای سەرۆک، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لەسەر تۆپەراسیۆنی بچووکی لەم چەشنە ناکۆکی

دەکەوتە نێوانیان. ئەم بەربەرەکانێیە بێگومان سەرئەنجامی خەراپی بەدوای خۆیدا هێنا.

لێهاتوویی دەزگای هەواڵگری هێمایی لە شکاندنی کۆدی دبلۆماسی ژاپۆنییەکان نەیتوانی ئەمریکا رزگاربکات لە "رۆژی نەنگیی" لە پێرل هاربەر، کاتێک کەشتیگەلی ژاپۆنییەکان هێرشێکی لەناکاویان لە حەوتی کانوونی یەکەمی ١٩٤١ بۆسەر کەشتیگەلی ئەمریکا پێکهێنا، وەک بەشێک لە هەڵمەتی داگیرکردن لەسەرتاسەری ئاسیا و زەریای هێمن. هۆکاری گیرانی پێرل هاربەر لە نەبوونی سەرچاوەی نەبوو. بەڵکو تەوا بەپێچەوانەوە، سەرکەوتنی هەواڵگری ئەمریکا لە برینی پەیامی دبلۆمسی ژاپۆنییەکان، بەشێوەیەک لە شێوەکان، بوو بە مەزنترین لاوازی وڵاتەکەیان.

دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکا دوو زانیاری لەدەستدا کە دەکرا کەشتیگەلی ئاگاداربکاتەوە دەربارەی هێرشەکە بۆسەر پێرل هاربەر. یەکێکیان لە کۆدێکی کەم بایەخەوە بوو بەناوی(جەی١٩) کە لە بەرواری ٢٤ی ئەیلولی ١٩٤١. بەگوێرەی ئەو کۆدە، تاکیۆ یۆشیکاوا، ئەو سیخورەی کە بۆ قونسڵخانەی ژاپۆن لە هۆنولولو دیاریکرابوو، رێنماییکرا بۆئەوەی شوێنی نیشتنەوەی کەشتیەکان لە پێرل هاربەر دیاری بکات. هەرچەندە دەزگا هەواڵگرییەکان توانیبوویان ئەم کۆدە بشکێنن، بەڵام بایەخی پێویستی پێنەدرا. هیچ کەسێک لەنێو دەزگا هەواڵگرییەکان پێیان وانەبوو کە پێرل هاربەر دەبێتە ئامانجی هێرشی ژاپۆنییەکان چونکە ئەو پەیامانەی پێشتر بڕیبوویان داوای بەدەستهێنانی زانیاریان دەکرد لەسەر شوێنی وەک مانێلا، پۆرتلان، سان دیێگۆ، وە کەناڵی پەنەما.

دووەم زانیاری گرنگ کە ئەمریکا لەدەستیدا برینی کۆدێکی تری(جەی١٩) بوو دەربارەی "کۆدی با"ی ژاپۆنییەکان. ئەم جۆرە کۆدانە لە بەرواری ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٤١ لە دوورگەی بەینبریج لە واشنتۆن بردران. پەیامەکە بریتیی بوو لە لیستێکی کۆد کە ئامارەیان بەوە دابوو ژاپۆن دەبێت پەیوەندی لەگەڵ کامە وڵاتدا بپچرێنێت. "بارانی بای رۆژهەڵات" ئامارە بوو بۆ پچراندنی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا؛ "بای باکووری هەوراوی،" ئامارە بوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت؛ "بای خۆرئاوای روون"

ئاماژە بوو بۆ بەریتانیا. هیچ کەسێک بایەخی ئەم کۆدانەی نەزانی، وەک دیاریشە هێزەکانی هێرشی هاوای پشتیان بەم کۆدانە دەبەست چونکە لەسەر رێگای پێرل هاربەر بوو. لە وەڵامی پێشنیاری ئەمریکا بۆ قاییلکردنی ژاپۆن بۆئەوەی لە چین و ئیندۆسینا بکشێتەوە، حکومەتی ژاپۆن لە بەرواری ٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٤١ وەڵامی داواکارییەکانی ئەمریکای دایەوە. لە وەڵامەکەدا هاتبوو کە ژاپۆن داواکاری ئەمریکا رەتدەکاتەوە. لە بەشی چواردەمی هەمان وەڵامدا هاتبوو کە ژاپۆن گفتوگۆکانی هەڵدەپەسێرێت، کە دەبوایە زۆر بەرلە هێرشەکە ئەنجام بدرایە. سەرکەوتنی ژاپۆن لەم هێرشەدا بەرادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ پاراستنی ئەو نهێنییەی کە ئەوان لەرێی کۆدەوە بەیەکتریان دەگەیاند.[i]

## دەزگای ئاسایشی هێزە چەکدارەکان

ئەم دەزگایە وەک دەزگایەکی نووسینی نهێنی جیفرەیی لە بیستی ئایاری ١٩٤٩ لەلایەن وەزارەتی بەرگری ئەمریکاوە دامەزراوە. دوابەدوای دەساڵی ماوەی دوای جەنگی جیهانیی دووەم، بایەخی ئەم دەزگایە لە رێکخستنی هەوڵەکان بۆ دامەزراندنی سێ یەکەی گرنگی سەربازیی بەتەواوی دەرکەوت: سوپا، هێزی دەریایی، و هێزی ئاسمانیی. ئەم یەکانە لەژێر یاسای وەزارەتی بەرگریی لەرێگای یاسای ئاسایشی نیشتیمانیی ساڵی ١٩٤٩ دروست کران. هەروەها، دەبێت ئاماژە بەوەش بکەین کە رۆڵی ئەم دەزگایە لە یەکخستنەوەی هەموو دەزگاکانی تایبەتمەند بە نووسینی نهێنی شیفرەدار بەشێوەیەکی فراوان نابێت لەیاد بکرێت، ئەم دەزگایە رۆڵی بەرپرسیاریەتی

[i] Ameringer, Charles D. U.S. Foreign Intelligence: The Secret Side of American History. Lexington, MA: Lexington Books, ١٩٩٠.
-Andrew, Christopher. For the President's Eyes Only: Secret Intelligence and the American Presidency from Washington to Bush. New York: HarperCollins, ١٩٩٥.
-Andrew, Christopher, and Jeremy Noakes. Intelligence and International Relations ١٩٠٠–١٩٤٥. Exeter, UK: University of Exeter Press, ١٩٨٧.

ستراتیژی پێدرا لە زانستی نووسینی نهێنییدا، بەمەش کارە تەکنیکییەکان بۆ کەسانی تایبەت تەرخانکرا.

رێکخستنی ئۆپەراسیۆنەکان لەساڵی ١٩٥٢ هەنگاوێکی تری لەبەرەو پێشچوون بەخۆیەوە بینی کاتێک سەرۆک هاری ترومان بڕیاری دروستکردنی ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی (NSA) دەرکرد. ئەم دەزگایە شوێنی دەزگای ئاسایشی هێزە چەکدارەکانی گرتەوە، هەموو ئەو ئەرکانەی پێ سپێردرا کە پەیوەست بوون بە کاری نووسینی هونەری شیفرەسازی وەزارەتی دەرەوە چەند دەزگایەکی تری تایبەتی حکومەت. پاڵنەری سەرەکی بۆ ئەم گۆڕانکارییە بریتیی بوو لە یاداشتێکی ساڵی ١٩٥١ لەلایەن بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندی واڵتەر بێدیل سمیس کە تیایدا جەختی لەسەر ئەوە کردبووەوە کە ئەو میکانیزمەی ئەوکاتە لەبەردەست بوو بۆ کۆنترۆڵکردن و رێکخستنی کۆکردنەوە و پرۆسەکردنی هەواڵگریی گەیاندن، گونجاو نەبوو.[i]

## هەواڵگری سوپا و فەرماندەیی پاراستن

فەرماندەیی هاوبەشی سوپای ئەمریکا بەرپرسیارە لە دابینکردنی پێویستییە هەواڵگرییەکان و پێداویستییەکانی پەیوەستدار بە هێزە زەمینییەکانی سوپای ئەمریکا لەسەرتاسەری جیهاندا. هەواڵگری سوپا و فەرماندەیی پاراستن لە بەرواری یەکی کانوونی دووەمی ١٩٧٧ دروستکراوە، ئامانج لە دامەزراندنیشی بریتیی بوو لەکۆکردنەوەی هەواڵگری فرەڕەهەندی سوپا و ئۆپەراسیۆنی ئەمنی لەژێر سەرپەرشتی یەک فەرماندەییدا. یەکەم کەسیش کە سەرپەرشتی ئەم دەزگا نوێیەی پێ راسپێردرا بریتیی بوو لە ویلیام رۆیال، جەنەراڵی پێشووی بریکاری ئاسایشی سوپا.

---

[i] Hopple, Gerald, and Bruce Watson (eds.). The Military Intelligence Community. Boulder, CO: Westview Press, ١٩٨٦.
-Relyea, Harold C. Evolution and Organization of Intelligence Activities in the United States. Laguna Hills, CA: Aegean Park Press, n.d., pp. ٢٤٠–٢٧٣.

ئەم دامەزراوەیە لەوەتەی کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەمەوە گرنگترین دامەزراوەی هەواڵگری سوپای ئەمریکایە. ئەم دەزگایە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە هەندێ ئۆپەراسیۆنی هەواڵگری ئەنجامبدات کە راستەوخۆ پەیوەندییان بە سوپاوە هەیە، ئەمەش بە ئامانجی بەدەستهێنانی هەندێک زانیاری تایبەت کە لەڕووی هەواڵگییەوە بایەخێکی زۆریان هەیە. بۆ بەهێزکردنی زیاتری ئەم دەزگایە، هەندێ دامەزراوەی تریشی خرایەسەر وەک ئاژانسی هەواڵگری سوپای ئەمریکا، کە دەزگایەکی هەواڵگری مرۆیی و دژەهەواڵگرییە، بارەگاکەی دەکەوتە فۆرت جۆرج، ماریلاند.

هەر لەنێو ئەو دەزگا هاوبەشەدا، چەندین بەشی ئەنجامی هەواڵگری سوپاش بوونیان هەیە. بۆ هاوینی ١٩٧٧، یەکەکانی نێو ئەم دەزگایە بەنێو چوار کیشوەردا بڵاوەیان پێکرا، وەک هەشت بارەگای جێگری، چەندین یەکەی دیسپلینی کەسیی. ئەو گروپ و یەکانەی دەکەونەژێر بەرپرسیاریەتی ئەم دەزگایە لە ٦٦ەمین گروپی هەواڵگریی سەربازیی لە ئەڵمانیا؛ ٤٧٠ەمین گروپ لە پەنەما؛ ٥٠٠ەمین گروپ لە ژاپۆن؛ و ٥٠١ەمین گروپ لە کۆریای باشوور. لەکۆتایی ساڵانی حەفتاکاندا، بە هەردوو کارمەندی مەدەنی و سڤیلەوە، ژمارەی کارمەندانی دەزگاکە گەیشتە دە هەزار کەس. لەساڵانی هەشتاکاندا دەزگاکە فراوانتریش بوو، وە بۆساڵی ١٩٨٥، ژمارەی کارمەندەکانی گەیشتە نزیکەی پازدە هەزار کەس.

تا دەهات ئەم دەزگایە فراوانبوونی زیاتری بەخۆیەوە دەبینی. لەبەرواری هەشتی کانوونی دووەمی ١٩٧٨، هەواڵگریی و ناوەندی شیکردنەوەی هەڕەشەی خرایەپاڵ. هەروەها، دەزگاکە خرایەنێو کاری نوخبەی گروپی ئاسایشی تایبەت کە بەرپرسیار بوو لە بڵاوکردنەوەی زانیاری نهێنیی بۆ دەزگا تایبەتمەندەکان. لەساڵی ١٩٨٩، بارەگای دەزگایە گواسترایەوە بۆ فۆرت بیلۆڤار، ڤێرجینیا، وە لەساڵی ١٩٩١ هەڵسا بە دروستکردنی ناوەندی هەواڵگری نیشتیمانی (NGIC) داتای هەڕەشەئامێز و شیکردنەوەی بڵاوەپێکردنی هێزی دەبەخشی.[i]

---

[i] Finnegan, John Patrick. Military Intelligence: An Army Lineage Series. Center of Military History, United States Army. Washington, DC: US Government Printing Office, ١٩٩٨.

## دەزگای ئاسایشی سوپا

ئەم دەزگایە وەک دەزگایەکی نووسینی شیفرەدار لە بەرواری پازدەی ئەیلولی ١٩٤٥ لەلایەن وەزارەتی جەنگی ئەمریکاوە دروستکراوە. لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەم، چەندین کاری نووسینی شیفرەدار لەنێو سوپای ئەمریکادا لەژێر سەرپەرشتی چەندین ئەفسەر و یەکەوە ئەنجامدران و پارەیەکی زۆری تیادا خەرج کرا. ئەم سیستەمە لاوازە بە دروستبوونی دەزگای ئاسایشی سوپا وجودی نەما؛ بەرپرسیارییەتیەکانی بریتیی بوون لە ئەنجامی هەواڵگریی گەیاندن؛ لێکۆڵینەوە لە تەکنیکەکان بۆ پەیوەندی گەیاندنی نهێنیی، وەک مەرەکەبی نادیار، وێنەی بچووک، و کۆدی کراوە؛ سەرپەرشتیاری تەکنیکی چالاکییەکانی ئاسایشی گەیاندن بۆ وەزارەتی سوپا؛ و ئامادەکردن، کۆگاکردن، بڵاوکردنەوە، و ژمێریاری هەموو ئەو مادانەی لە سیستەمی شیفرەدارکردنی سوپایی بەکاردەهاتن.

لەڕوویەکەوە، ئەم دەزگایە تەمەنێکی کورتی هەبوو لەڕووی کردارییەوە چونکە تەنیا بۆماوەی چوارساڵ بەردەوام بوو، دوای ئەوە ئاژانسی پاراستنی هێزە چەکدارەکانی سەریهەڵدا. بەڵام لەڕوویەکی ترەوە، تا ساڵی ١٩٧٦ هەر بەردەوام بوو لە ئەرکەکەی. بە سەرهەڵدانی جەنگی کۆریا ئەو بەشانەی کە لە دەزگاکە مابوونەوە زیادکران بەمەبەستی پێدانی پشتیوای تەکنیکی بۆ ئەو هێزانەی لەوێدا جێگیرکرابوون. لەساڵی ١٩٧٧، دەزگاکە دەستی گرت بەسەر کارەکانی کاروباری ئەلیکترۆنی و هەواڵگری ئەلیکترۆنی کە پێشتر لەژێر سەرپەرشتی فەیلەقی هێماییدا بوون. هەروەها دووبارە کارمەندانی دەزگاکە لەساڵی ١٩٦١ بەژداری جەنگی ئەمریکایان لەدژی ڤیێتنام کرد.[i]

---

-Miller, Nathan. Spying for America: The Hidden History of U.S. Intelligence. New York: Dell Publishing, ١٩٩٠.

[i] Kahn, David. The Codebreakers: The Comprehensive History of Secret Communications from Ancient Times to the Internet. New York: Charles Scribner & Sons, ١٩٩٦.

-The Origin and Development of the Army Security Agency. Laguna Hills, CA: Aegean Park Press, n.d., p. ١٥٩.

## کۆمسیۆنی وزەی ئەتۆمی (AEC)

کۆمسیۆنی وزەی ئەتۆمی بەپێی ماددەی وزەی ئەتۆمی ساڵی ١٩٤٦ دروستکرا. سەرۆک هاری ترومان لە بەرواری یەکی ئابی ١٩٤٦ بڕیارەکەی واژوو کرد وە لە سەرەتای کانوونی ساڵی داهاتوو بەفەرمی دەست بەکاربوو. سیاسەتی سەرەکی دروستکردنی بریتیی بوو لەوەی ئایا بەرنامەی ناووکی دەچێتە ژێر کۆنترۆڵی کەرتی سڤیل یان سەربازییەوە. بەپێی یاساکە —کە بە یاسای ماکماهۆن ناسرابوو— وزەی ئەتۆمی بەتووندی خرایەژێر رکێفی کەرتی سڤیلەوە. بەپێی مەرجەکانی، کۆمسیۆنەکە کۆمسیۆنەکە لە پێنج کەس پێک دێت کە هەموویان لەلایەن سەرۆکی ئەمریکاوە دادەمەزرێنرێن بەڵام بە ئامۆژگاریی و رەزامەندی ئەنجوومەنی پیرانی ئەو وڵاتە. هەروەها کۆمیتەیەکی هەماهەنگیی سەربازییش دروستکرا کە دەبوایە کۆمسیۆنەکە راوێژکاری لەگەڵدا بکات و ئامۆژگاری پێبدات لەسەر ئەو مەسەلانەی لە بواری وزەی ئەتۆمی پەیوەندییان بە کەرتی سەربازییەوە هەبوو. هەروەها، یاساکە ئەو دەسەڵاتەشی بەخشیبوو کە هەموو ناوەندەکانی بەرهەمهێنان و ریاکتۆری ناووکی لەلایەن حکومەتەوە خاوەندارییەتی بکرێن. کۆمسیۆنەکە دەسەڵاتی تەواوی پێبەخشرا لەمەڕ ئەو زانیارییە تەکنیکیانەی پێویست بوون لە بەرهەمهێنانی هێزی ئەتۆمی. لەکۆتاییدا، لە بواری سیاسەتی دەرەوە و ئاسایشی نیشتیمانیدا یاساکە ئەو مەرجەی دانا کە دەبێت بەتووندی رێ لە دزەکردنی هەموو زانیارییەکی ئەتۆمی و تەکنەلۆژی بۆ وڵاتانی تر، بە هاوپەیمانانی ئەمریکاشەوە، بگیرێت.

هەرزوو کۆمسیۆنەکە کەوتەبەر شاڵاوی رەخنە. لەساڵی ١٩٥٣، راوێژکاری کۆمسیۆنەکە رۆبەرت ئۆپێنهایمەر وەک مەترسی ئاسایشی لە پۆستەکەی هەڵپەسێردرا، ئەمەش دوابەدوای ئەو رەخنانەی لەلایەن ئێدوارد تێلەر ئاراستەی ناوبراو کرابوو. هەردووکیان لە لۆس ئالامۆس وەک دوو زانا کاریان کردبوو رۆڵێکی کارایان گێڕابوو لە پەرەپێدانی بۆمبی ئەتۆمی. ئۆپێنهایمەر لەسەر بنەمای ئەخلاقی و تەکنیکی دژی پەرەپێدانی بۆمبی هایدرۆجینی وەستابوو. بە تێپەڕبوونی یاسای وزەی ئەتۆمی لەساڵی ١٩٥٤ مشتومڕەکە قووڵتر بووەوە. هەرکە یاساکە پەسەند کرا،

ئەرکی کۆمسیۆنەکە گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینی کە ئێستا دەبوایە لایەنی سەلامەتی هێزی ناووکی بپارێزێت و هانی بەکارهێنانی بازرگانیەکەی بدات. بۆ سالآنی شەستەکان، کۆمسیۆنەکە بەوە تۆمەتبارکرا کە سەرنجی پێویست ناخاتە سەر بواری ژینگەیی و پرسەکانی سەلامەتی مرۆڤ لەکاتی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی هێزی ناووکی بۆ مەبەستی بازرگانیی. بەهۆی دەرچوونی یاسایەکەوە لەساڵی ۱۹۷۵ کۆمسیۆنەکە هەڵوەشایەوە و بەفەرمی کارەکانی وەستاند. لەجیاتی ئەمە، *کۆمسیۆنی یاسایی ناووکی* دەستبەکاربوو.

کۆمسیۆنی وزەی ئەتۆمی ئەندامی سەرەتایی کۆمەڵگای هەواڵگریی بوو وە وەک بەکارهێنەر و بەرهەمهێنەر هەواڵگریی کاری دەکرد. وەک بەرهەمهێنەرێکی هەواڵگریی، بەشی هەواڵگری کۆمسیۆنەکە چەندین زانیاری کۆکردەوە لەسەر وزەی ناووکی لەڕێگای تۆپەراسیۆنی تۆڕێکی جیهانی چاودێری کردنی شوێنی بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە چەکە. هەروەها کۆمسیۆنەکە هەڵسا بە پێدانی خەملآندنی تواناکانی ناووکی وڵاتانی تریش. هەر کۆمسیۆنەکە بوو کە لە ۲۷ی شوباتی ۱۹۵۸دا رایگەیاند کە یەکێتی سۆڤیەت دوو بۆمبی هایدرۆجینی لە شوێنێکی تاقیکردنەوەی قوتبیدا تەقاندۆتەوە. لەساڵی ۱۹٤۹وە، نزیکەی سی و یەک تاقیکردنەوەی ناووکی سۆڤیەتی ئاشکرا کردووە، لەکاتێکدا چەندین نهێنی تریشی پاراستووە بەبێ ئەوەی بڵاویان بکاتەوە. هەر کۆمسیۆنەکە بوو کە بەشێوەیەکی ئاشکرا رایگەیاند وڵاتی چین یەکەم تەقینەوەی ناووکی خۆی لە ١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤ ئەنجامداوە.

وەک بەکارهێنەرێکی هەواڵگریی، کۆمسیۆنەکە دەیەویست زانیاری بەدەست بهێنێت لەمەڕ بەرنامەکانی وزەی ئەتۆمی بیانی و پێشکەوتنی چەک. ئەندامەی کۆمسیۆنەکە، ئەدمیرال لویس ستڕۆس، نیگەرانی خۆی دەربڕی کە هیچ سیستەمێکی گونجاو نییە بۆ چاودێریکردنی ئاستی تیشکی ئەتۆمەدار لە بەرگەهەوادا، کە مەبەستی سەرەکی لەمە زانینی تاقیکردنەوە ناووکییەکانی سۆڤیەت بوو. لە ئەنجامی ئەمەدا گرووپی هەواڵگری ناوەندی و دەزگای هەواڵگری ناوەندیی *پانێلی درێژخایەنی چاودێریان* دامەزراند. هێزی ئاسمانی بەتووندی دژی ئەم بڕیارە وەستایەوە، پێی وابوو کە

دروستکردنی ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنە پێشکەوتوو نییە و بەفیرۆدانی پارەیە چونکە پێی وابوو کە یەکێتی سۆڤیەت لەوکاتەدا هیچی وای نەمابوو تواناى ناووکی بەدەست بهێنێت. هەروەها هێزە ئاسمانییەکان پێشیان وابوو کە ئەمە دەبێتە هۆی پچڕاندنی ئەوان لە تواناکانیان بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی ئەوان وەک ئەرکی سەرەکی بۆردومانی ستراتیژی درێژخایەن دەبینی. سەرۆک ترومان لە ئەیلولی ١٩٤٧ ڕەزامەندی دەربڕیی لەسەر بیرۆکەکە. سیستەمەکە لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٩ وەگەڕکەوت هەرچەندە ناڕەزایەتییەکان دەربارەی خەرجەکەی هێشتا بەردەوام بوون. ئیمڕۆ؛ *وەزارەتی وزە* هەمان ئەرکی کۆمسیۆنەکە لە کۆمەڵگای هەواڵگرییدا دەگێڕێت و وەزیفەکانی لەپێدانی زانیاری دروست و لەکاتی خۆیدا دەربارەی چەکی ناووکی و تەشەنە نەکردنی؛ زانست و تەکنەلۆژیا؛ ئاسایشی وزە؛ وە وزەی ناووکی، سەلامەتی، پاشماوە.[i]

## بەرنامەی تالپیۆت

بەرنامەی تالپیۆت بەرنامەیەکی مەشقپێدانی نوخبەی هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیلە بۆ تەجنیدکردنی ئەو کەسانەی کە توانایاکی باشی ئەکادیمی نیشاندەدەن لە زانست و توانا شاراوەکانی سەرکردایەتییدا. دەرچوانی بەرنامەی تالپیۆت بواری زیاتریان پێدەبەخشرێت لە خوێندنی باڵادا لەوکاتەی لەخزمەتی سەربازییدان، وە دواتر پسپۆڕییەکەیان بەکاردەهێنن بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتری هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیل و پەرەپێدانی پێگەکانی سەرکردایەتی تەکنەلۆژی. بەرنامەکەی بۆیەکەمجار لەساڵی ١٩٧٩ دەستبەکاربوو.[ii]

---

[i] Herken, Greg. Cardinal Choices: Presidential Science Advising from the Atomic Bomb to SDI. Oxford: Oxford University Press, ١٩٩٢.
-Hewlett, Richard, and Oscar Anderson. A History of the United States Atomic Energy Commission. University Park, PA: Pennsylvania University Press, ١٩٦٢.
-Sylves, Richard. The Nuclear Oracles: A Political History of the General Advisory Committee of the Atomic Energy Commission, ١٩٤٧–١٩٧٧. Ames, IA: Iowa State University Press, ١٩٨٧.
[ii] Forbes, ١٩٩٨ (https://www.forbes.com/asap/١٩٩٨/٠٦٠١/٠٩٢_٤.html)

ئەم بەرنامەیە بۆیەکەمجار لەلایەن پرۆفیسۆر فیلێکس دۆسام و پرۆفیسۆر شۆل یاتزیڤ لە زانکۆی عیبریەوە دەستی پێکرد، کە هەردووکیان بیرۆکەکەیان دایە رافایل ئیتان، سەرۆک ئەرکانی سوپا، بۆئەوەی پەرە بە سوپای ئەو وڵاتە بدرێت. ئامانجی بیرۆکەکە بۆئەوە بوو کە سوود لە تواناکانی مرۆڤ وەربگیرێت بۆ پەرەپێدانی تەکنەلۆژیا لەناو سوپای ئەو وڵاتەدا. بەرنامەکە لەلایەن هێزەکانی ئاسمانی ئیسرائیل و هێزەکانی بەرگریی ئەو وڵاتەوە سپۆنسەری کرابوو بە ئامانجی پەرەپێدانی پیشەسازی چەک و تەکنەلۆژیا وە لەژێر سەرپەرشتی زانکۆی عیبری لە ئۆرشەلیم بەرێوەدەچوو.

لەماوەی سەرەتای دەسبەکاربوونیدا، بەژداربووانی ئەم بەرنامەیە هەڵدەستان بە خوێندنی زانستەکانی فیزیا و بیرکاری و بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان لەم بوارەدا بەدەست دەهێنا (هەندێکیان لە بواری زانستی کۆمپیوتەریشدا دەیانخوێند- بەگوێرەی حەزی خۆیان) لە زانکۆی عیبری ئۆرشەلیم بە جلوبەرگی سەربازی هێزەکانی ئاسمانی. جگە لەمەش ئەم فێرخوازانە چەندین راهێنانی تریشیان دەکرد بۆئەوەی شارەزابن لەگەڵ هەموو لقەکانی هێزەکانی بەرگری ئیسرائیل (مەشقی سەرەتایی ئاستی ٤٠ی پیادە، خولی ئەندازیاری جەنگ، خولی زرێپۆش، خولی مەدفەعیە، رێنمایی وەرگرتن لە تەکتیکی سەربازییدا). لەکۆتایی هەر خولێکدا، کە ٤٠ هەفتە خەریکی دەبوون، بەژداربوان پلەی میلازمی یەکەم و بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان پێدەبەخشرا لەم بوارەدا. سەرەڕای سێ ساڵی خزمەتی ناچاری سەربازیی، خزمەتەکە پێک هاتبوو لە شەش ساڵ خزمەتی سەربازیی لە پێگە جیاجیاکانی سوپادا. تەواوی ماوەی خزمەتەکە، بە خزمەتی سەربازیشەوە، نۆساڵە.[i]

یەکەمین خولی ئەم بەرنامەیە ٢٥ قوتابی لەخۆگرتبوو. پاشان، ژمارەی فێرزخوازان بۆ ٥٠-٦٠ فێرخواز بەرزکرایەوە. ئەو کەسانەی داوای بەژداربوون لەو بەرنامەیان دەکرد ژمارەیان نزیکەی دەهەزار کەس دەبوون، دەبوایە بەرزترین کۆنمرە لە ئاستی دواناوەندییدا بەدەست بهێنن. ئینجا، باشترین ١٥٠-٢٠٠ فێرخواز وەردەگیران و

---

[i] Wall Street Journal

بۆماوەی دووڕۆژ دەکەوتنەژێر تاقیکردنەوەیەکی چڕەوە. ئاستی ژیری ئەو قوتابیانە هەڵدەسەنگێنرا، ئەرکێکی بەکۆمەڵیان پێدەدرا کە بزانرێت تا چ ئەندازەیەی توانای کارکردنی بەکۆمەڵیان هەیە، هەموو ئەم کارانە لەژێر سەرپەرشتی دەروونناسی پسپۆر و کارمەندی سەربازییەوە ئەنجام دەدرا. شێوازی خولەکە، بۆنموونە، بەو شێوەیە بوو کە ئەو بەژداربوانە ئەرکێکی دیاریکراویان پێدەدرا پاشان لەنیوەی ئەو ئەرکەدا ڕێنماییەکان دەگۆڕدران، وەک کورتکردنەوەی کاتی تەرخانکراو یان گۆڕینی خودی ئەرکەکە. دوا قۆناغی وەرگرتن بۆناو بەرنامەکە لە لێکۆڵینەوەیەکی چڕی ئەمنی پێکدێت کە لەلایەن هێزەکانی ئاسمانییەوە ئەنجام دەدرێت.[i]

## یەکەی ٨٢٠٠

یەکەیەکە لەناو هەواڵگری سوپای ئیسرائیلی کە بەرپرسە لە کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری هێمایی[(٧)] و شکاندنی کۆد. ئەمە یەکەیە، پاشکۆی بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سەربازییە کە بە (ئامان) ناسراوە. ئەم بەشە بەشێوەیەکی سەرەکی لە گەنجانی ١٨ بۆ ٢١ ساڵ پێکدێت. لەئەنجامی بوونی سەربازی گەنج لەو یەکەیدا، وە کەمی ماوەی خزمەتی سەربازییان، یەکەکە پشت بە تەجنیدی تایبەت دەبەستێت کە توانای خۆگونجاندن و فێربوونی خێرایان هەبێت.[ii] دوای بەرنامەی قوتابخانە بۆ گەنجانی ١٦ تا ١٨ ساڵ، کە فێری کۆدی کۆمپیوتەر و پسپۆڕی هاککردن دەکرێن. سەربازانی پێشووی یەکەی ٨٢٠٠، دوای ئەوەی خزمەتی سەربازی تەواو دەکەن، دەچنەنێو بەرزترین پێگەکانی کۆمپانیاکانی تەکنەلۆژیای زانیاری و سیلیکۆن ڤالی.[iii]

---

[i] http://www.themarker.com/technation/١.١٤٨١٨٩١

[ii] "٨٢٠٠ graduates aren't like ٢٣ year-olds in Texas or Norway" (http://www.globes.co.il/en/article-٨٢٠٠-graduates-are-not-like-٢٣-year-olds-in-texas-or-norway-١٠٠١١٩١٢٩٤) ٥ Jun, ٢٠١٧, Tali Tsipori

[iii] InsideIsrael'sSecretStartupMachine(https://www.forbes.com/sites/richardbehar/٢٠١٦/٠٥/١١/inside-israels-secret-startup-machine/#٥٨ed١c٥٠١a٥١) Richard Behar , CONTRIBUTOR, MAY ١١, ٢٠١٦; From The Israeli Army Unit ٨٢٠٠ To Silicon Valley (https://techcrunch.com/٢٠١٥/٠٣/٢٠/from-the-٨٢٠٠-to-silicon-valle y) Posted Mar ٢٠, ٢٠١٥ by Idan Tendler

بەگوێرەی وتەکانی بەڕێوەبەری زانستی سەربازی لە پەیمانگای شاهانە، "یەکەی ٨٢٠٠ دەکرێت وەک پێشکەوتووترین دەزگای تەکنیکی هەواڵگری دابنرێت لە جیهاندا وە لەڕووی هوونەرییەوە دەکرێت بە ئاژانسی ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکا بەراورد بکرێت، تەنها لەوەدا نەبێت کە ئەمەی دواییان لەڕووی قەبارە و ستافەوە مەزنترە.[i] لەڕووی مێژووییشەوە، دەزگاکە لەساڵی ١٩٥٢ دامەزراوە. ئەوکات دەزگاکە زۆر سادده بوو، تەنیا چەند کەلوپەلێکی ئاسایی ئەمریکی تیادا بەکاردەهات. لە ئەسڵدا پێی دەوترا یەکەی خزمەتی سەربازیی دووەم و دواتر یەکەی خزمەتی هەواڵگری ٥١٥، یەکەکە گواسترایەوە بۆ شاری یافا بۆ بنکەی ئێستای لە چوارڕیانی گلیلۆت. یەکەی سەربازی ٨٢٠٠ لە ئێستادا مەزنترین یەکەیە لە هێزەکانی بەرگری ئیسرائیلدا کە لە چەند هەزار سەربازێک پێکدێت.[ii] لەڕووی کار و ئەرکەوە ڕێک لە دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکا و پێکهاتەیەک لە وەزارەتی بەرگریی هەروەک چۆن ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکاش بەشێکە لە وەزارەتی بەرگری ئەو وڵاتە.

هەروەک لەسەرەوەدا باسکرا، یەکەکە تەنیا گەنجانی ١٨ بۆ ٢١ ساڵی وەردەگرێت، ئەمەش لەڕێگای گەڕان و دۆزینەوەیەکی وردی تواناکانی ئەو گەنجانە لەلایەن هێزەکانی بەرگری ئیسرائیل دوای ئەوەی قۆناغی خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکەن، ئەنجام دەدرێت.[iii] لە چالاکییە هەرەسەرەکییەکانی ئەم یەکەیە بریتییە لە

---

[i] Unit ٨٢٠٠: Israel's cyber spy agency, Former insiders and whistle-blowers provide a view of the formidable military intelligence outfit (https://www.ft.com/content/٦٩f١٥٠da-٢٥b٨-١١e٥-bd٨٣-٧١cb٦٠e٨f٠٨c) JULY ١٠, ٢٠١٥ by John Reed, Financial Times

[ii] "IDF Record Book ٢٠١٠". Bamahane (in Hebrew). No. ٣٠٥٢. September ٨, ٢٠١٠. p. ٨٣.

[iii] ئەم ڕێکارە نیشانەی سەرکەوتنی سوپای ئیسرائیلی نیشاندەدات، لەو ڕووەوەی کە قوتابییەکان خۆیان ناچن داوای دامەزراندن لەو بەشەدا بکەن بەڵکو یەکەیەکی بەهێزی حکومەت خۆی سەرپەرشتی ئەو کارە دەکات و بەدوای قوتابییە ئاست بەرزەکاندا دەگەڕێت. بە بڕوای من، وەرگێڕ، کوردستان زۆر پێویستی بەم جۆرە تەکنیکە هەیە چونکە قوتابی زۆر بەهرەمەند لەنێو ناوەندەکانی خوێندندا هەن کە سوودێکی بێ ئەندازەیان بۆ داهاتووی ئەم وڵاتە هەیە. دامەزراندن و پێدانی کار لەسەر بنەمای خزم و ناسیاویەتی لە ستراتیژیەتی درێژخایەندا زیانی

دروستکردنی ڤایرۆسی (Stuxnet) کە لەساڵی ٢٠١٠ هێرشی کردەسەر یەکە ناووکییەکانی ئێرانی. هەروەها، ڤایرۆسی (Duqu)ش هەر دەستکردنی ئەو یەکەیەیە کە لە ئەیلولی ٢٠١١ دروستی کردبوو. بەهێزترین و پێشکەوتووترین ڤایرۆسی سەردەمیش بەناوی (Duqu ٢,٠) هەر لە بەرهەمهێنانی ئەو یەکەیەیە کە لەساڵی ٢٠١٤ هێرشی کردە سەر تاقیگەکانی (Kaspersky). ڤایرۆسەکە بۆماوەی چەندین مانگ لە سیستەمی تاقیگاکەدا مایەوە بەبێ ئەوەی هەستی پێبکرێت. جگە لە بەئامانجگرتنی ئەو تاقیگەیە، ڤایرۆسەکە بەکاریش هات بۆ سیخوڕیکردن بەسەر گفتوگۆکانی سەبارەت بە پەیمانی ناووکی ئێران، وە دوای ماوەیەکی زۆر لەلایەن کۆنپیتەرەکانی شوێنی مانەوەی ئێرانییەکان هەستی پێکرا. بەگوێرەی لێدوانەکانی (Kaspersky)، "فەلسەفە و ڕێگاکانی کارکردنی ئەم ڤایرۆسە چەندین نەوە پێش هەموو ئەو شتانەیە کە جیهانی بینیویەتی."[i]

## پارتی کۆمۆنیستی ئەمریکی

تێوەگلانی پارتی کۆمۆنیستی لە کردەی سیخوڕیدا ڕەگوڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی پارتی ناوبراو بە کۆمۆنیستی نێونەتەوەیی، وە سیاسەتەکانی دەرەوەی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەتی جاران. هەوڵەکانی سیخوڕی لەساڵی ١٩٤٢دا زیادیان کرد، ئەمەش لەوکاتەدا هات کە هەردوو وڵاتەکە لە یەک بەرەی هاوپەیمانیەتیدا بوون لەکاتی جەنگی لەدژی ئەڵمانیای نازی. لەم نێوەندەدا دەکرێت بوترێت کە هەردوو نەتەوەکە بەناچاری دەبوایە بەتەواوی پشت بەیەکتر ببەستن، وە لەهەمانکاتیشدا بەقووڵی متمانەیان بەیەکتر نەبوو. پرۆژەی نهێنی ڤینۆنا (VENONA)، شکاندنی شیفرەی گەیاندنی و پەیوەندی سۆڤیەت لەساڵی ١٩٤٣ بۆ ١٩٤٥، لەوکاتەدا دەستی

---

زۆر بە ئاساییشی نیشتیمانی دەگەیەنیت لەلایەک، خاوەن بەهرەکانی تریش پەراوێز دەخرێن، لەلایەکی ترەوە. بەمەش، خاوەن بەهرەکان بۆ دەرەوەی کوردستان کۆچ دەکەن و سوود بە وڵاتێکی تر دەگەیەنن. (وەرگێڕ)

[i] ٢٨. The Duqu ٢,٠ Targeted Attacks(https://www.kaspersky.co.uk/resource-center/threats/duqu-٢)

پێکرد کە هەردووکیان هاوپەیمانی جەنگ بوون. چەند کەس لە ئەندامانی پارتەکە کردەی سیخوڕیان ئەنجامدا، کێ ئەندامی پارتەکە بوو، وە تا چ ئەندازەیەک سیخوڕیەکەیان بووە هۆی خستنەمەترسی ئاسایشی ئەمریکا، جێگای مشتومڕە.

دوای شۆڕشی رووسیای ۱۹۱۷، یەکێتی سۆڤیەت هیچ هەڕەشەیەکی سەربازیی نەکردە سەر هیچ یەکێک لە زلهێزەکانی جیهان. هێزی سەرمایەداریی، وەک سەرکەوتنی هاوپەیمانان لەجەنگی جیهانی یەکەم، بووە هۆی ئەوەی چەند بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێری لەنێو خودی خەڵکەکەی خۆیاندا رووبدات. پارتە کۆمۆنیستەکان، لە ئەمریکا و ئەورووپای رۆژئاوا، والێکدرانەوە کە مەترسییەکی مەزن بن بۆسەر هاندانی یاخیبوون و ناکۆکی مەدەنی، تەنانەت یاخیبوونیش، نەوەک کردەی سیخوڕی.

پارتی کۆمۆنیستی ئەمریکی، کە لەساڵی ۱۹۱۹ لەلایەن چارلس رۆزەنبێرگ و لویس فرەینا رێکخرابوو، لەلایەن سەرکردەکانی رووسیا، لاتڤیا، لیتوانیا، پۆلەندا، ئۆکرانیا، و فیدراسیۆنی جوو پێشووی پارتی سۆشیالیستی ئەمریکاوە پەیوەندی پێوەکرا، رکەبەری کرد بۆئەوەی لەلایەن کۆمۆنیستی نێونەتەوەییەوە لەگەڵ پارتی کرێکارانی کۆمۆنیستی دانی پێدا بنرێت، کە ئەمەی دواییان لەلایەن جۆن رید و ئالفرید واگنکینختەوە رێکخرابوو. بۆ ساڵی ۱۹۲۹ ئەوانەی هێشتا چالاک بوون هەڵسان بە پێکهێنانی پارتی کۆمۆنیستی ئەمریکا. هەرکە شەپۆلی گەرمی شۆڕشگێڕی دوای جەنگ بەرەو کشانەوە هەنگاوینا، کە بووە هۆی پەراوزخستنی یەکێتی سۆڤیەت، و دەسەڵاتی ستالین لەنێو پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت زیادی کرد، هەموو کایەکانی ئەو وڵاتە بە ئاراستەیەک هەنگاویاننا کە لەبەرژەوەندی نیشتیمانی یەکێتی سۆڤیەت بن و هەژموونی ئەو وڵاتە لە جیهانی نوێدا هەڵکشانی بەخۆیەوە بینی.

لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا، کۆمۆنیستەکانی ئەمریکا لە پێگەیەکی نایابدا بوون بۆ ئەوەی زانیاری بەسوود بە دەزگا هەواڵگرییەکانی یەکێتی سۆڤیەت ببەخشن. ژمارەیەکی زۆریان لەو پیشانەدا کاریان دەکرد کە لێیەوە توانیان زانیاری ببەخشنە سۆڤیەت بەو نیازەی خزمەتێک بکەن بۆ دۆزە رەواکەیان لەدژی بەرەی یەکگرتووی فاشیستی. زیاتر لە پازدە هەزار کۆمۆنیست خۆبەخشانە چوونە ریزی سوپاوە؛

کۆمۆنیستەکان لە دەزگا گرنگەکاندا کاریان دەکرد وەک نووسینگەی خزمەتگوزاری ستراتیژیی و نووسینگەی ئیدارەی نرخ. تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی کە ئەندامانی کۆمۆنیست بەئاشکرا لە دەرگای دراوسێکانیان بدەن بۆئەوەی داوایان لێبکەن بێن و لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیاندا بەژدار بن بۆئەوەی پەیامی خۆیان پێڕابگەیەنن بە ئامانجی دانانی کاریگەریی لەسەر هز و رامانی زۆرینەی هاولاتیان. هەرکە پارتەکە بەهێز بوو، ئەمجارە دەستی برد بۆ کڕینی کەلوپەلی جەنگی و هەماهەنگیکردن لەگەڵ ئەو کارگانەی چەکیان بەرهەم دەهێنا، لەکاتێکدا بێ پسانەوە کاریان دەکرد بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت. لەلایەکی ترەوە، ژمارەیەکی زۆری کۆمۆنیستەکان حکومەتە دژە کۆمۆنیستیەکانیان وەک دوژمنی پێشکەوتن لەقەڵەم دەدا. رابەرانی پارتی وەک یوجین دێنیس و ئەلیزابێت گورلی فلین بەم تۆمەتە درانە دادگا، بەڵام هەرگیز بەتۆمەتی سیخوڕی هیچ کاردانەوەیەکیان لەگەڵدا نەکرا. بەدەستهێنانی زانیاری بۆ یەکێتی سۆڤیەت کاری تۆڕێکی تایبەت بوو کە راستەوخۆ پەیامەکانی بۆ کەسی دیاریکراو لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی سۆڤیەت دەنارد، بەتایبەتی دەزگای (NKVD) و (GRU).

ئەم دەزگایانە خاوەنی چەندین شوێنی نیشتەجێ بوون لە دەرەوەدا کە پەیوەندییەکی چڕیان لەژێر ناوی نهێنی "هاونیشتیمانی" لەگەڵ ئەندامانی پارتی کۆمۆنیست هەبوو لەو وڵاتەی کە تیایدا بەتایبەتی تەرخانکرابوون بە ئەنجامدانی چالاکیگەلێک بۆ بەرژەوەندی یەکێتی سۆڤیەت. بۆ نموونە، شکاندنی کۆدەکانی (VENONA) ئەوەمان پێدەڵێت کە دەسەلاتدارانی ئەمریکا بەبەردەوام کاریان دەکرد بۆ زانینی ناوی ئەندامانی رابەری پارتی کۆمۆنیستی. بەکورتی، جەنگێکی بێدەنگ لەناو ئەمریکادا دروست بوو لەنێوان حکومەتی ئەو وڵاتە و ئەو کەس و پارتانەی لەجیاتی یەکێتی سۆڤیەت (وە بۆ یەکێتی سۆڤیەت) کاریان دەکرد.

دوای ئەوەی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت لەدوای جەنگەوە بوون بە نەیاری سەرسەخت و دوو لە بەهێزترین وڵاتی جیهان، کۆمۆنیستەکان چیتر بە نایاسایی زانیارییان بە هاوپەیمانێک نەدا، بەڵکو بە دوژمنێکی نیشتیمانیی. دیارترین کەیسی بریتیی بوو

لەو کەیسەی کە جولیوس و ئەسیل رۆزەنبێرگی تیادا تۆمەتبارکران (کە بەبێ هیچ گومانێک ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی بوون). ناوبراوان تەنیا نەبوون لەم هەڵمەتە، بەڵکو دەیڤید گرین گلاس، برای ئەسیل؛ هاوسەرەکەی، روس؛ وە چەندانی تر زانیاری گرنگیان بەدەست هێنابوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت لە پرۆژەی مانهاتن (کە تیادا گرین گلاس کارمەندی بوو) و تەکنەلۆژیای چەکی ناووکی. کارەکە تەنیا لەم شوێنەدا کۆتایی نەهات، ناوبراو زیاتر لە چل و نۆ بەڵگەنامەی گرنگی لەسەر دۆزرایەوە سەبارەت بە سیخوڕی سۆڤیەت، دیارترینیان ئەوە بوو کە زانیاری گرنگی هەبوو لەمەڕ توێژینەوەی ئەمریکا بۆ بەرەوپێشبردنی بۆمبی ئەتۆمی ئەو وڵاتە. هەموو ئەو بەڵگەنامە نهێنیانە لەساڵی ١٩٩٥دا بڵاوکرانەوە، و دیرۆکڤانان ئەم چەندە بە تاڵترین بەشی مێژووی چل ساڵی رابردووی ئەمریکا دەبینن.

جۆن نێرل و هارڤی کلێر ناوی زیاتر لە ٣٤٩ هاوڵاتی ئەمریکیان کۆکردەوە کە سیخوڕیان بۆ یەکێتی سۆڤیەت کردووە. پشت بەستن بە لێکۆڵینەوەکانی ڤینۆڤا گومانی زۆری بۆ دیرۆکڤانان دروست کردووە. دەقەکانی زمانی رووسی کە لێیەوە ئەو زانیاریانە شیفرە کرابوون تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت بڵاونەکراونەتەوە. ژمارەیەکی زۆر لەو سەرچاوانەی پچڕپچڕن، وە زانیاری دروست بەدەستەوە نادەن. کەیسی ئالگەر هیس هێشتا مشتومڕی لەسەرە، هەرچەندە راپۆرتەکانی ڤینۆڤا ناوی نهێنی ئەوەیان بە "ئالێس" ناساندووە.[i]

---

[i] Amerasia Case; Atomic Spy Ring; Bentley, Elizabeth Terrill; Browder, Earl Russell; Chambers, Whittaker; Cohen, Lona (Leontina) and Morris, aka Helen and Peter Kroger; Currie, Lauchlin B.; Fuchs, Emil Julius Klaus; Gold, Harry; Greenglass, David; GRU (Main Intelligence Directorate); Hall, Theodore Alvin Alvin; Hiss, Alger; KGB (Komitet Gosudarstvennoi Bezopasnosti); Los Alamos; NKVD (Narodnyj Komissariat Vnutrennikh Del—Peoples Commissariat for Internal Affairs); Rosenberg, Julius and Ethel; Sedition Act, ١٩١٨; Sobell, Morton; VENONA

## بلێچلی پارک

لەساڵی ١٩٣٨ دەزگایەکی هەواڵگری بەریتانی، بەشی کۆد و شیفرە، کۆشکێکی زەمانی ڤیکتۆریا و خانووبەرەیەکیان لە سێر هێربێرت لیۆن کڕی. شوێنەکە دەکەوتە نزیکەی پەنجا میل لە باکووری شاری لەندەن لە شارۆچەکەی بلێچلی لە بەکینگهامشێر لە ناوچەیەک کە ئێستا بەشێکە لە میلتۆن کەینس.

ناوی نهێنی بلێچلی پارک بریتیی بوو لە وێستگەی X یان وێستگەی جەنگ. ئەم دەزگایە بوو بە ناوەندی شکاندنی کۆدی بەریتانی لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا. کۆدی هەموو نەیارەکانی لەوێدا دەشکێنران کە گرنگترینیان بریتیی بوو لە کۆدی ئێنیگمای نازییەکان، کە بەهۆی ئامێری ئێنیگماوە بەرهەم دەهێنران. لە زنجیرەی ئامێری ڕۆتۆری کارەبایی میکانیکی تەشفیرە، بەکارهێنراوە لە سەرەتا بۆ ناوەندی سەدەی بیستەم، بۆ پاراستنی پەیوەندی سەربازیی و بازرگانیی و دبلۆماسیی. لەلایەن ئەندازیاری ئەڵمانی ئارثەر شیبیەس(Arthur Scherbius) لەکۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا دروستکراوە. مۆدێلەکانی سەرەتای ئەم ئامێرە بۆ مەبەستی بازرگانی بەکارهێنراوە لە سەرەتاکانی ساڵانی ١٩٢٠ و هەڵبژێردرابوو لەلایەن سوپا و خزمەتگوزاری حکومی چەند وڵاتێکەوە، بەشێوەیەکی دیار ئەڵمانیای نازی لە پێش و ماوەی جەنگی جیهانی دووەم. چەند مۆدێلێکی جیاواز لە ئێنیگما بەرهەمهێنرابوو، بەڵام ناسراوترینیان مۆدێلی سوپای ئەڵمانی بوو. ئێنیگما بەکاردێت بۆ نوسینی نامە یان پەیامێک پاشان ئەو نامەیە تێکەڵ دەکرێت بەبەکارهێنانی سێ ویل یان ڕۆتۆر کە پیتی جیاوازی ئەلفابێت پیشان دەدات. وە، وەرگری نامەکە پێویستە ڕێکخستنی تەواوی ئەو ڕۆتۆرانە بزانێت بۆئەوەی تێکستە کۆدکراوەکان چاکبکاتەوە. لەماوەی چەند ساڵێکدا ئەم ئامێرە زۆر قورسکرا کە پسپۆرە ئەڵمانیەکان پلاگ و سرکێتی کارەباییان بۆی زیاد کرد. ئەم ئامێرە لەناو سندوقێکدا ڕێکخراوە کە کیبۆردێکی نووسین و کیبۆردێکی گڵۆپی هەیە، کاتێک تۆ هەر پیتێک دادەگری لەسەر کیبۆردەکە ئەوە گڵۆپی ئەو پیتە نیش دەکات کە لەجیاتی دانراوە.

ئەڵمانیەکان بڕوایان وابوو کە ئێنیگما ناشکێندرێت، بۆیە بەکاریان دەهێنا لە هەموو شێوازەکانی پەیوەندیکردنیان لە مەیدانی جەنگ و ئاسمان و دەریاش بۆکارە نهێنیەکانیان. بەریتانییەکان باسیاندەکرد کە هەر هەواڵگریەک دەتوانێت سودێکی زۆر لە ئێنیگما وەرگرێت و دەیانوت کە زۆر نهێنیە.

پەیامە شفرەکراوەکانی (نهێنیکراوەکانی) سوپای ئەڵمانی بۆیەکەمجار لەلایەن نوسینگەی شفرەکردنی پۆلەندیەوە لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ ئاشکراکران. ئەم سەرکەوتنە ئەنجامی هەوڵدانی سێ شفرەکاری پۆلەندی Marian Rejewski ,Jerzy Rozycki، Henryk Zygalski بوو کە ئیشیان دەکرد بۆ دەزگای هەواڵگری پۆلەندی. ریفیسکی (Rejewski) هەستا بەپێچەوانەکردنەوەی یاساکانی ئامێرەکە، بەبەکارهێنانی بیردۆزەکانی بیرکاری و کەرەستەکانی بۆ دابینکرا لەلایەن دەزگای هەواڵگری فەرەنسیەوە. لەوەبەدوا سێ بیرکاریزانەکە ئامێرێکی میکانیکیان دارشت بۆ شکاندنی (ئاشکراکردنی) شیفرەکاری ئێنیگما. لە ١٩٣٨ بەدواوە، ئامێری ئێنیگما بەبەردەوامی زیاتر ئاڵۆز دەبوو، ئاشکراکردنی زیاتر قورس دەبوو و کەرەستە و کەسی زیاتری دەویست زیاتر لەوەی کە پۆلەندیەکان بەرهەمیان ئەهێنا.

لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بیرکاریزانی بەریتانی ئالان تیورینگ هەوڵدەدات بۆ شکاندنی (ئاشکراکردنی کۆدی ئێنیگما) کە بەهۆیەوە سوپای ئەڵمانی نامەکانیان پێ ئاڵوگۆڕ دەکرد بۆ ئەم مەبەستەش هەڵدەستێ بەدروست کردنی ئامێرێک ( The Bomb)، کە دوای چەند ساڵێک ئەم ئامێرە زیاتر پەرەی پێ دەدرێت و دەبێت بەیەکەم کۆمپیوتەر لە مێژوودا و هەر ئەمیش بوو توانی ئێنیگما بشکێنێت.[i]

---

[i] Hinsley, F. H., and Alan Stripp. Code Breakers: The Inside Story of Bletchley Park. New York: Oxford University Press, ١٩٩٤.
-Sebag-Montefiore, Hugh. Enigma: The Battle for the Code. New York: John Wylie & Sons, ٢٠٠٠.

## نووسینگەی هەماهەنگی ئاسایشی بەریتانی

ئەم نووسینگەیە دامەزراوەیەکی فرەئامانجە کە کاری لەسەر هەواڵگری رۆژئاوا، ئۆپەراسیۆنی تایبەت، و پروپاگەندە دەکرد لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا. ولیام ساموێل ستیڤنسن، خاوەن کارگەیەک و هاوڵاتی کەندی، لە حەزیرانی ١٩٤٠ گەیشتە شاری نیۆیۆرک. مەبەستی سەرەتایی ناوبراو بریتیی بوو لە بوون بە بەڕێوەبەری نووسینگەی کۆنترۆڵی پاسپۆرت، پێگەیەکی نهێنی دەزگای هەواڵگری نهێنی بەریتانی (SIS) یاخود (MI-٦) لە دەرەوەی وڵات.[أ] سەرەڕای ئەم کارەی، ئەرکی سەرەکی ناوبراو بەخێرایی گەشەی کرد بۆ پاراستنی موڵکی بەریتانییەکان لە ئەمریکا، پشکنینی چالاکییەکانی ئەو وڵاتانەی دژەی هاوپەیمانان لەجەنگی جیهانی دووەم دەجەنگان، و بەرپەرچدانەوەی پروپاگەندەی ئەو وڵاتانە بۆئەوەی وا لە رای گشتی ئەمریکا بکەن ببن بە پشتیوانی بەریتانیا و هانی ئەمریکا بدەن بۆئەوەی بێتەناو جەنگەکەوە، بێتە بەرەی بەریتانیا. بۆسەرکەوتن لەو ئەرکانەیدا، لەکۆتاییدا دەزگاکەی دەبوایە نەک تەنیا کۆنترۆڵی دەزگای هەواڵگریی نهێنی بەریتانیدا بگرێت، بەڵکو پێویستی بە کۆنترۆڵکردنی دەزگای دژەهەواڵگری (MI-٥)، دەزگای ئۆپەراسیۆنی تایبەت، و دەزگای کاروباری سیاسی لە نیوەگۆی رۆژئاوای زەویدا، هەبوو. هەرکە دامەزراوەکە لەو قاڵبە تەقلیدیەیدا نەما، لەسەرەتای ساڵی ١٩٤١ ئەوکات وەک نووسینگەی هەماهەنگی ئاسایشی بەریتانیا ناسرا. ئەم نووسینگەیە بارەگاکەی

---

[أ] دەزگای هەواڵگری بەریتانی یان ئێس ئای ئێس: کەلەهەمان کاتدا بە ئێم ئای ٦ (ژمارەکانی هەواڵگری سەربازی ٦ دەناسرێت، دەزگای هەواڵگری بەریتانیایە، کەلەساڵی ١٩٠١ دامەزرێنراوە. کە جگە لە دەزگای هەواڵگری، دەزگای هەواڵگری نهێنییە. پێشتر کاری دەزگاکە بە (نووسینگەی خزمەتگوزەرانی نهێنی) بووە. بارەگای سەرەکی دەزگاکە، بینای ئێس ئای ئێسە لەشاری لەندەن، لە بەریتانیا. دەزگاکە کاری هەواڵگری بۆ وڵاتەی دەکات، لەپاڵ گشت دەزگاکانی وڵاتدا. دەزگاکە لەسەرانسەری وڵاتدا خاوەن هەواڵگر و سیخوورە. دەزگاکە لە دوای هەریەکەلە دەزگای هەواڵگری پاکستان و دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا، ناسراویە (سی ئای ئەی)، سێیەم بەهێزترین دەزگای هەواڵگرییە لەجیهاندا، لەڕووی سیخوڕی و هەواڵگری.

دەکەوتە ناوەندی رۆکفێلەر لە نیۆیۆرک و لق و بنکەی لەسەرتاسەری نیوەگۆی رۆژئاوادا هەبوو.

ئەم نووسینگەیە رۆڵێکی زۆر گرنگی گێڕا لە پێوەندی لەگەڵ دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکادا. سەرەتا، پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێف بی ئایدا توندوتۆڵ کرد. ئەو دەزگایە زانیاری هەواڵگری نهێنی پێدەدا دەربارەی سیخوڕی ئەو وڵاتانەی دژی هاوپەیمانان دەجەنگا لە جەنگی جیهانیی دووەم و هەموو ئەو چالاکیانەی ئەوان لە ئەمریکا ئەنجامیان دەدا. ئەم چەشنە زانیارییە هەواڵگرییانە لەڕێگەی ئێف بی ئای دەدرانە سوپای ئەمریکا و هێزە دەریاییەکانی. هەروەها، نووسینگەکە رێنمایی دەدایە ئێف بی ئای دەربارەی چۆنیەتی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری نهێنی و رێگاکانی کردنەوە و خوێندنەوەی نامە نهێنییەکان.[i]

## بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی (NSA)

لە ئەمەریکا بە گەورەترین خاوەنکار بۆ بیرکاریزانان لە جیهاندا دادەنرێت واتە زۆرترین ژمارەی بیرکاریزان کە لە دەزگایەکی حکومی یان ئەهلی کار بکەن بریتیە لەو دەزگایە. بیرکاری کاری سەرەکیە لە بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی، و بیرکاریزانان ئیش لەسەر نیشانە هەواڵگریەکان و ئاسایشی زانیاری دەکەن کە دیارە مەبەست لەمە تەشفیر و بەدەستهێنانی زانیاری نهێنی وڵاتانی ترە لەکاتی ئاشتی و شەڕدا. هەروەها رەگەزنامەی ئەمریکی مەرجە بۆ ئیش کرد لەم دەزگایە (هەڵبەت ئاسانترین مەرجیشە). دەوترێت کە NSA نزیکەی پێنج هێندەی سی ئسی ئەی گەورەترە، کە رێکخراوێکی هەواڵگریە بەرپرسە لە چاودێریکردنی جیهان و زانیاری هەواڵگریەکان و پاراستنی ئاسایشی ئەمریکا.

---

[i] Macdonald, Bill. The True Intrepid: Sir William Stephenson and the Unknown Agents. Vancouver: Raincoast Books, ٢٠٠١.
-Stafford, David. "'Intrepid': Myth and Reality," Journal of Contemporary History ٢٢ (١٩٨٧), ٣٠٣–٣١٧.
-Troy, Thomas F. Wild Bill and Intrepid: Donovan, Stephenson, and the Origins of CIA. New Haven, CT: Yale University Press, ١٩٩٦.

لێرەدا پرسیارێک سەرهەڵدەدات کە ئەویش: بۆچی بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا ئەوەندە گرنگی بە بیرکاری دەدات؟

زۆرێک لە کردارەکان ئاسانن بۆ جێبەجێ کردن، بەڵام زۆرینەیان مەحاڵن بۆ پێچەوانە کردنەوە. بۆ نمونە، تێکەڵکردنی چەند قوتویەکی زەرد و سور، سوتاندنی پارچە کاغەزێک، یان شکاندنی پەرداخێکی شوشە، ناتوانین ئەم کردارانە پێچەوانە بکەینەوە. (پێچەوانە کردنەوە لێرە مەبەستمان کاغەزە سوتاوەکە بکەینەوە بە پارچە کاغەزەکەی پێش سوتان، یان پەرداخە شکاوەکە بکەینەوە بە پەرداخەکەی پێش شکان). بەهەمان شێوەش زۆرێک لە کردارە بیرکارییەکان ئاسانن بۆ جێبەجێ کردن، بەڵام زۆر قورسن بۆ پێچەوانە کردنەوە. کریپتۆگرافی مۆدێرن (تەشفیرکردنی زانیاری) لەسەر ئەم راستیەی سەرەوە بنیاتنراوە.

ئاسانترین نمونە بۆ هەژماری نارێکی بریتیە لە لێکدانی ژمارە خۆبەشەکان. لە بیرت بێ ژمارەی خۆبەش بە ژمارەیەک دەوترێت کە تەنها بەسەر خۆی و یەکدا دابەش دەبێت، وەک... ٢،٣،٥،٧،١١،١٣: تێبینی بکە ژمارە خۆبەشەکان ناتوانرێت بکرێن بە لێکدانی دوو ژمارەی بچوکتر. لێکدان کردنی نێوان ژمارە خۆبەشەکان کردارێکی ئاسانە، تەنها لێکدانی یەکتریان دەکەیت. بەڵام دۆزینەوەی دوو کۆلکەی خۆبەش بۆ ژمارەیەکی گەورە قورسە. بۆ نمونە، ئەو دوو ژمارە خۆبەشە کامانەن کە لێکدانیان دەکاتە ١٠٠٣؟ وەڵامەکەی پێویستی بە ماندوبونێکی زۆر زیاترە وەک لە دۆزینەوەی ژمارەکە خۆی. ئەو کردارە بیرکاریانەی کە ئاسانن بۆ هەژمار کردن، بەڵام قورسن بۆ پێچەوانە کردنەوە پێیان دەوترێت *کردارەکانی یەک — ڕێگا*.

بۆ تەشفیرکردن، دوو ژمارەی خۆبەشی زۆر گەورە وەردەگرین، کە هەریەکەیان سەدان ڕەنوسی هەبێت، و لێکدانی یەکتریان دەکەین. گەر بێتوو ئەنجامەکەی روون بێت، ئەو کۆلکانە ناتوانرێت بە ئاسانی بدۆزرێنەوە. هەرچەندە، ئەگەر یەکێک لەو کۆلکانە زانراوبێت، ئەوا کۆلکەکەی تریان بە دابەشکردنێکی سادە دەدۆزرێتەوە. هەبوونی زانیاری یەکێک لە کۆلکەکان وەک دەرگایەکی نهێنی وایە، ڕێگە بەهەموو کەسێک دەدات کە بیزانێت، بۆ دۆزینەوە دەرگاکەی تر. کرداری یەک — ڕێگای نهێنی

ئەتوانرێت پێچەوانە بکرێتەوە لەلایەن دیزاینەرێکەوە، کە کلیلەکەیی هەبێت، و هیچ کەسێکی تر. ناتوانێت بەمە هەڵسێت.
لەساڵی ١٩٧٨، سێ قوتابی لە پەیمانگای ماسەچووستس بۆ تەکنەلۆجیا (MIT)، *رۆن ریڤیست، ئادی شەمیەر* و *لێن ئادەلمەن* سیستەمێکی کریپرۆگرافیان داهێنا، لەسەر ئەساسی قورسێتی دۆزینەوەی فاکتەری ژمارە گەورەکان. و ئەلگۆریزمەکەیان ناونا RSA کە دەکاتە پیتی یەکەمی ناوی هەرسێکیانە. ئەلگۆریزمی RSA یەکەمین سیستەمی کلیلی گشتی بوو. هەر بەکارهێنەرێک دوو کلیلی ژمارەیی پەیوەندیدار بەیەکتر دروست دەکات. یەکێکیان لە چوارچێوەی کلیلێکی ژمارەیی وەک دەلیلێک. ئەوەی تریان تایبەتە و تەنها خاوەنەکەی دەیزانێت. کەسی نێرەر کلیلە گشتیەکەی وەرگر بەکارئەهێنێت بۆ شفرەکردنی پەیامەکەی، و پاشان ئەینێرێت. دواتر کەسی وەرگر بە بەکارهێنانی کلیلە تایبەتەکە کە تەنها ئەو ئەیزانێت پەیامەکە ئاشکرا ئەکات.
درێژەی تەکنیکی سیستەمی RSA لەهەمان کاتدا ئاسان نیە قوتابی بەشەکانی بیرکاری زیاتر لە قۆناغی چوارەم دەیخوێنین، مەرجە ئەو کەسەی لەم جۆرە تەشفیرانە دەخوێنێت جۆرێک لە پاشخانی هەبێت لە تیۆری ژمارەکان (Number Theory)، بەشێوەیەکی رێژەیی روونە. کە پشت بە ئەنجامێک دەبەستێت کە پێی دەوترێت تیۆرمە بچکۆلەکەی فێرمات، کە لەلایەن بیرکاریزانی فەرەنسی *پیەر فێرمات* لەساڵی ١٦٤٠ دانراوە، و لەساڵی ١٧٣٦ لەلایەن بیرکاریزانی سویسرایی *لیۆنارد ئۆیلەر* سەلمێنراوە. ئەنجامێکی گشتیتری تیۆرمەکەی فێرمات-ئۆیلەر بریتیە لە بەردی بناغەی سیستەمی ئاسایشی کۆمپیوتەری نوێ.
کریپتۆگرافی مۆدێرن پشت دەبەستێت بەو گریمانەیەی کە هیچ کەسێک ناتوانێت کۆلکەی ژمارە خۆبەشەکان بە ئاسانی بدۆزێتەوە. بەڵام پێویستە بپرسین ئایا ئەمە گریمانەیەکی سەلامەتە؟ زەحمەتی ئەم پرسە هەتا ئێستا بەوردی لەلایەن بیرکاریزانانەوە نەسەلمێنراوە، بەڵام سەدان ساڵە هەوڵەکان شکست ئەخۆن لە دۆزینەوە ئەلگۆریزمێکی کارامە. کریپتۆگرافی و تیۆری کۆد دوو مەیدانی چالاکن بۆ

توێژینەوە لەم بابەتە، لەگەڵ لێکۆڵینەوە قوڵەکان لە بیرکاری وەستاو، جەبر، ئەندازەی جەبری، و تیۆری ژمارەکان.

رێگەیەکی هاوشێوەی RSA چەند ساڵێک زووتر دۆزرابونەوە لە بنکەی پەیوەندیەکانی حکومەتی بەریتانیا لە *چلتنهام*، بەڵام ئاشکرا نەکرابوو هەتا ١٩٩٧. بەروانین لەو پاشخانە، لەوانەیە سەرسورمان ببی کە چی دۆزراوەتەوە لە بریکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا؟ ئەگەر رێگایەکی خێرا بۆ شکاندنی ژمارە خۆبەشە گەورەکان دۆزرایەوە، کە لەوانەیە گوێمان لەوەنەبێت سەبارەت بەوە بۆ هەندێ کات، بەڵام تووشبوون بە پێشکەوتنی لەو شێوە کاریگەر دەبێت.

## ناوچەی ٥١

ئەم ناوچەیە خاوەنی زۆرترین نهێنیە لەسەر گۆی ئەم زەویە، نە بە کرداریی و نە بە ئینتەرنێت، نەبەهیچ تەکنەلۆژیایەکی پێشکەوتوو تاکو ئێستا نەتوانراوە راستی ئەم شوێنە بەجیهان رابگەیەنرێت. بەهۆی گرنگی و نهێنی ئەم شوێنەوە، ئەمریکا تەواوی نهێنیەکانی ئەم شوێنەی بە پێشکەوتووترین تەکنەلۆژیا پاراستووە، وە بە هەموو شێوەیەک رێگری دەکات لەدووری بیست کیلۆمەترەوە لێێ نزیک بیەوە.

شوێنکە دەکەوێتە باکوری نیڤادا کە رووبەرەکەی هێندەی چەند وڵاتێکی ئەورووپی دەبێت، وە سەرەڕای گەورەیەکەی بینینی زۆر ئەستەمە، سەرەتا لە نێوان ساڵەکانی چلەکان و جەنگی ساردی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتدا هەردوولایان هەوڵیان ئەدا پێشکەوتووترین جۆری چەک و فرۆکە و بۆمب دروست بکەن. ئەمەریکا کە خاوەن بۆمبی هایدرۆجینی بوو سەرەتا ویستی ئەم چەکە بەرەو پێش بەرێت کە ٢٠ هێندە لە جۆرەکەی خۆیان بەهێزتر بێت، بۆیە بۆ بەهێزکردنی ئەم چەکە ناوچەی ٥١یان هەڵبژارد، ئەمە سەرەتای دروست بوونی بوو بەڵام بەرهو پێشچوونی ئەم ناوچەیە لەگەڵ پارێزگاریکردنی ئەم ناوچەیە نهێنی زۆر گەورە لەخۆی دەگرێت.

سی ئای ئەی وەکو گەورەترین هێز لەپشت پارێزگاریکردنی ئەم ناوچەیە وە بەجۆرە تەکبەلۆژیایەک چاودێری ئەم ناوچەیە ئەکرێت کە مرۆڤی تا ٥٠ ساڵی تر چاوی بەم

جۆرە زانستە ناكەوێت. لەدووری ٢٠ كیلۆمەترەوە كەس ناتوانێت ١سم لێی نزیك بێتەوە چونكە ئەم جێگایە بەجۆرێك كۆنترۆڵ كراوە كە پلەی گەرمی لەشی مرۆڤ ئەخوێنێتەوە كە لەدووری ٢٠كم لەو جێگەیەوە بێت، وە توانای خوێندنەوە بەردانە خوارەوەی هەموو جۆرە تەنێكی ئاسمانی هەیە وە رادارەكانی توانای بینینی ئەو فرۆكانەیان هەیە كە خۆیان لەڕادار ون ئەكەن و لە هەوادا دیار نامێنن.

ناوچەی ٥١ لەسەر نەخشە

سەرەتا كاتێك تەكنەلۆژیا بەرەوپێش چوو بەگشتی لەناو جیهاندا و ئاسانی پەیوەندی تۆڕە كۆمەڵایەتیەكان لەساڵەكانی ٢٠٠٠ چەند قسەیەكی زۆر لەسەر ئەم ناوچەیە كرا، دەگوترا و ئێستاش لەبارەی ئەو پرسەوە قسەی زۆر دەكرێت كە ئەم ناوچەیە جێگای دابەزینی بوونەوەرە ئاسمانیەكانە وە كۆمەڵێك بوونەوەر لێرە دەستیان بەسەردا گیراوە وە هەندێكیش ئەڵێن جەنگی مرۆڤ ئەو بوونەوەرانە لێرە دروست بووە هەموو ئەو بوونەوەرانە لێرە كوژراون وە هەندێكی تریش ئەڵێن جێگای پەیوەندی مرۆڤ و بوونەورە ئاسمانیەكانە كە لێرە گفتووگۆ دەكەن و ئەو تەكنەلۆژیایەی ئەمریكا هەیەتی

هەمووی هی ئەم بوونەوەرانەیە و ئەمریکا لەبەرامبەردا پلاتینیۆمان ئەداتێ تا لە دەفرەکانیاندا بەکاری بێنن بەڵام تارادەیەک ئەم قسانە سەد لە سەد ڕاست نیە. ئەم ناوچەیە لەلایەن وڵاتانی ترەوە داوا کراوە کە ئەمریکا ڕاستی ئەم ناوچەیە دەربخات وە هەندێک هەواڵ بڵاوبوونەوە کە پێشکەتووترین جۆری چەک و فڕۆکە بەرهەم دێت لێرە، کە ئەمانەن:

- تیشکی لێزەری laser weapon system
- بەرەوپێشبردنی بۆمبی هایدرۆجینی لە جۆری کاسل براڤۆ و لەگەڵ B٥٣ nuclear weapon
- بەرەوپێشبردنی فڕۆکەکان لە جۆری A-١٠thunderbult II وە جۆری rockwell-b-١ lancer وە چەندین جۆری تر کە لەدەرەوەی خەیاڵی مرۆڤن
- چەندان چەکی تری ناووکی و کیمیایی

لەساڵی ١٩٤٧ لە نیومەکسیک و دانیشتوانی گوندی ڕۆزێڵ ئەوەیان گێڕایەوە کە تەنێکی ئاسمانی کە وەکوو دەفری فڕیو وابوو لەنزیک ئەم ناوچەیە کەوتۆتە خوارەوە گومان دەکرا کە ئەم دەفرە ویستبێتی لە ناوچەیەکەوە بەرەو ناوچەیەکی تر بڕوات لە ٥١ کەوتۆتە خوارەوە، وە ئەوەی ئەم قسانە پشڕاست نەکاتەوە ئەوەیە کە سوپای ئەمریکا دوای ڕووداوەکە دەست بەجێگەیشتنە ئەوێ و ئەو ناوچەیان منع تەجەول کرد و خەڵکی گوندەکەیان لەناوماڵەکانی خۆیاندا دەستگیرکرد، وە دواتر تەواوی شوێنەواری دەفرەکەیان پاک کردەوە و هیچ شوێنەوارێکیان نەهێڵا وە ئەوکەسانەی لەو ناوچەیە نزیک بوونەتەوە و هەندێک شتیان بەچاوی خۆیان بینیوە دەڵێن لەوێ ژێرزەمینێکی چەند کیلۆمەتری هەیە کە سەرجەم لاشەی ئەو بوونەوەرانە لەوێ پارێزراوە و توێژینەوەیان لەلایەن زیرەکترین پزیشکەکانەوە لێنەکرێت. بەڵام لەساڵی ١٩٥٥ دەنگۆی ئەوە بڵاوکرایەوە کە وێنەی ئەو پزیشکەی پشکنین بۆ لاشەکە ئەکات تەنها فیلمێک بووە هیچی تر.

لەساڵی پەنجاکاندا، ئەمریکا هەستا بە دروستکردنی فڕۆکەی تارمای ٢-U هەم بۆ هێرشبردن وە هەم بۆ بەرگری کردن بەکاردەهات وە بەجۆرێک دروستکرا وەک وابێت لەسەدەی ٢١ دا دروستکرابێت، وە لەناو ناوچەی ٥١ گەورەترین فڕۆکەخانەی سەرڕووی زەوی هەیە کەسیش نازانێت کەی دروستکراوە هەموو جۆرە فڕۆکەیەکی تایبەت بە ئەمریکا ئەتوانێت لێبنیشێتەوە بێ ئەوەی تووشی هیچ چاوەڕوانیەک و ناستەنگێک ببێت بەڵام تەنها ئەو فڕۆکانەی ئارمی ناوچەی ٥١ یان پێوەیە. نهێنی ئەم ناوچەیە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت بە تەواوی روون نەبۆتەوە، پێدەچێت هەرواش بمێنێتەوە.

## هەواڵگری لە ئیدارەی جۆرج بوشی باوکدا

جۆرج بوش لەساڵی ١٩٨٩ تا ١٩٩٣ سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو. لەماوەی سەرۆکایەتی ئیدارەی ئەودا، ولیام وێبستەر و رۆبەرت گەیتس وەک بەڕێوەبەرانی هەواڵگری ناوەندی خزمەتیان دەکرد. دەکرێت بڵێین کە جۆرج بوش پڕزانیارترین سەرۆکی ئەمریکا بووە لەبارەی سیاسەتی دەرەوە چونکە پێشتر چەند ئەزموونێکی لەم چەشنەی هەبووە و وەک باڵیۆز وڵاتەکەی لە نەتەوەیەکگرتووەکان (١٩٨١-١٩٨٩)، باڵیۆزی وڵاتەکەی لە چین (١٩٧٤-١٩٧٥)، وە جێگری سەرۆک (١٩٨١-١٩٨٩) کاری کردووە. ئەو تا ئەو ساتەشی لەگەڵدا بێت پڕزانیاریترین کەسە دەربارەی هەواڵگریی. ناوبراو لەماوەی ئیدارەی سەرۆک فۆرد بەڕێوەبەری هەواڵگریی ناوەندی (١٩٧٦-١٩٧٧) بووە. بەشێوەیەک زانیاری لە بارەی هەواڵگرییەوە هەبوو کە ویلیام کەیسی، بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندی لەسەردەمی سەرۆک رۆناڵد رەیگان، ناوبراوی وەک رکابەرێک بینی و لە بەڕێوەبەرایەتیەکەدا پێشوازی لێنەکرا. ویلیام گەیتس بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندی تێبینی ئەوەی کرد کە هەموو ئەو سەرۆکانەی ناوبراو لەگەڵی دواوە لەساڵی ١٩٦٨ تا ١٩٩٣، بوش روونترین تێگەیشتنی سنوورەکان و نهێنی هەواڵگریی هەبووە.

وەک سەرۆک، جۆرج بوش بەڕاستەوخۆ لەگەڵ شرۆڤەکارانی هەواڵگرییدا کاری دەکرد. وەک بڕیاردەریش، ئەو زۆر پشتی دەبەست بە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکان و هەردەم پەیوەندی بە شرۆڤەکار و بەرپرسانی تری هەواڵگرییەوە دەکرد بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری زیاتر. ئەم پەیوەندییە نزیکەی ناوبراو تەنانەت دوای بوون بە سەرۆکیش لەگەڵ گەیتس بەردەوامی پێدا بەڵام سەبارەت بە وێبستەر، ئەم کارەی نەدەکرد. پەیوەندییەکی کەم هەبوو لەنێوان بوش و وێبستەر، کە ئەندامێکی بازنەی ناوەخۆیی بۆ بڕیاردان نەبوو لە کابینەکەی بوشدا، و هەرکات لە ڕاگەیاندندا دەردەکەوت، لەڕووی هەواڵگرییەوە زیانی بە بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەی دەگەیاند، وەک شکستی ناوبراو لەپێدانی ئاگادارکردنەوەی پێشوەختەی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن ئێراقەوە یان زانیاری دەربارەی ڕووداوەکانی پاناما. لەجیاتی وێبستەر، سەرۆک بوش بە قووڵی پشتی دەبەست بە گەیتس، کە ئەوکات جێگری ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتیمانی بوو. بوش گەیتسی ناوزەد کرد بۆ جێگرتنەوەی وێبستەر و هەردووکیان پەیوەندییەکیان گرێدا کە دەکرێت بڵێین وەک هی نێوان سەرۆک ئازنهاوەر و ئالێن دولێس، بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەندی، وابوو. لەماوەی سەرۆکایەتی بوشدا، کردەی سیخوڕی چەندین جار هاوکار بوو لە بەدەستهێنانی زانیاری گرنگ کە بەبێ ئەم زانیاریانە ئەمریکا دەکەوتە مەترسییەوە. وێنەی سەتەلایەتی لە هەردوو بنکەی لاکرۆس و کەیهۆل زانیاری وێنەیی گرنگیان بەخشی دەربارەی جووڵەی هێزە ئێراقییەکان و پەڕینەوەیان لە سنووری کوێت. دواتر هەمان سەتەلایەت توانی ئەو وێنانە بگرێت کە ئێراق هیچ پلانێکی نەبووە بۆ داگیرکردنی سعودییە. دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی (NSA) توانیبووی چەند گفتوگۆیەکی دەنگی تۆماربکات لەبارەی ناڕەحەتی بەرپرسە باڵاکانی سعودییە لە بەرەنگاربوونەوەی سەددام لەڕووی سەربازییەوە. هەروەها، هەواڵگری ئەوەشی دەرخست کە چەندین پێشێلکاری مافی مرۆڤ لەناو ئێراقدا کراوە و هەوڵەکانی سەددام بۆ بەدەستهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ هاوکاربوون لەوەی سەرۆک بوش بتوانێت

بڕیارێک بدات کە بەزووترین کات دەبێت ئێراق لە کوێت دەربکرێت و بەمەش ئۆپەراسیۆنی گەردەلولی بیابانی دەست پێکرد.
چەرخی دووەم کە تیایدا هەواڵگریی ڕۆڵێکی باڵای گێڕا لە پێدانی زانیاری گرنگ لەسەردەمی سەرۆک بوشدا دەگەڕێتەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت. چاودێریکردنی دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی ئابی ۱۹۹۱ بۆ هەوڵی کودەتایەک بووە هۆی ئەوەی ئیدارەی بوش بتوانێت بەئاسانی گوێ بۆ هەموو پەیوەندییەکان هەڵبخات کە لەنێوان داڕێژەرانی کودەتاکەوە ئەنجام دەدران، لەکاتێکدا هەواڵگریی هێمایی[i] چەند چالاکییەکی کەمی سەربازیی نیشاندەدا لە پشتیوانیکردنی کودەتاکە. بەرلە دوو ساڵ، زانیاری لە هەڵاتوویەکی سۆڤیەت بەڵگەی پێشکەشکردبوو لەبارەی بەرنامەیەکی جەنگی بایۆلۆجی سۆڤیەت کە لەلایەن میخایل گۆرباچۆڤەوە سەرپەرشتی دەکرا. کەوتنی سۆڤیەت وایکرد ئەمریکا چاو بە سیاسەتی ئاسایشی نیشتیمانی ئەمریکادا بخشێنێتەوە. بوش بەشێوەیەکی فەرمی ئەم چەندەی ئەنجامدا و سێ ڕۆژ دوای سوێندخواردنی گەیتس پرۆژەیەکی نوێ بۆ ئەم دەزگایە ڕاگەیاند.[ii]

---

[i] *هەواڵگریی* هێما بریتییە لە پرۆسەی وەرگرتنی زانیاری لەڕێگای ئەو شەپۆڵە کارۆموگناتیسیەی لەلایەن دەزگایەکی هەواڵگرییەوە دەبردرێن. ئەم جۆرە هەواڵگرییە بەگوێرەی جۆری ئەو شەپۆڵە کارۆموگناتیسیەی کە دەستیان کەوتووە لەڕێی هەواڵگرییەوە، پۆلێن دەکرێت:

- هەواڵگری گەیاندن (پەیامی ڕادیۆیی)
- هەواڵگری تێلیمەتریی (هێمای شەپۆڵی فڕۆکە)
- هەواڵگری ئەلیکترۆنی (وەک ڕادار)
- یان هەر شەپۆڵێکی تری کارۆموگناتیسی کە بەشێک بێت لە ئامێری ئەلیکترۆنی، وە بکرێتە ئامانجی وەرگرتنی سیگناڵی دەزگایەکی تری هەواڵگریی.

[ii] Andrew, Christopher. For the President's Eyes Only: Secret Intelligence and the American Presidency from Washington to Bush. New York: HarperCollins, ١٩٩٥.
-Halberstam, David. War in a Time of Peace: Bush, Clinton and the Generals.NewYork: Touchstone, ٢٠٠١.
-Ranelagh, John. The Rise and Decline ofthe CIA. Revised and updated. New York: Touchstone, ١٩٨٧.

## هەواڵگری لە ئیدارەی جۆرج بوشی کوڕدا

جۆرج بوش لەساڵی ٢٠٠١ تا ٢٠٠٩ سەرۆکی ئەمریکا بوو. جۆرج تێنێت و پۆرتەر گۆس وەک بەڕێوەبەرانی هەواڵگری ناوەندی لە سەردەمی ئەودا خزمەتییان کردووە.
جۆرج بوش بە ئەجێندایەک بۆ سیاسەتی دەرەکی هاتەنێو ململانێکان بەناوی "هەر شتێک تەنیا کلینتۆن نەبێت" ئەمە ئەجێندایەک بوو کە تیایدا ئامانجی ئەوە بوو ئەمریکا بهێنێتەدەرەوە لە کاری مرۆیی و گێڕانی رۆڵی پاراستنی ئاشتی و ئەمریکا دووربخاتەوە لە هەوڵەکانی بەستنی پەیمانی نێودەوڵەتی وەک پرۆتۆکۆلی کیۆتۆ لەهەمبەر ژینگە و دروستکردنی دادگایەکی تاوانی نێودەوڵەتی. ئەم ئەجێندایە بەشێوەیەکی دراماتیکی لەدوای هێرشە تیرۆرستییەکانی یازدەی ئەیلولی ٢٠٠١ گۆڕا.
ئیدارەی بوش جەختی لەسەر ناوەندیبوونی کردەی سەربەخۆ و تاکلایەنە هێشتەوە، بەڵام دوای ئەم رووداوە خۆی لە ناوەندی بنیادنانێکی نیشتیمانی مەزن و هەوڵەکانی پاراستنی ئاشتی لە ئێراق دوای روخاندنی سەدام لەسەر دەسەڵات بینیەوە. بەرلە جەنگی ئێراق، ئیدارەی بوش پێناسەی ئەوانەی فروانکرد کە لە جەنگی دژەتیرۆر بەرهەڵستی دەکرد، بەمەش ئێران و کۆریای باکووریش خرانەنێو لیستەکەوە. سەرەڕای ئەمەش، ئەمریکا هەڵسا بە ناساندنی ستراتیژیەتێکی نوێ بۆ بەرهەڵستیکردنی ئەو هەڕەشانە. ئەمریکا چیتر ناتوانێت بەربەست یان دەستەمۆی هەڕەشەکان بکات. بەمەش، ستراتیژیەتەکە بریتیی دەبێت لە "هێرش بردن وەک بەرگری لەخۆکردن."
پەیوەندی نێوان ئیدارەی بوش و کۆمەڵگای هەواڵگریی چەند دژبەریەکێک لەخۆدەگرێت. لەلایەک، بە فراوانبوونی ئەجێندای ئەمریکا لە سیاسەتی دەرەوە ئەو وڵاتە کەوتەنێو کێشەی کەمی بودجە بۆ چالاکییەکانی کۆمەڵگای هەواڵگریی. لەلایەکی ترەوە، ئەو وڵاتە تووشی گرفتێکی تریش بوو لەمەر کۆنترۆڵ و ئاراستەکردنی کۆمەڵگای هەواڵگریی و پێگەکەی لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاردا.
یەکەم گرفت لە دانانی بەڕێوەبەرێکی ئاسایشی نیشتیمانی وەک بەڕێوەبەری گشتی کۆمەڵگای ئاسایش سەریهەڵدا. دروستکردنی نووسینگەیەکی لەم چەشنە یەکێک

بوو لە سەرەکیترین ئەو پێشنیارانەی دوای یازدەی ئەیلول سەریهەڵدا. ئیدارەکە بەخێرایی کاریکرد بۆ دروستکردنی پۆستێکی لەم جۆرە بەڵام لەناو کۆشکی سپی داینا و ئیتر تەنیا سەربە سەرۆکایەتی ئەمریکایە و کەس دەستوەرنادات کاروبارەکەی. کۆنگرێس نارەزایی دەربڕی و لەکۆتاییدا بەشی ئاساییشی نیشتیمانی لەسەر مەرجی ئیدارەکە دروست بوو.

ئەنجامدانی ئەم کارە کۆتایی بە گرفتەکە نەهێنا چونکە چەند کەسێک، بەتایبەتی ئەوانەی سەربە دەزگای هەواڵگری ناوەندیی بوون، کە بەڕێوەبەرەکەی تا ئەوکاتە وەک بەڕیوەبەری سی ئای ئەی و کۆمەڵگای هەواڵگریی کاری دەکرد، ئەمەیان وەک کەمی هێز و پێگەکەی دەبینی. هەروەها مشتومڕ لەسەر ئەوەش کرا کە دروستکردنی بەشێکی ئاساییشی نیشتیمانی نەبووە هۆی ئەوەی هەماهەنگی زیاتر لەنێو دەزگا هەواڵگرییەکان. لەجیاتی ئەمە، تەنیا ئیدارەیەکی تری دروست کرد. ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەندێک کەس لەناو ئیدارەکە دەڵێن کە ئیدارەی بوش زۆر بەشی جێبەجێکاری دروست کردووە و بەمەش ئامانج و پەیامەکەی لەدەست دەدات. ئەم ئارگومێنتە زیاتر توندبوو کاتێک ئیدارەکە شکستی هێنا لە ڕووبەڕووبوونەوەی گەردەلولی کاترینا.

دووەم خاڵی ناکۆکی لەنێوان کۆمەڵگای هەواڵگریی و ئیدارەی بوش بریتیی بوو سەروکاری کۆمەڵگاکە لەگەڵ ئەنجامی هەواڵگرییدا (Intelligence Products). بەسەرۆکایەتی کەسای وەک جێگری سەرۆک دیک چینی و وەزیری بەرگریی دۆناڵد رامسفێلد، ئیدارەی بوش دەستیکرد بە خۆڕزگارکردن لە کۆمەڵگای هەواڵگری تەقلیدی و بوو بە کۆکەرەوەی هەواڵگریی و شیکەرەوەی خۆی. لە پرۆسەکەدا هەواڵگری بە سیاسیی کرا و، بەبۆچوونی شیکەرەوە هەواڵگرییە خاوەن ئەزموونەکان، چیتر نەیدەتوانی رۆڵی خۆی بگێڕێت وەک پێدەری بێ لایەنی داتا و بۆچوون کە پێویست بوو لەلایەن داڕێژەرانی سیاسەت بۆ دروستکردنی بڕیار. کۆمەڵگای هەواڵگری زیاتر نیگەران بوو کاتێک ئیدارەی بوش بڕیاری دروستکردنی لێکۆڵینەوەی هەواڵگریدا وەک راپۆرتی یازدەی ئەیلول و راپۆرتی چەکی کۆمەڵکوژ بەشێوازێک کە لابردنی

گلەیی لەسەر ئەو کێشانەی کە چۆن هەواڵگریی چارەسەرکراوە بۆ ئەو کێشانەی کە چۆن هەواڵگری بەرهەمهێنراوە و لەسەر چ بنەمایەک ئەو بڕیارانە دراون.
سێیەم خاڵی ناکۆکی کە پەیوەندی بە ئیدارەی بوش و هەواڵگرییەوە هەبوو، بریتیی بوو لە سیاسەتەکانی لێکۆڵینەوە لە تیرۆریستە گومانلێکراوەکان یان ئەوانەی پێیان وابوو هاوسۆزن لەگەڵ تیرۆرستان یاخود پشتیوانی تیرۆریزم دەکەن. هەرچەندە هەرزوو ئەم تۆمەتانە رەتکرانەوە، رەخنەگرانی ئەم سیاسەتە وتیان کە ئیدارەیەکە بەڕاستەوخۆ لە ئەشکەنجەدانی ئەماندا تێوە دەگلێت، بەڵگەش بۆ ئەمە بەکارهێنانی ئەشکەنجەی ئاپڕژێن[i] و تەکنیکی هاوشێوەیە لەدژی گیراواندا. سەرەڕای نکۆڵیکردنی، ئەو وێنانەی کە لە گرتوخانەکانی ئەبوغرێب لە ئێراق، گوانتانامۆ لە کوبا بڵاوبوونەوە گەواهیدەری ئەم تۆمەتانە بوون. چەندوچوونی زۆر کرا بۆئەوەی وا لە کۆمەڵگای هەواڵگریی و ئیدارەی بوش بکەن کە بنچینەی ئاسایی بۆئەم کردەوانە بدۆزێتەوە بەڵام بێسوود بوو.
چوارەم خاڵی ناکۆکی بریتیی بوو لە سیاسەتی ئیدارەکە بۆ رێگادان بە ئاژانسی ئاساییشی نیشتیمانی بۆئەوەی سانسۆر بخاتە سەر ئیمێل، کورتەنامە و گوێهەڵخستن بۆ پەیوەندی تەلەفۆنیی، چالاکی ئینتەرنێتی هەموو هاوڵاتیانی ئەمریکی بەبێ پرسی یاسا. بوونی ئەم جۆرە بەرنامەیە بۆیەکەمجار لەلایەن رۆژنامەی نیۆیۆرک تایمز لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥دا ئاشکرا کرا. ئیدارەی بوش جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەم جۆرە کارە یاساییە و دەکەوێتە ژێر فەرمانی دەسەڵاتی سەرۆکەوە.[ii]

---

[i] ئەو شێوازەی ئەشکەنجەیەک کە ئەمریکییەکان خاولییەکیان دەخستە سەر دەم و لووتی گیراو، وەپاشان ئاویان دەپرژاندە سەر خاولییەکە بۆئەوەی بەتەواوی ئۆکسجین لە گیراوەکەدا بپچڕێت (وەرگێڕ)

[ii] Pillar, Paul. "Intelligence, Policy and the War in Iraq," Foreign Affairs ٨٥ (٢٠٠٦), ١٥–٢٨.
-Ricks, Thomas. Fiasco: The American Military Adventure in Iraq. New York: Penguin, ٢٠٠٦.
-Woodward, Bob. Plan of Attack. New York: Simon & Schuster, ٢٠٠٤.
-Woodward, Bob. State of Denial: Bush at War, Part III. New York: Simon & Schuster, ٢٠٠٦.

## دەزگای هەواڵگری مۆساد

ئەوەی دەزگای مۆساد لە دەزگا هەواڵگرییەکانی تر جیادەکاتەوە،
ئەوەیە کە ئەم دەزگایە لەسەر بنەمای رق، نەتەوەپەرستی، و تۆڵەسێنی کاردەکات:
واتە، هاوڵاتی جوو لە هەر مرۆڤێکی تری جیهان لەپێشترە.
(سیروان بیەیی)

مێژووی دامەزراندنی ئەم دەزگایە دەگەڕێتەوە ئەوکاتەی کە لە ئێوارەی هەینی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٩ بۆنەیەکی جووەکان لە ئۆرشەلیم بەڕێوەچوو لەبەردەم دیواری گرینۆک کە تاکە شوێنەواری بەجێماوبوو لەئۆرشەلیم، بە هەزاران جوو بەرەو ئەو دیوارە بەجل و بەرگی رەشەوە و بەکتێبی نوێژەوە دەڕۆیشتن، وە لەم بۆنەیەدا رابییەکان (پیاوانای ئاینی جوو) خەڵکێکی زۆریان بۆ ئەم بۆنەیە بانگکردبوو کە ئەمەش هێمایەک بوو بۆ دەرکەوتنی زایۆنیزم لەم ناوچەیەدا، بە چەندین رۆژ و مانگ پێشتر قسەوباس لەسەر ئەم بۆنەیە لەو رۆژەدا بڵاوبوویەوە و لەناو عەرەبەکانی فەلەستین دەنگی دایەوە.

لەکاتژمێر ٧ی ئێوارە بەهەزاران جوو لەبەردەم دیوارە لماوییەکەدا کۆبوونەوە و خەریکی نوێژکردن بوون، بەڵام لەناکاو لە هەموو چواردەوریانەوە لەلایەن عەرەبە موسوڵمانەکانەوە بەرد و قوتو شوشە و تفەنگ ئاراستەی جووەکان کراو چەندان جوویان خستەسەر ئەرز و برینداریکی زۆریان لێکەوتەوە، بەڵام کەس لەم پێکدادانەدا نەکوژرا ئەگەر چی برینداریکی زۆریان لێکەوتەوە.

هەمان ئێوارە سەرکردە جووەکان لەکۆمەڵگای یوزوف لە فەلەستین لەسەر ئەم رووداوە کۆبوونەوە، هەموویان رایان وابو ئامادەکاری بۆنەکە هیچ کەمتەرخەمییەکی تێدانەبووە تەنها ئەوە نەبێت کە ئاگاداری پێشوەختیان نەبووە بۆ هێرشی عەرەبەکان، یەکێک لەئامادەبووانی کۆبوونەوەکە ئەوەی درکاند کە ئێمە هەر لەسەردەمی شا داود-ەوە بڕوامان بەسیخوڕی بەهێز هەبووە، هەر لەوێدا بناغەی دەزگایەکی سیخوڕی دانرا، هەر لەدوای ئەو کۆبوونەوەیە دەستیان کرد بەکاری سیخوڕی لەناو عەرەبەکان و زانیاری وایان بەردەست کەوت کە ئاگاداری پێشوەختی هەموو هێرشەکانی

عەرەبەکان بوون بۆ سەر ئیسرائیل. ساڵی ١٩٤٢ داوود بنگۆریۆن و ئیسحاق رابین لە حەیفا گەیشتنە یەک و چەند پلانێکیان دارِشت بۆ هێنانی جووە رزگاربووەکان لەدەستی نازییەکان لە ئەورووپاوە بۆ ئیسرائیل، لەو سەردەمەدا نەدەبووایە هەموو جووەکان بەیەکەوە بهاتنایەتە ناو فەڵەستینەوە چونکە بەریتانیا بەوە رازی نەبوو وە هاوسەنگی ئەو ناوچەیەی تێکدەدا، ئەم دوو کەسە بریاری ئەوەیاندا کە دەزگای هاگانا (دەزگایەکی بەرگری چەکداری ئیسرائیلی بوو) پەرەی پێبدرێت و سیخوری زیاتری بۆ دابنرێ و هەروەها دەزگایەکی دژە سیخوریش لە ئیسرائیل دورست بکرێت بۆ دەستگیرکردنی ئەو جووانەی کە ناپاکی دەکەن و دەزگاکەش ناوی لێنرا (ریگەڵ هەردی)، ئەم دەزگایە دەستی کرد بە کوشتنی ئەو ناپاکانە و لەنیوەی شەواندا دەیانگرتن و دەیان کوشتن و لەملیان دەدان.

لەساڵی ١٩٤٥ دەزگای هاگانا یەکەیەکی تایبەتی بە چەک کرین دروست کردوو هەرزوو چەندین تانک و زرێپۆشی ئەڵمانی و ئیتالی بە قاچاخ گەیاندە فەڵەستین. ساڵی ١٩٤٦ بنگۆریۆن لەوە سەرکەوت کە هەموو گروپە نهێنییە جووەکان یەکبخات.

ساڵی ١٩٤٨ بەریتانیا بریاریدا فەڵەستین جێبهێڵێت و ئیتر ئەرکی ئەو ناوچەیە بە نەتەوە یەکگرتووەکان سپێردرا و ئەو سەرپەرشتی دەکرد، هەر لەو ساڵەدا ئەو شەرە گەورەیە هەڵگیرسا کە بەشەری سەربەخۆی لای جووەکان ناسراوە و هێزەکانی ئیسرائیل سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەستهێنا بەسەر عەرەبەکاندا. لەساڵی ١٩٤٩ سەرکەتنەکانی ئیسرائیل بووە راستی، وە بنگۆریۆن بووە یەکەمین سەرەک وەزیرانی یەکەم دەوڵەتی ئیسرائیل، یەکەم کاری بنگۆریۆن پێنج دەستەی هەواڵگری دامەزراند و رێکیخستن، هەرگیز دەوڵەتێکی وا تازە و نەتەوەیەکی بەو شێوەیە بە دوژمن دەورەنەدراوبوو کە لەهەموو لایەکەوە عەرەبە موسوڵمانەکان ئامادەی جیهادبوون دژی جووەکان، لەم نێوەندەشدا بنگۆریۆن بەردەوام خەریکی چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان دەزگا هەواڵگرییەکان بوو، لە ٢ی مارتی ١٩٥١ بنگۆریۆن فەرمانیدا سەرانی هەر پێنج دەزگاکە بچنە نوسینگەکەی و لەوێ بۆی ئاشکراکردن بەنیازە چالاکی هەموو دەزگاکان لەژێر ناوی (ها مۆساد تیۆم — پەیمانگا بۆ هاوکاری) رێکبخاتەوە،

ئەو پەیمانگایە بە بودجەی بیست هەزار لەپارەی ئیسرائیلی دەستپێدەکات و وە لە ٢٥٪ ئەو پارەیە بۆ ئۆپەراسیۆنی تایبەتی تەرخان دەکرێت، وە وردە وردە ئەم دەزگایە زیاتر پەرەی پێدراو گەشەی کردو لەژێر ناوی (مۆساد) واتە پەیمانگا مایەوە تاکو ئێستا.

لۆگۆی دەزگای هەواڵگری مۆسادی ئیسرائیلی

ساڵی ١٩٦٣ مایر ئامیت بووە سەرۆکی مۆساد، کەمێک پاش دەستبەکاربوونی، کەسێک بەناوی سەلمان سەردانی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل دەکات لە فەرەنسا و لەوێ پێشنیارێک دەخاتە بەردەم ئیسرائیل بۆ دزینی میگ ٢١ی ئێراق بە یەک ملیۆن دۆلار، وە بۆ گەرەنتی ئەو باسەش بە باڵیۆزخانەی وت کە کەسێک بنێرنە بەغداد و تەلەفۆن بۆ ئەم ژمارە تەلەفۆنە بکات ناوی یوسف-ەو هەموو کارەکە تەواو بکەن، بەڵام پێشتر مشوری یەک ملیۆن دۆلارەکە بخۆن.
ئەم باسە بە راپۆرتێکی تێروتەسەل کەوتە بەردەست مایر ئامیت سەرۆکی دەزگای مۆساد، ئەویش بە وردی چەندان رۆژ هەڵدێرو داگێری ئەم باسەی کرد کە ئاخۆ ئەمە راستە یاخود پلانە، بۆ ئەم کارەش ئامیت نەیدەتوانی واز لەو فرۆکەیە بهێنێت کە لەو سەردەمەدا یەکێک بوو لە چەکە هەرە بەهێزەکانی دوژمنەکانی و زۆر گرنگ بوو بۆ ئیسرائیل. ئامیت کەسێکی ناردە بەغداد بەناوی جۆرج باکۆن وەک بازرگانێکی ئەشیعەی نەخۆشخانەکان، ئەویش لە بەغداوە تەلەفۆنی بۆ یوسف کرد و رێککەوتن لەسەر ئەوەی رۆژی دواتر لە شوێنێک لەبەغداد یەکدی ببینن، لەکاتی یەکتر بینینیان

لە قاوەخانەیەکی ناو بەغداد یوسف بە باکۆنی گوت تۆ بۆ فڕۆکەی میگ هاتویت و من بۆت ڕێکدەخەم بەڵام نرخەکەی یەک ملیۆن دۆلارە، لەو قاوەخانەیەدا نەدەتوانرا زۆر قسان بکرێ بۆیە بڕیاریاندا بۆ ڕۆژی دوای لە باخچەیەک لەسەر ڕوباری دیجلە یەکدی ببینن، بەڵام هەتاکو بەیانی باکۆن نەیتوانی بخەوێت چونکە لەوە دەترسا ئەگەر ئەمە داو بێت ئەوە لەناوجەرگەی وڵاتی دوژمن دەگیرێت و یەکسەر لەسێدارە دەدرێت.

ڕۆژی دواتر لەکەنار ڕوباری دیجلە یوسف و باکۆن جارێکی دیکە یەکتریان دیت، بەڵام ئەمجارەیان باکۆن هەندێ شتی زیاتری دڵنیاکەرەوەی وەچنگ کەوت، ئەویش ئەوەبوو بۆی دەرکەوت کە یوسف بە ڕەچەڵەک جووە و خانەنشینە و لەگەڵ خوشکێکیدا دەژی بەناوی مانو، وە مانو کوڕێکی هەیە فڕۆکەوانە لە خزمەت سوپای ئێراقی و بەڵام بە خانەوادە حەز دەکەن کۆچ بکەن بۆ ئیسرائیل بەڵام چۆن و کەی نازانن وە لەو سەردەمەدا تەنها باسکردنی ئەوە ئەشکەنجەدانی بەدوای خۆیدا دەهێنا وە ئەمە دەرفەتە بۆ ئەوان. دەستکرا بە ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنەکە بە ناردنی نیو ملیۆن دۆلار بۆ بانکێکی سویسری بۆ سەر حیسابی یوسف، دواتر ئەمیت پێنج دەستەی پێکهێنا بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە بەم شێوەیە؛ یەکەم دەستە دەبوایە لەسەر هێڵ بوونی سەرۆکی مۆساد لەگەڵ دەستەکانی بەغداد مسۆگەر بکەن بە پەیوەندی رادیۆی و بە بەردەوامی تەنها لەکاتی ناچاریدا ئەم هێڵە بپچڕێت. دەستەی دووەم دەبوایە لەبەغداد بونایە کەس پێیان نەزانێ تەنانەت نە باکۆن و نە یوسف و هیچ کەسێک وە کاری ئەمان ئەوەبوو کە باکۆن و یوسفیان لەبەغداد دەرباز دەکرد گەر بهاتبایە و کێشەیەکیان بۆ دروستبووایە.

دەستەی سێهەم کاری ئەوەبوو دەبوایە چاوی لەسەر خانەوادەکە بوایە. دەستەی چوارەم پەیوەندییان لەگەڵ کوردەکان کرد چونکە لەکۆتاییدا کوردەکان ئەندامانی خانەوادەکەی یوسفیان لە ئێراق ڕزگارکرد بۆ ئیسرائیل. دەستەی پێنجەم مشوری پەیوەندی بخۆن لەگەڵ ئەنکەرە و واشنتۆن، چونکە ئەو میگە بفڕێت لە ئێراقەوە دەبێت بە ئاسمانی تورکیادا بڕوات تا دەگاتە ئیسرائیل وە واشنتۆن بنکەی لە باکوری

تورکیا هەیە و دەکرێت قەناعەت بە تورکەکان بهێنن بۆ ئەم کارە، وە ئەوەی کێشەبوو مایەوە ئەوەبوو کە ئێراق بەردەوام دەترسا فڕۆکەوانەکان ئەو فڕۆکانە بفڕێنن بەرەو رۆژئاوا، بۆیە بەردەوام لەکاتی مەشقدا تەنکییەکانی بەنزین هێندە سوتەمەنی بەشی ئەوە تێدانەبوو راستەوخۆ بگاتە شوێنی مەبەست بەڵام مۆساد مشوری ئەوەشی خواردبوو، وە کێشەی دووەم ئەوەبوو یوسف دەیویست سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی کە ژمارەیان ٤٣ کەسبوو بە فڕۆکە بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی ئارام پێش ئەنجامدانی کارەکە، کارەکە رێڕەوی خۆی وەرگرت و یوسف بە باکۆنی گوت ئەوان ئامادەن هەموو خێزانەکەی، وە ئەو ئێوارەیەی پێش ئەوەی مونیر بفڕێ ئەوانیش بەرەو باکور دەڕۆیشتن واتە هەرێمی کوردستانی ئێستا لەوێ لای کوردەکان دەمانەوە و ئەندامانی دەزگای مۆساد چاوەڕێی دەکردن.
دوای گەیشتنیان مۆساد ئەندامانی خێزانی یوسفی زیاتر برد بۆ شاخە بڵندەکانی کوردستان و لەوێ هەلیکۆپتەرەکانی تورکیا چاوەڕێی دەکردن و سەرجەم خانەوادەکەی یوسف گەشتەکەیان کرد و جارێ لە تورکیا مانەوە، پاشان کارمەندێکی مۆساد زەنگی بۆ مونیر لێدا و پێی گوت "خوشکەکەت لەش ساغەو کیژۆڵەیەکی بووە،" بۆ سبەینێ ١٥ ی ئابی ١٩٦٦ مونیر لەکاتی مەشقی فڕۆکەوانیدا فڕۆکەی میگی ٢١ی بەرەو تورکیا فڕاندو هیچ کام لە ئێراقییەکان ئاگاداری ئەم کارە نەبوون و لە تورکیا نیشتەوە لەژێر چاودێری ئەمریکا، لە تورکیا بەنزینی تێکرد و لەوێ جارێکی دیکە دەستی بە فڕین کردەوە بۆ ئیسرائیل. لەکاتی فڕیندا پێیان راگەیاند ئەمجارە بەشێوەیەکی روون لەڕێگەی شەپۆلی رادیۆوە کە خانەوادەکەت باشن و لە ئیسرائیل یەکدەگرنەوە، دوای یەک کاتژمێر فڕۆکەی میگی ٢١ لە فڕۆکە خانەیەکی سەربازی لە باکوری ئیسرائیل نیشتەوە وە دواتر نیو ملیۆن دۆلارەکەی تر درایە یوسف دوای گەیشتنی فڕۆکەکە، وە مۆساد سەلماندی کە کارێکتەرێکی گەورە و بەهێزە لەسەر شانۆی هەواڵگری جیهانی و توانای ئەنجامدانی کاری گەورەی هەیە.

## دەزگای هەواڵگری پاکستان (ISI)

دەزگای هەواڵگری پاکستان وەکالەتێکی هەواڵگری پێشەنگە لە پاکستان، کە بەرپرسە لە چالاکیەکانی کۆکردنەوە و شیکارکردنی ئەو زانیاریانەی کە بۆ ئاسایشی نیشتیمانی گرنگن لە سەرانسەری جیهاندا. وە یەکێکە لە دەزگا چالاکەکانی هەواڵگری لە پاکستاندا کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتیەکی گشتییەوە کارەکانی ڕێکدەخرێت، کە ئەرکی سەرەکی بریتیە لە کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری بۆ حکومەتی پاکستان. ئەم دەزگایە بەشێوەیەکی سەرەکی لەلایەن ئەو ئەفسەرانەوە بەڕێوەدەبرێت کە پێشتر لە هێزی ئاسمانی و دەریایی پاکستاندا خزمەتیان کردووە، هەروەها هەندێک جار ئەم دەزگایە پەنا دەباتەبەر بەکرێگرتنی سیخوڕ و بەکرێگیراو لە ناو خەڵکی مەدەنیدا.

لەساڵی ١٩٧١ەوە ئەم دەزگایە لەلایەن جەنراڵێکی سوپای پاکستانەوە بەڕێوەدەبرێت کە لەلایەن سەرۆکوەزیرانی پاکستانەوە دانراوە لەسەر پێشنیازی سەرۆک ئەرکانی سوپای پاکستان، بەڵام لەئێستادا لەلایەن جەنراڵ نافید مختارەوە بەڕێوەدەبرێت کە لە ١٢ی تشرینی دووەمی ٢٠١٦ەوە وەک بەڕێوەبەری گشتی دەستبەکاربووە، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕاپۆرتە هەواڵگریەکان پێشکەشی هەریەک لە سەرۆک وەزیران و سەرۆک ئەرکانی سوپای پاکستان دەکات.

ناوبانگی ئەم دەزگایە لەسەرئاستی جیهان لەساڵی ١٩٨٠ەوە دەستپێدەکات کاتێک پاڵپشتی موجاهیدەکانی ئەفغانستانی دەکرد دژی یەکێتی سۆڤیەت پاش داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن ڕووسەکانەوە، لەماوەی ئەم جەنگەدا لیژنەیەکی هاوبەشیان پێکهێنا لەگەڵ دەزگای هەواڵگری ناوەندی ئەمریکی (سی ئای ئەی) بەمەبەستی ڕاهێنان و هاوکاریکردنی موجاهیدەکان. وە، دوای نەمانی یەکێتی سۆڤێت ئەم دەزگایە پاڵپشتی ستراتیژی و هەواڵگری پێشکەشی بزووتنەوەی تالیبان کرد لە ئەفغانستان دژی (بەرەی ئیسلامی ئەفغانی) لەماوەی ساڵانی شەڕی ناوخۆی ئەفغانستان.

بەڵام لەم دواییانەدا ئەم دەزگایە ڕووبەڕووی چەندین ڕەخنە بووەوە لەلایەن ناوەندە سەربازی و مەدەنیەکان بەهۆی پاڵپشتی کردنی هێزە تیرۆریستەکان و ئەو چالاکیە تیرۆرستیانەی کە لە وڵاتاندا دژی هێزە سەربازیەکان ئەنجامدەدرێن بەتایبەتی لە

هیندستان. وە لەساڵی ٢٠١١ لەلایەن ئاژانسی IBT ەوە وەک گەورەترین وەکالەتی هەواڵگری لە جیهاندا دیاریکراوە، وە لە نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠١٥ بەڕێوبەری پێشووی وەکالەتی هەواڵگری هیندستان دەزگای(isi) ی وەک بەهێزترین دەزگای هەواڵگری لە جیهاندا باسکرد کە دەگاتە ئاستی دەزگای هەواڵگری روسی. مێژووی ئەم دەزگایە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٨ دوای جەنگی نێوان پاکستان و هیندستان حکومەتی پاکستان چەندین خاڵی لاوازی لە سیستەمی هەواڵگری و سەربازی وڵاتەکەیدا بەدی کرد بەتایبەتی لەڕووی کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی زانیاریە هەواڵگریەکان و هەماهەنگی نێوان هێزی دەریایی و ئاسمانی پاکستانی لەگەڵ نووسینگەی هەواڵگری سەربازی کە بۆ ئەم مەبەستە دووبارە سیستەمی هەواڵگری و سەربازیان رێکخستەوە. هەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە، ئەم دەزگایە لەلایەن چەند ئەفسەرێکی پلەبەرزی سوپاوە بەڕێوەدەبرا کە ئامانجی سەرەکی بریتی بوو لە کۆکردنەوەی زانیاری سەربازی و ناسەربازی لە دەرەوە و ناخۆی پاکستان و شیکارکردنی. دامەزراندنی ئەم دەزگایە لەراستیدا بیرۆکەی جەنەراڵێکی بەریتانی بوو بەناوی رۆبەرت کۆسۆم کە سەرهەنگ شەهید حامدی راسپارد بۆ دامەزراندنی ئەم دەزگایە. ئەم دەزگایە بەشێوەیەکی گشتی لەم بەشانەی خوارەوە پێکدێت:

- بەشی ناوخۆ: کە بەرپرسە لە چالاکیە هەواڵگری و دژە هەواڵگریەکان لە ناوخۆی پاکستان و هەروەها قەڵاچۆکردنی سیخوڕی و تیرۆر.
- بەشی دەرەکی: بەرپرسە لە هەواڵگری دەرەکی و سیخوڕی کردن.
- بەشی پەیوەندیە دەرەکیەکان: بەرپرسە لە هەواڵگری دیبلۆماسی و پەیوەندیە دەرەکیەکان.

دەستەی بەڕێوەبەری ئەم دەزگایە لە کۆمەڵێک ئەفسەری هێزە چەکدارەکان پێک دێت لەگەڵ کۆمەڵێک لە هێزە مەدەنیەکان و بەڕێوەبەرایەتی گومرگ و پۆلیسی پاکستان، کە بەردەوام و بەشێوەیەکی چالاکانە کارەکانیان رادەپەڕێنن، شارەزایان ئەم دەزگایە بە گەورەترین دەزگای هەواڵگری دادەنێن لەجیهاندا لەڕووی ژمارەی

کارمەندەکانیەوە، هەرچەندە بەشێوەیەکی فەرمی ژمارەی کارمەندەکانی نەزانراوە بەڵام شارەزایان ئەم ژمارەیە بە دە هەزار ئەفسەر و کارمەندی هەواڵگری دەخەمڵێنن، ئەمە سەرەڕای هەواڵدەر و سەرچاوەکانی تر.

## هەواڵگری وڵاتی چین

چین ئەو وڵاتە فراوانەی کە دانیشتوانی زیاتر لە ملیارێک کەسە و ساڵانە ١٥ ملیۆن زیاد دەکات، ئێستا ئەوەندە بەهێز بووە کە بۆمبی ئەتۆمی و هایدرۆجینی بەرهەم ئەهێنێت و لەئێستادا خاوەنی عەمبارێکی چەکی ئەتۆمییە. ئەمریکا ئەو وڵاتەی کە بۆ یەکەم جار لەمێژوودا بووە خاوەنی چەکی ئەتۆمی مەترسی لە چین پەیدا کردووە بەهۆی پێشکەوتنی لە بەرهەم هێنانی چەکی ئەتۆمی. لەگەڵ ئەوەشدا، چین وڵاتێکە بەهۆی هەڵکەوتەی جوگرافی و زۆری ژمارەی دانیشتوانی وەک خۆڕاگرترین وڵات دادەنرێت بەرامبەر هێرشی چەکی ئەتۆمی، بۆ نموونە ئەگەر لەلایەن ئەمریکاوە هێرشێکی چەکی ئەتۆمی بکرێتە سەر چین با وای دابنێین لەئەنجامی ئەو هێرشەدا ٢٠٠ ملیۆن کەس دەکوژرێت کە ئەمەش بەراورد بە ژمارەی دانیشتوانی چین ژمارەیەکی کەمە و بەئاسانی قەرەبوو دەکرێتەوە لە کاتێکدا ئەگەر چین لەبەرامبەر ئەو هێرشەی ئەمریکادا تەنها یەک رۆکێتی هەڵگری کڵاوەی ئەتۆمی بۆ سەر ئەمریکا بهاوێژێت ئەوا دەبێتە هۆی لەناوبردنی ٦٠٪ ی دانیشتوانی ئەمریکا کە شیرازەی ئەو وڵاتە بەتەواوی تێک دەشکێت و بەئاسانی قەرەبوو ناکرێتەوە و ئەمریکا دەبێت بە دەوڵەتێکی بێهێز لە ناوچەکەدا، هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە کە زۆرجار چین گاڵتەیان بە هەڕەشە ئەتۆمیەکانی ئەمریکا دێت. ئەگەر جەنگ لەنێوان ئەمریکا و روسیا بەرپا ببێت ئەوا دوای ئەو جەنگە چین دەبێتە بەهێزترین دەوڵەتی ئەتۆمی لە جیهاندا، پاش ئەوەی کە ئەو دوو دەوڵەتە یەکتری وێران ئەکەن. بۆیە زۆرجار گوێبیستی هەندێک سیاسی دەبین کە بانگهێشت دەکەن بۆ گفتوگۆی دۆستانە و لێکتێگەیشتنێکی ئەتۆمی لە نێوان روسیا و ئەمریکا تا فشار بخەنە سەر چین و رازی بکەن بەرێککەوتنێکی ئەتۆمی تا ئاشتی لە جیهاندا بەرقەرار بێت. هەواڵگری چینی

میللی وەک هەموو دەزگا هەواڵگریەکانی تری جیهان لە کاتی مەترسیدا دامەزراوە و هەواڵگریەکی نوێیە لەو کاتەی کە شیوعیەکان هاتنەسەر دەسەلأت، ئەرکی دژایەتی دوژمنانی شۆڕشە لەناوخۆدا و هەروەها شوێن کەوتنی دوژمنانی لەدەرەوە بۆ چەسپاندنی شوعیەت لەسەرتاسەری چیندا، هەواڵگری چینی بەشێوەیەکی فەسمی یەک ملیۆن فەرمانبەری هەیە، کەمترین پارە خەرج دەکات کە بۆ هەواڵگری خەرج دەکرێت لە جیهاندا، لەبەرئەوەی پێویستە لەسەر هەموو شیوعیەکی چینی یارمەتی پارتەکەی و حکومەتەکەی بدات بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی سوپاس و پێزانین بکات. لە ئەرکەکانی هەواڵگری چینی سیخوڕیکردنە بەسەر نەیارانی چین و هاوڕێکانی وە لەسەر گەلی چینی لەهەمان کاتدا، بۆیە ژمارەی فەرمانبەرانی زیادی کرد تا گەیشتە ۳ ملیۆن کەس لە نێر و مێ (ژمارەی کارمەندانی هەواڵگری چینی لە ژمارەی دانیشتوانی زۆر دەوڵەت زیاترە). کاتێک هەواڵگری چینی دەیەوێت فەرمانبەری نوێ بێنێتە ناو دەزگاکەیەوە لەڕێگەی ئاگاداریەکەوە بڵاوی دەکاتەوە کە وەزارەتی دەرەوە پێویستی بە فەرمانبەر هەیە لە باڵیۆزخانە و کونسوڵخانەکانە و دامەزراوەکانی چین لەدەرەوە، بەو مەرجەی ئەو کەسە شێوەی ڕووخساری لە چینیەکان جیاواز بێت، بەم شێوەیە سەدەها کەس دێنە پێشەوە و گونجاوترینیان هەڵدەبژێردرێت، بەم شێوەیە فەرمانبەری هەواڵگری چینی دەست بە کارەکەی دەکات و دەبێتە یەکێک لە تۆڕی هەواڵگری چینی کە بە جیهاندا بڵاوبۆتەوە پاش ڕاهێنانی لە قوتابخانەکانی هەواڵگری چینیدا. ئەو پلانەی هەواڵگری چینی لەسەری دەڕوات دەست گرتنە بەسەر ئاسیادا هەر لە ڕۆژهەڵاتی چیای ئۆڕاڵەوە لە ڕوسیا هەتا لەگەڵ ئەو پێدەشتانەی کە لە پشتیەوەیەتی تا دەریا. وەزیری بەرگری چینی پلانێکی ئاشکرا کرد بۆ دەست بەسەردا گرتنی سێ یەکی جیهان، ئەویش بە ملکەچ پێکردنی ئەو دەوڵەتانەی کە دەکەونە باکوری زەریای ئەتڵەسیەوە بەهۆی شۆڕشی ناوخۆیی و پلانگێڕی و کودەتا لەو وڵاتە دواکەوتوانەدا. هەواڵگری چینی پاساو بۆ ئەم پلانەی ئەهێنێتەوە بەوەی کاتێ شوعیەت سەردەکەوێ کێشەی چینی هەژار و چەوساوکان چارەسەر دەبێت و ئاشتی لە جیهاندا بەرقەرار دەبێت. هەواڵگری چینی دابەش دەبێت بەسەر چوار

بەشدا بەم شێوەیە: بەشی یەکەم: سەر بە وەزارەتی دەرەوەی چینە. بەشی دووەم: ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە حکومەتەوە هەیە. بەشی سێیەم: سەر بە سەرکردایەتی سوپایە. بەشی چوارەم: سەر بە پارتی شوعی چینیە .

هەر دەزگایەک لەم چوار دەزگایە بە جیا لەوانی تر کاردەکات، بەڵام ئەم دەزگایانە لەڕێگەی سەرۆکەکانیانەوە ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە حیزبەوە، بەڵام دەزگا و فەرمانگەکانی کە لێیان جیا دەبنەوە بە تەنیا کاری خۆیان ئەنجام ئەدەن، ئاشکرایە کە ئەندامانی پارتی شیوعی لە فەرمانگەکاندا وەک فەرمانبەر و چاودێر کاردەکەن، بەم شێوەیە سەرۆکی هەواڵگری دەتوانێت چاودێری هەموو شتێک بکات. ئەو ئەندامانە ڕاپۆرت بەرز دەکەنەوە کە ئەو زانیاریانە دەگرێتەخۆ کە گرنگی هەیە، ڕاپۆرتانەش کۆدەکرێنەوە و لێیان دەکۆڵرێتەوە و بەراورد دەکرێت و ڕاستی ڕاپۆرتی هەر دەزگایەک بە جیا هەڵدەسەنگێنرێت. سەبارەت بە کاری بەشە جیاوازەکانی هەواڵگری چینیش ئەوا دەبینین بەشی یەکەم کە سەربە وەزارەتی دەرەوەیە دەزگایەکی گرنگ و نهێنیە تایبەتە بە هەواڵی دەرەوە و کاری دەرەکی کە دابەش دەبێت بەسەر دوو بەشدا کە بە چینی پێی دەوترێ (های وای):

یەکەم: بەشێک بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ و پشکنین. دووەم: بەشێک بۆ کارکردن و جێبەجێکردن، دەزگای دووەم سەر بەوەزارەتی دادە، کە بە چینی پێ دەوترێ (باونشتۆ). کە بۆی هەیە چاودێری بیانیەکان بکات لە چین، هەروەها بۆی هەیە کۆنترۆڵی کارەکانی پۆلیسی چینیش بکات و چاودێریان بکات، ئەم دەزگایە کاری تێکدان دەسەپێنێت بەسەر نەیاران و بەرهەڵستکارانی حیزبی شیوعی چینی. لە ئەرکەکانی ئەم دەزگایە دابەشکردنی سیخوڕە بەسەر باڵیۆزخانەکانی چیندا لەدەرەوە و چاودێریکردنی فەرمانبەران. دەزگای سێیەم سەربە سوپای چینی میللیە کە دەزگایەکی بە هێزە و سیخوڕی دەکات بەسەر هێزی سەربازیەوە بۆ دڵنیابوون لە دڵسۆزیان بۆ حیزبی شیوعی، سەرەڕای چاودێری کردنی شاندە سەربازیەکان و پاشکۆ سەربازیەکانی چین لەدەرەوە .

دەزگای چوارەم ئەو دەزگایەیە کە راستەوخۆ بە حیزبەوە بەستراوە، لەهەموو دەزگاکانی تر شاراوەیە و ئەرکی سیخوڕیکردنە بەسەر هەموو مرۆڤێک لە چیندا، ئەم دەزگایە سیخوڕی دەکات بەسەر ئەندامانی حیزبەوە لە گەورەوە بۆ بچوک جگە لە سەرۆک وەزیران و سەرۆکی دەوڵەت، ئەم دەزگایە ناوێکی ئێجگار سەرسورهێنەری لێنراوە کە ئەویش *فەرمانگەی کاروباری کۆمەڵایەتییە*، نووسینگەکەی لە تەلارێکدایە لە شەقامی (١٥) لە پەکین.

مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بە ساڵانی چلەکان، یەکەم سەرۆکی ئەم دەزگایە کانگ شی بووە کە لە دۆخێکی تەم و مژاویدا لەساڵی ١٩٥٢ کوژرا، لە جێگەی ئەو جەنەڕاڵ لی کۆنگ دانرا کە پاش دە ساڵ ئەمیش کوژرا، پاشان جەنەراڵ شۆ تاینگ بەڕێوبەری بەشی های وای سەرۆکایەتی دەزگای چوارەمیشی دەکرد، کە لەبەر بلیمەتی ئەم پیاوە سەرۆکاتی دوو بەشی جیاوازی هەواڵگری پێسپێردرا.

## گۆستاپۆ

گۆستاپۆ ئەو ناوەیە کە لە هەواڵگری ئەڵمانی و دەزگای سیخوڕی ئەڵمانی لەسەردەمی رایخی سێیەمدا نرابوو، لە ئەڵمانیا وشەی گۆستابۆ بەمانای ترس و تۆقاندن و دەستگیرکردنی بەرهەڵستکارانی حیزبی نازی دێت، وە سووتاندنیان لە فرنی تایبەتدا بێ هیچ سۆز و بەزەییەک، سەرۆکایەتی هەواڵگری ئەڵمانی (گۆستاپۆ) لە تەلارێکی هەشت نهۆمیدا بوو، لە بەرلین لە شەقامی برنز ئەلبرت ستراش ژمارە ٨. لە مەڵبەندی گۆستاپۆدا دەیەها ئەفسەری نازی دڵسۆز بۆ پارت و هیتلەر هەڵدەستان بە پیلان دانان بۆ کاری تێکدان و سیخوڕیکردن، بەکرێگیراوانیان دەڕەخساندن و رایان دەهێنان و دەیان ناردن بۆ ئەو وڵاتە جۆراوجۆرانەی کە مەبەستیان بوو بزانن چی تیادا روودەدات. جگە لەمەش، هەواڵگری ئەڵمانی سڵی نەدەکردەوە لە بەکارهێنانی ئافرەت بۆ ناردنیان وەک سیخوڕ بۆ وڵاتانی تر. پاش دۆڕاندنی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی دووەم و رووخانی رایخی سێیەم، بەرلین کەوتە دەست هێزەکانی هاوپەیمانان، دوای ئەوەی بەسەدان جار بۆردومان کرا. بارەگای

